میرزا ڕەشید ئەدیبوششوعەرا



# مێژووی ئەفشار

وەرگێڕ

سەلاحەددین ئاشتی

میرزا ڕەشید ئەدیبوششوعەرا

# مێژووی ئەفشار

وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

سکەی زیڕ
سلێمانی ٢٠٠٨

ئـ ٩٨٤ ئەدیبوشوعەرا، میرزا رەشید
مێژووی ئەفشار، دانانی میرزا رەشید ئەدیبوششوعەرا؛ وەرگێڕ
سەلاحەددین ئاشتی.- سلێمانی. بنکەی ژین، ٢٠٠٨.
٦٠٩ل: ٥ .١٧×٢٥ سم).- زنجیرە: ٩٣
١- کوردستان- مێژوو. ٢- ناونیشان
٣- زنجیرە: ٩٣ ٤- ئاشتی، سەلاحەددین (وەرگێڕ)
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی بۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

## سەرپەرستی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق سالح

•زنجیرە: ٩٣
•ناوی کتێب: مێژووی ئەفشار
•نووسەر: میرزا رەشید ئەدیبوششوعەرا
•وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی
•تایپ و مۆنتاژ: پەروین پیرەبابی- چاپی پیرەمێرد- ٢٢٢١٧١٥- ٤٤٢،
•خەت و رووبەرگ: ئەحمەد سەعید
• بەرگەژمێر: ١٠٠٠
•نرخ: ٩٠٠٠ دینار
•ژمارەی سپاردن: ١٢٠٣ی ساڵی ٢٠٠٨
•شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

ئەم سەرچاوەیەوە وەرگێڕدراوە: تاریخ افشار، میرزا رشید ادیب‌الشعراء به کوشش محمود رامیان و پرویز شهریار افشار. چاپخانەی شفق تبریز. ١٣٤٥ - ١٣٤٦ شمسی



لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و رۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣، سندوقی پۆست: ١٤
ژمارە: ٣٣٠٠٦٦٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٢٤٢٨٢٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

# پێرست

# سەردەق

بەداخەوە زۆر کەم هەڵدەکەوێ ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بە مێژووی ئێران و تووران نووسراون و کوردیشیان گرتۆتەوە، پارسەنگیان تێدا پارێزرابێ و بەرەنگاری و بەرخۆدان و بەربەرەکانیی مانەوەی ئەم گەلەیان بە کەلەوەکێشی و ملانە و ئاژاوەگێڕی نەقەبلاندبێ. کەچی هەر لە رووی ئەو سەرچاوانەوە دەردەکەوێ ئەوانەی کە هاتوونە خاکی کوردستان تێی‌نەفکریون و تێی‌رۆهاتوون و هەرچی کردوویانە بە حەلاڵ و زەلالیان زانیوە و تەنانەت تووبڕینەوەی کوردیان بە ئەرکی دینی و شەڕی پیرۆز داناوە. وا دیارە خەنیمەکانی هەتا پتر لە سەر زگی هەڵبەزیون، زیاتریان تەنگەتاو کردووە و پێداپێدا لە پێدەشتانەوە بەرەو بنار و کۆساران چێوەختەیان داوە. پاشان بە تێرادیوی لێی‌بوونە ئاغا و کوێخا و چۆنی دڵیان پێی‌گەشابێتەوە و هەڵومەرجی پێویست رەخسابێ ئاوای لەگەڵ تێکەوتوون. لە هەموو ئاشێک لێی‌بوونە بەرداش و بۆ خواردن و لێس‌دانی هەر بەرهەم و دەسکەوت و داهاتێک سەرپشکی یەکەم بوون و لێرەدا «سەرگوڵ بۆمن، بەرماو بۆ تۆ» چاکی رەنگداوەتەوە. بەلام دەبێ لە بیرمان بێ کە نووسەرەکان جاری وایە کەمتر ئەو دیوی کاڵ و نێومرۆکی نووسینەکانی خۆیان وەبەرچاو گرتووە و پتر بە رووکار و پێداهەڵدانەوە نووساون هەتا لێکدانەوەیەکی ورد و زانایانە و هیچکامیشیان سڵەیان لە درۆهەڵبەستن نەکردۆتەوە. هەڵبەت نابێ ئاستی خوێندەواری و وریایی قەڵەمداران و چۆنیەتی سەردەمی ژیان و ئەرکی سەر شانیان بەرژینی لێ‌بگیرێ.

میرزا ڕەشیدی ئەفشاریش کە ئەم کتێبەی نووسیوە نەیتوانیوە لەم بازنەیە دەربازبێ. بەلام سەرەڕای هەموو کەمایەسییەکانی زۆر بە ڕوونی مەبەستی گرینگی وای درکاندووە کە بەلگەی قورس و پتەون لەسەر خاک و سنووری بەشێک لە نیشتمانی کوردان. سەرخان و ژێرخانی گەلێک ڕووداوی بردوونەوە سەر یەکتر کە وەک گەنجی سەربەمۆر وان. هیچ بە پێویستی نازانم لێرەدا دەست بکەم بە گێڕانەوەیان. ئەوەندەم لە سەرە دۆعای بە خێری بۆ بکەم و بلێم بەشی خۆم لەو جنێوانەی کە دوایەتی و دەمگرێتەوە، گەرنی خۆی و باب و باپیریشی ئازا بێ.

وەکوو دیارە خوابەخشیوان مەحموود ڕامیان و پەرویز شەهریار ئەفشار سالی ١٩٦٧ ئەم کتێبەیان چاپ کردووە کە ئەو دەم سەد سالێک بە سەر نووسرانی دوایین بەشیدا تێپەڕیوە و لایانوایە لەپڕ براوەتەوە و ڕەنگە نووسەر درێژەی دابێ، بەلام وەچنگ ئەوان نەکەوتووە. هەرچۆنێک بووبێ نووسینەکەی میرزا ڕەشید لەو چاخەوە کە خۆی شارەی بۆ داناوە و دەستی کردووە بە گێڕانەوەی هەتا ئەو شوێنەی کە چاپ کراوە بەڕوالەت گرێ و قۆرتێکی وای وەبەرنایا. تەنیا لەو جێیانە هەستی پێدەکرێ کە «ڕامیان» و «شەهریار ئەفشار» خۆیان پێیان لێناوە و گوتوویانە چونکە لە ڕەوگەی سەرەکی لای داوە کە مێژووی ئەفشارە، لێیانهەلقرتاندووە. لە پێشەکی کتێبەکەدا نووسیویانە: «ئێمە ویستوومانە کە ڕەسەنایەتی دەقەکە تەواو وەکوو خۆی بمێنێتەوە، بەلام ـ هێندێک شوێن ناچار بووین هەلیبەڕتێوین هەتا لە کورتی برابێتەوە. هەولمان داوە ڕووداوەکانی مێژوویی بە سەر کەموکووڕیدا نەکەون و نەمانهێشتووە هەوداکان لێکدابڕێن...»

بەلام بەڕاستی هەتا ڕۆژایەکی کە دەقی سەرەکی وەدەرنەکەوێ چۆنیەتی بانگەشەی ئەوان ڕوون نابێتەوە. بۆ ئەوەی سوکنایێم بە دەروونیدا گەڕابێ ماوەیەک هەلسووڕام، کەچی هیچم دەست نەکەوت. بە بڕوای من وێدەچێ لەبەر

بەرژەوەندی سەردەم مەبەستی واشیان دەرهاویشتبێ کە نەگەڕێتەوە سەرباری دڕێژداری و بە هەوانتەیان دانابێ!

ئەو بەڕێزانە لەو جێیەی وا کتێبەکەی میرزا ڕەشید براوەتەوە بە نووسینی تێبینییەک گوتوویانە بۆ ئەوەی کە مەودای سالانی ١٢٩٠ – ١٢٩٩ی کۆچی / ١٨٧٣ – ١٨٨١ی زایینی بە تاریکی نەمێنێتەوە و مێژووی ئەفشارانی ورمێ بە سەر بەتالاییدا نەکەوێ پاشکۆیەکیان ڕەگەل خستووە. ئەم دەستنووسە کە بەرهەمی قەلەمی عەلی کوڕی گۆنەخانی ئەفشارە، لە ژێر سەردێری «سەربزێوی شێخ عوبەیدیللا»دا خراوەتەڕوو.

ڕامیان و شەهریار ئەفشار نووسەری پاشکۆیان بە پیاوێکی ڕەمەکی و کۆلەمیرزا داناوە و گوتوویانە نووسینەکەی گەلێکی هەلە و پەلەی ڕێزمانی و ڕێنووسی تێدا بووە کە هەموومان بۆ ڕاست کردۆتەوە و پاشان لە بێژینگمان داوە و چۆن جوانە و تێگەیشتنی هاسانە ئاوامان بە سەر هێناوە. وا دیارە ئەرکی دووبارە نووسینەوەی ئەم بەشە کەوتۆتە سەر ئەستۆی پەرویز شەهریار ئەفشار و وەک دەرکەوتووە بەڕاستی ڕەسەنایەتی دەقەکەی نەپاراستووە و چۆنی ویستوویەتی و تێیگەیوە ئاوای نووسیوەتەوە و بەرگی بایەخی دیرۆکی لەبەر داڕیوە.

سالی ٢٠٠٠ نووسەری بەڕێز کاک محەممەد حەمەباقی ئەم پاشکۆ ناپوختەی بە تەواوی کردۆتە کوردی و لە کتێبی «شۆڕشی شێخ عوبەیدوللای نەهری (١٨٨٠) لە بەلگەنامەکانی قاجاری‌دا» خستوویەتە بەرچاوان. بەڕاستی کاری ڕاست بێ کە ئەو کارە چەوت و نالەبارەی لە ئەستۆی داڕنیوم. پێشتر ئاماژەم پێکرد کە ڕەسەنایەتی دەقی پاشکۆ نەپارێزراوە و ئەم مەبەستەشم کاتێک بۆ ڕوون بۆوە کە توێژەر و نووسەری هێژا کاک ئەنوەر سولتانی دەقێکی دەستنووسی ئەم کتێبەی لە لەندەن دۆزیوەتەوە و ناردوویە بۆ برادەرانی بنکەی ژین لە سولەیمانی هەتا یەکێک بیکاتە کوردی. ئەوانیش داویانە بە کاک

محەممەد حەمەباقی و ئەویش بۆ جاری دووەم وەریگێڕاوە، بەڵام ئەمجارەیان دەقێکی تەواو. ئەم کتێبە ساڵی ٢٠٠٧ کۆڕی زانیاری کوردستان چاپی کردووە و وا دیارە دوای چندرانی پیتەکانی کەس پێیدانەچۆتەوە و وەک خیز و خۆڵ هەڵەی ڕێنووسی تێدایە. بە باری ڕێزمانی و وەرگێڕانیشدا ئەوەندە شل و شاشە کە لێم سوورە دارشتنەوەی تازەی دەوێ.

دەڵێن پیاو ئەگەر زۆری گوت، چاکیش دەڵێ و خراپیش دەڵێ! بەڵام هێندەم فەراغ لێکێشا کە سەرەداوی قسەکانی خۆشم لێ ون بوو. جا با لێرەدا بگەڕێمەوە سەر دەقی مێژووی ئەفشار و بڵێم بێجگە لەو پەراوێزانەی کە بە دوو پیتی «م.پ» داکووژاون و بۆ نیشانەی ناوی مەحموود ڕامیان و پەرویز شەهریار ئەفشار داندراون، ئەوانی دیکە خۆم نووسیومن. تەواوی وشە و ڕستەکانی نێو کەوان و قولاپیشم زیاد کردوون. هەروەها کتێبەکە لیزگەی ناوەکانی تێدا نییە و ئەویشم بۆ ڕێکخستووە و بەرامبەری ساڵەکانی کۆچی، ساڵی زایینم داناوە. نووسەر و وەرگێڕی کارجوان کاک سەید عەولا سەمەدی لە دوازدە جێیان ڕۆژ و مانگ و ساڵەکانی بە زایینی بۆ بردوومەوە سەر بەکتر و ماڵی ئاوەدان بێ. سپاس بۆ نووسەر و وەرگێڕی خۆشەویست دکتۆر عەبدوڵڵا مەردووخ کە ئەم کتێبەی پێناساندم و دنەی دام بۆ وەرگێڕانی. ماکەی سەرەکی ئەم کتێبە کە فارسییە، وەرگێڕی ئازیز کاک سمایل بەختیاری نایە بەردەستم و چاکەی لە چاومدایە. خۆم بە ئەمەگداری یای پەروین پیرەبابی دەزانم کە زۆر بە دڵوداو ـەری پیتچنینی ئەم بەرهەمەی ڕاپەڕاند.

سەلاحەددین ئاشتی

١٣٧٨/٢/١٨ی هەتاوی - ٢٠٠٨/٥/٧ی زایینی

# پێشەکی

## بە ناوی خوداوەندی دەهندەی دلۆڤان

ڕازینەوەی سەردەقی وتار و شەمی ڕووناکیدەری خانووچکەی ئاوات و ئامانج، سپاس و پێزانینی بێپسانەوەیە بۆ مەزنەمیرێکی فرەزانی خاوەنشکۆ کە ڕووباری بەخشینی هیچکەس وەدوا نادا.

یەزدان بە مەبەستی ڕێکخستنی ڕێوشوێنی دین و دەوڵەت و هەڵدان و گەشەی گەل و نیشتمان کۆمەڵێک پێغەمبەری وردبین و پیاوچاکانی بەدین و پادشاهانی دادپەروەر و میرانی خۆشفەڕی زەنگینی لە حەشارگەی غەیبەوە دەرخستوون. ئینجا هەوساری ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی خەلکی داونە دەستی هەتا بکەونە وەشاندنی گەوهەری ژیری و زۆرزانی و پەرەپێدانی بەستێنی دادەوانی و ڕاگرتنی پارسەنگی نێوان کۆمەلانی خەلک و ولاتان کە تێکڕایان داهێنانی تازە و بە ئامانەت داندراوی توانست و دەسەلاتی ئەون.

پەروەردگار وای داناوە کە پۆلی پێشەنگان بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتی ولاتان هەنگاو باوێن و ڕێ خۆش بکەن بۆ تێر و تەسەلیی مرۆڤان و ڕایانبێنن کە توێشەبەرەی بەڕێچوون و هەمبانەی ڕۆژی ڕابوونەوە و بەسەرچوون بناخنن.

خواوەند لە هەر چاخ و خولێکدا مل بە تۆخم و تۆرەمەی ئادەمی دەچەمێنێ و دەیخاتە ژێر نیری دەسەڵاتی پادشایەک و ئیدی لەوەی ناپرسێ کێ لە سەرە و کێ لە ژێرە و کامە دارایە و کامە نەدارە. چونکە فەرمانڕەوا حوکمی بێسێودووی چەشنی رووحی ڕەوانە کە ژیان دەهەژێنێ و چۆمەڵ و جۆباری دادپەروەری و سەرڕاستی لە دەریای مەزنایەتی و جوامێری ئەوڕا بەرەو هەموو لایەک پەل دەکوتن.

ئێمە لە ڕووی مێژووی کۆن و کەوناراوە وامان بۆ دەردەکەوێ کە لە سەردەمی کەیوومەرسی پێشدادیڕا هەتا ئەمڕۆ پۆلپۆل سوڵتانی گەورە هاتوون و تاجی دەسەڵات و شەوکەتیان گەیوەتە ئەستێرەی گولبەندی چەرخی گەردوون و گەلێک ساڵ لەسەر تەختی حوکمات پاڵیان داوەتەوە. بەڵام سەرەنجام کەوتوونە شوێنپێی ئایەتی «هەموو کەسێک تامی مردنێ دەچێژێ»[1] و دەستیان لە داوێنی دنیای نەمێن و رووخەکی سەرانسەر پڕ کوێرەوەری بەرداوە و وەکوو خەزێنە گڵەبان کراون و هەست و خوستیان لێبڕاوە و خرپ خەوتوون.

لە مەودای ڕۆژگاراندا بەپێی چارەنووسی یەزدانی ڕەوت و ڕێبازی دەسەڵاتی خانخانی بۆتە باو و هەر سنوورەی سنووردارێک و هەر مەڵبەندەی حاکمێک و هەر شارەی میرێکی ناوبەدەرەوە لێیبوونە خاوەن و ماوەیەک بەسەری ڕاگەیشتوون و ئاڵای برشت و دەسەڵاتیان لێهەڵداوە. ئەم حاکمانە لەجێوە ماڵ و نامووسی خزم و خێڵیان پاراستووە، بەڵام چونکە لەگەڵ شێواز و چێشکەی مێژوونووسانی ڕەوانبێژ یەکتری نەگرتۆتەوە و هانی نەداون بچن خۆ بەو کار وردانەوە خەریک بکەن، زۆربەی هەرەزۆری ئەم رووداوە پرشوبڵاوانە لە قەڵەم کەوتوون. بۆ وێنە چۆنیەتی بەسەرهاتی حوکمڕانان و بەگەرانی

[1] - « كلُ نفسٍ ذائقة الموت » قورئانی پیرۆز، سوورەی ئالی عیمران، ئایەی ١٨٥، لاپەرە ٧٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار، چاپی یەکەم، ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی (٢٠٠٠ی زایینی)، تاران، چاپەمەنی «ئیحسان» و «تازەنیگا».

گەورە و بەشەرەفی ئەفشاری ورمێ باسی نەکراوە کە لـە ڕۆژگـارانی پێـشوودا بەیداخی بەختیان گەیوەتە لووتکەی بەرزی درەوشانەوە و تەواوی سەربزێوانی کەوشەن و کەڵەوەکێشانی ناوچەکانی ئازەربایجان و ئەم هەرێمـەیان کردۆتـە مێو و ڕۆن و سەریان پێبەرداونەوە.

ماوەیەک لێرەوبەر واتە سالی ١٢٥٠ی کۆچی/١٨٣٤ی زایینی، لە سەردەمی دەسـەلات و پاشـایەتی محەممەدشـای خەزاکـەری کـوڕی عـەبباسمـیرزای جێنشینیمیردا، یەکێک لە ئامۆزاکانی دایکی منی چووکە و بەرەژێری جـەماوەر بە ناوی مەولا مەحموود لەسەر ڕاسپاردەی نەجـەفقولـیخـانی بەگلەربـەگی ئەفشاری قاسملوو، کتێبێکی سەبارەت بـە سـەربوردەی ئەفـشارەکانی ورمـێ نووسیوە و بە یادگار بەجێیهێشتووە. بەلام چونکە لەگەڵ بەلـگەنامە ڕاسـت و دروستەکان یەکتری نەدەخوێندەوە و گەلێک وشەی ڕەقوتەق و دزێو خۆیان تێدا دەنواند، وەبەردلی کەسانی ورد و باریک نەدەکەوت و هەموو لایەک ئەو کۆمەلە شپرزەیان وەبەرچاو نەدێنا و هیچ وازیان لێنەبوو بخوێننەوە. هەتا وای لێهات کە شوکر بۆ خوا لەم سەردەمەدا شابالی بەختی پیرۆزی پەرمەدەری دینی یەزدان، ناسرەددینشای قاجار ترووسکایەوە... .

... منی هەژاری شەرمەندەی بێدەسـەلات و کـەمبڕسـت عەبدوڕڕەشـیدی کوڕی محەممەدشەفیعی ئەفشاری مـەحموودلووی ئـوروومی بـەپێی ئامـاژە و فەرمانی مزگێندەری چرای خانەدانی هەتاهەتایی قـاسملوو، شـوجاعوددەولە یۆسفخان کوڕی لوتفعەلیخانی سەرتیپ کوڕی ئیمامقولیخانی بەگلەربـەگی ئەفشار کوڕی ڕەزاقولیخان، تاسەم بزووت و دنە درام و کەوتمـە شـوێن ئـەم بەختەوەرییە. جا ئەگەر بێتوو شلەی نەدەمێ و سەرکەوتنم بە دەسـتەوە بـێ و تەمەن بالـم بگـرێ، لێبـڕاوم کـە بەسـەرهاتی ئـەم خێلە و سـەرکردەکانی بنووسمەوە و هەر کتێب و سەرچاوەیەکی باسی ئەوانی تێدایە وەپاشی نەدەم و لێیخورد ببمەوە و بەرهەمێک بکەمە یادگاری دەوران.

وەرە گوێ بگرە شـێعرم خـاوەنی بـیر
ئەگەر چەنـد ڕۆژێ بـەختم لاری دێنـا
بەلام شوکرانە بۆ خـوا ڕەوتـی گـۆڕی
بەلـێ وایـە زەمانـە خـۆی دەزانـێ
ئـەوا عـومرم لـە قـەرنێ[1] تێپـەڕیوە
کە دەستم کرد بـە هەلـدان گـەورەکانم
زەمانێ تۆوی شـێعرێ هـات و چانـدم
هەتا سەر نابێ بێکڕیار وتـەی جـوان
ئەوانـەی ئـاقل و زانـان بـە جـارێ
قسەی مـن ڕووی لـە خاوەنـدی دلانـە
ئـەتۆ پێـتوایـە کێیـە ئێـستە کـڕیار
ئـــەمیری بـــەختیاری بەرزەشـــانە
ئـــــەوە ئاقانـــــە بەخـــــشندەی زەمانە.........................................
بــە پـشتیوانی خــوا پـشتم دەبەسـتم

بە وردی تێکەوە ئەی زیرەکـی ژ
ئەوا گـەردوونی لارێ خـواری دێ
ئەما گـرژی، فـرێی دا داو و تـۆ
لە کوێ تالاو و شەکراو بێت و ڕا
مەلی بەختم بەرەو بـەرزی فـڕ
هەموو وتیان ڕەشیدم بـاش بـز
لە خەلکی دیکـەیان زۆر تێپەڕاند
کە وەک گەوهەر بپارێزن لە لێو
هونـەر دەکڕن، لـە دەسـتیان زێ
دەبـــــــــــــــــــا
لە کـوێ بـۆ گێرەشـێوێنی نەزا
ئەوەی ئرخم دەزانـێ داویـە بـر
بـە جـوامێری لـە بـانی ئاسما
بە ناو و دەنگە یۆسف میر و خا

کتێبێکی بەناوبانگ هەلدەبەستم

❖❖❖❖

[1] - بەپێی هێندێک بۆچوون قەرنێک ١٠٠ یان ٣٠ سالە. بەلام نووسەر لەم کتێبەدا بە ٣٦ سالی داناوە و دەبێ تێودرسووڕانەوەی مانگی محەڕرەم بە دەوری خۆیدا بـە قـەرنێک حیساب کرابێ یان بە کوردی ڕەمەزان گەڕابێتەوە سەر جێی ٣٦ سال پێـشتری و هـەموو سالێ دە ڕۆژ بەرەوپێش چووبێ و ماوەی ٣٦٠ ڕۆژی بڕیبێ.

# ماکەی ناوی ورمێ

ئەوەی زۆر باوە و لەسەر زار و زمانان دێ و دەچێ، دەڵێ ئەم شارە بە دەستی یەکێک لە کوڕانی تورکی[1] کوڕی یافس کوڕی حەزرەتی نووح - سەلامی خودای لەسەر بێ- بناغەی داندراوە. بەڵام لە ڕووی توێژینەوە و بەڵگەوە ناوی بناغەدانەر و مێژووی سەردەمی سازکرانی دیار نیە و ئەگەر هەشبێ وەبەرچاوی منی ڕەشکەرەوەی ئەم لاپەڕانە نەهاتووە. کەچی لە ڕووی سەرچاوەکانی مێژوویی ئێرانەوە کە لە ڕۆژگاری میرانی گوورەکانی و پادشاکانی سەفەوی‌دا نووسراون و تۆمار کراون و بە دەستەوەن، قەڵا کۆنەکانی ورمێ واتە «دمدم»[2] و «گەوەرچینقەڵا»ی ئێستا و «بانیەی سۆما»[3] و چەند قەڵاتێکی تێکڕووخاوی دیکەی ناوچەکە هەر هەبوون. لەم شوێنانە تیرە و تۆرەمەی کوردان و ڕەگەزی تریش خەریکی حوکمڕانی و سەرقاڵی کەوشەنداری بوون، هەتا وا هات کە شاعەبباسی خوابەخشیو لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خۆی‌دا کۆمەڵێکی

---

1 - بە گوتەی تاقمێک لە ڕەگەزنامەنووسان، یەکێک لە فرزندانی یافسی کوڕی نووحە و باپیرەگەورەی نەتەوەکانی توورانییە و وادیارە دوو پیاو بە ناوی مەغوول و تاتار کە هەرکام هۆزێکیان بەم ناوەی خۆیانەوە لێکەوتۆتەوە، تۆرەمەی ئەون، بەڵام ئەم گوتەیە جێی ڕامانە و بەکورتی بێ‌بنەمایە. (وشەدانی دێهخودا، چاپی دوودەمی خولی نوێ، ب ٥ ، لاپەڕە ٦٦٥٠، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی/١٩٩٨ی زایینی، تاران)

2 - نووسەر نووسیویەتی دۆمدۆم.

3 - بە «صومای» نووسراوە. بێگومان دەبێ هەر «بانی» بێ کە گوندێکە لە ناوچەی سۆما.

زۆر و زەوەندی ڕاسپاردوون بۆ حکوومەت و پاراستنی ئەم شار و ناوچەیە و ئەوانیش داوەریون و هاتوون.

خودا یار بێ لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ کە هەر لە سەرەتاوە تاقمێک لە کوردانی سەرسنوور کۆمەڵەیان بەست و بە مەبەستی گێڕانەوە و بەرەگە لێگرتن سەرەڕێیان بەم خێڵە دەوڵەتخوازە گرت، بەڵام لە دەوروبەری گوندی «خانتەختی» وەها بەزین و شپرزە کران کە هەمیشە لە بیری تۆڵە و تێهەڵێنانەوەدا بوون... .

کەلبالیخانی[1] ئەفشاری ئیمانلوو ناسراو بە شێرشکار کە ئەو چاخی سەرزنجیرەی ئەفشار و لە لایەن شاعەبباسەوە کرابوویە حوکمڕانی ئەم مەڵبەندە، لە پێشدا «تۆپراق‌قەڵا»ی باڵی باکووری ورمێی بۆ ناوەندی دەسەڵات هەڵبژارد و دیوارێکی قایمی بە دەورەیدا کێشا کە هەمووی ۱۵۰۰ هەنگاوێک لە شارەوە دوور بوو. پاش ماوەیەک چەند وەستاکار و ئەندازیاری شارەزای کۆکردنەوە و شوورەیەکی پتەویان لە دەورەی ئەم بازێڕە هالاند. ئەگەرچی لەو دەمیڕا هەتا ئێستا چەند جارێک خرمەی کردووە و داتەپیوە و سەرلەنوێ چاکیان کردۆتە، دیسانیش هەر ناگاتەوە سەر دۆخی جارانی و شکۆمەندیی شوێنەواری جێجێ بەجێماوی پێشووی ناگرێتەوە.

هەرچی بێ و هەر چۆنێک بێ شاری شادیهێنی ورمێ[2] کەوتۆتە هەرێمی چوارمم[3] و مەڵبەندی ئازەربایجان و پاڵی ومپاڵی کەژ و چیاکانی شانبەشانی خاکی ڕۆم داوە. لە سێ فرسەخ ئەولاتری قۆڵی ڕۆژهەڵاتی شارەوە زرێبارێک خۆی دەنوێنێ کە بە بەحری خوێیە و شاهی ناسراوە.

---

1 - کەلبعەلیخان

2 ورمێ بە «دارالنشاط» ناسراوە.

3 - وڵات و نیشتمان و مەڵبەند... بەشێک لە گۆی زەوی. خاکی ئێران. (وشەدانی دێهخواد، ب ۲، ل ۳۱۲۷-۳۱۲۸)

بەڕاستی دەر و دەشتی ئەم مەڵبەندە هەستبزوێنە و خاکی گوڵاوپژێنە و کەش و هەوای ڕوحلاوێنە و بۆن و بەرامەی هەناسە و پشووی دەڵێی لە بەهەشتەوە دێ و ئاوەکەی سارد و سووک و بە گیانخۆشە و چەشنی کانیاوی سەلسەبیلە و شنەی فێنکی کوێستانەکانی، ئانە داوێنە داوێنی چیای ئەلوەند و باخ و بێستانی گەشی بۆتە جێی ئێردیی بەهارخانەی سەمەرقەند. خەڵکەکەی مەشرەفخۆش و غەریبکر و گەرموگوڕن.

ئەم مەڵبەندە بە باری پانایی‌دا لە لێواری بەحرۆکەی شاهی ئۆلی ورمێ‌ڕا هەتا جێرمی و بیدکار[1] و شەهیدان حەوت فرسەخێک دەبێ و بە باری درێژایی‌دا بە ڕووباری قەرەسووی سەلماسەوە هەتا خانتاوسی سندووس[2] نۆزدە یان بیست فرسەخە. تاکوو سەردەمی حکوومەتی قاجاران سندووس و سابلاغی[3] موکری و مەرحەمەتئابادی مەراغە هەتا سەفاخانەی ساینقەڵا بەشێکی دانەبڕاوی ژێر دەسەڵاتی ورمێ بوون، بەڵام دوای نەمانی خودالێخۆشبوو عەلیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری قاسملوو لە ورمێ دابڕاون.

---

1 - دوو دێی کوردانن کە یەکەمیان قەڵایەکی سەختی لێبووە و هێشتاش هەرەس و کاولەکانی هەر دیارن. م. پ

2 - بەپێی دەقەکە سۆلدووز.

3 - بەگوێرەی دەقەکە «ساوجبلاغ»ە. وشەیەکی تورکییە و لە ڕاستی‌دا «ساوخبلاغ»ە و یانی «ساردەکانی». بە «ساوجبلاق» و «سابلاخ»یش هاتووە کە دەبێتە «مەهاباد»ی ئێستا.

# بنەچەکەی خێڵی ئەفشار

هەروەک دیارە بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی نووسراون، توخم و تۆرەمـەی خێڵی ئەفشار پشتاوپشت دەگەنەوە سەر ئەوشاری کوڕی یۆڵدووزخان کـوڕی... کوڕی قەرەخان و ئیلخانی خواپەرست... لەویشەوە بە چەند پـشتان دەچنـەوە سەر تورکی کوڕی یافس کوڕی نووح. ئەم عێلـە لـە هەرێمـەکانی خوراسـان، فارس، ئازەربایجان و ئاران بنەگر بوون... .

بەگشتی میرانی ئەفشار... وێرای خێڵ و جەماوەری تۆرەمەی خۆیان بـە دەروەستی جووڵاونەوە و گەلێک خزمەتی بەرچاویان خستۆتەڕوو. وەختایـەک سەرەی فەرمانڕەوایەتی پاشایانی سەفەوی هات و ناوبانگیان لە ئێرانا دەنگی دایەوە، لە سایەسەری مبارەکی ئەو خانەدانە عەلەوی‌نەژادەوە[1] - کـە پـارەبی خودا بەڵگەی پاکانەیان بخاتە سەر زمانی - باخچۆڵەی حکوومەت و مێرگۆڵەی دین خونـــاوەی گـــەشە و نەشـەیان بـە ڕووی‌دا بـاری و کەوتنـە ئەوپـەڕی درەوشانەوە. گەورەپیاوانی دەوروبەران و سەربزێوانی ئەوبەرەوبەران ئۆباڵیان بۆ کێشان و سەریان وەبەرهێنان. لە خێڵی ئەفشاریش کۆمەڵێکی زۆر چووبوونە ڕیزی غولامانی بارگای ئەو سوڵتانە مەزنانە و لەبەر نۆکـەرچاکی و نیازپـاکی گەیبوونە پلەی بەرز و دەوڵەمەندی. بۆوێنە ئەمیرئەسـلانسوڵـتانی سـەرۆکی تیرەی ئەرەشلوو[2] کە دەهەزار ماڵێک لە ژێر دەسەڵاتی‌دا دەژیان و لە سـەردەمی شانەهماسبی یەکەم‌دا ببوو بە ئەتابەکی[3] سوڵتان ئەحمەدمیرزای ئۆهەم کـوڕی

---

1- ئەوانەی بە ڕەسەن دەچنەوە سەر ئیمامی عەلی کوڕی ئەبووتالب. مەبەستی بنەڕەتی لێرەدا «شیعە» بوونە.

2 - تیرەیەکی خێڵی ئەفشار. م . پ

3 - دەمڕاست و نیگادێری شازادە.

ئەو پاشا پایە بلیندە. هەروەها ئەللاقولیخانی قاسملوو[1] ببوو بە قوّرچیباشی[2] دەربار و حوکمڕانی کرمان و یۆسفخانی کوڕی لە وێندەریّ وەک بریکار کاروباری حکوومەتی ڕادەپەڕاند. مەحموودسولتانی قاسملووش لە هەرەتی فەرمانڕەوایەتی شاسمایلی دووەمدا جڵەوی دەسەڵاتی کرمانی درایە دەستی. خەلیلخانی گۆندوزلوو لە کۆهگیلۆیەی فارس ئاڵای حوکمەتی دەشەکایەوە. هەروابێتەوە تۆماسبسولتانی[3] ئیمانلوو و قاسمسولتانی کوڕی کە لە ڕۆژگاری شاهەباسی[4] یەکەمدا نازناوی خانی باربوو کرا و پاراستن و حکوومەتی مووسڵ و قەڵەمڕەوی «عەلیشکور»ی بە دەستەوە بوو. هەڵبەت بە ئومێدی خودای گەورە لە جێی خۆیدا باسی ئەوانی دیکەش دەخرێتەڕوو.

ئێستا بەر لە بزووتن بەرەو ئامانج، سەرەتای هاتن و داوەرینی جەماوەرێکی زۆر و زەوەندی خێڵی ئەفشار بۆ ئەم ناوچەیە دەکەمە قەڵەمندارە کە دەبێتە ساڵی ١٠٣٦ی کۆچی/١٦٢٦ی زایینی. پاشان لێرەوە سەری ئەسپی خۆشاژۆی قەڵەم بۆ نووسینەوەی ڕووداوەکان و گێڕانەوەی بەسەرهاتی هێندێک لە خێڵاتی سەردەسەڵاتی ئەم هەرێمە، وەردەسووڕێنم و ئاوی دەدەم.

---

1 - تیرەیەکی خێڵی ئەفشار. م پ

2 - قوڵچی. فەرماندە هێز. سەرهێز.

3 - لە زمانی کوردیدا تەهماسب بۆتە تۆماسب و سواوە.

4 - کورد «عەبباس»یان کردۆتە هەباس و ساکاریان کردۆتەوە و لەسەر زمان سوکتر و خۆشترە و بە هەردک شێوەکە دروستە.

## کورتەباسێک سەبارەت بە چۆنیەتی حکوومەت و ناوی حاکمانی ورمێ بەر لە چوونی ئەفشاران

**میر تەیمووری گوورەکان (کوورەگان) بەر لە هێرشی حەوت ساڵەی بۆ سەر ئێران، وەختایەک بە مەبەستی گرتنی وڵاتی ڕۆم لەشکری دەنگ دا، شەڕێکی سەخت و خوێناوی لەگەڵ ئیلدروم بایەزیدخانی سوڵتانی عوسمانی هەڵگیرساند و لەم هەرا و هەڵلایەدا... سوڵتان ئیلدروم بایەزید گیرا و بەرەو جەهەندەم ڕادرا.[1] هەروەک بە دوور و درێژی لە زەفەرنامەی شەرەفەددین عەلی یەزدی و بەرگی شەشەمی ڕەوزەتوسسەفای خاوەندی‌دا هاتووە، کاتێک میری پایەبەرز گەڕایەوە و ئاپۆرای شکۆمەندی قۆشەنی گەیشتە ناوچەی ئەردەوێل بیستی کە تاقمێک لە کوردان و عێلانی گێچەڵبازی دەورانپشتی ورمێ شوویان لێهەڵکێشاوە و دانامەزرێن و کەوتوونە تاڵانوبڕۆی ماڵ و سامانی جەماوەری مسکێن و بێ‌دەرەتان... بۆیە میر بەپێی پێشنیاری پیاوانی باوەڕپێکراوی حکوومەت، گورگینبەگی عێلی ئوسالوو[2] کە ئەو کاتە لە ڕکێفی‌دا دەبزووت و شوێنەواری لێوەشاوەیی بە نێوچاوانییەوە دیار بوو، کردی بە حوکمداری ورمێ و ئەرکی سەرکوتی ئاژاوەگێرانی پێ‌ئەسپارد. ئەویش بەگوێرەی فەرمانی میر ساڵی ۸۰۲ی کۆچی/۱۳۹۹ی زایینی ڕووی کردە ورمێ و لە تۆپراققەڵا بنەی داکوتا کە شوێنێکی یەکجار قایم و پتەو و حاکمنشین بوو. ئەم گوندە ئێستا**

---

1 - ئیلدروم بایەزید (۱۳٤۷ـــ۱٤۰۳ی زایینی)، ساڵی ۱٤۰۲ بە دەستی تەیمووری گوورەکانی (۷۳٦ـ۸۰۷ی کۆچی) بە دیل دەگیرێ و لە ڕکەی ئاسنی دەپەستێوێ و ساڵی ۱٤۰۳ی زایینی دوای هەشت مانگ گیران دەمرێ. ئیلدروم یانی هەورەبرووسکە. بریسکە. (دیهخودا. ب۳، ل ٤۳۳۳)

2 - دەبێ مەبەستی خێلی ئوسانلوو (أصانلو) بێ کە لە دەوروبەری تاران، زەرەند، ساوە و قەزوێن دەژیان و دەورانشین بوون. (دیهخودا، ب۲، ل ۲٦۹۲)

کەوتۆتە باڵی باکووری قەڵای ورمـێ و ١٥٠٠ هـەنگاوێکیان مەودایـە. هێنـدەی پێنەچوو کە حاکم بە هێزی دەست و مەچەکی قۆشەنی ورمـێ، لـە [کـوردان] و گەڕبازانی ناوچەکە وەخۆکەوت و وای تەزاندن کـە هـەتا ئـەو ڕۆژەی جـڵەوی حوکمانی بە چنگەوە بوو، مەڵـبەندەکە وا هێـور بـۆوە کـە خەڵـک ماوەیـەک حەسانەوە و بە ئاسوودەیی پاڵیان داوە. بەڵام دوو ساڵ و هێندێکی پتر پێنەچوو کە مەرگ گرنەی پێگرت و بارگە و بنەی ژیانی پـێ کـۆکردەوە و بـەرەو دنیـای پاشینی برد.

پاش کۆچی‌دوایی گورگین‌بـەگ، ئۆلامەسو لـتانی کـوڕە گـەورەی جێـی گرتەوە. بەپێی حوکمی کاربەدەستانی حکوومەتی تـەیمووری بـۆ مـاوەی سـێ ساڵان باج و بیتاکی لەسەر خەڵکی ناوچەی ورمێ هەڵگرت و ئەوەنـدەی تـوانی دڵی جەماوەری وەدەس هێنا و مەودای ژیانێکی لەباری بۆ ڕەخساندن. ڕاست لەو ڕوژگارەدا فەرمانڕەوای خاوەن‌شکۆ تـەیمووری گوورەکـان لـە شـاری ئـەنزار (ئۆترار)ی سەمەرقەند کە زێـد و پایتـەختی بـوو، بـەرەو بانگـاوازی یـەزدان هەنگاوی نـا و دنیا و تاج و تەختی بەجێهێـشت. دەم‌پـاراوانی ئـەو سـەردەمە ئاوایان ساڵی لەدایک‌بوون و نەمانی هۆنیوەتەوە.

تەیموور شایەک بـوو نەیـدیوە دەوران
حەوسەد و سی و شەش پێی نایـە ژیـان
حەوسەد و حەفتا و یەک بوو بـە پاشـا
هەشسەد و حـەوت ڕۆی بـەرەو نـەمان

کاتێک هەواڵی سامناکی نەمانی ئەو میرە جیهانگیرە بیروبـەوێ‌دا بـڵاو بۆوە، بۆشایی دەسەڵات و ئـاژاوە و شـێواوی تـەواوی هەرێمـەکانی ئێرانـــی

گرتەوە و هێمنایەتی نەما و بوو بە پاشاگەردانی و زوڵم و زۆرەملی باڵی ئەنگاوت... .

بە ناچار ئۆلامەسوڵتان کەوتە داکووژاندنەوەی ئاگری شەڕ و گەڕی شەڕفرۆشانی کێوی و دەستەیەکی ڕێکخست و چالاکانە لێیان وەدەس هات. دوای تێکهەڵچوونی هێزەکان شەڕێکی قورس قەوما و لە گەرمەی بگرە و بەردەدا بە فیشەکێک لاقی ئەم پیاوە ئازایە ئەنگوا و برینێکی قووڵی هێنا. بەڵام دیسانیش کۆڵی نەدا و بۆ بەرەنگاری پێی چەقاند و بە پشتیوانی خودا شەڕەفرۆشانی بەزاند و دەسکەوتێکی زۆری وەچنگ هێنا و بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە ناوەندی دەسەڵاتی و پاش چەند ساڵان ئەویش کەوتە شوێن کاروانی ڕابردووان.

## باسی حکوومەتی یادگارسولتانی ئوسالوو

بەپێی بەرژەوەندی و ڕاوێژی کەیخوداکانی عێل و ئامادەی کاربەدەستانی ئازەربایجان، دوای ئۆلامەسولتان، یادگارسولتانی برا چووکەی جێی گرتەوە و بوو بە حوکمداری ورمێ. یادگارسولتان لەسەر پێوشوێنی باوک و برای کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵک و هەژار و دەوڵەمەندی وەدوا نەدەدا و دووچاوەکی نەدەکرد و قەت لانی دادپەروەری و پارسەنگی کارانی بەرنەدەدا و تێکڕای جەماوەر شوکرانەیان دەبژارد و لەم بار و بوارەدا دڵنیا بوون. دوای چەند ساڵان یادگارسولتانیش دەستی لە داوێنی ژیانی ئامانەتی بەردا و ناوچاکی بە یادگار لە پاش بەجێما. ماوەی حکوومەت و ڕێکەوتی مردنی وەبەرچاو نایا و نەنووسراوە. بەکورتی دوای ئەو حکوومەتی ورمێ دراوەتە دەس ئاغزیو ئۆرخانی بێگدلی و چراغسولتانی شاملوو و چەند کەسێکی تر کە بە ڕیز باسی هەموویان دەکرێ.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شاسمایلی[1] سەفەویدا ئەم سەرکردانە حوکمداری ورمێ بوون: عەلیسولتانی زولقەدر، کۆکجەسولتانی قاجار، بوداقسولتانی مافی، وەلیسولتانی مافی و بەکربەگی موکری. پاشان لە جەنگەی پادشایەتی شاتۆماسبی خوابەخشیودا حاکمەکانی بریتی بوون لە: بوداقسولتانی مافی، حوسێنخانی مافی، شابازسولتانی زەنگەنە، جانیخانی شاملوو، محەممەدعیساخانی شاملوو، محەممەدخانی نەسەقچیباشی، فەرەجوڵلاخانی شاملوو، مەردعەلیخانی ئەفشار و سوبحانوێردیخان.

❖❖❖❖

---

[1] - شاهـ ئیسماعیل سواوە و بۆتە شاسمایل.

## خێڵی ئەفشار لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شاعەبباسی گەورەدا

شاعەبباس لە سەردەمی ژیانی شاسولتانمحەممەدی باوکیدا، لە هیراتەوە ڕووی کردە قەزوین و تاجی پادشایەتی کردە سەری. پاش سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی دەستی کرد بە دابەشینی پلە و پایەی حکوومەتی. بۆوێنە عێلی ئەفشاری خوێندەوە کە هەمیشە لە ڕکێفی باب و باپیرانیدا سەرەڕای ئازایەتی گەلێکیان خزمەتی شیاو ئەنجام دابوو. شاعەباس بە سیلەچاوی میرانە بەسەری کردنەوە و بەم چەشنە بەشێک لە ئەرک و پلەکانی حکوومەتی بە سەر سەرۆکانی ئەفشارا دابەشی:

ئەسکەندەرخانی ئیمانلوو دەسەڵاتی قەزوینی پایتەختی خەڵات کرا. مەحموودسولتانی گۆندوزلوو بوو بە دەسەڵاتداری «قوم»ی خانەی ئیمانداران[1] و ساوە. کۆهگیلۆیە کە جاران لە بەردەستی خەلیلخاندا بوو، بەخشرا بە حەسەنخانی ئەفشار. یۆسفخانی قاسملووی کوڕی ئەڵلاقولیخانی قۆرچیباشی کە باوکی لە بارگای میریدا گەلێک خزمەتی بەرچاوی ڕاپەڕاندبوو و ئەو سەردەمە وەک بالوێز لە خاکی ڕۆم دەژیا، دەسەڵاتی ئەبەرقوو و ئەو مەڵبەندەی درایە. قاسمسولتانی ئیمانلووی کوڕی تەهماسبسولتان کە بۆ چاونەترسی و وریایی و کارزانی بەناوبانگ بوو، کرایە سەرۆکی پاراستنی قەڵەمڕەوی عەلیشکوری نێوان مووسڵ و دیاربەکر. هەشتسەد سوارەی ئەفشار و شەڕکەرانی ناوداری خرایە ژێرڕکێفی هەتا ئەگەر هاتوو

---

1 - قوم بە «دارالمؤمنین» داندراوە.

حکوومەتی ڕۆم و هێزەکانی ناوچەکە پێیان بە خواری دانا، وێڕای حەسەنخانی حاکمی لوڕستان بکەوێتە بەرەنگاری و بەرخۆدان.

ئەبیوەرد و نێسای سەر بە خوراسان کە هەوارگە و جێ‌خێڵی لەمێژینی ئەفشارەکانی قۆرقلوویە ئەسپاردەی مەحموودخانی قۆرقلوو کرا. ئەمیرخانی قۆرقلوو کرایە سپاسالاری هێزەکانی عێراق و سەری پێی‌بەرز کرایەوە. عەلیمەردانخانی قاسملوو نێردرایە ورمێ و کرایە حوکمدار. بەکتاشخانی کوڕی وەلی‌خانی ئەرەشلوو کە هەتا ئەو دەم حوکمڕانی یەزد بوو، لەبری باوکی چووە کرمان و جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت. نەدرخانی ئەفشار کە لە جێی ئەڵلاقولی‌خانی قۆرچی‌باشی، ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ بوو کرایە حاکمی ئەستەراباد و پلەی بەرزی قۆرچی‌باشێتی درایە وەلی‌خانی حاکمی کرمان کە پیاوێکی لێوەشاوە بوو. پاشان وەختایەک میر بە مەبەستی سەرکوتی ئۆزبەکان کە لە خوراسان دەسەڵاتیان تەنیبوویەوە هەنگاوی نا، دەستووری فەرموو کە کۆمەڵەچەکدارێکی خێڵی ئەفشاریش لە ڕکێفی‌دا بزوون و مەهدی‌قولی‌خانبەگی ئەفشار کرایە سەرهێزی سوارانی عێل.

## باسی شەڕی قاسمسولتانی ئەفشار
## لەگەڵ ئەحمەدپاشای حوکمڕانی بەغدا

هەروەک پێشتر باسی کرا قاسمسولتانی ئەفشاری ئیمانلوو کوڕی ئەهماسبسولتان بە خۆی و هەشتسەد سواری ئەفشار و چەکداری دیکەوە بە فەرمانی شاهەباسی یەکەم کرابوویە سەرکردە و پارێزەری مەڵبەندی عەلیشکوری هەمەدان[1]. لەم چاخەدا کە لوونیئیل (ساڵی نەهەنگی تورکان) ڕێک بوو لەگەڵ ١٠١٢ی کۆچی/١٦٠٣ی زایینی، هەژدە ساڵ بە سەر هاتنە سەردەسەڵاتی شاهەباسی یەکەمدا تێدەپەڕی و کاروانی کەژاوەی ئەم فەرمانڕەوایە ئەو کاتی لە قۆرغبلاغ لەنگەری خستبوو. ئەحمەدپاشای حوکمڕانی بەغدا کە پارەکە هەڵیکوتابوویە سەر ئێران و زەبری توندی لێوەشابوو، کاتێک بیستی حەسەنخانی حوکمڕانی هەرێمەکە بانگهێشتنی هۆزدووی پیرۆزی میر کراوە و ئەو سەرهەدە چۆڵە، هەلەکەی بە لەبار زانی و ویستی هێزەکانی بەغدا بەرەو هەمەدان باژوێ و ئەوەندەی بۆی دەکرێ دەستی لە کوشت و کوشتار و تاڵان نەپارێزێ، هەتا بەم شێوەیە هەم تۆڵەی لە قزڵباشان کردبێتەوە و هەم دەنگ و ئاوازەی قۆشەنی عێراقی عەرەب بتوانێ ..رسووران لە گرتنی قەڵاکانی ئازەربایجان کە ئەو کاتی پێیەوە سەرقاڵ بوون، پەشیمان بکاتەوە و ڕوویان پێ بەرەو عێراقی عەرەب وەرسووڕێنێ و ئەم کارەی وەکوو خزمەتێکی گەورە بخاتە بەرچاوی دەسەڵاتدارانی عوسمانی. هەربۆیە محەممەدپاشای کوڕی لە جێی خۆی دانا و وێڕای دەهەزار کەسێک لە

---

[1] - پێشتر عەلیشکوری خستوتە نێوان مووسڵ و دیاربەکر و دەبێ مەبەستی هەرێمەکان بێ نەک شارەکان

هێزەکانی بەغدا و سوارە و پیادەی لوڕان و کوردان کە بە تەمای هێنانی تالآن ڕەگەڵی کەوتبوون، بەرەو هەمەدان بزووت.

قاسمسولتانی ئەفشاری ئیمانلوو و شاقولیسولتانی خودابەندەلوو لەسەر سنووران بە هاتنی ئەحمەدپاشا و قۆشەنیان زانی. قاسمسولتان پیاوی ناردە لای حوسێنخانی حاکمی لوڕستان و تێیگەیاند و ئەویش بە هەزار سواری لوڕەوە تیژ بەرەو ئەو بالە فڕی. لە ماوەیەکی کورتا سێهەزار چەکداری لوڕ و ئەفشار و هێزە نەبەزەکان خێرا یەکتریان گرتەوە و بەرەو ماهیدەشت کە ڕەوگەی لەشکری ڕۆمییەکان بوو، بزووتن. لە شەڕگەی زەهاوی سەر سنوور هێزەکانی دوو حکوومەتی گەورەی ئێران و عوسمانی تێکهەڵەنگووتن. وەختایەک قاسمسولتانی ئەفشار و حوسێنخان بە سێڵاوی لەشکری دوژمنیان زانی، لێبڕان بەرلەوەی قۆشەنی ڕۆم بە کەمبوونی هێزی سەرسووران بزانێ، لەڕێوە هەڵکەنە سەریان و بەلکوو هاتوو گرتی و شکستیان بە ملیدا هات و بە حوکمی چارەنووس گۆی مرادیان فڕاند. بۆ ئەم مەبەستە هێزەکانی خۆیان کردە دووبەش و قزلباش و ئەفشار بە سەرکردایەتی قاسمسولتان کەوتنە لایەک و شاقولیسولتان وەک سەرپێشەنگ لەگەڵیان دامەزرا و کۆمەڵی لوڕان بە سەرۆکایەتی حوسێنخان وەلا کەوتن و وا داندرا لەناکاو پەلاماری خەنیمان بدەن. لەو لاشەوە ئەحمەدپاشای بەغدا بە خۆی و تفەنگچی و کەوانداران لە هۆردووبەز هاتبووەدەر و لەشکرچی ڕیز کردبوون و تەیار بوو بۆ شەڕ و لێکدان.

کاتێک چەکدارانی قزلباش و لوڕ و ئەفشار وێکرا ئەسپیان تاو دا و هەڵیانکردە سەر سپای دوژمن... لە یەکەم پەلاماردا هێزەکانی عوسمانی تۆقین و لەرزەیان کەوتە ئەندامی و ڕەوین. ئەحمەدپاشا ماوەیەک خۆی ڕاگرت و نەیهێشت هێزەکانی هەڵێن، بەلام هیچی بۆ نەکرا و لەبەروەی خۆی پیاوێکی کەڵەگەت و کەتە و قەڵەو بوو، نەیتوانی ببزوێ و بەناچار گیرا و کەوتە چنگ سپای سەرکەوتە. لەم گرمە و هەرایەدا نیزیکەی دووهەزار پیاوی لەشکری

عوسمانی یان گیران یان کەوتنە بەر مەودای لەپەشیران. لە کاتی ڕاکردنا ڕۆمی بە سەر لوڕاندا کەوتن و ئەوانیش ئەوەندەی بۆیان کرا دەستیان لێنەپاراستن و ڕووتیان کردن و هێزی ئەفشاریش زۆر ئازایانە دەستیان وەشاند.

پاش ئەم سەرکەوتنە دیار و بەرچاوە قاسمسولتان و حوسێنخان، ئەحمەدپاشایان بە زیندوویی وێڕای کەللەسەری سەرکردە کوژراوەکانی عوسمانی و دیلان و دەسکەوتێکی زۆر بەڕێکردە ژێرپێچکەی تەختی بەرزی پاتشایەتی و لە قۆرخبلاغ میری بەرزەشان چاوی پێیان کەوت. پاشا بە تووڕەیی لە ئەحمەدپاشای ڕاخوڕی و بە سەری ڕۆیی، بەڵام لەبەرەوەی ئەحمەدپاشا پێی لە تاوانەکانی نا و بە ڕووڕاستی پەشیمان بۆوە و بەڵێنی خزمەت و کاری چاکی دا، کەوتە بەر بەزەیی میرانە و بەخشرا و خەڵاتی زۆر باشی درایە و پاشان فەرمان درا کە پیاوەکانی حاکمی عەلیشکور بەڕێی بکەونەوە و بیپارێزن. قاسمسولتان و حوسێنخانیش چۆن چاکە ئاوا خەڵات کران و حوکمیان بۆ نووسرا و لاوێندرانەوە. قاسمسولتان پاشناوی خانی باربوو کرا و کەلبالیبەگی کوڕە گەورەی گەیشتە پلەی سولتانی. دیسانیش فەرمان درا کە قاسمخان بە خۆی و هێزی ئەفشار و چەکدارانییەوە ئەو سنوورە بپارێزێ.

لە هێندێک سەرچاوەی مێژوویی‌دا ئەحمەدپاشایان بە نووزوونحەسەنپاشا نووسیوە و ئەم سەرکەوتنە بەرچاوەیان داوەتە پاڵ سەرکردایەتی ئەڵلاوێردیخان.

## حکوومەتی ئەمیربەگ لە ورمێ و دانانی
## قەڵای ناوبەدەرەوەی دمدم

پوختەی بەسەرهات و ڕووداوەکان بەپێی کتێبی عالەمئارای عەبباسی ئاوا دەخرێتە بەرچاوان:

ئەمیربەگی کورد لە عەشیرەتی سۆمای برادۆستی[1] کورد لە پێشدا بۆرەپیاوێکی کەسنەناس بوو. لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شاسوڵتانمحەممەدی کوڕی شاتۆماسبی یەکەمدا کە ڕۆمی مرخیان لە ئازەربایجان خۆش کرد، لەشکریان دەنگ دا و توانیان خۆی و سەڵماس و ورمێ لە چنگ کاربەدەستانی حکوومەتی ئێران دەرکێشن. «شامحەممەدبەگ»ناوێک لە میرزادەکانی سۆما و برادۆست[2] بە فەرمانی خوندکاری ڕۆم کرا بە مەزن و خاوەن دەسەڵاتی ناوچەی بەرباس.

ئەمیربەگ سەری بۆ شامحەممەدبەگ دانەنواند و ملی بۆ ڕانەکێشا. ماوەیەک لە لای «عومەربەگ»ناوێکی مێهرانی (سۆرانی) کە حوکمڕانی دەشت و تەرگەوەڕ بوو گیرسایەوە. لە شەڕێکی کە عومەربەگ ئەو دەمی لەگەڵ ڕۆمییەکان کردی، ئەمیربەگ گەلێکی ئازایەتی نواند و چاوی لە کەس نەدەترسا. بەڵام لە جەنگەی هەراکەدا دەستێکی لە ئانیشکەوە بە زەبری شیری شەرکەرێکی عوسمانی پەڕی و ناوبانگی بە ئەمیربەگی چۆلاق[3] ڕۆیشت.

لەو ساڵەدا کە ئاڵای بەرزی شاهەباسی یەکەم دەشەکایەوە و بۆ داگیرکردنی ئێرەوان و نەخجەوان دەیئاژوا، ناوبراو هاتە نێو هۆردووی میری و

---

1 - نووسەر نووسیویەتی عەشیرەتی سۆمای برادۆست. بەڵام دروستەکەی عەشیرەتی برادۆستە.

2 - بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١.

3 - وشەیەکی تورکییە. ئەو کەسەی دەست یان پای نەقوستان بێ. هەر کەس دەست و لاقێکی لە کاردا نەبێ یان کوڵ و گێڕ و گەواڵ بووبێ.

خۆی بە شاپەرست نیشان دا. لەبەر بوێری و مێرخاسی و مەردازایی لە شەڕی بەرەنگاربوونەوەی ڕۆمییەکاندا و پەرینی دەستێکی، خاوەنشکۆ شاوڕی ڕەحمەتی لێداوە و کردی بە میر و مەزنی عێل و عاشیرەتەکانی دەشتی ئەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و نازناوی خانی پێبەخشی. لە ڕاستیدا دەسەلاتی ورمێ و شنۆشی باربوو کرا. لەسەر فەرمانی شا، وەستا زێرینگەرەکان دەستێکیان لە زێڕی سوور بۆ دروست کرد و بە گەوهەر و مرواری گرانبایی ڕازاندیانەوە و لە باسکیان بەست. پاشا ئەوەندەی چاکە لەگەڵ کرد و خوێندییەوە کە ئەمیرخان بۆپەی شانازی گەیشتە ئەستێران. بۆیە ماوەیەک دەستی خزمەتکاریی لەسەر سینەی پڕکینەی دانا و بە لاشیپانەی بەرزی بارگایەوە ڕاوەستا. پاش مەرەخەست کرانی لە دەربار پێینایە شاری ورمێ. لەبەر تیشکە و ترووسکەی میری سێبەری خودا کە ئەو کابرا پووچەکەی گرتبۆوە، ڕۆژ بە ڕۆژ بە پەیژەی مەزنایەتیدا سەرکەوت و لە هەموو هاوشانەکانی خۆی تێپەڕاند. چەند ناوچە و مەڵبەندی لە ئەمیرەکانی کوردی سەر بە ڕۆم ئەستاندەوە و وەسەر دەسەلاتی خۆی گێڕان و بەمجۆرە لە نێو ئەمیرانی کوردا بە پایەبەرزی و لەشکرزۆری ناوبانگی دەرکرد.

هێندەی پێنەچوو فیز و هەوا لە سەری دا و کەڵکەڵەی سەربادان و دژایەتی لە کاژەلاکی مێشکیدا گەرای دانا. ساڵی ١٠١٣ی کۆچی/١٦٠٤ی زایینی، وەختایەک جوغاڵ ئۆغلی کە یەکێک بوو لە گەورە سەرکردەکانی عوسمانی بە مەبەستی گرتنی ئازەربایجان لەشکری کێشا و لە دەوروبەری تەورێز هێزەکانی ئێران بە سەرکردایەتی ئەللاوێردیخان بەرەوڕووی بوونەوە، ئەمیرخان ئەگەرچی کاخەزی لێنووسرا بچێ و زۆریش لە شەرگە نیزیک بوو، گوێی نەدایە و خۆی بوارد. پاش شکاندن و تاراندنی جوغاڵ ئۆغلی، لەشکری سەرکەوتە لە چیمەنی دۆرشەکی سەڵماس خستی. ئەویش بە دیروژانەوە هاتە بارەگا و دەستی کرد بە هێنانەوەی بروبیانووی بێجێ و دیسانیش لاوێندرایەوە و بۆ ئەوەی میرانی

دیکەی کورد دڵیان گەردی لێنەنیشێ بە بیانووی ڕاپەڕاندنی ئەرک و ڕاسپاردەیەک ئیزن درا بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی.

دوای ماوەیەک ورەوورده مەیلی سەربەخۆیی و سەرەڕۆیی ئەمیرخانی دووڕوو خۆی نواند و کەوتە ئاوەدانکردنەوەی قەڵایەکی ڕژد و هەڵەمووت و قایمی سەر دوندی چیایەکی ورمێ. بە فێڵوفرتان بە بارەگای دەوڵەتی ڕاگەیاند کە قەڵای ورمێ بنکۆڵ بووە، هەرەسی هێناوە و خۆڕاناگرێ و بۆ ئەوە نابێ پشتی پێببەسترێ. ئەگەر ئیزن بفەرموون بناخەی چواردیوارێک لە شوێنێکی لەبار دادەڕێژم. لەبەروەی داواکەی بەڕواڵەت خێری پێوە بوو، میری مەزن ئیزنی دا. بەڵام ئەمیرخان بەر لە گەڕانەوەی ئەو کەیخودایەی ناردبوویە بارەگای میری، لە سێ فرسەخی شاری ورمێ بە باڵی باشووری دەرەی قاسملوودا، لەسەر کێوێکی هەرەبەرزی سەر بە ناوچەی مەرگەوەڕ گەڵاڵەی قەڵاتێکی سەخت و بەرزی داڕشت و لێی وەکار کەوت.

لە نێو خەڵکدا وا باوە و دەڵێن بەر لە ئیسلام هەر لەو شوێنە دوو قەڵا هەبوون کە کورد پێیان گوتوون «دمدم» و «جمجم»[1] و دەستدرێژی ڕۆژگار خاپوور و وێرانی کردوون. کاتێک هەواڵی سازکرانەوەی قەڵای دمدم کەوتە سەر زار و زمانان، پیربوداقخانی ئەمیریئەمیرانی ئازەربایجان کە پیاوێکی بەئەزموون و وشیار و کارامە بوو، لە جووڵانەوەی دوژمنانەی ئەمیرخاندا نیشانەی کەڵەوەکێشی و ملهوڕی بەدی کرد. بۆیە بە بارەگای پیرۆزی ڕاگەیاند کە ئەمیرخان لە ڕێگای ڕاستی لاداوە و هەوای سەرپێچی و لاساری کەوتۆتە سەر و بناخەی ئەو قەڵا بەرز و قایمەی بۆیە داڕشتووە کە لە ڕۆژی پێویستا بە کاری بێ. ئەم غولامە دروست کردنی قەڵایەکی ئاوا هیچ بە قازانجی دەوڵەت نازانم.

گەورەپیاوانی دەوڵەت لێیان ڕاسپاردەوە و گوتیان کەیفی خۆتە و چما بە قازانجی دەوڵەتی نازانی پێشی پێبگرە. پیربوداقخان بەپێی فەرمان دوو پیاوی

---

1 - لە دەقە فارسییەکەدا نووسراوە جۆمجۆم.

باوەرپێکراوی زمانلووسی ناردە کن ئەمیرخان و پێیڕاگەیاند ئەو لە ریزی مەزنەمیرانی دەوڵەتخوای ئەم حکوومەتەدا حیساب دەکرێ. بۆیە بە بڕوای من بەم قەڵادانانە لە هەموو لایەکەوە زمانی زمانپیسان لە خۆی دەکاتەوە. خەنیمانی وردبین و کەسانی دووڕاز هەمیشە گوێیان لە کڵاوی دەرپەڕاندووە. ئەگەر ئەو قەڵایەی بە مەبەستی پاراستنی خێڵ و ماڵ و پاراستنی ناو و نامووسە لە چنگ سەرهەڵدانی دوژمنانی یان چما لە ترسی پەلاماری ڕۆمییان سازی دەکا، ئەوان هەتا قەڵای قایم و گەورەی ئێرەوان و تەوریز لە نێودا بێ، ڕوو لە قەڵاتی وا ناکەن. بێتوو هەر شتێک بقەومێ ئێمە کە پاراستنی ئەو هەرێمەمان لە ئەستۆیە، بە هێزی خۆمان ڕۆیدەمرکێنین و نەیاران دەتەزێنین و شوکرانەی خوداش دەبژێرین کە پادشامان بەختی بلێندە.

پیاوەکانی پیربوداقخان ڕاسپاردە و ئامۆژگاری زیرەکانەی سەر شانی خۆیان ڕاگەیاند و هەوڵیان دا ئەو خەیاڵاتە پڕوپووچانە لە مێشکی هەڵفڕێنن، بەڵام نەک هەر گوێی بۆ شل نەکردن، بەڵکوو فەرمانی کوشتنی دان و کوردانی برادۆستی پشوویان لێبڕین، کە دیارە هیچ دینێک ئەوەی ناسەلمێنێ.

ئەمیرخان لە ماوەیەکی کەمدا قەڵایەکی یەکجار پتەوی ساز کرد و بە باڵی ڕۆژهەڵاتا دەروازەیەکی تێکرد و چەند کلاوقوڕچەیەکی لێهەڵخست کە لە جێی خۆیدا گورگەئاورێکیان لێدەدرێتەوە. پاشان ئازووخە و چەکوچۆڵی کێشاوە نێو قەڵاکەوە و لە ورمێڕا ڕایگوێزت بۆ ویندەرێ. لە ڕاستیدا هۆی چارەڕەشی و لێقەومانی خۆی زیاتر پێکدێنا کە بە هیچ بارێک لەگەڵ پاکی و یەکڕەنگی ـەیان نەدەگرتەوە و بە چاکەی سایەچەوری خۆی نەدەزانی و کەوتبووە سەر باری خواری و ملانە.

لەو ڕۆژگارەدا وەختایەک دەنگ و ئاوازەی سەربزێوی ئەمیرخان و پتەوی قەڵای دمدم و خەیاڵی خۆڕاگری دەگەیشتە دوور و نیزیکان. سەربزێوانی ئێران و عوسمانی کە پێمل نەدەبوون و لە گۆشە و کەناران بە شوێن هەلێکدا دەگەڕان تا لەپڕێ ببن بە کوڕێ، بێپسانەوە ڕوویان دەکردە ئەمیرخان و قەڵاکەیان بە

پەنایەکی باش دەزانی. بۆ نموونە خان‌ئەبدالی موکری سابلاغی برای شێخ حەیدەری ناوبەدەرەوەی عێلی موکری کە لە دەوڵەت هەڵگەڕابۆوە و لە ترسی هێزە باڵادەستەکان کۆنەلانی خۆی بە سەر نەدەکردەوە و چەواشە و ڕاکردوو دەخولایەوە. بە خۆی و چەند کەس لە دەست و پێوەندەکانییەوە پەنای بردە قەڵای دمدم و ئەمیرخانیش وەژێر باڵی دا و کردی بە هاودەم و هاونشین و هاوڕازی. بەڵام بە فێڵ و ڕێوی‌بازی پیاوەکانی خۆی دەنارده دەرگای عالەم‌پەنا و خۆی بە فیدایی و یەکڕەنگ نیشان دەدا.

وەک کتێبی «عالەم‌ئارا» باسی دەکا، لەم بەینەدا باس‌وخواسی داوەرینی جەلالییەکانی ژێر فەرمانی حەسەن‌خان و محەممەدپاشا بڵاوبۆوە کە ماوەیەک پێشتر لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵتەزیبوونەوە و پەنایان هێنابوویە بەر دەوڵەتی ئێران. بەپێی هەواڵەکە هێزی جەلالی کە بە سەرکردایەتی پیربوداق‌خان و بۆ مەبەستی گوێ‌بادانی سەربزێوانی کوردستان گاڵ درابوون، ترس و دڵەڕاوکەیەکی وایان لە دەروونی ئەمیرخان‌دا نایەوە کە خێرایەکی کەوتە پاڕانەوە و بە پایەبەرزانی دەسەڵاتی ڕاگەیاند کە نێوانی ئەم غولامە و پیربوداق‌خانی سپاسالاری ئازەربایجان خۆش نیە و لە قسەی دەغەزدارانەی تۆقیوم. حاوانەوەی من لە نێو لەشکرێک‌دا کە ئەو سەرکردەی بێ زۆر گران و ئەستەمە.

لە پایتەختەوە وڵامی درایەوە: ئەوە لەسەر داوا و لەبەر دڵی تۆ پیربوداق‌خان لادرا و حەسەن‌خانی سەرۆک عێلی جەلالی لە جێی داندرا کە پیاوێکی بێ‌گرێ‌وگۆڵ و مەشرەف‌خۆشە. دەبێ وەختایەک هێزە باڵادەستەکان کەیشتنە مەڵبەندی ئێوە بە دەنگیانەوە بچن و ئەگەر بۆخۆشت لەبەر هەر هۆیەک بۆت ناکرێ، بێ‌وەنەبێ دەبێ تەمرخانی[1] کوڕت وێرای چەند ڕدێن‌سپی و پیاوماقووڵ و سێسەد چوارسەد پیاوێکی کارامەی ڕەگەڵ بخەی. با یەکڕەنگی و

---

1 - لە دەقەکە تەمیرخان نووسراوە کە دیارە دەبێ تەمرخان، تەمەرخان یان تەیموورخان بێ

سەرراستی تۆ بو هەموو میران روون بێتەوە و دمی ئەمام و دووزمانان گرێدرێ. ئەمیرخان سەرەڕای ئەو هەمووە نەرمکێشان و لاگیری کردنەی دەولەتی پایەبەرز، دیسانیش هەر لەسەر لاساری و سەربزێوی خۆی رۆیی. بەکورتی کاتێک حەسەنخان و گەورەگەورەکانی حکوومەت لە مەراغە گەیشتنە محەممەدپاشا و جەلالییەکان و بەرەو راپەڕاندنی ئەرکی سەر شانیان کەوتنەرێ، بە ئەمیرخانیان راگەیاند کە بەپێی فەرمانی خاوەنشکۆ پێویستە خۆی ساز بکا و ببێتە پێشەنگی هێزەکان.

ئەمیرخان چەند پەلپ و بیانووی هێنانەوە و گوتی خێلی جەلالی پشتیان پێنابەسترێ و نایەم. گەورەمیرانی دەولەت شێر و رێوی هێنانەوەکانیان بە دلەوە نەنووسا و وایان بە بەرژەوەند زانی رێگایان هەتلە کەن و بە هەرێمی ژێر دەسەلاتی ئەودا ببزوون بەلکوو بۆیان دەستەمۆ بێ. چونکە ئەگەر بێتوو ئەمیرخان کە لە نیزیکانی دلەودەزگای پادشایە ئاوا لاساری بکا و بە لارێدا بروا، دەبێ چاوەڕوانی چ بین لە ئەمیرانی دیکەی کورد و کاروبار چۆن جێبەجێ دەبن. بۆیە سەرلەنوێ لێیان راسپارد، خانەخوێی چا بێ و چەند شەوێکمان راگرێ و هەر کە چاومان پێککەوت لەسەرەخۆ راوێژی لێدەکەین. ئەمیرخان هەر جوابی نامە و راسپاردەی حەسەنخانی نەداوە و لەسەر کەللەرەقی و کەلەوەکێشی خۆی رۆیی.

بۆ بەیانیرا کە پێشەنگی لەشکر گەیشتە دەوروبەری دمدم و ناوچەی بەرحوکمی خان، دەستەیەک لە کوردەکانی برادۆست بەرەنگاری بوون و سەلیانکردە سەر پێشقەرەولەکانی جەلالی و دوویان لێکوشتن و چەند کەسێکی دیکەشیان بریندار کرد. حەسەنخان و ئەمیرەکان کە بەم رووداوەیان زانی پیاوەکانیان گێرایەوە و شەڕ و کێشەیان وەستاند و لە نێو فرسەخی قەلا هەلیاندا و لەشکریان خست. هەر ئەو شەوە کوردەکان لە قەلاوە هۆردووگایان وەبەر تۆپ و تفەنگان دا و دژایەتی خۆیان بۆ گەورەپیاوانی سپا روون کردەوە. سەرکردەکان دیسانیش کەیخودایان ناردەوە لای ئەمیرخان و

هــۆی ئەم هەڵوێست و ئاکارە نالەبارەیان لێ پرسی. هەروەک جاران وڵامێکــی دڵخۆشکەری نەدایەوە و وردەوردە دەستەچیلەی ئاوری دوژمنایەتی چاکتر گڕی گرت و کار لە کار ترازا.

دوای چەند ڕۆژان ڕووداوێکی سەیر قــەوما و نیزیکــەی چوارســەد کــەس پیاوی جەلالی کە لە محەممەدپاشا دڵتۆنگ و ناڕازی بوون و لە چنــگ براکــەی وەزاڵە هاتبوون، لێیهەڵگەڕانەوە و چوونە نێو قەڵای دمدم و ســەریان وەبــەر ئەمیرخان هێنا. حەسەنخان چۆنیەتی ڕووداوەکانی لە ئــەردەوێڵ بــە خزمــەت خاوەنشکۆ ڕاگەیاند. حاتەمبەگی ئۆردووبادی کە ئــەو کاتــە ئیعتیمادوددەولــە [مەزنەوەزیر]ی دەوڵەت بوو، بەپێی فەرمانی پاشا بەرەو ورمێ کەوتەڕێ هەتا بە وردی لە چۆنیەتی هەڵوێست و حاڵوباڵی ئــەمیرخان بکۆڵــێتەوە و ئەگــەر هەستی کرد خان ڕووڕاست و بــێگرێیــە دڵــی بداتــەوە. ئەگــەرچی لــە کاکــڵی مەبەستەکەش حاڵی نابێ، بەلام با ئــەم چوارینەیــەی ســەرتۆپی خوداناســان ئەبووسەعید ئەبولخێری لە زمانی موبارەکی خاوەنشکۆوە بۆ بخوێنێتەوە:

دەی دەی وەرەوە، هەرچی ئەگەر هەی وەرەوە
گەر کافری، گەوری، بوتپەرەس، دەی وەرەوە
ئەم دەرگەی ئــەمــە کــانــی مــرادانــە خــەسم
سەت جــارت ئەگــەر شکــاوە تــۆبــەی وەرەوە

بەلام ئەگەر زانی هەر لەســەر بنــەوەزی و دوژمنایــەتی سووورە، دەبــێ لەڕێوە بە شیری تیژی جەوهەرداری غەزاکەران، ئاوری ئاژاوە و شەڕفرۆشــتنی وەکووژێنێ و تۆزی لێ بــە بــا بکــا و هەڵــیدێرێتە هــەرێمی نــەمان و پاشــان حکوومەتەکەی بداتە دەس جەلالییەکانی ڕۆم و بگەڕێتەوە... .

❖❖❖❖

## شەڕی دمدم و چارەنووسی ئەمیرخان

بەرلەوەی بەرەو ئامانجی باسەکە بکەومەڕێ، بە پێویستی دەزانم کە سەرەتا هێندێک باسی شووورە و دیواری قەڵای دمدم بکەم کە بە حاڵوبووبەڵا شوێنەواری هەرەسەکانی دیارن و تەنیا ناوی ماوە و نێوکی نەماوە. بۆ ئەم مەبەستە دەچمە سوێی ئەسکەندەربەگی مونشی کە مێژووی «عالەمئارای عەبباسی» نووسیوە و لەو هەڵلایەدا لەوێ بووە و ڕووداوەکانی بە چاوی خۆی دیتوون. لێرەدا دەمهەوێ دەقی نووسراوەکە وەکوو خۆی ڕاگوێزمە نێو ئەم ڕەشنووسە ئاڵۆزەوە و پاشان بە پشتیوانی خودا بەرەو مەبەست هەنگاو باوێم.

«ئەم قەڵایە لەسەر دوندی کێوێکی یەکجار بەرز دروست کراوە کە پارچەبەردێکی درێژووکەی تەسکە و وەک کلکی گا دەچێ. لای باکوور و باشووری دۆڵی زۆر قووڵن کە لە ژێرڵا بۆ سەرێ دەبێ بە پەیژەی خەیاڵ بۆی بچی. لەبەر بەرزی پێویستی بە شوورە نیە و عاشووریان بۆ نەکێشاوە. دوو لایەکەی دیکەی دەبێتە پانایی قەڵا کە لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وەبەرزایی چیا داوە و وارشێکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوە و بورجی بلندی هەن و دەروازەیەکی تێکراوە. لای ڕۆژاوای کە لە گۆڕایی نیزیکترە شوورەیەکی یەکجار قایمی هەیە و دەرگایەکیشی بەرەو باشوور دەکرێتەوە. لە دەروازەڕا بۆ عەرزی ڕێگایەک بە نێو بەردەڵاندا دەڕوا کە هێندە تەنگەبەرە بە زەحمەت سوارێکی تێوەدەچێ. سەنگەر بردنە پێش لە لای ڕۆژهەلات و ڕۆژاواوە نەبێ ناکرێ. لە لای ڕۆژهەلات تیرهاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵا بمێنێ، یەکپارچە بەردی سەخت و تەخت و ڕەقە. لە بنەوە بوودری بۆ لێنادرێ و ئەگەر بەردەکە دەبڕێتەوە بورجێکی زۆر بەرز و قایمیان لێ دروست کردووە کە بۆخۆی قەڵاییچەیەکە. تا ئەو بورجە بەردەست نەکرێ سەنگەر بردنە بن قەڵا محاڵە. ئاوی قەڵا لە حەوزێکی گەورەوە دابین دەکرێ کە بە باران پڕ دەبێ. بەڵام

لە لای باکوور لە نێو گەلی‌دا نیزیکەی قەڵا کانییەک هەیە و ئـاوی زۆر کەمـە. ئەمیرخان جۆگەی بۆ کێشاوە و ڕێی بۆ دادڕیوە و لە حەوزەکەی کردۆتەوە. ئاوی ئەم کانییە لە ئێوارەوە تا بەرەبەیانی حەوزەکە پڕ دەکا. ئاوەکەی بەشی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لە ڕێکی عەرزی لەسەر حەوزەکە هەڵخستووە کە لە پێش‌چاوان ون بێ و پێی‌دەڵێن «سـوولق»[1]. بـۆ پاراسـتنی حەوزخانەکـە بورجێکیان بە پاڵ قەڵاوە هەڵچنیوە. لە لای باشوورەوە سەهۆڵـدانێکیان سـاز کردووە کە زستانان بە بەفر و سەهۆڵ داخندرێ. لە تەنیشت وێ حەوزێک هەیە، هەتا ئەو بەفر و سەهۆڵەی لە گەرمای هاوین‌دا دەتوێتەوە و دەبێتە ئاو بەفیـڕۆ نەڕوا و لەوێ‌دا کۆبێتەوە و لە کاتی کەم‌ئاوی‌دا بە کار بێ. ئـەو سەهۆڵـدانەش قەڵاییچەیەکی لەسەر دروست کراوە و پاسەوان و تفەنگچی لەسەر داندراوە. بـە ویش دەڵێن «بووزلق»[2] یا «قارلق»[3]؛ ڕێگای وێـش وەک ڕێگـای «سـوولق» لـە دەرەوەڕا ونە.

بەکورتی ئەم قەڵایە لە پێنج قەڵا پێکهاتووە. یەکیان قـەڵاکی سـەرەکی، یەکیان قەڵای خوارەوە، یەک «سـوولق»، یـەک «بووزلـق» و ئـەوی دیکـەیان بورجی گەورەی دەرەوەی دەرگای ڕۆژهەڵات کە پێشتر باسمان کرد. هـەر پێـنج ئەوەندە بەرز و قایمن کە پەیکی تیژڕۆی بیر و مێرووڵەی خەیاڵ ڕێیان تێنادا و وێیان‌هەڵناگەڕێ.» هەتا ئێرە دەقاودەق لـە کتێبـی «عالـەم‌ئـارای عەبباسـی» وەرگیراوە.

بەکورتی وەختایەک [حاتەم‌بەگی] مەزنەوەزیر وێـرای پیربـوداق‌خـانی حوکمڕانی ئازەربایجان، بەرخورداربەگی فەرماندەی تۆپخانە، پۆلە تـۆپچی و تفەنگچییـەکانی ئیـسفەهانی، خوراسـانی، بـافقی و تـەورێزی، هـەروەها

---

1 - سوولوق: خەزێناو، هەماراو (تورکییە)

2 - بووزلوق: سەهۆڵدان، جێ‌سەهۆڵ (تورکییە)

3 - قارلوق: چاڵەبەفر، بەفردان (تورکییە)

خانئەمیری کوڕی غازیبەگی کوردی حاکمی سەلماس و ئەولیابەگی سەرۆکی ئەنزەلی قەرەباغلار و ناوچەی سۆما گەیشتنە ورمێ. هەموویان چوونە پاڵ لەشکری دەورەی دمدم. سەرەتا حاتەمبەگ بۆ دوایین جار پیاوی نارده قەڵایە و رایئەسپارد کە وا باشە ئەمیرخان بێتە خوارێ هەتا بەپێی فەرمانی بەرزی پادشا دڵی بدرێتەوە و ئامۆژگاری دۆستانە و خێرخوایانە بتوانێ گورچووی بگرێ و دامەزرێ. ئەمیرخان ملی دا و بۆ بەیانی وێڕای چەند کەسێک بەرەو داوێن داگەڕا و هەردوو لا چاویان بە یەکتر کەوت و کوانووی قسانیان داگیرساند. دوای وتووێژێکی دوور و درێژ لەبەرەوەی ئەمیرخان هیچ جوابێکی سەرەوخێری پێنەبوو، بەناچار هەموو تاوانەکانی خستە ئەستۆی جەلالییەکان و گوتی چاوی تەمایان بڕیوەتە ملکوماش و دەسەڵاتم و لەخۆوە ناویان زڕاندووم و تۆمەتباریان کردووم و بە دوژمنی دەوڵەتیان داناوم. ئەگینا من خۆ بە غولام و خزمەتکار دەزانم و هەمیشە ئامادەی راپەڕاندنی ئەرک و فەرمانم. ئێستاش تکام وایە وەزیری پایەبەرز لە خزمەت خاوەنشکۆ عوزرم بۆ بخوازێتەوە. لەم زستانەدا لێمگەڕێن بۆخۆم نەبزووم. یەکێک لە کوڕەکانم وەک بارمتە دەنێرمە بارەگای میری، جا کە بەهارێ پادشا بەرەو کوێستان هات، خۆم دەچمە خزمەتی و بنڕیسمەی ماچ دەکەم.

[حاتەمبەگی] مەزنەوەزیر دڵنیای کرد هەموو شتی لێقبووڵ دەکرێ بەو مەرجەی بەڵێنی خۆی بێنێتەجێ. وا بڕیار درا چونکە قەڵاداری وی دەنگی داوەتەوە، بۆ ئەوەی خەڵک بزانن ئەو یاغی و سەرکێش نیە، بە خۆی و کەسوکار و دەستوپێوەندییەوە بێتە نێو لەشکر و لەگەڵ گەورەگەورەکان یەکتر ببینن و هیچ ترسی نەبێ. ڕۆژێک ئەو میوانی ئێمە بێ و ڕۆژێک ئێمە دەبینە میوانی ئەو لە نێو قەڵایە. هەتا ئاوا دەنگ و باسی نێوانخۆشی و یەکەتی ئەوان لەو سنووره بڵاوبێتەوە. ئەمیرخان بەڕواڵەت قسەکەی سەلماند و گەڕاوە قەڵا. بەڵام هەر کە گەیشتەوە لەڕێوە دەرگای گاڵەدان و کەوتەوە لاساری.

بەکورتی وەختایەک بیری چەپەلی وەکوو رۆژی روونی دەمەو چەشتەنگاو بۆ هەموو لایەک روون بۆوە، بەجارێک تۆماری تەمەنی راستی و دروستی پێچایەوە. هەر بەراستی هێندە نەوی‌کێشان و خاوەخاوە لەگەلی بە قازانجی دەولەتی بەشەوکەت نەبوو، بەلکوو گێچەل و ئاژاوەی گەورەی لێدەکەوتەوە. دیسانیش چونیەتی رووداوەکان بە پێچکی تەختی بەرزی میری راگەیەندران و ئامرازی پێویستی قەلاگیری و گەمارۆ ساز و پەرداخ کران. حەسەن‌خان وێرای میران و تفەنگدارانی ئیسفەهانی لە بالی رۆژهەلاتی قەلا دامەزران. قەلاتی خوارێ لە قۆلی رۆژوا ئەسپاردەی پیربوداق‌خان و تفەنگچییەکانی خوراسان کرا. مرادخان‌سولتان و خەلیل‌خان‌سولتانی سیلسپوور لەگەل چەکدارانی ئازەربایجانی لە لای باشوور بەرەورووی بوورلق مەتەرێزیان گرت. چاوەدێری دەروازە خرایە سەر شانی گەنجالی‌خانی ئیمانلوو. تفەنگدارانی رەشت بە سەرکردایەتی سەفەرقولی‌بەگ و چەکدارانی چگنی روویان کردە باکووری قەلا و بە شانی سوولق‌دا بەرەیان تەنی. دوو تۆپی گەورە و یەکی «بالمیز»یان دابەست و تۆپێکی چووکەش کە لە قەلاتی «گۆگرچین‌لق»ی «ئەنزەل»ەوە بە سواری لۆتکە بە نێو گۆلی ورمێ‌دا هێنابوویان لە مەتەرێزی حەسەن‌خان و رووبەرووی قووچەقەلای دەرەوە دایانمەزراند. لەبەرەوەی زستان بوو بە مەبەستی حاوانەوەی هێزەکان هەر قۆلەی وارگەیەکی بۆ دیاری کرا و خێوەت و رەشمالیان هەلدا و پاشان کەوتنە کاری بەربەرەکانی و قەلاگیری. جا وەکوو «عالەم‌ئارا» باسی دەکا لەشکرچی بۆ گرتنی قەلای دمدم کەوتنە ئەوپەری هەول و هەلسووڕانی مەردانە و دوای شەش مانگ و بە قەولێکی نۆ مانگ توانیان قەلاتێکی ئاوا سەخت و هەلدێر و هەلەمووت بگرن. وەدرەنگ کەوتنی گیرانی دمدم دەگەڕێتەوە سەر قەومانی چەند کارەسات و رووداوێک کە بەکورتی دەیانگێڕمەوە:

رووداوی یەکەم: نەخۆشکەوتن و بێمردنی محەممەدپاشای سەرۆک خێلی جەلالییەکانی رۆم کە دوای نەمانی ئەو دووبەرەکی و ئاژاوە لە نێویان‌دا

بالی ئەنگاوت و دەستەیەکیان چوونەوە ڕۆمــی نیــشتمانی ســەرەکی خۆیــان و تاقمێکیان بێــرە و بــەوێدا بلاوبوونــەوە و ئەمــەش تــرسێکی زۆری وەبـــەر قەلاگیران نا.

ڕووداوی دووەم: داهاتنی وەرزی بەهار و بارینی بارانێکی بە غوڕڕەمی وەکوو گۆزەی سەرەوژێر کە بە ڕوحمی خودای مانگێکی بێنێوبڕ لێی‌نەکردەوە و خەزێناوەکان پڕ بوونەوە و قەلانشینان لە کۆسپ و گرفتی بێئاوی خەلەســتن. چونکە لەشکرچی لەو ماوەیەدا توانیبوویان بــورجی ســوولق بگــرن و قــەلادار کەوتبوونە تۆڕ و داوی توونیایەتی و پەنایان دەبردە بەر بۆگەناوی بووزلق.

ڕووداوی سێهەم: کــۆچی‌دوایــی لەناکاوی حاتــەم‌بــەگی مەزنــەوەزیر (ئیعتیمادوددەولە) کە نیوەشەوێک بە مەرگی موفاجا مرد. نەمانی وەزیرێکی ئاوا بێوێنە و شارەزای کارزان و پشت و پەنای لەشکرداران، گیرانی قەلای وەدوا دا. پاش ئەم کارەساتە میرزا ئــەبووتالبی کــوڕی جێــی گرتــەوە و محەممەدبــەگی بێگدلی کە لە تۆرەمەی خانەدانی موقەددەمی مەراغە بوو کرایە سپاسالار و وێکڕا هــاتن. ســەرلەنوێ مەزنــەمیران و قۆشــەن کەوتنــەوەخۆ و ئــاگری شــەڕیان هەلگیرساندەوە و لە ماوەی چەند ڕۆژاندا بە زەبری تــۆپی قەلاشــکێن لایــەکی شوورەی قەلایان داڕووخاند و سێ کلاوقووچەیان گرتن و گەلێک لە پارێزەران و دانیشتووانی نێو جەغزی حەوشەیان کوشتن. میرەکۆلە وەختایەک لــە شــەش لاوە دەرەتانی لێبڕا و زانی دەرناچێ، لە فرە کــەوت و پیــاوی نــارد و پــەنای خواست. پاشان خان‌ئەبدالی موکری وێڕای چەند کەسێک لــە نیزیکــانی نــاردە ــیوەتی ئەلیاس‌خەلیفەی قەرەداغلووی یەکێک لــە گــەورەپیاوانی حکوومــەت. خۆشی لەگەل تەمرخانی کوڕە گەورەی و نیزیکەی سەد کــەس لــە عەشــیرەتی برادۆست، هەموو زرێپۆش و تفەنگ بە دەست و تەیار و پەرداخ پێی نایە مالــی محەممەدبەگی سەردار و دەستەیەکیش بۆ پاراستنی قەلا دیاری کران. دوای چەند ڕۆژان ئاکامی نابەخێری دژایەتی و بێئەمەگی ئەستۆ و بەرۆکی ئەو مالوێرانەی گرت. ئەمیرخان و خان‌ئەبدالی موکری بەر لە گیرانی قەلا پێکەوە دانیشتبوون و

دوای باس و تەگبیران گوتبوویان بێتوو بگیرێین پاشای قزلباش لێمان خۆش نابێ و دەمانتەزێنێ. بۆیە وا باشە زۆر بەپارێز و پرچەک بچین و لە کۆڕی سەرکردەکاندا دەرفەت بێنین و دەستیان لێ بوەشێنین و چما مەرگ مەودامان بدا بۆی دەرباز بین و دەنا پیاوانە بکوژرێین. لەسەر ئەم پێوشوێنە سەرەتا خانئەبدالی موکری زەبری وەشاند و ئەلیاسخەلیفەی خانەخوێی خۆی کوشت. لەم کاتەدا سەرکردەکان لە خەوی بێخەبەری راپەڕین و خانئەبدال و ئەمیرخان و دەستوپێوەندەکانیان لەتوپەت کرن و ناردیانن بۆ دنیای نەمان و دەستیان لە کوشتار و تالانی قەلانشینان نەپاراست.[1]

پاش ئەم ڕووداوانە شاعەبباسی یەکەم کە بە خۆی و لەشکریەوە لە [کاودۆلی] مەراغە و مەلبەندی سابلاخی موکری بوو، دەسەلاتی ناوچەی ورمێی کردە باربووی قەببانخانی موقەددەم برای محەممەدبەگی بیگدلی و بڕی سێهەزار تمەنیش زێڕی نەغد لە خەزێنەی دارمالی بۆ پێداویستیەکانی قەلای دمدم و خەرجوبەرجی هێزەکانی ئەم کەوشەنە دیاری کرا. ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ئیتئیل (سالی سەگی تورکان) و دەکاتە ١٠١٨ی کۆچی/١٦٠٩ی زایینی.

1 - بەگوێرەی گێڕانەوەی خودی ئەسکەندەربەگ، وەختایەک ئەمیرخان دەچێتە خێوەتی محەممەدبەگ، حەسەنخان دەچێ و بانگی دەکاتە دەرێ و دەڵێ چۆن لە نێو ئەو خەنیمانە دانیشتووی و خزمەتیان دەکەی، برۆ لێکیانهەلبڕە. لەو بێنەوبەردەدا دەبێ کە پیاوەکانی ئەلیاسخەلیفە دەیانهەوێ چەک لە خانئەبدالی موکری و یارانی دامالن بۆ حەسانەوەیان و ئەوانیش وەدەس دێن و شەڕ دەقەومێ و ئەمیرخان و هاوڕێیانیشی کە هەراکەیان گوێ لێدەبێ دەکەونە بەرەنگاری. ئەوەش کە داخوا دەبێ ئەمیرخان و خانئەبدال پێشتر پیلانیان دارشتبێ تا جووقەوار لە سەرۆکانی قزلباش ببڕن و ئەگەر کرا بۆی دەرباز بن، نووسەری «عالەمئارا»ش کە لەوێ بووە لێی سوور نیە و دەڵێ: «خودا بۆخۆی دەزانێ.»

## حکوومەتی قەببانخان و شەڕی دووبارەی دمدم

وەختایەک بۆ دەستخۆشانەی محەممەدبەگی بێگدلی، حکوومـەتی ورمـێ باربووی قەببانخان کرا، ناوبراو بەپێی فەرمانی بـێسـێودووی خـاوەنشـکۆ قەڵای دمدمی کردە ناوەندی دەسەڵاتی و بە قۆشەن و هێزی چەکداری لە ناوچەی «کاورد»ەوە[1] هەتا سەلماس هەمووی خستە ژێرڕکێفی. وردەوردە کەوتە کەلتەی دار و دیواری داڕووخاوی قەڵای دمدم کە لە جەنگەی گەمارۆدا بە تۆپ و تفـەنگی خەزاکەران هەرەسیان بردبوو. لە ماوەی شەش ساڵدا توانی تەواوێک مەلبەند و سنوورەکانی ورمێ بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرێ. بەڵام کەترەخەمی و بێتەگبیری و چارەنووس وای کرد کە قەڵاکـەی لـە پیـاوانی ڕەشوڕووتـی ئـەمیرخان پـاک نەکردەوە و ڕێی هاتوچۆی لێنەگرتن و دیارە ئەم کارە بەپێچەوانـەی پـارێز و دووربینی بوو. «ئۆلۆغبەگ»ناوێکی[2] خزمی ئەمیرخانی چۆلاق لـە عەشـیرەتی برادۆست کە دوای گیرانی قەڵا و برانەوەی ئەمیرخان لە چنگ شـابازی مـەرگ دەرچووبوو، چەشنی کوندەبووی شوم لـە کـون و کـاژێر و کاولاشـەکانی ئـەو ناوچەیە بە دزی هەلکورمابوو.

ڕۆژێکی ڕایسپاردە یەکێک لە ژنانی ئەمیرخان [وانە پەریزادخاتوون] کـە وێڕای کۆمەڵێکی کەسنەناس لە دمدمدا دەژیان و قەراری لەگەڵ دانـا پێویـستە وریا بێ و هەر وەختایەکی قەببانخان بۆ ڕاپەڕاندنی کارێک یان بـە مەبەسـتی

---

[1] دروستەکەی «گاوەوڵ»ی سەر بە مەراغەیە کە ناوەندی دەسـەڵاتی میرانـی مـوکری بووە.

2 - مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لە پـەڕاوێزی لاپـەڕە ٥٥٦ی شـەرەفنامەی وەرگێـڕاوی مامۆستا هەژاردا نووسیویەتی: ئۆلۆغبەگ ڕەنگە کوڕی میر خدر کوڕی ڕۆسـتەم کـوڕی باباعومەر کوڕی سەیفەددینی موکری بووبێ.

چوونە ڕاو وەدەرکەوت، پێیڕابگەیەنێ. ژنە هەر چاوەڕوان بوو هەتا جارێکی قەببانخان بۆ چەند ڕۆژەراوێ لە قەڵا تلاسابوو. خێزانی ئەمیرخان بە ئۆلۆغبەگی ڕاگەیاند و ئەویش شەوێ بە چەند پیاوی تەڕدەستەوە هاتە سوێی قەڵا و بورجێکی سوولقیان کون کرد و وەژوور کەوتن و هەموو پاسەوانانی خافڵاوی ئەم شوێنەیان کوشت. پاشان بە ناوی ئۆلۆغبەگەوە لێیاندا لە دووتەپڵەی شادمانی و کردیانە قریوە و قەڵاکەیان گرت. قزڵباشی قەڵایە بەم هەرا و هوریایە تۆقین و داچڵەکین و وایانزانی کە کۆمەڵێکی زۆر پەلاماریان داون. سەریان لێشێوا و یەکیەک و دوودوو خۆیان هەڵداشت و هەڵاتن و هەتا بەرێبەیانی قەڵا کلاوسوورێکی بۆ تۆوی تێدا نەما.

ئۆلۆغبەگ دەستی بە سەر ماڵ و سامانی قزڵباشاندا گرت و ناردی کە لە دەوروبەرانەوە بێنە یاریدەی. کاتێک قەببانخان لە جێیڕاوێ بەم کارەساتە ناکاوەی زانی، سەیر سەری سوڕما و بەناچار تەتەرێکی تیژڕۆی ناردە لای ئاغاسولتانی موقەددەمی حاکمی مەراغە. لەوێوە ڕووی کردە لای پیربوداقخانی ئەمیریئەمیرانی ئازەربایجان و هانای بۆ برد. ئاغاسولتان ئەوەندەی بڵێی یەکودوو خۆی گەیاندە بناری قەڵای دمدم. بەختیان چاکی هێنا و سەد و پەنجا کەس سوارەی کورد کە دەچوونە یاریدەی ئۆلۆغبەگ، بە سەر قۆشەنی ئاغاسولتان و پیاوەکانی قەببانخاندا کەوتن و شەڕ قەوما. هەر بە تێکهەڵچوونێک کوردەکان شکان و تاقمێکیان کوژران و ئەوەی مان ڕەوین و بۆی دەرچوون. لەو لاشەوە پیربوداقخان و شێرسولتانی موکری سابلاخی وەکوو هەورەبرووسکە و شنەی شەماڵ باڵیان گرت و خۆیان گەیاندە پەنا شوورەی قەڵا و لە بیری پەلاماردا بوون کە خودا ئاوێکی ڕەحمەتی بە سەر ئەم ئاگرەدا کرد و کوژاندییەوە. ڕۆژێکی کە ئۆلۆغبەگ باڕووتی بە سەر تفەنگچییەکانیدا بەش دەکا، لەپڕێ پریشکێک ئاور دەپەڕێتە نێو کۆگای باڕووت و گڕی لێبڵێند دەبێ و ئۆلۆغبەگ لایەکی ڕوومەتی دەسووتێ و چەند کەسیش بە سووتاوی

دەکەونەوە و بۆ شەڕ و قەڵاداری پەکیان دەکەوێ. لەو لاشەوە هەواڵی کوژران و ڕاکردنی ئەو کوردانەی کە قەرار وابوو بچنە هانایان ئەوەندەی دیکەی داترووسکاندن. کوردەکان لە جەرگەی شەوێکی تاریکونووتەکدا ئۆلۆغبەگیان بە مەفرەشبار هاویشتە سەر پشتی بارگینێک و لە ناخافڵ دەرپەڕین و بە کوێرمرێیاندا تێیانتەقاند. سەرکردەکان پاش ئاگاداربوونەوە پیاویان وەدوا خستن، بەڵام نەیانگەیشتنێیە و تۆزیان نەشکاندن و گەڕانەوە. جارێکی دیکە قەڵای دمدم کە پتر لە دەموازدە ڕۆژان بە دەست کوردانەوە نەبوو، کەوتەوە چنگ لەشکری پاشا. بە فەرمانی گەورەپیاوانی دەوڵەت، قەبیانخان لەبەر کەترەخەمی و ڕەخساندنی هەلێکی ئاوا بۆ خەنیمان لەسەر دەسەڵاتی ورمێ وەلاخرا و ئاغاسولتانی موقەددەم لە جێی داندرا. پاشان بڕیار درا کە کۆمەڵێک چەکداری خوراسانی و ئیسفەهانی بە مەبەستی پاراستنی دمدم لەوێ سەقامگیر بن و خۆشی تۆپراق‌قەڵای ورمێ بکاتە ناوەندی دەسەڵات.[١]

١ - ڕووداوەکە ساڵی ١٠٢٤ی کۆچی-١٦١٥ی زایینی کە ٢ ساڵ بە سەر پادشایەتی شاعەبباسدا تێپەڕیوە قەوماوە.

ئەوەندەی باسی ئەمیرخانی لەپزێرین و قەڵای دمدمە، میرزا ڕەشید لە ڕووی کتێبی «ئەمنارا» نووسیویەتی کە مامۆستای بەهەشتەلان «هێمن» وەختی خۆی کردوویەتە کوردی و لە کتێبی «توحفەی موزەففەرییە»دا چاپ کراوە. دیارە میرزا ڕەشید کەکڵ و پوختەی مەبەستی بە دەستەوە داوە و زۆر جێگای قرتاندووە یان بە ڕاوێژی خۆی دایڕشتۆتەوە. منیش پێداگەرام و لە هەر شوێنێک لەگەڵ وەرگێڕاوەکەی مامۆستا هێمن یەکی دەگرتەوە، هەر ئەوم دانا. گوتم با ئەو یادگارە هەمیشە لە یادان بێ.

بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم ڕووداوە بڕواننە: ڕاجەر سەیڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، بەشی پاشکۆ، ل ٣٨٥-٤١٥، بنکەی ژین، سولەیمانی، ٢٠٠٦.

## کەمتەرخەمی قاسمسوڵتانی ئەفشاری ئیمانلوو و غەزرینی شاعەبباس بۆ ماوەیەک لە ئەفشاران

وەک پێشتر باسی کرا قاسمسوڵتانی ئەفشاری ئیمانلوو کوڕی ئەهماسبسوڵتان بەپێی فەرمانی شاعەبباسی خوابەخشیو، دوای شەڕ لەگەڵ ئەحمەدپاشا و بەزین و گیرانی ئەم حاکمە بە چنگ خەزاکەران، پاراستنی هەرێمی دیاربەکر و ناوچەی ماهیدەشتی پێئەسپێردرا و لەو سنوورانە بە خۆی و قۆشەن و پیاوانی خێڵی ئەفشارەوە گەلێک خزمەتی بەرچاوی ئەنجام دا.

ڕاست لەم سەروبەندەدا کە دەبێتە ساڵی ١٠٣٢ی کۆچی/١٦٢٢ ـ ١٦٢٣ی زایینی عێراقی عەرەب وانە بەغدا دووبارە کەوتەوە دەست هێزەکانی ئێران، وەک چۆن پێشتر لە دەورانی شاسمایلی یەکەمدا گیرابوو. هەروەک لە سەرچاوەکانی مێژوویی‌دا نووسراوە، هەتا ساڵی ٩٤٠ی کۆچی/١٥٣٣ ـ ١٥٣٤ی زایینی حاکمی شاری بەغدا لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە دیاری کراوە. بەڵام ئەو ساڵە دەبێ حاکمێک بە ناوی غازی‌خانی تەکەلوو لەخۆوە سەری وەبەر دەوڵەتی عوسمانی هێنابێ و هەڵگەڕابێتەوە. سوڵتان سولەیمان‌خانی عوسمانی دەهاروژێ و دێ و بەغدا دەکەوێتە بەر چنگی عوسمانی. لەو ساوە حوکمدارانی بەغدا جارێک سەریان وەبەر حکوومەتی عوسمانی دێنا و جارێک وەبەر ئێران و بەکورتی ئاوری دووبەرەکایەتی و ئاژاوەیان هەڵدەگیرساند. لەم ڕۆژگارەدا «بەکرسوو» [سووباشی بەکر]ی حاکمی بەغدا کە هیچ دڵی بە دەوڵەتی عوسمانییەوە نەدەنووسا و خۆشی نەدەویست، کاخەزێک لە شاهەباسی خوابەخشیو دەنووسێ و دنەی گرتنی عێراقی عەرەبی دەدا و پەلکێشی دەکا و دوای هەوڵ و هەڵسووڕانێکی زۆر بەغدا دەگیرێ. پاشان پادشا بە مەبەستی پاراستنی ژیان و

حاڵی‌وباڵی هەژار و مسکێن و ژێردەستان کە لە سامی سپای سەرسووران پرشوبڵاو کەوتبوونەوە و عەرز وەخۆی نەدەگرتن، قەرەچوغای‌خانی سپاسالاری وێڕای هێزێکی ئازا و دەستەیەک قۆرچی و تفەنگچی دیاری فەرموو بۆ گرتنی مووسڵ. هەروەها خان‌ئەحمەدی ئەردەڵانی والی کوردستانیشی بەرێکردە کەرکووک و شارەزوور کە لێیەوە نیزیک بوون. لەشکرچی و خەڵکی کەرکووک خۆیان لەبەر هێرشی سپای خان‌ئەحمەد پێ‌ڕانەگیرا و بەرەو دیاربەکر ڕەوین و قەڵای شارەکە کەوتە ژێرکێفی میری ئەردەڵان. بەڵام کۆمەڵێکی بەرچاوی چارەڕەشانی بێ‌داهاتوو لە قەڵاتی مووسڵدا بە پاشەکەوت و ئامراز و چەکوچۆڵی تەیاری قەڵاداری خۆیان دەنازین و کەوتنە بەربەرەکانی و ملنەدان. قەرەچوغای‌خانی سپاسالار، قاسم‌سوڵتانی ئەفشاری ئیمانلووی وێڕای هێزێک دانا بۆ ئابلۆقەدان و گرتنی قەڵای مووسڵ. پاشان بۆخۆی و قۆشەنی ژێرکێفی بەرەو کەوشەنی دیاربەکر کوتای و دوای کوشت و کوشتار و تالانی ناوچەکە گەڕایەوە دەورەی قەڵاتی مووسڵ. قاسم‌سوڵتان شان‌بەشانی کوڕانی خۆی کەلبالی‌بەگ[1] و گەنجالی‌بەگ و هەروەها وێڕای نەدرخانی ئەفشار، تەنگیان بە گەمارۆدراوان هەڵچنی و هێندەی نەمابوو قەڵاکە بگیرێ. بە گەیشتنەوەی سپاسالار چاکتر لە جاران تەنگەیان لێ‌کێشان و پیاوانە لە هەموو لاوە هرووژمیان کردنە سەری و گەمارۆدراوان کە دیتیان چاریان ناچارە و هیچیان بۆ ناکرێ، پەشیمان بوونەوە و کەوتنە لالانەوە و پاڕانەوە و دەستیان بەردایەوە. بەڵام دیسانیش ئەوانەی دەستیان کردبۆوە بە شیری تیژی غەزاکەران ئەنجن‌ئەنجن کران. ئەوانەش کە مەرگ مەودای دابوون و نەکوژرابوون ماڵ و سامانیان بوو بە دەسکەوت و خەنیمەتی سوارانی ئەفشار و چەکدارانی دیکە. دوای ئەم سەرکەوتنە قەرەچوغای‌خان بە سەربەرزی لەم مەڵبەندەوە گەڕایەوە و

---

[1] کەلبعەلی‌بەگ

لە نەجەفی پیرۆز هەواڵەکەی بە خزمەت خاوەنشکۆی سێبەری خوا ڕاگەیاند کە لە مانگی ڕەجەبدا لەنگەری زیارەتی خستبوو. بە دەسخۆشانەی ئەم خزمەتە قاسمسوڵتانی ئەفشار نازناوی خانی و حکوومەتی مووسڵی باربوو کرا و تێکڕای چەکدارانی ئەفشار خرانە بەرکێفی. قاسمسوڵتانی کوڕی پەرغەیبخانی ئۆستاجلووش نازناوی خانی و دەسەڵاتی جوانرۆی پێبەخشرا.

یەکێک لە ڕووداوەکانی تری ئەو سەردەمە شەڕی قاسمخانی ئەفشارە لەگەڵ خەنیمانی دەوڵەتی ئێران، واتە هێزەکانی حکوومەتی عوسمانی لە مووسڵ. دوای گیرانی قەڵاکە قاسمخان و سەرهێز و سەرلک و سەرپەلەکانی ئەفشار کەوتنە ڕێکخستنی کاروباری ئەو شوێنە و بنەیان لێداکوتا. لەم سەروبەندەدا کۆمەڵێک لە عوسمانییەکانی ئەو مەڵبەندە و کورد و عەرەب بە سەرکردایەتی حافزپاشا، وێڕای جەماوەری دیاربەکر گەرم داهاتن و ورەیان بەرز بۆوە و نیزیکەی ۲۷۰۰ تفەنگدارێک لێکهاڵان. سەردارێکی ڕۆمیش بە ناوی حەسەنپاشا هات و گەیشتە پاڵیان و تێکرا بە سەرڕەو بەرەو مووسڵ مامزەیان لە ئەرادی ئەسپان کوتا. بەڵام هەر بەڕاستی لەم کاتەدا قاسمخانی ئەفشار تەنیا سێسەد پیاوێکی شەرکەری بە دەستەوە بوو. ئەگەر تێکڕای قۆرچی و فەرماندەکانی ئەفشار کۆبووبانەوە لە حەوتسەد کەسی تێنەدەپەڕین. کەچی دیسانیش قاسمخان نەخەجڵا و بە پشتیوانی هانای نەبەدی یەزدانی مەزن و بە تین و تاوی دەوڵەت و سێبەری باڵی بەختی وێڕای هێزی کەمی پیاوانە ڕاسا و کەوتە بەربەرچدانەوەی دوژمنان و ئەم ئایەتە پیرۆزەی لەگەڵ حاڵوباڵی خۆی هەڵسەنگاند کە دەڵێ: «زۆرجار کۆمەڵێ کەم – بە ئیزنی خوا – بە سەر کۆمەڵێکی زۆردا وەسەر کەوتوون.»[1] کاتێک ڕیزەکانی سپا لە هەردک لاوە شان بە شانی یەکتر ڕاوەستان، سەرەتا پۆلێک لە دلێرانی تیرەی ئەرەشلووی خێڵی ئەفشار غیرەتیان بزووت و هەڵیانکردە سەر لەشکری ڕۆمییان و سایری سەرکردە و

---

[1] – « كم من فئة قليلة، غلبت فئةً كثيرة باذن الله »، قورئانی پیرۆز، سوورەی بەقەرە، ئایەی ۲۴۹، ل ٤١. وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

تفەنگدارانیش دوابەدوایان پێوەربوون و هرووژمیان برد. قاسمخان لەگەڵ تایفەی ئیمانلوو خۆی تێوەردا و گەیشتە مەیدانێ و گرمەشقەلانی ئاگری شەڕ زمانەی کێشا. وەختایەک حەسەنپاشا و حافزپاشا هەستیان بە زەبری دەستی خەزاکەرانی ئەفشار کرد، تابشتیان نەهێنا و خۆیان بۆ ڕانەگیرا و هەلاتن. قاسمخان بە خۆی و هێزەکانی کەوتە پەیکەردەیان و نیزیکەی هەزار کەسێک لە ڕۆمییەکان و داروەستەیان برینیان هێنا و گەوزێندران و کوژران. هەزارەزیلەیان دەستیان لە چەکان بەردا و لاقیان لێبوو بە باڵ و پەرانپەران بوون. پاشان دەسکەوتێکی بێهەژمار کەوتە چنگ سپای سەرکەوتە و لە نێو خۆیاندا بەشیان کرد. کۆمەڵی قۆرچی و یووزباشی سەری براوی کوژراوان و خەنیمەتێکی زۆریان کۆ کردەوە و مالاوایییان لە قاسمخان کرد و لە فەرەحئابادی مازندەران هەموویان خستنە بەرچاوی شاعەبباسی گەورە و بە لوتفی میرانە بە سەرکرانەوە.

لەو لاوە سولتان سولەیمانخانی خونکاری ڕۆم بە بیستنی سەرکەوتنی ئێرانییەکان و شکستی سەرکردەکانی لە مووسڵ پەژارەیەکی قورس دەورەی دا و هێندەی پێتووڕە بوو کە ویستی خۆی لەگەڵ لێشاوی بێبڕانەوەی قۆشەنی بە مەبەستی تۆڵەئەستاندنەوە و دابڕینەوەی عێراقی عەرەب لە ڕۆمەوە ببزوێ.

لەم کاتەدا محەممەدپاشای مەزنەوەزیر و پۆلێک لە سەرکردەکان چۆکیان دادا و تکایان لە خوندکاری مەزن کرد کە خۆی نەچێ و ئەمجارەشیان شەڕی ئێرانییەکان و گرتنەوەی بەغدا بخاتە ئەستۆی خزمەتکارانی. سولتان سولەیمانخانی خونکاری ڕۆم ئیزنی هەلگیرسانەوەی شەڕی دا و نیزیکەی پێنجهەزار چەکداری ڕۆمی و کورد و عەرەب لە دەورەی ئەحمەدپاشا و حەسەنپاشا کە دوو سەرکردەی دیار و باوەڕپێکراو بوون کۆبوونەوە و بە ساز و پەرداخی لە ڕێگای دیاربەکرەوە روویان کردە مووسڵ.

ڕاست لەو وەختەدا کە هەواڵی هێرشی سەردارانی ڕۆم وڵاتی تەنییەوە، قاسمخانی ئەفشار لەبەر بلاوبوونەوەی نەخۆشی چاوقولکە و تاعوونی

پەرەگرتووی نێو مووسڵ، بنکەی گوێزتبۆوە دەرەوەی شار. بە بیستنی ئەم هەواڵە سامناکە لەرێوە هەنگاوی بەپارێزی هاویشت و گوتی نەکا ڕۆمی بگەنێ و کەس دەستیان وەبەرنەهێنێ و سووک و هاسان قەڵای مووسڵ بگرن، بۆیە گوێی نەدایە پەتاومەتا و نەخۆشی و خێرایەکی گەراوە و سەرەڕای کەمقۆشەنی کەوتە قەڵاداری. بۆ بەیانیڕا سەرداران بە خۆیان و لەشکرەوە گەیشتنە دەورانپشتی مووسڵ و کەمەندیان هاویشتە بەژنی قەڵا و تێیهاڵان. قاسمخان بە خۆی و پۆلی چەکدارانی کەوتە پاراستن و پاسەوانی و ئەم خەبەرە لە مازندەران بە گوێی شاهەباسی یەکەم ئاشنا کرا. پادشا لەرێوە یەکێک لە خزمەتکارانی بارەگای بە ناوی زەینولعابیدینبەگی شاملووی خوانسالاری ڕاسپارد کە هەستێ و هێزێک بەرێ و بچێتە هانای قاسمخانی ئەفشار و لێدان و دەربەراندنی سپای ڕۆمییان. هەتا ئەو گەیشتێ قاسمخان چەند جارێک لە قەڵای مووسڵ هاتەدەر و ئەوەندەی بۆی کرا زەبری وەشاند و ئازایەتی نواند و خۆی ڕاگرت. بەڵام سەرەنجام کەم بوونی هێزەکانی و زەوەندی دوژمنانی و نەنینەوەی تاعوون و بڕانی پاشەکەوت و پەرداخ نەکرانەوەی چەکدارانی تینی بۆ هێنا و دەریبەراند و دەستی پێ لە بەرەنگاری بەردا و قەڵای بۆ ڕۆمییان خۆڕایی کرد. لەولاشەوە خانئەحمەدی ئەردەڵان کە بۆ پاراستنی قەڵای کەرکووک دیاری کرابوو، باڵەپرژەیەکی وای کرد کە هێندەی نەمابوو خۆشی بێ و ناخۆشی بێ قەڵاکە بداتە دەست هێزەکانی ڕۆمی.

وەختایەک لە مەودای ڕێیەدا زەینولعابیدینبەگی سەردار چۆنیەتی گیرانی قەڵای مووسڵ و ڕەوینی قاسمخانی ئەفشار و ترس و لەرزی خانئەحمەدی لێڕوون بۆوە، قاقەزێکی ناردەوە بارەگای بەرزی میری و خێراتر ئاژاوتی و ئەسپی لینگ دا. کاتێک گەیشتە نێزیک دەرەتەنگ، حوسێنخانی حاکمی لورستان بەپێی فەرمان وێرای پۆلەچەکدارێک ڕەگەڵی کەوت. لەوێ هێزەکان بە سەرکردانەوە و بێجگە لە بارگەچی و پیادان، سێهەزار چەکداری تەیار بە دار کران. [illegible] یوە بە وێرغە کوتایان و ئەو مەودا دوورەیان بە دوو

شــەو و ڕۆژان بری و بۆ سەری سێ ڕۆژەی خۆیــان گەیانــدە خــەنیمان. بــەڵام ئەوەندە تێڵ فریبوون کە پتر لە دووهەزار کەسیان نەگەیبوونێ. هەر کە لەشکری قزلباشان ئاسـۆگی دا، کۆمەڵــەچەکدارێکی کــورد و عــەرەب تــۆقین و وەکــوو کێوییان تەقورەویان تێکەوت و ئەوەی مابوونــەوە کۆڵــیان نــەدا. وەختایــەک ریزەکان تێکبەزین و مەردازایانی مەیدان دەست و مەچەکیان نیشان دا و ڕۆبوونە چەکوچۆڵ و شیر و تیران و نێزەیان هەژاندن، ئیستێکی وای پێنەچوو کــە بــە یاریدەی یەزدان، لەرزە کەوتە ئەندامی نــەیاران و بەرگــەیان نــەگرت و وەهــا بەزین هەر دەبێ بێیە سەیرێ و نیزیکەی شەشــسەد کەســیان بوونــە چێــشتەی شیری تیژی جەوهەردار. یەکێک لە هەڵکەوتە باشەکانی ئەم شــەڕە نــەکوژرانی هیچکام لــە چەکــدارانی قزلــباش و تــەنیا ئــەنگوانی چەنــد کەسێکیان بــوو. حەسەنپاشا وێرای هەزارەزیلەی لەشکری، خۆی گەیاندەوە قــەڵا و هــۆردووی بوو بە پێخوستی تالانوبرۆ. لەبەر برەو ئەستاندنی نەخۆشی، شار خۆی تێــدا ڕانەدەگیرا و مانەوەی لێنەدەگونجا، بۆیە ڕاسپاردەی نێــوان حەســەنپاشــا و زەینولعابیدینبەگ کەوتنە هاتوچۆ و بــڕیار درا کــە هــەرێک لەشــکر قــەڵا و دەوروبەری چۆل بکەن و لە شوێنی تر بیخــەن هــەتا دوای هێــور بوونــەوەیان ئەوەی بە چاک و بەرژەوەندیان زانی بکەونە بێوشوێنی.

زەینولعابیدینبەگی سەردار بە نیــشانەی ڕەزامەنــدی ســەری لەقانــد و قۆشەن و بارگە و بنەی دەنگ دا و سەرکەوتە و شادمان گەڕایەوە. بەکورتی دوای بۆڕاندنی شاری مووسڵ قاسمخانی ئەفشاری ئیمانلوو وێرای عێل و کەسوکاری بەرچاوی خاوەنشکۆ ڕەش ببوون. هەموو حاکمــەکانی ئــەم خێــڵە لــە هــەر جێگایەکی دەسەڵاتدار بوون، لێخران و لە پەنا و پەسیوان، دوورەپــەرێز و بــە دڵەڕاوکە دەژیان. بە پشتیوانی خودای بەخشندە لە جێی خۆیدا بەسەرهاتەکان دەخرێنەروو...

❖❖❖❖

## باسی بەسەرهاتی گەمارۆی بەغدا؛ ئازایەتی بێوێنەی کەلبالیخانی کوڕی قاسمخان و خۆشەویستبوونەوەی خێلی ئەفشار

پاش ئەوەی کە حافزئەحمەدپاشا قەلای مووسلی گرت، حەسەنپاشای دانا بۆ پاراستنی و خۆی و هێزەکانی روویان کردە دارولئیسلامی بەغدا. ڕۆژی ٩ی مانگی پیرۆزی سەفەری سالی ١٠٣٥ی کۆچی/ ١٠ی نوامبری ١٦٢٥ی زایینی، دەورەی قەلای بەغدا بوو بە خێوەتگای قۆشەنی ڕۆم. سەفیقولیخان کە پاشای دادەوانی ئێران کردبوویە حوکمرانی بەغدا و مەلبەندەکانی دەورانپشتی، کەوتە بەربەرەکانی و قەلاداری و بە گوللەی کۆمەلەتۆپی دلئاسنین و پشووئاگرینی سەر بورج و دیواران تۆزی ژیانی ئەو سەربزێوانەی بە دەم بای نەماندا دەدا. وەختایەک ناپۆرایەکی ڕۆمییەکان بە گەڕانگەری قەلادا پەرمپەرم بوون، سەفیقولیخانی جوامێر بە پالپشتی تروسکانەوەی ئاوێنەی بێگەردی دەروونی و بە پشتیوانی هێزی پەروەردگار بۆلێک شەڕکەری کارامەی هەلبژارد و بەڕێیکردن بۆ دەرەوە هەتا چەشنی هەورەبرووسکە لە رووبار تێپەڕن و بکەونە شوێن خەنیمان و چما زەبری خۆیان وەشاند خێرایەکی بگەڕێنەوە قەلا. هێزی ڕاسپێراو بە لای مەزارگەی ئەبووحەنیفەدا وەدەرکەوتن و ئاگری هات و هاواری پەلاماریان خستە گیانی نەیاران و شەڕێکی قورسیان لە مابەینیدا قەوما. هەر ئەوەندەی مستێ لە چاوێ دەی سێسەد کەسێکیان لێکوشتن یان گرتیانن و ڕەوەیەکی بەرچاوی بارگین و ئەسپ و بەستر و وشتریان هێنا و گەڕانەوە جێی خۆیان. گەمارۆدەرانی بەغدا بە دیتنی ئەم شالاو و دەستوبردەی گەمارۆدراوانی بەغدا، شوورەی دلیان کەوتە لەرزین و بەندی هەناویان پسا و سەفیقولیخان بوێرانە بەرەنگاریان چەقی. بەکورتی لەبەروەی هەرەتی هەلگرتنی دەغلودان بوو، ڕۆمی بەرهەم و پاشەکەوتێکی زۆریان وەچنگ هێنا و بە ئاسوودەیی

بنەیان داکوتا و دووبارە کەوتنەوە قەڵاگیری. ئەم هەواڵانە وەختایەک بە خزمەت شاعەبباسی خوابەخشیو ڕاگەیەندران کە ڕکێفی پیرۆزی لە هەمەدان وەستابۆوە. خاوەنشکۆی سێبەری خوا فەرمانێکی نووسی بۆ زەینولعابیدینبەگی سپاسالار کە دەبێ هەرچی زووتر بگاتە بەغدا و بچێتە فریای دەورەدراوان و «هاروونئاباد»ی[1] سەر بە ماهیدەشت هۆردووبەزی بێ. لە گەرمەی ئەم کارانەدا میری ڕازێنەوەی جیهان هاتە سەر ئەو باوەڕە کە پێویستە کۆمەڵێکی دیکەی مەردازای کارزان خۆیان بگەیەننە شاری بەغدا و قورقوشم و باروونی گەمارۆدراوان فەرەبوو بکەنەوە، نەکا ماوەی ئابلۆقە زۆری پێبچێ و قەڵاداران جبەخانەیان هەڵتەکێ و هیچی تێدا نەمێنێ. هەموو لایەک ئەم کارەیان بە هەنگاوێکی دژوار دەزانی، بەڵام ئەرک و ڕاسپاردەکە خرایە بەردەم سەرۆکانی سپا. لەو دەمەدا کەلبالیسوڵتانی کوڕی قاسمخانی ئەفشار کە لە ڕکێفی پاشادا بوو ئەم خزمەتەی وەئەستۆ گرت و وێڕای چەند کەسێکی وەکوو فەرەیدوونبەگ، میرزا حوسێن کوڕی حوسێنخانبەگ، مورتەزاقولیبەگ و میرزا خانبەگی قاجار کە هەموویان لە چۆڵ کردنی قەڵای مووسڵدا لەگەڵ قاسمخان بە کەترەخەم دەرچووبوون، یەکتریان گرت. هەر یەکەی مەنێکی تەوریزی[2] قورقوشم و باروونیان لە پاشکۆی ئەسپان شەتەک دا و بە هیوای خودا لە خزمەت ڕکێفی موبارەک هەڵبڕان و ڕێگایان هەڵبوارد. وەختایەک گەیشتنە لەشکری زەینولعابیدینبەگی سەردار کە لە هاروونئاباد هۆردووبەزی کردبوو؛ دیتیان ئەوە بۆخۆی لەبەر بارڕاستی کاران و دووربینی وێڕای تاقمێکی سوارەی دوژمنبەزێنی خەریکە بە ڕێنوێنی ڕێنیشاندەران بەپارێز دەڕوا و ڕێگا بەتاقی دەکاتەوە. پاشان دووسێهەزار چاونەترسی کارامەی لەگەڵ نووروددەهربەگی برازای و کەلبالیسوڵتانی ناودار و سەردارانی دیکە گاڵی دان کە بڕۆن و خۆیان

---

1 - شاهئابادی غەرب. ئیستا کراوەتە ئیسلامئابادی غەرب. ئەم شارۆکەیە وەختی خۆی کەوتبووە سەر ڕێگای بازرگانێتی کرماشان و بەغدا.

2 - هەر مەنێکی تەوریزی سێ کیلۆیەک بووە. مەن سەر و خواری کردووە.

بگەیەننە نووسێ فرسەقی شار و شەوەریان لە دەشتێ بێ و چما ڕۆمی پێبزانن و دەست لەو پۆلە بوەشێنن بگەنە فریایان.

کەلبالیسولتان و یارانی سەرەتا پیاویان ناردە قەلا و چوونی خۆیان ڕاگەیاند. پاشان لە تاریکایی شەودا چەشنی لێشاوی سەربەرەژێر لووزەویان بەست و بە شانی دەروازەی ئەبووحەنیفەدا ڕوویان کردە قەلا. قۆشەنی ڕۆم کە لە دەوروبەری دیجلە وەکوو دەریا دەهاژان، کۆمەلێکیان کەوتنە بەرەنگاری. دلێرانی خوێنخۆرەوەی لەشکری ئێران وەکوو شێر دەیاننەڕاند و گورمیان دەبەست و دەتگوت شەپۆل و چەپۆکانی ئێرینەی دەریان و قەلبەزەی دەکەن. لەو شەوڕەشی ئەنگوستەچاوەدا بەرخورداربەگی زولقەدر و میرزا مەعسووم بە خۆیان و چەند کەسیکەوە هەلبڕان و گیرۆدەی داوی ڕۆمییەکان بوون و پاش شەڕ و لێکدانێکی زۆر هەردوو گیران. ئەوانی تر پشتی یەکتریان بەرنەدا و لە گوێن تیزمالکی تریفە گەیشتنە دەروازە و بە سلامەتی لە قەلا وەژوور کەوتن و سێهەزار مەن قورقوشم و باڕووتیان گەیاندە قەلاداران. لەو کاتەدا قرمەقرمی تەپلی شادمانی لە قەلاوە بەرز بۆوە و لە ڕاستیدا ئەم کارە ئازایەتییەکی ئەوەندە بێوێنە و بەرچاوە کە دنیا شتی وای زۆر کەم بە خۆیەوە دیتووە. لەم کاتەدا ڕکێفی پێپیرۆزی سێبەری خوا کە لە هەمەدانەوە کۆچاوکۆچ دەهات، گەیشتێ و لە گەرانگەری مەزارگەی ئەبووحەنیفە بە قەدرایە ئەستێران خێوەت و ڕەشمال هەلدران و ئەستوندەکیان وەبەردرا. ئەمجارەیان پاشای بەرزەجێ هێزەکانی دوژمنبەزێنی بۆ شەڕی ڕۆمییان دەنگ دا و حافزئەحمەدپاشاش کەوتە شەڕ و بەرەنگاری. لەم کاتەدا سەفیقولیخان و گەمارۆدراوان کە ورەیان بەرز ببۆوە و بە شەکانەوەی ئالای خاوەنشکۆ تین و توانیان لە دەروونی زابوو، لە قەلا دەرپەڕین و لێنگیان دایە دوژمنان. سەرەنجام ڕۆمی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و ڕەوین. جا لەبەروەی ئەسکەندەربەگ بە درێژی لە «عالەمئارا»دا باسی کردووە، من لە ترسی درێژدادری سەری ڕکێفی قەلەمە کوێتم وەرسووڕاند.

❖❖❖❖

## درانی مەڵبەندی ورمێ بە ئەفشاران

لە پێشەکی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی سەبارەت بە مووسڵدا ئاماژەی پێکرا کە ئەو قەڵایە لەبەر تەنینەوەی نەخۆشی تاعوون و سستی و کەمتەرخەمی و خۆڕانەگرتنی قاسمخانی ئەفشار کەوتە چنگ سەرکردەکانی ڕۆم و قاسمخان و تیرە و تۆرەمەی بۆ ماوەیەک لەبەرچاوی پادشای سێبەری خودا کەوتن. پاشان ئەمەشیان زیندوو کردەوە کە خێڵی ئەفشار دەستیان هەبووە لە کوژرانی شاژنی گەورەی مەزلوومی دایکی شاهەباس و شەهید کردنی سولتان هەمزەمیرزای برای‌دا، هەروەک بە پانەوە لە «عالەمئارای عەبباسی»دا نووسراوە. بەڵام وەختایەک کێشەی گەمارۆی بەغدا و تێمانی سەفی‌قولی‌خان و دانیشتووانی هاتەپێش و کەلبالی‌سولتانی کوڕی قاسمخان سینگی ڕەپێش دا و وێڕای پۆلەسوارێک بە نێو دەریای هێزەکانی ڕۆمی‌دا تێپەڕی و قورقوشم و باڕووتی گەیاندە قەڵانشینان و زۆری ئازایەتی نواند و پەت و گوریسی خێوەتانی هەڵبڕی و خەنیمانی لە خاکی نەمان گەوزاند، میری مەزن لە سووچ و تاوان و کەترەخەمی کۆن و تازەی خێڵی ئەفشار خۆش بوو. نازناوی خانی کردە خەڵاتی کەلبالی‌سولتان و لە نێو هاوشانەکانی‌دا سەری بەرز کردەوە. پاشان لە لای خاوەن شکۆوە حوکمێک دەرچوو کە خێڵی ئەفشار هەر ناوچە و مەڵبەندێکی ئێران هەڵبژێرێ و پێی‌خۆش بێ و داوای بکا، باربووی بکرێ. کەلبالی‌خان و ئەمیرانی ئەفشاری خزمەت ڕکێفی پادشا تێکڕا چۆکیان دادا و بە خزمەتیان ڕاگەیاند لەبەروەی مەڵبەندی ورمێ سنوورێکی بەرفرەوانە و بە خاکی دەوڵەتی گەورەی ڕۆمەوە نووساوە و هەمیشە بۆتە سمکوتی خێڵاتی کارەسات و ڕووداوان، تکامان وایە بدرێ بە ئێمە. چونکە خەڵکی ناوچەکە بە کورد و تێکڕای

هۆز و عەشیرەکانییەوە شکاو و پێبەست کراون و قەت لـە چنـگ شەڕفرۆشـان نەحەسانەوە و نەیانگوتووە ئۆخەی و بە ئاسوودەیی سەریان وەسەر سەرینی خاترجـەمی نـەکردووە. بەتایبـەتی لـە ئـاژاوەی ئـەمیرخانی برادۆسـتیدا مەڵبەندەکە خەساراتێکی زۆری بـە گـەردنیدا بـڕاوە. بێتـوو دەسـەلاتی ئـەو مەڵبەندە بە کەڵەبری و پاوانەمیر بۆ ئێمەی غولامی فیداکار دیـاری بکـرێ بـە کۆمەگی یەزدانی مەزن و لە ژێر باڵـی بـەختی پادشـای تاقانـەدا، قـەرەبووی سالمەخەتە و هەنگاوی لارولوێری پێشوو دەکەینەوە و بە نۆکەرچاکی خۆمـان ڕەزامەندی بەڕێزتان وەدەس دێنین و چۆن باشـە ئـاوا تێدەکۆشـین و تـەواوی هەرێمەکە بە داسی شیری تیـژی تازەسـاو لـە دڕکوداڵ و ئـاپۆرای کەسـانی شەڕانی پاک دەکەینەوە و ڕایدەماڵین. ئەم تکا و داوایەی کەڵبالیخان و خێـڵی ئەفشار کە لە هەوێڵ شاهەباسی خوابەخشیودا خرایەڕوو قبووڵ و پەسند کرا و بە مەبەستی دابین کردنـی هێمنایـەتی و ئـاوەدانی مەڵـبەندەکە و پـارێزرانی سنووران، دەسەلات و حکوومەتی ورمـێ بـاربووی کەڵبالـیخـان کـرا. پـاش دامەزرانی بەرایی کاران کەڵبالیخان بەپێی حوکمی خاوەنشکۆ هەشتهەزار سەر خێزانی تیرە و تایفەکانی ئەفشاری نیشتەجێی هەرێمـەکانی عێـراق، فـارس، کرمان و خوراسانی لە ماوەیەکی کەمدا کۆکردنەوە و لـە مەوتـەنی خۆیانـەوە کۆچی پێدان و بە خێڵ و بار و هێزی شایانەوە ڕوویان کردە مەڵبەندی ورمێ.

## شەڕی قەرەسوو؛ سەقامگیربوونی کەلبالیخان لە ورمێ و دابەشینی زەویوزار لە نێو بنەماڵەکاندا

وەختایەک کەلبالیخان و خێڵ و ماڵ و بارگە و بنەی کۆچاوکۆچ گەیشتە دەوروبەری سەلماس، کۆمەڵێک لە عێلاتی ئێران و عوسمانی نیشتەجێی سەر سنووران، بە بیستنی ئەم هەواڵە و بە هان و دنەی تەمرخانی کوڕی ئەمیرخانی خاوەنی دمدم، هارووژان و لەشکرێکی زۆر و زەوەند کۆبوونەوە و بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی خێڵی ئەفشار بەرەگەیان تەنی و لە لێواری ڕووباری قەرەسووی سەلماس تێکهەڵچوون. شەڕێکی قورس و خوێناوی قەوما و دلێرانی ئەفشار کە شێری مێشەی هەڵمەت و بە گژداچوونەوە بوون، بە شیر و تیر و تفەنگان لێیانوەخۆ کەوتن و گەلێکیان دەستوبرد و ئازایەتی نواند. ئاخرییەکەی هێرشکەران بەرگەی گورم و پەلاماری خەزاکەرانی ئەفشاریان نەگرت و تابشتیان نەهێنا و زۆریان لێکوژرا و هەزارەزیلەیان بە ڕاکەڕاکە خۆیان گەیاندە زەرد و ماهـ و ڕەوزی چیا سەختەکان و ماتەیان هەڵگرت.

پاشان کەلبالیخان وێڕای خێڵی ئەفشار بە سەرکەوتوویی داوەری بۆ خاکی ورمێ و تۆپراققەڵای کردە ناوەندی دەسەڵاتی و بۆ هەر تیرە و تایفەیەکی خێڵی ئەفشار ناوچەیەکی دیاری کرد کە بڕۆن و لێیبنەگر بن. لە پێشدا ناوچەی نۆل، کە لە «قاشقەگەدووک»ەوە هەتا خانتاوس بە باری درێژیدا پێنج فرسەخێک دەبێ، دای بە تیرەی قەرەئێولووی ناسراو بە گۆندوزلوو. ئەمانە لەو ناوچەیە چەند گوندێکیان ساز کرد و ملیان نا لە کشتوکاڵ و فەلەیی و کەوتنە ئاوەدان کردنەوەی چەند شوێنێک و لێدانی جۆگە و جۆبار و هەرەس کردنی داران. بناوی نازلووی دا بە تیرەی کۆهەکلوو. سەرچاوەی ئاوی ئەم

دەڤەرە لە سێ لکەوە دابین دەبێ: دامێنی قەلای بەردووک، مێهرانرووود و جێرمی و بیدکار. لێواری چۆمی «رموزە» تیرەی قۆرقلووی لێ بنەگر بوون. سێ تیرەی قاسملوو، ئەرەشلوو و ئیمانلوو هێندێکیان لە گەرانگەران و کۆمەلێکیان لە جەرگەی مەلبەندەکە نیشتەجێ بوون. حکوومەتی «سائینقەلا» درایە دەست ئەللایارخانی قاسملوو و جڵەوی دەسەلاتی شارۆچکەی شنۆ ئەسپاردەی خوداوێردیخانی ئەرەشلوو کرا. ئەسکەندەرخانی ئەرەشلوو ناوچەی سندووسی پێ‌ئەسپێردرا. بەم چەشنە تێکرای ناوچەکان دابەش کران و هەر تیرە و تایفەیەک شانی چۆنی هەلیدەگرت دەسەلات و ملکوماشی درایە. ئەم خێلە کە ماوەیەک رۆژگارێکی پەرێشانیان رادەبوارد و ببوونە تۆوی هەرزن، لەم هەرێمە خۆش‌ئاو و هەوا و پاک و باسەفایەی کە بەراستی لە هەموو مەلبەندەکانی دیکەی ئازەربایجان سەرتر و ناوازەترە، دامەزران. خێلی ئەفشار کەوتنە شوکرانەبژێری یەزدانی تاق و بێهاوتا و بە دلنیایی و ئاسوودەیی بە جووتوکا و ئاومدانییەوە نووسان. هەتا وای لێهات کە لە ماوەیەکی کەمدا تیرە و تایفەکانی ئەفشار بەپێی پلە و پایەی خۆیان بوونە خاوەن مووچە و مەزرا و بە سەر دەولەمەندی و مال و سامانیدا کەوتن. هێز و جەماوەر و دەسەلاتی ئەم خێلە هێندەی پەرەئەستاند کە [کوردانی] ئاژاوەگێری کەوشەنان پەشۆکان و هەستیان بە لاوازی کرد، بۆیە بەناچار هێندێکیان لە سنووران و دەستەیەکیان لە قەراغ و قولاغی هەرێمەکە سەریان وەبەر دەولەتی هەتاهەتایی هێنا و ملیان بۆ دانی باج و پیتاکی دیاریکراوی حکوومەتی راکێشا. ئەمانە بۆیە پێمل بوون چونکە ژانی جێ‌پەنجەی زەبری ئەفشارانیان هەرگیز لە گیانی دەرنەدەچوو.

❖❖❖❖

# شەڕی ئەنهەر

منـــی ڕەشـــکەرەوەی ئـــەم ڕووپەڕانـــە، بەســـەرهاتێکم لـــە مـــامی خوداڵێخۆشبووم مـیرزا محەممـەدڕەفیعی کـوڕی عـەلیبـەگی محەممـەدلووی ئەفشاری ئورووەمی بیستووە کە پیاوێکی ڕاست و باوەڕپێکراوی بە تەمەن بـوو. مامم ڕووداوەکەی لە پێشینیانی خۆی بیستووە و بە دەم[1] بۆ منی گێڕاوەتەوە کە دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی بیسەران و وەکوڵهاتنی غەیرەتیان.

دەگێڕنەوە کە لە سەرەتای دامەزرانی حکوومەتی کەلبالیخاندا لە ورمێ، بێپسانەوە خەبەر هات و وەراست گەڕا کـە هێـزی زۆر و زەوەنـدی [کـوردانی] ئاژاوەچی خەریکە لە باڵی دەشـت و تەرگـەوەڕەوە دێ و دەیهـەوێ قـەرەبووی سووکایەتی و شکانی شـەڕی قەرەسـوو بکاتـەوە و تۆڵـە لـە کەلبالـیخـان بستێنێتەوە. بەپێی هەواڵـەکە لافـاوی تێکـدەری خـەنیمان کـە بـەرەو ورمـێ دەیئاژاوت گەیبوویە گوندی ئەنهەری سەر بە ناوچەی بناوی ڕەوزە. چونکە لەو دەمەدا کەلبالیخان لەبەر پەرتەوازەیی خێڵی ئەفـشار و سـەرقاڵبوونیـان بـە کاروباری فەلایی و کشتوکاڵەوە، توانایی بەربەرەکانی نـەبووە، پۆلێـک لـە سەرۆکانی ئەفشار کۆدەکاتەوە و سەبارەت بە شەڕ و ئاشتی لەگەڵیان دەکەوێتە باس و ڕاوێژ. سەرۆکانی ئەفشار بە تێکڕای دەنگ هەڵەکە بـۆ شـەڕ بـە لـەبار نـازانن. لـە گەرمـەی قـساندا یـەکێک لـە خزمـەتکارانی ئەنـدەروون دێ و مەجومعەیـەکی سـەر داپۆشـراو لەبـەر دەمـی خـاندا ڕۆدەنـێ. وەختایـەک

---

[1] - نیوەی زیاتری ئەم کتێبە لە زمان کـوڕ و کـاڵ و نـەوە و نـەتیژەکانی بەگـەران و شەرکەرانی کۆن و بە سالاچوو وەرگیراوە کە لە باوک و باپیرانیـان بیـستووە یـان بـە چاوی خۆیان دیتوویانە. م . پ

سەرپۆشەکە هەڵدەداتەوە شمشێرێک و دەسماڵێک وەبەرچاو دێ. خانی حوکمڕان پرسی ئەرێ دەبێ مانای ئەم شیر و دەسماڵە چ بێ؟ کەیخوداکان گوتیان خودا دەزانێ. خان فەرمووی قەرەواشانی ئەندەروونی ئاماژەیان کردووە، هەرکەس پیاوە با هەستێ و شیر لە قەدی شەتەک بدا و بڕواتە مەیدان و مۆری ترسەنۆکی بە نێوچاوانییەوە نەنێ، چونکە دوژمن بەپێی خۆی هاتۆتە سەر کەندەڵانی گۆڕ؛ دەنا نا با دەسماڵی ژنانە بە سەردا بدا و خۆهەڵنەکێشێ و بانگەشەی پیاوەتی نەکا. کەسی ئاقڵ هەرگیز هەلی ڕەخساو نادۆڕێنێ و شاعیرانی تورک گوتوویانە:

زانا دەرفەت لە دەس نادەن، نەزانن کە دەیدۆڕێنن

پاش ئەم لێکدانەوەیە خانی حوکمڕان لەڕێوە شیرەکەی لە نێوقەدی بەست و گوتی: هەر پیاوێک ئەگەر غیرەتی مەردانەی نەبێ هەر بۆ نەمانێ دەبێ... هەرچۆنێک بێ وێڕای ئەوانەی بە دەستییەوە بوون هەستا و مەچەکی ئازایەتی هەڵکرد و بەرەوپیری هێرشکەران فڕی. کاتێک لە نیزیک قەرەحەسەنلوو هێزەکانیان تێکهەڵەنگووتن، ڕۆبوونە چەکان و شەڕیان هەڵگیرساند. خانی حوکمڕان لە گەرمەی شەڕا تەماشای کرد کە شەڕفرۆشانی دڵڕەق خەریکن بە قوونەشەڕ دەرەدزەی دەدەنێ و وەکوو وەرگێڕکەی بەردەستی گوریسکەران پاشەوپاش دەکشێنەوە. سەری سوڕما و وای زانی کە دەیانهەوێ بە فێڵوفرت و ڕێوی‌بازی خێڵی ئەفشار تێن بدەن و ڕایانکێشن؛ بەڵام وەختایەک لە باڵی ورمێیان ڕوانی دیتیان ئەوە کۆمەڵەسوارێکی نێزەداری سێسەدچوارسەد کەسی دیارن و بەپرتاو دێنە هانایان. گێچەڵبازانیش پێیان‌زانیوە و دەیانهەوێ هەڵێن. سەرەنجام وەختایەک سوارانی نێزەدار گەیشتنێ لەڕێوە ئاژاوەچی لێک‌بلاو بوون. پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە قەرەواشانی حەرەمخانەی

کەلبالی‌خان دوای ڕۆیشتنی ئەوان، جلی پیاوانەیان کردۆتە بەر ژنان و چەک‌وچۆل و نێزەیان داونە دەست و بە شوێنیان‌دا هاتوون و خەنیمان هەلخەلەتاون و ڕەویون.

ژنانی حەرەمخانەی کەلبالی‌خان، کەنیزانی تایبەتی ئەندەروونی فەرمانڕەوایەتی بوون کە شاعەبباسی پێشوو بە دەسخۆشانەی کار و خزمەتەکانی خانی ئەفشار چ لە کوشتنی شێردا لەبەرچاوی شا و چ لە بردنی قورقوشم و باڕووت بۆ گەمارۆدراوانی قەلای بەغدا بە مەرجی مارەکردنیان، بە وی بەخشیبوون.

لەم سەروبەندەدا [کە سالی ١٣٠٨ی کۆچی/١٦٢٩ی زایینی] بوو پاشای بەرزمجێ، واتە شاعەبباسی خوابەخشیو بەناچار جامی ئەمانی بە سەرەوە نا و قومی لێدا و لە کاولاشی دنیاوە تەشریفی بردە سەراپەردەی هەرەخۆشی بەهەشت و بە شوێن ئەم بەلگەیەدا ڕۆیی کە دەلێ: «هەموو کەسێک تامی مردنێ دەچێژێ.»[١]

١ - « کلُ نفسٍ ذائقة الموت » قورئانی پیرۆز. سوورەی ئالی عیمران، ئایەی ١٨٥، لاپەرە ٧٤، وەرگێراوی مامۆستا هەژار....

## شەڕی سێجارەی دمدم و ئاژاوەی تەمرخان

دوای ساڵێک تێپەڕین بە سەر حکوومەتی کەڵباڵیخاندا، تەمرخان ئەم ماوەیە بێدەنگ دانەنیشت و دیسان کۆمەڵێک خەنیم و شەڕفرۆشی لە خۆی کۆکردەوە و پەلاماری بردە سەر دانیشتووانی خاکی ورمێ. کەڵباڵیخان سەرەتا کاخەزی لێنووسی و بە پەند و ئامۆژگاری بە سەری کردەوە کە دانیشێ و دەست هەڵگرێ، بەڵام هیچ فایدەی نەبوو. بۆیە گەنجاڵیخانی[1] برای ناردە سەری و ئەویش دەوری قەڵای دمدمی دا. هەموو ڕۆژێ ڕاسپاردەی فیشەکان ئەوبەرەوبەرەکێنیان دەکرد. چونکە قەڵاکە شانی وە ناوچەکانی خێڵنشین داوە، ئاژاوەگێڕانی سەر سنووریش لەبەر دەمارگرژی و دوژمنایەتی چوونە هانای تەمرخان و شەڕ و کێشەیەکی گەورەیان نایەوە و گەنجاڵیخان بە ناچار هیوای بە گرتنی قەڵاکە نەما و داوای یارمەتی لە کاکی کرد.

کەڵباڵیخان هەر کە چۆنیەتی ڕەوتی ڕووداوەکانی بە گوێی ئاشنا کرا، کۆمەڵێک لاوی پەنجە بە خوێن و ڕقئەستووری ئەفشاری لەگەڵ خۆی هەڵگرت و ڕووی کردە دمدم. بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەیشتە پای قەڵا و دوای دیتنی باروبۆخ و بەرزی و سەختی شوورەی دمدم، سوورمداڵی ورەی پتەوی بە ئامانجی گرتنی بورجەکانی ئەو قەڵا قایمە باڵی ئەنگاوت و لە ڕاست و چەپەوە پەلاماری کلاوقووچەی سوولق و بووزلق درا و هەرتک تەنیشتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا بەرەیان لێتەندرا. چەکدارانی شەڕانی وەختایەک ئەم دیمەنەیان بینی بۆ

---

1 - گەنجعەلی، بەپێی چێشکەی زمانی کوردی بۆتە گەنجالی. نموونەی دیکە زۆرن وەکوو: حاجیعەلیکەند - حاجیالیکەند، دووستعەلی - دۆستالی، دەروێشعەلی - دەروێشالی کە هەموو ناوی گوندانن لە کوردستان.

بەربەرەکانی لە حەوشە دەرکەوتن و هەتا ئاوپەڕین بە تـەقوتـۆقی فیـشەکان ئاورگی شەڕ هەر نێڵ درا. بەڵام گەلێک لە چەکدارانی کـورد کەوتنـە بـەردەمی تیخی دەمنەپارێزی بوێرانی ئەفشار و شکستەیان گەڕانەوە قـەڵا. بـۆ سـبەینێ سەرلەنوێ کۆمەڵی ئەفشار بـە ئامـاژەی کەلبالـیخـانی نـاودار ڕێزاوڕێـز و شانبەشان هێرشیان بردەوە سەر دیواری دەمدەم. بـەڵام قەڵانـشینان لـە ترسـی زەبری خەزاکـەرانی چوسـت و چـالاک نـەیانوێرا بێنـە مەیـدان و لــە قـەڵا دەرنەکەوتن و لە سەر بانی بورجان و لێواری شوورانەوە بەرەتۆپ و تفـەنگیان بە سەردا باراندن و کەلبالیخان زانی کە تازە شەڕفرۆشان ئاوێرن لێیان بچنـە پێش. شەو سەرکردەکانی ئەفشاری بانگهێـشت و بـڕیاری لێـدانی مەتـەرێز و داکوتانی سیپەی دا. بۆ بەیانی تەواوی قۆشەن کەوتنە کۆکردنەوەی کەرەسـەی پێویستی سەنگەر دابەستن و خەندەک لێدان. چـەنـد ڕۆژێک ئــاوا تێپـەڕی و ئاخرییەکەی کەلبالیخان وەک دەڵێن حاکمـان شـتیان بـە دڵـیدا دێ، بـیر و تەگبیرێکی کەوتە مێشکی و دەستووری دا کە پەسترێک دابەستن و سـێ شـەو و ڕۆژان تفاقی بدەنێ و نەهێڵن ئاو بخواتەوە و ڕۆژی چـوارەم بەریـدەن بەڵـکوو لەبەر توونیایەتی بۆنی کەرێز و ڕەوگەی ئاوی سوولقی وەبەر لووتی بکـەوێ؛ چونکە ئەوانەی لە دەرەوە بوون پێیان نەدەزانی و وەبەرچاویان نەدەهات. خـان گوتی ئەگەر شوێنی ئاوەکە وەدەرکەوێ دەکـرێ کـونی تێبکـرێ و قەڵانـشینان لەبری ئاو تاڵاوی ناخۆشی مەرگیان بە گەروودا بکرێ.

بـەکورتی دوای ڕاپەڕانـدنی فـەرمانی خـان، پەسـتری بەسـتەزمانیان دەرکێشا و بە دەورەی قەڵادا گێڕایان. خوداوڕاستان وەختایەک گەیشتە نیزیـک گومبەزی سوولق کە بە شانی باشووردا دادەکشایە ڕێکی زەوی، بە ئاژوانی ئاوی کەرێزەی زانی و لە توونیان کردی بە کۆڕژن و چەپۆکان و سمکوت. لەڕێوە بـە حوکمی کەلبالیخان کەرێزکەنانی شارەزا بە دەمی قولینگ وەرگەڕانێ و شانیان لێداخست و شـوێنەکەیان کۆڵـی و ڕەوگـەی ئاوەکـەیان دیتـــەوە و چـەنـــد

خاڵواریکیان نەوت هێنا و تێیان ڕشت و حەوزەکە وەسەر نەوت گەڕا. سەرەڕای ئەمەش گەمارۆدراوان بەناچاری چەند ڕۆژێکی پێ حاوانەوە و کۆڵیان نەدا. بەڵام سەرەنجام لەبەر بێئاوی و لە ترسی گیانیان کردیانە هاوار و لیللا و داوای بەخشین و پەنادرانیان کرد. بەناچار شێخ و مەلا و کەیخوادایانی شەرفرۆشان قورئانیان هێنایە تکایە و هاتنە لای کەلبالی‌خان. ئەویش خاتری گرتن و چاوی لێ پۆشین بەو مەرجەی کە ئەمرخان وێڕای کەس‌وکار و دەست‌وپێوەندەکانی بە داری‌دەستی وەردەکەون و تۆپ و تفەنگ و کەلوپەل و ئامراز و بارگە و بنەیان لە قەڵا بەجێ‌بێڵن و ڕووحیان دەرباز بکەن. قەڵانشینان ڕەزامەندییان نواند و سپاس و پێزانینی خۆیان دەربڕی.

بۆیە لە مەودای شەودا قەرموڵەکان دەورەی قەڵایان بەرنەدا و پاراستیان و هەر کە ڕۆژهەڵات دەروازەی قەڵایان کردەوە و شەرفرۆشان ناهومێد و خەساربار و بە دەستی بەتاڵ لە قەڵا دەرکەوتن و هەر یەکەی ڕووی کردە قوژبنێک. ڕووداوی سەیر ئەمە بوو کە لە جەنگەی شەودا نیزیک ۸٦ کچ و تازەبووکی ئاژاوەگێڕان، لە ترسی ئەگەری دەستدرێژی و ئەتککران و بێناموسی خۆیان لەسەر کلاوقووچە و شوورەی بەرزی قەڵاوە هەڵداشتبوویە دۆڵێکی قووڵ و مردبوون!

بەکورتی کەلبالی‌خان دوای گرتنی قەڵا، ماوەی حەوت ڕۆژان لەوێ مایەوە و ماڵ و خەنیمەتی قەڵانشینانی بە سەر غەزاکەراندا بەش کرد و هەر کەسەی شتێکی دایە. پاشان چەند کەسێکی ڕاسپارد بۆ تێکدان و ڕووخاندنی دەمدم و شاد و بەکەیف و سەرکەوتە گەڕایەوە ئاوەندی دەسەڵاتی. لەبەرەوەی وارش و دیواری قەڵای کۆنی ورمێ لە ساڵانی پێشوورا دەستی کردبوو بە دارمان و جمین و ڕوخساری ئاوەدانیی بە ڕووکارییەوە نەمابوو، خانی حوکمدار بۆ پاراستنی ناوبانگ و شەرەفی خێڵ و خانەدان، فەرمانی دانانەوە و هەراوکردنەوەی حەساری دەورەی شاری دا. هەر بۆیە ئژیاروانانی لێزان

گەلالەی کارەکەیان دارشت و وەستاکارانی شارەزا لێی‌وەخۆ کەوتن و بە مشوورخۆری و سەرپێوەئێشاندنی خان، لە ماوەیەکی کەمدا دیوارێکی قایمیان ساز کرد کە بریتی بوو لە چەند کلاوقووچە و حەوت دەروازە و خەندەکێکی پانیش دەورەی دابوو. نووسەر دەڵێ هەتا ئێستا چەندجارێک قەلای ورمێ رووخاوە و هەموو جارێک پوولێکی زۆری لە دیوانی بالاوە بۆ تەرخان کراوە و کەلتەیان کردۆتەوە و ئێستاش لە هێندێک جێیان شوێنەوارێکی ماوە و دەریدەخا کە ئەو شوورەیەی پێشوو چەند قایمتر بووە. بەکورتی کاتێک حەوشەی دەوری قەلا کۆتایی پێهات، سەرۆکانی ئەفشار هەر کەس بەپێی توانستی خۆی خانووبەرەی تەرز و چاک و باخ و بێستانی بەرفرەوانی لە گەرەکەکانی شار بۆ نیشتەجێبوون و دەست بە سەردا گرتنی زەوی بنیات نا.

## هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان ئێران و عوسمانی و ڕاسپێردرانی کەلبالی‌خانی ئەفشار بۆ بەرەنگاری

لێرەدا دەبێ ئەمە بزانین کە ساڵی ١٠٤٣ی کۆچی مانگی/١٦٣٣ی زایینی، سەرکردەکانی سەرسنووری عوسمانی و دیاربەکر، لە نێوان دەوڵەتی ئێران و عوسمانی‌دا کەتن و ئاژاوەیان دەنایەوە. میرانی هەکاری بە بیستنی ئەم هەواڵانە بە مەبەستی پشتیوانی لە دەوڵەتی گەورەی ئێران نامەیان نووسی بۆ شاسەفی و ئەوەیان دا بیزوێ و قەڵای «وان» بگرێ، هەر بۆیە سپاسالارێک لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرک و خزمەتە ڕاسپێردرا.

مورتەزاقولی‌پاشا کە بەگلەربەگی دیاربەکر بوو وێڕای لەشکرێکی زۆر چوو بە هانای حاکمی «وان»ەوە. خەلیل‌پاشای بەگلەربەگی «ئەرزەڕۆم»یش پاڵی وێدا و بە پەنجاهەزار کەسەوە چوونە بەرپەرچدانەوەی سپاسالاری ئێران لە ڕووکاری شاری وان. شاسەفی پێی‌زانی و تۆماسب‌قولی‌خانی قاجاری بەگلەربەگی ئێرەوانی وێڕای کەلبالی‌خانی ئەفشاری حاکمی ورمێ و ئاغورلووخانی ئیشیک‌ئاقاسی[1] بارەگای لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە ڕاسپاردن کە بڕۆنە یاریدەی سپاسالار. بەڵام بەرلەوەی ئەوان بگەنێ، هێزەکانی عوسمانی وێڕای مورتەزاقولی‌پاشا و خەلیل‌پاشا گەیبوونێ و قۆشەنی قزلباش دەستی لە گەمارۆ کێشابۆوە و چاوەڕوانی کۆمەک و یاریدەر بوو. لەبەرەوەی لەشکرچی عوسمانی زۆریان خۆ هەڵدەکێشا و بە ئازایەتی دەنازین، قۆشەنی قزلباش چاوەڕوانی یارمەتی نەمانەوە و کەوتنە تێکهەڵچوون. ماوەی دوو ڕۆژان شەڕی

---

[1] - سەرۆکی ڕاپەڕاندنی کاروباری بارەگای میری لە سەردەمی سەفەوی‌دا.

بیاوانەیان کردن و چەکدارێکی زۆری عوسمانی لە خۆڵی نەمان گەوزان و بەناچار رایانکردەوە نێو شوورەی قەڵا و گەمارۆدران. سپای قزلباش سەرقاڵی گرتنی قەڵا بوون کە لەشکری عوسمانی بیستیان ئێستا هێزی یارمەتیدەری ئێرانی بەڕێوەن و دێنە هانای سەرسووران؛ بۆیە خێرایەکی لە «وان» دەرپەڕین و تێکڕا ڕەوین. پاشان سپاسالاری ئێران کەوتە دەورەدان و گرتنی قەڵای «قۆتوور»ی سەر بە «خۆی» کە هی کوردەکانی «مەحموودی» بوو. لەوێ ۱۵۰ سەر خێزانی دانیشتووی قەڵاکەی کۆچپێدا و لە مەڵبەندی دیاربەکر و «ئەخلات»ەوە گەڕایەوە دەرگانەی شاسەفی. کەلبالیخانیش وێڕای سوارانی ئەفشار گەڕایەوە ورمێی ناوەندی دەسەڵاتی و کەوتەوە ڕێکوپێک کردن و بەدیهێنانی تەناهی سەرسنووران. هەتا ڕۆژایەکی کە دوای هەشت ساڵ حکوومەت ئاخرییەکەی خێڵی ئەجەلی بێگەڕانەوە ومبەر شەپۆلی خۆی دا و لەم کاولاشە رووخەکەوە رووی کردە جیهانی هەرمان. کەلبالیخان شێست ساڵ یان شتێک زیاتر تەمەنی بڕی کرد و قۆناخەکانی ژیانی هەڵبوارد.

پاش کۆچیدوایی کەلبالیخان، گەنجالیخانی برای پشتی سەبری لەبەر بارگرانی دابڕانی پایەبەرزێکی ئەوتۆ شکا و بە دڵێکی بریندار لە کۆڕی ماتەمین و پرسەیدا ڕۆنیشت. تیرە و تۆرەمەکانی ئەفشار و بنەماڵەی حوکمداری ناودار لەم نەهامەتییە گەورەدا کەوتنە شین و شەپۆڕ و گریان و لە خۆدان و بە سەری نینۆکان تەلی تاری سینەیان ڕنین. هەر بەڕاستی خان بۆ زەبروزەنگ و ڕدان و مەردازایی و کارزانی لە خزمان و هاوشانەکانی تێپەڕاندبوو. لە هەرەتی لاوەتیڕا هەتا کۆتایی ژیان گەلێک خزمەتی شایان و ئازایەتی بێوێنەی دەنواند و هەنگاوی بەجێی هەڵدێناوە. زۆربەی ڕۆژانی ژیانی لە شەڕ و بەرەنگاریدا تێپەڕ کرد و خوانی زینی بە جێی حەسانەوە دەزانی. سەردەمی دەسەلاتی ئەو لە ورمێ [کوردانی] ئاژاوەگێڕ وەها تەزێندرابوون کە سەرۆک

عەشیرەتەکان لە زارکی «هەکاری»را هەتا سنووری لاجان[1] بڕستی جووڵانەوەیان لێبڕابوو. لە ڕاستیدا باڵەپڕژەیان دەکرد و لە چەند ناوچەیەکی گەرمەسێر بڵاو ببوونەوە. وەک پێشتر باسی کرا یەک لە شوێنەوارە گرینگ و بەرچاوەکانی شووڕەی ئێستای دەورەی شاری ورمێ و یەکی تر هەڵبەستنی بەندی «شاراجۆ»یە کە شەقەجۆیەکی دەچێتە قەڵایە و لقێکی بە گوندەکانی بەکەشلوودا تێدەپەڕێ و دەڕژێتە گۆلی ورمێ. ئێستاش هێندێک نەوە و نەتیژە و تایفەی لەوێ ماون و بە بەرەبابی گەنجالیخانی ناسراون.

[1] - لە دەقەکە نووسراوە لایجان.

# حکوومەتی گەنجالیخان و شەڕی دووبارە لەگەڵ ئاژاوەگێڕان

وەختایەک هەواڵی کۆچیدوایی کەلبالیخانی خودالێخۆشبوو بە خزمەت گەورەبەرپرسانی دەوڵەتی شاسەفی سەفەوی ڕاگەیەندرا، گەنجالیخان حکوومەتی ورمێی بۆ لە قاقەز کرا و لە جێی کاکی ناوداری داندرا و هەروەکوو وی بو ئاوەدان کردنەوەی وڵات و دڵدانەوەی خێڵ و خەڵک زۆری هەوڵ دا. لەم سەروبەندەدا سەرانی ئاژاوەگێڕان و گێرەشێوێنانی عەشیرەتان کە ماوەیەک لە ترسی کەلبالیخانی خوابەخشیو لە کەلێن و قوژبنان خزیبوون، بە بیستنی نەمانی خان وەکوو جرجانەوەر هارووژان و یەکدڵ و یەکزمان بۆ تۆڵەئەستاندنەوە و ڕقڕشتن بە ئەفشاران یەکترگیر بوون و تەلاقیان خوارد ئەگەر بۆیان بکرێ جووقەواریان لێبرن و نەهێڵن هیچکەس لەم تایفە ناودارە بە زیندیسەر لەو مەڵبەندە بمێنێ.

جا بۆیە کۆمەڵێکی زۆر و زەوەندی سوارە و پیادەی ناوچەکانی سۆما، برادۆست، دەشت، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ و بەردەسوور داوەرین و لێکهالان و بەرەو قەلای ورمێ وەڕێکەوتن. هەر گوندێکی وەبەریان هات دەستیان لێنەپاراست و کەوتنە تالان و داڕووتاندنی و لە کوشتار و ئاکاری نالەبار نەسلەمینەوە و ترس و سامێکی لە ڕادەبەدەر کەوتە دڵ و دەروونی دانیشتووانی ورمێ.

کاتێک گەنجالیخان بەم کێشە لەنەکاوەی زانی، لە ماوەی چەند ڕۆژاندا سپای کۆکردەوە و شان بە شانی خەزاکەرانی ڕقەوەن و پاڵەوانانی زرێپۆشی ئەفشار کە ماوەیەک لە شەڕ و گرمە و هەرا دوور کەوتبوونەوە و بە ئاسوودەیی

پاڵیان دابـۆوە، بەهەشـتاو رووی کـردە بـەرەنگاری. لـە دەوروبـەری ورمـێ هێزەکانیان تێکهەڵچوون و شەڕێکی قورس قەوما. هەردک لا بـە چـەکوچـۆڵان لێکتر وەخۆکەوتن و بەراستی ئازایەتی و دەستوبردیـان نوانـد. دوای بگـرە و بـەردە و تێکۆشانێکی زۆر، بـە یاریـدەی خوداوەنـدی گـەورە خێـڵی ئەفـشار سەرکەوت و ئاژاوەگێران بـــەزین و گـەوزین و گـــەلێکیان وەبـەر لەپەشـیر و بەرەتفەنگی خەزاکەران کـەوتن. ئەوانــەش کـە دەرچووبـوون چەشـنی پـۆلی مێشوولان کە لەبەر هووهووی گژەبا خۆیان بۆ راناگیرێ و دەرەوون، رایانکرد و دەسکەوتێکی زۆریان بۆ خێلی ئەفشار بەجێهێشت. پـاشان گەنجالیخـان بـــە شان و شەوکەتی بێسنوور و زاڵ و سەرکەوتە گەرایەوە ناوەنــدی دەسـەڵاتی و ماوەی شەشحەوت ساڵێک بەبێ شەڕ و کێشە و بەوپەڕی سەربەستی حکوومەتی کرد. هەتا ئاخرییەکەی چارەنووس تۆمـاری تەمـەنی پێچایــەوە و نەغدینــەی گەنجخانەی ژیانی دایە دەس خەزێنەداری نەمان. دەڵێن ئەو خوابەخـشیوە لـە زانستەکانی سەردەمی خۆیدا پیاوێکی سەرتۆپ و شارەزا بووە و لەگەڵ زانایان هەسـتاوە و دانیـشتووە و خـاتری گرتـوون. لـە دادپـەروەری و لاواندنــەوەی جەماوەردا مەنشوور بووە و بە چاکە ناوبانگی رۆیشتووە. عــەولادی نێرینــەی بریتی بوون لە محەممەدعیسابەگ و شاوێردیبەگ.

## حکوومەتی محەممەدعیساخان

سالی ١٠٥٢ی کۆچی/١٦٤٢ ـ ١٦٤٣ی زایینی، دوای نەمانی گەنجالیخان، حوکمی حوکمداریێتی ورمێ بە فەرمانی سولتان محەممەدمیرزا ناسراو بە شاعەباسی دووەم، پاشای ئەو کاتی ئێران بۆ محەممەدعیسابەگی کوڕی گەنجالیخان نووسرا. ناوبراو چۆن شیاوە ئاوای خەلات و کاغەزی دەسەلاتداری وەرگرت و ئایە سەر سەر و سەر چاوی و لە بان تەختی دەسەلات پالی داوە. چەند سالێک بەوپەڕی سەربەستی کەوتە بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەت و پێراگەیشت و خەلکی ورمێی بە تورک و تاجیک و دەولەمەند و هەژارەوە لە هەلسوکەوتی بەجێوڕێی خۆی ڕازی کرد، هەتا سەرەنجام ئەویش کەوتە شوێن ڕێبوارانی پێشووی ڕێگای نەمان.

## گەنجالی‌خانی دووەم و سازبوونی دووبەرەکی نێوان تیرە و تایفەکانی ئەفشار و حکوومەتی سیلسپوورخان

پاش کۆچی‌دوایی محەممەدعیساخان، ماوەیەک شاوێردی‌خانی برای بە سەر حکوومەتی ورمێ رادەگەیشت. چونکە گەنجالی‌خانی دووەمی تەمەن کالی مێرمنال هێشتا شیاوی ئەرکێکی ئاوا گرینگ نەبوو، ناکۆکی و دووبەرەکایەتی گەورە خێلی گرتەوە و کاروبار گرێ و کۆسپی بەرچاو ڕێی لێ‌تەنین. سەرەنجام سەرۆکان و پیاوماقوولانی ئەفشار بە کاغەزێک چۆنیەتی باروبۆخەکەیان بە خزمەت بارەگای شاعەبباسی دووەم ڕاگەیاند. بە تەگبیر و ڕای مەزنانی دەوڵەت، جڵەوی دەسەڵات ئەسپاردەی دەستی گەنجالی‌خان کرا هەتا بە هاوکاری و ڕاوێژی جانی‌خانی ئەفشار بتوانێ ئەم ئەرکە گرینگە ڕاپەڕێنێ.

ناوبراو بەپێی فەرمان ماوەیەک کەوتە ڕێکخستنی کاروباری سنوور و مەڵبەندان و ئەوەندەی لێی‌دەوەشاوە چاوەدێری خێڵ و خەڵکی دەکرد. بەڵام سەرەنجام لەبەر سرشتی نالەباری دەرگای زوڵم و زۆرەملی بە ڕووی ئەفشاران‌دا کردەوە و ڕێگای دەربڕینی هەر چەشنە دەنگ و هاوارێکی بەست و دادی کەسی نەدا و وای لێهات کە مەزنەمەلاکانی مەڵبەند و پیاوانی کەیخودای باوەڕپێکراو وەزاڵە هاتن و گەلێک سکالایان خستە بەردەستی گەورەگەورەکانی دەوڵەت. لەسەر تکا و داوای ئەوان سیلسپوورخانی سەرداری [کوردی] جەلالی کرایە حوکمداری هەرێمەکە و پاراستنی کەوشەن و دڵدانەوەی جەماوەری خرایە سەر شانی. ئەم هەڵکەوتە دەگەڕێتەوە بۆ ١٠٧٧ی کۆچی/١٦٦٦ی زایینی، ساڵی کۆچی‌دوایی شاعەبباسی دووەم. بەکورتی سیلسپوورخانی سەردار لەسەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ پاڵی داوە و کاروباری کەوشەن و مەڵبەندی تەواو ڕێکخست هەتا وەختایەکی کە ساڵی ١٠٨٨ی کۆچی/١٦٧٧ ـ ١٦٧٨ی زایینی داهات و ئامانەتی ژیانی دایە دەست ڕاسپێراوانی چارەنووس.

❖❖❖❖

## ئیمامویردی‌خان و فەزلعەلی‌خانی ئەفشاری ئیمانلوو

ئیمامویردی‌خانی ئەفشار دوای نـەمـانی سیلسپوورخان لـە لایـەن شاسولەیمانی سەفەوی‌را کرایە بەرپرسی کاروباری حکوومەتی ورمێ. با لـە چاوان ون نەبێ و دیزە بە دەرخۆنە نەکرێ کە ئەم سیلسپوورخانە لە عەشیرەتی [کوردە] جەلالییەکانی رۆم بوو. جا هەروەک پێشتر لە باسی گیرانی قەڵای دمدمی ورمێدا قامکی لەسـەر دانـدرا، سـەردەمی شاعەبباسـی گـەورە لـە دەوڵـەتی عوسمانی هەڵدەگەڕێنەوە و دەیدەنە پاڵ دەوڵەتی ئێران. پاشـان لـە سـەرۆکی خۆیان هەڵدەتەزنەوە و دەبنە دوو دەستە و یەکیان دەچنەوە خاکی رۆم و ئەوی دیکەیان لە ئازەربایجان بنەگر دەبن. سیلسپوور بە تورکی عوسمانی بەو کەسە دەڵێن کە زبڵوزاڵ کۆ دەکاتەوە و جێگایەک گەسک لێدەدا. کەوایە بەم تێبینییـە سیلسپوور پاشناوە نەک ناو.

لەبەروەی ئەو عەشـیرەتە بـە خودبەسـەری و ملـهوڕی دەرکـەوتوون و هەمیشە خەریکی تاڵانوبڕۆی ماڵ و سامانی خەڵک بوون، ناویان بـە جـەلالی[1] رۆیشتووە.

هەر چۆنێک بێ وەختایەک ئیمامویردی‌خـانی ئەفـشار پـاش ماوەیـەک دەسەڵاتداری ماڵاوایی لە ژیان کرد و کاولاشی رووخەکی بەرەو جیهانی هەرمان بەجێهێشت، هەوساری حکوومەتی ورمێ درایە دەست فەزلعەلی‌خانی ئەفشاری ئیمانلوو. ئەویش لە رۆژگاری دەسەڵاتی شاسولتان‌حوسـێنی سـەفەوی کـوڕی شاسولەیمانی خوابەخشیودا کۆچی‌دوایی کرد و پاش ئەو سوبحانویردی‌خـانی ئەفشار لەسەر کورسی حکوومەتی ورمێ رۆنیشت.

---

1 - لێکدانەوەیەکی بـێ‌بنەمایـە و لـە هـیچ فەرهـەنگێکی بەردەست و بـاوەڕپێکراودا «جەلالی» بە تالانچی مانای لێنەدراوەتەوە. وشەی جەلال بە مانای شان و شـەوکەت و پایەبەرزی و کۆنەساڵی و شاردزایی هاتووە.. ئاشکراشە کە جـەلالی دەچنـەوە سـەر سەرۆکێکی سەرناسی کورد بە ناوی جەلال....

## باسی حکوومەتی سوبحانوێردیخان؛ درەوشانەوەی خودادبەگ و شەڕی «ئاوەگەرم»

دەبێ ئەوەی بزانین کە محەممەدخانبەگی قاسملوو لە تۆرەمە و بەرەبابی قاسمبەگی سەرۆکی هەرەگەورەی ئەفشاری قاسملوو بوو. محەممەدخانبەگ بە پیاوێکی لێوەشاوەی کارزان و مەرد و ڕەندی دیار و بەرچاوی نێو کۆمەڵانی خەڵک دەناسرا. دوو کوڕی هەبوو فەتحعەلیبەگ و خودادبەگ کە ئەمەیان هەر لە تافی لاوەتیڕا شوێنەواری شەوکەت و ئازایەتی بە نێوچاوانییەوە دەدرەوشا. ڕۆژێکی کە بە هەڵکەوت محەممەدخانبەگ وێڕای خودادادی کوڕە گەورەی دەچوونە خزمەت سوبحانوێردیخان، دەرکەوانی حکوومەتی بەرێیگرتن و نەیهێشت وەژوور کەون و ئاخرییەکەی دەمەقرەیان لێپەیدا بوو. خودادبەگ غیرەتی بزووت و خۆی بۆ ڕانەگیرا و هەڵیکێشایە خەنجەری ئەفشاری و داگڕایە کابرای دەرکەوان و کوشتی. هەرا و زەنازەنا لە نێو کۆمەڵی خزمەتکارانی حکوومەتیدا باڵی ئەنگاوت و خێرایەکی بە ئاماژەی بەرپرسان خودادبەگیان گرت و بردیانە خزمەت سوبحانوێردیخان و ئەویش لەبەر گەنجی و چاونەترسی هیچی لێنەکرد و بە ڕاوێژی هەموو لایەک سزای نەدا، چونکە سەرهەڵدانی ئاژاوەی تایفەی ئەوانی بێدانەدەمرکا! بۆ بەرژەوەندی ڕۆژگار قەڵەمی بەخشینی بە سەر پیاوکوژی ئەوا کێشا و کەسوکار و خوێنکرانی بە خوێنبایی و چاکە و خەڵات ڕازی کرد. وا داندرا کە خودی محەممەدخانبەگ ببێتە بریکاری حکوومەت و بە سەر کاروباری خێڵ و جەماوەر ڕابگا و خودادبەگی کوڕیشی بچێتە نێو لیزگەی خزمەتکارانەوە. لەم سەردەمەدا کە بۆتە ساڵی ١١٠٥ی کۆچی/١٦٩٣ی زایینی، شاسولەیمانی سەفەوی پاش ٢٨

سالێک پادشایەتی، بەوپەڕی ئاسوودەیی و کامەرانییەوە لەو ئیسفەهانەی کە دەتکوت بەهەشتە، مالاوایی لە ژیان کرد و بە شەنگەشەنگ بەرەو بەهەشت رۆیی. شاسولتانحوسێنی کوڕە گەورەی بە تەگبیر و رای ئەمیران بەتایبەت شاقولیخانی کوڕی خودالێخۆشبوو شێخالیخانی[1] زەنگەنە کە باوکی وەزیرێکی بەمشوور و خێرخواز و شارەزای شاسولەیمان بوو کرایە فەرمانڕەوا.

بەکورتی وەختایەک خودادبەگ چووە نێو ریزی کاربەدەستانی حکوومەتی، سەرلەنوێ تاقمێک لە ئاژاوەگێڕانی سەرسنوور دەستیان کردەوە بە هێرش و پەلامار و چەند گوندێکیان وەبەر خۆیان دا. ئەم تاقمە بە تۆڵەی رۆژگارانی پێشوو و بە دەرفەتهێنان لە گۆڕانی فەرمانڕەوا و کزی و لاوازی دامودەزگای حکوومەتی شاسولتانحوسێن لە ناوچەی ئەنزەل کە نیزیکە لە مەلبەندی سۆما و برادۆست، ملیان نا لە خراپە و کوشتار و تالان و زولم و زۆرەملی. وای لێهات کە رێگاوبانی کەلی قوشچی و قولنجی کە رەوگەی بازرگانان و کاروانچییانە گیرا و بەجارێک شوێنەواری هێمنایەتی و تەناهی بۆ خەلکی چارەرەش بنەی هات. کاتێک ئەم هەوالانە بە گوێی سوبحانوێردیخانی حوکمداری ورمێ و غەزاکەرانی ئەفشار گەیشتنەوە، کۆمەلێک پیاوی ئازا و سەرکردەیان ناردنە بەرەنگاربوونەوەیان. سەرکردەکان هەر کە گەیشتن و چاویان بە کۆمەلی زەوەندی شەڕفرۆشان کەوت و لە ئاوێنەی بیر و خەیالی خۆیان ڕوانی، زانیان سەرناکەون، جا بۆیە لەڕێوە داوای کۆمەگیان لە سوبحانوێردیخان کرد. خانی حوکمدار لەڕێوە خودادبەگی وێڕای دەستەیەک لە شێرەمەردان ناردە هانایان کە خۆی پیاوانە راپەڕاندنی ئەم خزمەتەی وەئەستۆ گرتبوو. خوداداد هەر ئەو رۆژە چەشنی برووسکە و با رێی داگرت و فڕی. لای بانگیشێوان گەیشتە سپای ئەفشار و بەیانی خەبەر هات کە هێزی

---

1 - «شێخ عەلیخان»ە و لە کوردیدا بۆتە شێخالیخان. شێخالی دێیەکە سەر بە شاری مەهاباد و دەولەت بە «شێخعەلی» ناوی دەبا.

بێسەرەوبنی ئاژاوەگێران لە لای «ئاوەگەرم» و «دێمەدەشت»ەوە بزووتوون و دێن. خودادابەگیش خێرایەکی هێزی خـۆی لە سان دا و بێڕاوەستان ســاز بـوو بـۆ شەڕ و بەربەرەکانی. لە دوڵێک‌دا کە بەردەبێتەوە سەر ئاوایی ئاوەگــەرم، ئــەو دوو دەریا لەشکرە گەرماوگەرم پێکیان‌دادا. شەڕخوازان هەنگاوی مەردانەیان نا و تفەنگچی چەشنی ئەستێرەی بەسامی بارلم دەسرێژیان دەکرد و فیشەک وەکـوو گلێرە دەباریـن. ئەو کات هەورەتریشقەی نەمان گورانـدنی و بریـسکەی بـەڵا و نەهامەتی خۆی نواند و گڕی شەڕ لە دەوروپشتی «ئاوەگەرم» بەرز بۆوە و بـای پێچەوانە لەو شوێنە هەڵیکردێ و ئاخرییەکەی ئەفشاران بەرگـەیان نـەگرت و خۆیان بۆ ڕانەگیرا و هەڵاتن.

خودادابەگی جوامێر بە دیتنی ئەم دیمەنە سەری سوڕما و ڕقی هەسـتا و بەناچار دەستی لە گیانی شۆرد و لەگـەڵ پۆلەسـوارێک ڕکێفـی بـەتاڵ کـرد و فەرمانی دا لێی‌دەن لە تەپڵ و زوڕنـا و خـۆی پیاوانـە پێـی‌نایـە مەیدانــەوە. خۆلاسەی کەلام ئەو شەنگەلاوە ناودارە بە پشتیوانی یەزدانی داوەر وەکی سەددی ئەسکەندەر بە خۆی و پۆلێک چەکدارەوە لە بەرامبـەریان‌دا چـەقی و بەڕاسـتی پاڵەوانەتی و ئازایـەتی نوانـد. ڕاکردووانـی ئەفـشار بـە دیتنـی خـۆڕاگری و بەربەرەکانی خودادای ناودار ورەیان وەبەر هاتەوە و بـە کۆمـەڵ گەڕانـەوە و هرووژمیان برد. بە کۆمەگی خودا ڕیزەکـانی قۆشـەنی ئاژاوەگێـڕان دەسـتیان لێکبەردا و تاقمێکیان کوژران و گیران و هێندێکیان نـەنگوان و بـەرەو بیابـانی چارەڕەشی ڕۆیشتن. خەزاکەرانی ئەفشار هــەتا چیمــەنی دۆرشــەکی سەڵـماس هەڵیانبڕین و بە دەسکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوە ورمێ.

سوبحانوێردی‌خان بە ڕوودانی ئەم سەرکەوتنە بەرچاوە گەلێک سوژدەی شوکر و سپاسی یەزدانی پاکی بەجێ‌هێنـا. خودادابـەگی بـە خـەڵاتی شـیاو و جلوبەرگی گرانبـایی لاوانـدەوە و هــەر کــەس چـۆنی لــێ‌دەومشــاوە ئـاوای بەســەرکردەوە و دوز کـاخــەزی نــووسین بــۆ گــەورەپیاوانی دەوڵــەتی

شاسولتانحوسێنی سەفەوی کە بریتی بوون لە سەرکەوتننامە و گێرانەوەی چۆنیەتی ڕووداوەکان. کاتێک نێردراوی سوبحانوێردیخان کاغەزی سەرکەوتننامەی لە ئیسفەهانی پایتەخت گەیاندە خزمەت شاسولتانحوسێنی سەفەوی و ئازایەتی و لێوەشاوەیی خودادبەگ بەو جۆرەی کە مافی خۆی بوو دەرکەوت، لەسەر داوا و تکای سەرۆکان و مەزنەپیاوانی دەسەلات فەرمانی پیرۆزی بۆ نووسرا و حکوومەتی ورمێی باربوو کرا و ڕاسپێرا خێرا بێتە ئیسفەهان هەتاکوو پاشا چاوی پێیبکەوێ و خەلاتی میرانەی بداتێ و بیلاوێنێتەوە. سوبحانوێردیخان دەستەوبەجێ خودادبەگی وێرای هێزێکی شیاو ناردە بارەگای بەرز. دوای بڕینی مەودای ڕێگا، وەختایەک خودادبەگ گەیشتە ژێرپێچکەی تەختی دەسەلات، تەوێلی نیازی بە زەویدا سوو، چاوی بە خاکی بەردەرگانەی فەرمانڕەوایەتی ڕشت و ڕوونی کردەوە. لە سایەی پەروەردگارەوە شان و شەوکەت و وریایی و گەشە و کارزانی ئەو لاوە وەبەر دلی میری پایەبەرز کەوت و خۆشی ویست و هەتاوی سیلەچاوی بەسەرکردنەوەی پاشایەتی تیشکی پێداپژاند. بۆیە لەڕێوە نازناوی بەرزی خانی و دەستێک جلوبەرگی ڕایەل زێڕین و شمشێرێکی گەوهەربەند و ئەسپێکی خۆشڕاژۆی عەرەبی لەگەل بەگلەربەگایەتی ئەفشاری خەلات کرد و لە نێو هاوشانەکانیدا سەری بەرز کردەوە و لە هەمووانی تێپەڕاند.

پاشان خودادخانی بەگلەربەگ لە بارگای پاشایەتی ئیزنی گەڕانەوەی خواست و ڕووی کردەوە لانەی شەرەف و بەختەوەری و ناوەندی دەسەلاتی کە ورمێ بێ. دەلێن خوداداد خەلاتێکە و خودا داویەتی بەم خێلە. ئەو یەکەم کەسە لە تیرەی ئەفشاری قاسملوو کە پلە و نازناوی بەگلەربەگایەتی ئەفشاری دراوەتێ.

❖❖❖❖

## حکوومەتی خودادادخان و ڕووداوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی

خودادادخانی بەگلەربەگ سالـی ١١١٩ای کـۆچی/١٧٠٧ ـ ١٧٠٨ای زایینـی، چووە سەر تـەختی دەسـەڵات و دەنگ و ئاوازەی دادەوانی و ڕاگـرتنی پارسەنگی نێو جەماوەری لە ماوەیەکی کورتا هەموو لایـەکی تەنییـەوە. بـۆ ئـاوەدانی و ڕێکوپێک کردنی کاروباری قەلەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی و پاراستنی سنووران زۆر چاک هەڵسوورا و سەروەشێنانی گلانـدن و لـەبنکـەوتووانی هەسـتاندنەوە و دەستی گرتن. لە کەوشەنی قەرەسووی سەلماسەوە هەتا سابڵاغی بە دەستەوە بوو. لەم ڕۆژگارەدا دامودەزگای فەرمانڕەوایەتی شاسولـتانحوسـێن بـە سـەر بێبڕستیدا کەوتبوو، ئـاژاوەی ئەفغانـەکانیش لـەوێ ڕاوەسـتێ. جـا بۆیـە بارودۆخی گشتیی وڵات [وەکوو نەبەگە] لەرزۆک و خۆنەگر بوو.

## شەڕی هۆزی بلباس و خۆکوژی خودادادخان

لـــەم سەروبەنـــــدەدا کـــە ئـــاوازەی لـــەرزۆکیی دەوڵـــەتی ئێـــران و شوولیَ‌هەڵکێشانی سەرکێشان لێرولەویَ دەنگی دەدایەوە، مەڵبەندی ورمیَ لە سایە سەری موبارەکی خودادادخانی بەگلەربەگەوە وەها هێور و هێمن و پارێزراو بوو کە هیچکەس نەیدەتوانی پیَ لە بەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشیَ. بێجگە لە هۆزی بلباسی لاجان کـە جاروبارێـک دەسـتیان دەگەیانـدە ناوچـەی «سـندووس» و «دۆڵ»ی ملکوماشی تیرەی قەرەنیلو ناسراو بە گۆندوزلوو. خانی بەگلەربـەگ دەیڕوانییە هەلومەرجی نالەبار و بۆشایی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێران و لە ڕووی بەرژەوەندییەوە خۆی نەدەدایە زەبروەشاندن و تۆڵەکردنەوە. بەڵام ڕق و قینـی ئەو هۆزە وردەوردە و بەپێی تێپەڕینی ڕۆژگار پتر لەسەر دڵی کەڵـەکە دەبـوو. خودادادخان لە هەلێک دەگەڕا و تەنیا ڕیَچارەی ڕەواندنەوەی ئەم گرێیـەی لـە نووکی تیر و نێزەی پیـاوانی ئـازادا دۆزییـەوە. بۆیـە وێـڕای قۆشـەنێک لـە خەزاکەرانی ڕقەوەن و شەڕکەرانی چەشنی دەریا کـەفچـەڕێن، کـە ماوەیـەک شمشێری خوێنخۆرەوەیان لە جیَخەوی کالاندا خەوتبوون و بە خوێنی دوژمنان تینوو بوون، تەپی دایە سەر تیرە و تۆرەمەکانی هۆزی بلباس و لە نیزیک چیای «قەندیل»ی لاجان وەکوو سێلاوی بەگوڕم و بەڵای لـەناکاو، کۆمەڵـەڕەشماڵ و خێوەتی تێکەوەپێچان و فەرمانی دا ئەوەندەی دەکریَ نێرموەزیان لیَببڕن یان بە دیلیان بگرن. هۆزی بلباس بە دیتنی شەپۆ لی بیَئامانی قۆشەنی ئەفشار تۆقین و سامیان ڕێنیشت و ئەگەرچی ئەوان زەبروەشێنانی دیار و بەرچاوی نێو هـۆز و عەشیرەتان بوون، بەڵام پەشۆکان و سـەریان لـیَشـێوا و بـەزین و گـەوزین.

کۆمەڵێکیان بەخسیر کران و ماڵ و سامانی بەلێشاو و مەڕ و مـاڵات و ئەسـپ و ماینی حدوودیان بوونە دەسکەوتی خـەزاکـەران. پـاشان زاڵ و سەرکـەوتـە و بە سام و شەوکەتی بێسنوورەوە گەڕانەوە.

بۆ سبەینێ لای ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتنە چیمەنی «دۆلامەلەر» کە چوار فرسەقێک لە شاری ورمێوە دوورە. دەسـتووری فـەرمـوو کـە تـاقمێکی کـەم ڕاوەستن و ماڵی تالانی و ئەسیرەکان دوابەدوای ئەوان ڕاگوێزنە شار. بۆخۆشی بەختیار و کامڕەوا زۆر بەپرتاو ڕووی کردەوە شار. ئیدی خەبـەری نـەبوو کـە هەزارمزیلەی بلباسان بە یارمەتی و کۆمەگی هێندێک لە عەشیرەتان کەوتوونـە شوێنیان و بۆ ڕزگار کردنی دیلەکان ئەسپیان تاو داوە. وەختایەک کە خـان بـۆ بەجێهێنانی نوێژی نیوەڕۆ و ئێوارە لە جێگایەک بە ناوی «ئەڵـلاهووئەکبەر» ڕکێفی بـەتاڵ فـەرموو بـوو، هـەواڵ هـات کـە دوای بزووتنـی خزمـەتکارانی بەڕێزیان، لەپـڕێ هـۆزی بـلباس گەیـشتوونە چیمـەنی «دۆلامەلـەر» و ئـەو پۆلەچەکدارەیان کوشـتوون و ماڵـی تـالانی و یەخـسیرەکانیان گێڕاونـەوە و گەڕاونەوە. بە بیستنی ئەم هەواڵە سامناکە بەگەڕبەگی بـوێر هۆشـی لەسـەر خۆی نەما و حاڵی گۆڕا و هەڵیکێشایە خەنجەری بەرپشتێندی و لە سینگی دا و وەهای داگرت کە لە مووغەرەی پشتی سەری وەدەرنا. غولامان و نیزیکـانی کـە پێیان وابوو لەسەر سوژدەیە، بە درێژبوونەوەی مەوداکـە واقیـان وڕمـا و کـە وردبوونەوە تەماشایان کرد مەلی ڕووحی بەرەو باغی بەهەشت فڕیوە. بە دیتنی ئەم دیمەنە پیاوانی بەرڕکێفی کەوتنە پەشۆکان و دڵەڕاوکەیەکی لە ڕادەبەدەر و گوتیان: «بەڕاستی شتێکی سەیرە!»[1] دەستیان کرد بە شین و گریـان و زایەڵـەی شەپۆریان گەیشتە گومبەزە شینەکانی گەردوون. خێرایەکی ئەم هەواڵە سامناکە نێردرا بۆ زانایانی دینی و پیاوماقووڵانی شار. لـــە خـزمـەتکـارانـــی دیـوان

[1] - « ان هذا لشیءٌ عجیب » قورئانی پیـرۆز. سوورەی هوود. ئـایـەی ٧٢، ل ٢٣٠. وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

میـــرزا ئەحمـــەدی وەزیـر و مـیرزا سـەعیدی سـندووقدار و مـیرزا هـەمزەی سەرحیسێبی باج و پیتاک بـەرۆکیان دادڕی و خاکیـان وەسـەر کـرد و بـەرەو «ئەڵلاهوونەکبەر» چوون. تەرمەکـەیان هێنایـەوە شـار و ڕۆژی ۲۰ی ڕەبیعـی دووەمی ساڵی ۱۱۳٤ی کۆچی/۷ی فێوریبیـەی ۱۷۲۲ی زایینـی پـاش شـۆران، لـە گۆرستانی «خان» کە دەڕوانێتە سەر «چواربورج» ناشتیان.

نیزیکـەی چاردەساڵـێک لـە ورمـێ حکوومـەتی کـردووە و بێجگـە لـە محەممەدقاسمخانی کورە گەورەی کە دایکی لە خانـەدانی ماقووڵـی «خەڵـەج» باراندێز[1] بووە، منداڵەکانی دیکەی دیار نین و ناویان تۆمار نەکراوە.

[1] - لە دەقەکەدا «باراندووز»ە، بەڵام وەکوو دیارە لە دەقی فۆلکلۆری کوردی و هێندێک سەرچاوەی فارسیشدا بە باراندێز هاتووە.

# حکوومەتی محەممەدقاسمخان

پاش ئەوەی گەورەپیاوانی ئەفشار لە سەرەخۆشی و تازیەداری خودادادخان بوونەوە، ساڵی ١١٣٤ی کۆچی/١٧٢١ــ ١٧٢٢ی زایینی، بە ئیزنی بەرپرسانی باڵای دەوڵەت، محەممەدقاسمخانی کوڕە گەورەیان لە جێی دانا. گەورە و بچووک سەریان وەبەر فەرمانی بکە و نەکەی هێنا. بەگلەرزادەش لەسەر ڕێوشوێنی باوکی ناوداری ڕۆیی و تەواوی جەماوەری مەڵبەندەکەی خستە ژێر باڵی چاکە و دادەوانی و هەمووی هیوادار و شوکرانەبژێر کردن. لەبەروەی حەساری شاری ورمێ لە دەورانی خوالێخۆشبوو کەلبالیخانی ناسراو بە شێرشکارەوە کۆتایی پێنەهاتبوو، فەرمووی تەواو بکرێ. خاوەنشکۆ شاتۆماسبی دووەم کە دوای گیرانی ئیسفەهان بە چنگ مەحموودی [ئەفغان] و کوژرانی پاشای بەهەشتەلان و هاڵۆزکانی کاروباری ئێران لە ئەردەوێڵ بنەی داگرتبوو، لەسەر داوا و تکای مەزنانی ئەفشار حوکمی بەگلەربەگایەتی بۆ نارده ورمێ.

لەم جەنگەدا کە کاروباری ناوەندی ئێران گیرۆدەی شێوان و پەرێشانی ببۆوە، دیسانیش شەڕفرۆشانی ئاژاوەگێری سەرسنوور ئاڵای دژایەتییان هەڵدا و ملیان نایەوە لە دوژمنایەتی. بۆ وێنە «قاسمخان»ناوێکی تایفەی چاپۆقلوو کە لەم سەردەمەدا حکوومەتی ورمێ بە دەسەڵاتداری ناوچەی ئەنزەلی دانابوو و لە گۆگرچینقەلا نیشتەجێ بوو، لە قاسمخانی بەگلەربەگ هەڵگەڕایەوە و بە چەکدارێکی زۆرەوە بە سەر قەڵای ورمێی دادا و کردی بە گرمە و هەرا. محەممەدقاسمخان لێبڕا کە بێونەبێ تۆخمی خەنیمی خۆماڵی

وشک بکا و خاشەی بکێشێ. بە هێزێکی قورس و گرانەوە لە قەلا دەرکەوت و لـە چیمەنی قەرەحەسەنلووی نێوفرسەخی شار تێکهەلـچوون رووی دا. ماوەیـەکی وای نەکێشا کە قاسمخان بەزی و رایکرد و حاکم فەرمانی دا بکەونە پەیکەردەی. قاسمخـانی خوێنگرتـوو بـە کەمەنـدی چـارەنووس گـیرا و برایـە بـەردەمی بەگلەربەگ و لەرێوە دەستووری کوژرانی درا. چونکە ئـەم رووداوە شـەوی ١٩ی مانگی سەفەری ساڵی ١١٣٨ی کۆچی/ ٢٧ی ئۆکتۆبری ١٧٢٥ی زایینی، بەرامبەری جێژنی نەورۆز قەوما، سەری قاسمخانی یاغییان بڕی و وەک جێژنانە ناردیانە ناوچەی ئەنزەل هەتا خەلک چاویان پێیبکەوێ و بترسێن و نـەوێرن شـووی لێهەلکێشن. ئەم سەرکەوتنە ئەوەنـدەی دیکـە شـەوکەت و هێـز و دەسـەلاتی قاسمخانی بەگلەربەگی پێهەلابرد و سامی وی رەدلی دوور و نیزیکان نیشت.

## لەشکرکێشانی یۆسفپاشا بۆ سەر ورمێ و کوشتنی محەممەدقاسمخان

دوای کوژرانی قاسمخانی چاپۆقلووی حاکمی ناوچەی ئەنزەل بە دەستی محەممەدقاسمخان، خزم و کەسوکاری ناوبراو تێکڕا بە مەبەستی سکاڵا و دادخوازی هاواریان بردە بەر ساروومستەفاپاشا کە لە سنووری ئازەربایجان ئاڵای دەسەڵاتی هەڵدابوو. لەوێ بەڵێنی پتەویان دایە کە کلیلی دەروازەکانی قەڵای ورمێی باربوو دەکەن و دنەیان دا بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لە محەممەدقاسمخانی حوکمدار و زۆریان وەبەرهەڵخوێند. ساروومستەفاپاشا بەپێی گفتی ئەوان، یۆسفپاشای مووسڵی وێڕای دەهەزار لەشکرچی ڕۆمی نارده سەر ورمێ. خان بە بیستنی ئەم هەواڵە تۆقی و بە مەبەستی پاراستنی ناموسی خاوخێزان، ماڵ و بارگە و بنەی خۆی و تاقمێک لە چاوناسانی مەڵبەندەکەی ڕاگواستن بۆ قەڵای گوندی باراندێز کە لە دوو فرسەخی شار بەوپەڕی قایمی خۆی دەنواند. پاشان لەگەڵ خەزاکەرانی ئەفشار خۆی دە دەسک نا بۆ بەربەرەکانی و مەیدانداری. کاتێک لە نیزیک بناوی ڕموزەی سێ فرسەخی ئەولاتری شار هێزەکان پێکتریان دادا و هێرشی بەیتاپەیتا قەوما، کۆمەڵی ئەفشاران کە هێندێکیان لەبەر کوشتنی قاسمخانی چاپۆقلوو و بەشێکیان لەبەر ڕاگواستنی کۆچ و بار بۆ باراندێز لە بەگەربەگ سارد ببوونەوە، بەربەرەکانییان نەکرد و دەستیان نەبزاوت و ئاخرییەکەی سەری جڵەویان لە مەیدانی شەڕ و لێکدان وەرگێڕا. خانی حوکمدار بە دیتنی هەڵوێستی ناشیاوی خێڵی ئەفشار، ناچار پاشەکشەی کرد و بە قوونەشەڕ خۆی گەیاندە قەڵاتی باراندێز و دەرگای لەسەر خۆی گاڵە دا. پاش ڕاکردنی بەگەربەگ، خزمەکانی قاسمخانی کوژراو، یۆسفپاشایان بردە نێو قەڵای ورمێ و لەسەر تەختی دەسەڵاتیان دانا. خۆشیان تێکڕا بوونە ئاڵقە بە گوێی ڕاپەراندنی فەرمانەکانی و لە خزمەتیدا دەستەونەزەر ڕاوەستان. پاش ئەوەی هەوساری جێبەجێ کردنی کاروباری گەورە و بچووک کەوتە چنگ یۆسفپاشا و لە ورمێ بە سەربەستی

پاڵی دایەوە، پیاوی ناردە باراندێز بۆ لای بەگەربەگ و بانگهێشتنی کرد و لێیڕاسپارد زەحمەت بکێشێ و تەشریف بێنێ بۆ قەڵا هەتا قەراروبڕییەک سەبارەت بە ئاشتی و پێکهاتن دابنێین و پەیمان و وەفایەک نوێ بکەینەوە. بەڵام لە دڵی خۆیدا دەیهەویست کە بەم فێڵوفرت و بیانووانە بەگەربەگ تێدابەرێ و مەڵبەندی ورمێ تەواو بخاتە ژێر دەسەڵاتی. بەگەربەگ لەبەروەی بڕوا و متمانەی بە یۆسفپاشا نەبوو، ملی نەدا و خۆی پاراست. سەرەنجام پاشا ئەفەندییەکی زمانلووسی وەک ڕاسپاردە ناردە خزمەت غولامانی دەرگای کە بۆ فێڵ و تەڵەکە شەیتانی زەمانە بوو. وەختایەک کابرای کەیخودا لە باراندێز بە خزمەت محەممەدقاسمخان گەیشت، پاش دەربڕین و ترکاندنی ڕاسپاردەی سەر شانی ئەوەندەی شێر و ڕێوی هێنانەوە و درۆ و دەلەسەی تێکخستنەوە هەتا ئاخرییەی وای لێکرد چ پێیخۆش بێ و چ پێیناخۆش بێ بچێتە لای یۆسفپاشا کە بەڕاستی گورگێک بوو لێی خەفتا بوو. بەڵێ چارەنووس بە چەشنێکی تر نووسرابوو، بۆیە وێڕای کابرای نێردراو و چەند کەسێک لە خزمەتکارانی پێینایە ڕکێف و وێکرا ڕوویان کردە قەڵا. لە مەودای ڕێیەدا بەگەربەگ لەسەر داوا و تکای پیاوەی ڕاسپاردە مامزەی لە کەلەکەی ئەسپی خۆشاژۆی ئەنگاوت و دەستی کرد بە باز و ڕمبازی و جلیتبازی. ئەفەندی بە چاوی وێژدانەوە لێیڕوانی و کاتێک دیتی کە بەڕاستی بۆ سوارچاکیش هەروەک شێوەی هەستان و ڕۆنیشتنی کەسێکی زیرەک و ئاقانە و بێوێنەی زەمانەیە، ڕوحمی بۆی بزووت. بۆیە سەرزارەکی بە گوێی دادا کە یۆسفپاشا نیازی پێچەوانەی هەیە و قسەی وای کردن کە بەڵکوو وەخۆ بێتەوە و وریا بێ. کەچی بەداخەوە وەکوو دەڵێن: «ئەگەر چارەنووسرا چاو دەنووسێ»، بەگەربەگ لە ئاماژەکانی نەگەیشت و سەری جڵەوی هەڵنەنگاوت و ڕۆیی.

بەکورتی لای ڕۆژاوابوون لە قەڵا وەژوور کەوت و چووە دیداری پاشا و ئەویش چۆن چاک و پێویستە ئاوای بە دەوریدا هات و دەستی ڕێزی لێنا و لاواندییەوە و شەوەخوانێکی شیاوی بۆ ڕازاندەوە و دوای خواردنی نان و

خواردنەوەی شەراب و حەسانەوە و خەو بە سەردا هاتن. حەوت کاتژمێر لە شەوی ٢٩ی مانگی سەفەر تێپەڕیبوو کە لە ژێر ڕووناکایی مەشخەڵی دیوەخاندا سەری چاوسووری خانەدانی قاسملوو بە دەمی شیری دەمنەپارێز بڕدرا و ناردی بۆ لای ساروومستەفاپاشا. بەیانی وەختایەک هەواڵی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە ناوچەکەی گرتەوە، ڕۆژی ڕووناک لەبەر چاوی جەماوەری ئەفشار بوو بە شەوی تار و خێڵی بەرزەجێ هاوار و ڕۆڕۆی لێهەستا. یۆسفپاشا بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی باروبۆخەکە محەممەدمووساخانی کوڕی بەگەربەگی مەزلوومی تەمەن کاڵ و مێرمناڵی کردە کەیخودای تیرەی قاسملوو. وەکوو شتێکی ڕواڵەتی بەگەربەگایەتی کردە باربووی قاسمخانی کوڕی عەلیمەردانخانی ئەفشار و عەلیوێردیبەگی گەنجالیخانیی بە بریکاری حکوومەت دانا. پاشان خۆی دایە دڵدانەوەی خەڵکی ناوچەکە و گەشە و نەشەی ژیانی خێڵ و جەماوەری وەبەرچاوی گرت و کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری حکوومەت.

دوای ئەوەی کە یۆسفپاشا هەر بە ناو کەیخودایەتی تیرەی قاسملووی ئەسپاردە چنگ محەممەدمووساخانی مێرمناڵ و هەوساری حکوومەتی نایە بەردەستی لێومشاوەی قاسمخانی کوڕی عەلیمەردانخان، محەممەدمووساخان لە قەڵای باراندێز ڕاگیر کرا. جا لەبەروەی ئەم پایەبەرزە لە دایکیڕا [کە کورد بوو] دەچۆوە سەر سەرۆکانی عەشیرەتی زەرزا، ئەوان بە بیستنی کوژرانی باوکی و زاڵبوونی یۆسفپاشا بەداخ و کەسەر بوون. هەر بۆیە پیاویان ناردە لای بەگەرزادە و لێیانڕاسپارد ئەگەر بێتوو بەرێزیان پێیخۆش بێ ئەوان وێڕای جەماوەرێکی زۆر و زەوەندی شنۆ دێنە سەر ورمێ و پەلاماری یۆسفپاشا دەدەن و بە دەستی زۆر لە قەڵایەی دەردەپەڕێنن و ئاڵای دەسەڵاتی سەرەونخوون دەکەن. بەگەربەگزادە چۆنیەتی کوژرانی باوکی بەناهەق کوژراوی و بێدەسەڵاتی خۆی بۆ عەشیرەتی زەرزا و هۆزی بلباس نووسی و داوای یارمەتی لێکردن. سەرۆکانی زەرزا و بلباس بە هێزێکی پەرداخەوە خۆیان گەیاندە قەڵای

باراندێز و چوونە پاڵ محەممەدمووساخان و وێڕای ئەو بەچکەشێرە لـە لانـی باراندێزەوە بەرەو قەڵاتی ورمێ جمین. یۆسف‌پاشاش بە خۆی و هەشـت‌هـەزار چەکداری ڕۆمییـەوە بـۆ شـەڕ و بـەرەنگاری دەرکـەوت و کاتێـک لـە داوێنـی «کێوەسیر»ی باشووری شار دوو دەریای لەشکران بەرەورووی یـەکتر هـەژان، شەڕێکی بەگەرمە دەستی پێکـرد و گڕەمـشقاڵی ئـاگری کوشـتار و بـەرەنگاری زەمانەی کێشا. بەیننەڵلا سوارانی بلباس و زەرزا لەو گێژاوە سامناکەدا ئەوپەڕی پیاوەتی و ئازایەتییان نواند و هـەردک لا کۆمەڵـێکی بـەرچاویان لـێ‌کـوژرا و بریندارێکی زۆریشیان کەوتە سەر دەسـتی. ئـاخرییەکەی ڕۆمـی خۆیـان بـۆ ڕانەگیرا و بە هەڵاتن و ڕاکەڕاکە گەڕانەوە حەساری شار. سوارانی بلباس و زەرزا هەتا نێزیک حەوشە هەڵیانبڕین و کەوتنە شوێنیان و لە پەنا بەندی «شاراجۆ»[1] دابەزین. یۆسف‌پاشا وەختایـەک زانـی گـەمارۆ دراوە و داهاتوویـەکی خـۆش چاوەڕوانی ناکا، بەناچار چەند پیاوماقووڵ و ڕیـش‌سـپی کـارزان و وشـیاری هەڵبژارد کە لە چاکە و خراپەی ڕۆژگار و بەرژەوەندی کارانیان دەزانی و ناردنی بۆ لای محەممەدمووساخان و سەرۆکانی زەرزا. کەیخوداکانی ڕاسپارد کە بـە پەند و ئامۆژگاری و گەڵی دەوڵەتخوازانە دنەیان بدەن بۆ ئاشتی و بیانگێڕنەوە. محەممەدمووساخان کاتێک ئـەم ڕاسـپاردانەی بـە گـوێ ئاشـنا کـرا، بـەپێی هەڵومەرجی ڕۆژگار و بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەنـدی و وەبـەرچاوگرتنی بۆشایی دەسەڵات و لاوازیی دەوڵەتی ئێران، شەڕ و هەرای بە قازانج نـەزانی و سـەری ڕکێفـی بـەرەو قـەڵای باراندێز وەرسـووڕاند. پـاش چەنـد ڕۆژ بـە -ڕکردنەوەی سەرۆکانی کورد و دابەشینی دیاری و خەڵات بە سەریاندا، ئیزنی فەرموون کە بگەڕێنەوە سەر خانە و لانەی خۆیان! ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بـۆ ساڵی ١١٤٠ی کۆچی/١٧٢٧ ـ ١٧٢٨ی زایینی.

1 - لە دەقە فارسییەکەدا نووسراوە «شەهرناجوو».

## دره‌وشانه‌وه‌ی قاره‌مانی نیشتمان

## نادرقولی‌به‌گی ئه‌فشار

ئێسته لێره‌دا جێی خۆیه‌تی که باسی به‌شێک له چۆنیه‌تی سه‌رهه‌ڵدان و جیهانگیریی نادرشای قۆرقلووی ئه‌فشار بخرێته‌ڕوو. نادرقولی‌به‌گی[1] قۆرقلوو کوڕی ئیملم‌قولی‌خانی که‌ولدروو یان ساره‌وان، شه‌وی ٢٨ی مانگی محه‌ڕره‌می ساڵی ١١٠٠ی کۆچی/ ٢٢ی نوامبری ١٦٨٨ی زایینی، له ئه‌بیوه‌ردی مه‌ڵبه‌ندی خوراسان – ئه‌و مرواریيه شاز و بێوێنه‌یه- سه‌ری له سه‌ده‌فی مندالدانی دایکی وه‌ده‌رنا و پێی‌نایه لێواری ده‌ریای ژیان. هێندێک لایان وایه که ڕێکه‌وتی له‌دایک‌بوونی نادرشا تۆمار نه‌کراوه و دیار نیه. به‌کورتی ناوبراو دوای تێپه‌ڕکردنی چاخی منالی و داگیرسانی هه‌ڕه‌تی گه‌نجی به‌پێی داب و نه‌ریتی سه‌رده‌م ده‌ینێرنه به‌ر وشتران و ده‌یکه‌نه وشتره‌وان. جا هه‌روه‌ک له کۆنه‌وه گوتوویانه ده‌وڵه‌تداران شتیان به دڵیدا دێ، خه‌ونی وای ده‌دیتن که ده‌یانسه‌لماند له داهاتوودا ده‌بێته میر و جیهانگیر.

هه‌روه‌ک له دیرۆکاندا به دوور و درێژی باسی کراوه، نادرقولی خێرایه‌کی هه‌موو پله‌کانی له‌شکری بڕیوه و سه‌ره‌نجام نازناوی تۆماسب‌قولی‌خانی دراوه‌تێ و بۆته به سپاسالاری وڵات. [نادر] دوای تێکۆشان و هه‌ڵسووڕانێکی زۆر توانیویه‌تی که شاته‌هماسب به‌رێته ئیسفه‌هان و له‌سه‌ر ته‌ختی فه‌رمانڕه‌وایه‌تی باوک و باپیرانی دابنێ.

---

1 - نووسه‌ر نووسیویه‌تی نه‌درقولی‌به‌گ، به‌ڵام نادرقولی‌به‌گ باوتره و هه‌ردووکیشیان دروستن.

# چوونی نادرقولی‌بەگ بۆ ئازەربایجان

نادر پاش سەرکەوتنەکانی سەرەتایی، خۆی لە پاک کردنەوەی هەرێمی ئازەربایجان خۆش کرد و ئالای شەکاوەی بەرزی ئاسمان‌ئەنگێوی لە ناوچەی هەمەدانەوە خستەڕێ و لە نزیک شاری سنە هەواڵی کوژرانی ئەشرەفی ئەفغانی بیست. دوای شوکرانەبژێریی یەزدانی دلاوا پێی‌نایە سنە و لەوێ چەند سەرکردەیەکی لەشکری هەڵبژارد و بە ئامانجی یارمەتی‌دانی برایم‌خانی برای ناردنی بۆ خوراسان. لەوێشەوە تیشکەی شەوکەتی گەیشتە سەقاخانەی ساین‌قەڵا. کاتێ گەیشتێ بە خزمەتیان ڕاگەیاند تەیموورپاشای کارگێڕی «وان» و عەلی‌ڕەزاپاشای حاکمی موکری لەگەڵ تێکڕای ئەمیران و بەگەران، وەختایەک وڵاتیان بە چۆڵ‌وهۆلی و بێ‌پارێزگار و حوکمدار هاتۆتە بەرچاوی، لە قەڵای میاندواو و مەراغە کەوتوونە تراتێن و هێرش و ڕووت کردنی ڕێبواران و خێڵ و باران. هەڵبەت تەنیا یۆسف‌پاشای داگیرکەری ورمێ پاش گیرانی هەمەدان کەوتبووە پارێز کردن و لە قەڵاتی شارموە گواستبوویەوە نێو شوورە و حەساری نم‌نم و ڕەگەڵ ئەم جەماوەرە زۆر و زەوەندە نەکەوتبوو. تۆماسب‌قولی‌خانی هێژا بارگە و بنەی لەشکری هەر لەوێ بەجێهێشت و وێڕای دلێرانی پەنجە بە خوێن بە وێرغە و سەرڕەو مەودای بیست قۆناخیان لە سێ ڕۆژاندا بڕی؛ هەڵبەت ومباڵ بە ئەستۆی ئەو کەسەی کە قسەکەی ئاوا گێڕاوەتەوە. سپاسالار لە جەنگەی نوێژی نیوەڕۆدا گەیشتە پەنا چۆمی جەغەتوو کە جێ‌سانەوە و ئۆقرەگرتنی پاشایانی بەرباس و هێزەکانی ڕۆمی بوو. هەر لەڕێوە شەڕ هەڵگیرسا و تەرزە و ئاوەبارانی فیشەکان داباری و سەرەنجام پاش تەقە و لێکدانێکی کەم، لە بەختی بەرزی نادری سپای قزڵباش سەرکەوت و قۆشەنی ڕۆمی بەزی و بە ڕاکردن و

چەک فڕێ دان گەڕایەوە باڵی مەراغــە و بنــاو. چاونەترسـانی باڵادەســت ســێ فرسەخێک کەوتنە شوێنیان و تاقمێکی بەرچاویان لــێکوشــتن و پاشماوەیــان خستنە کۆت و بەندەوە و بە تۆپخانە و دەسکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوە.

پاشان بەڕێزیان بە مەبەستی ڕاگرتنی قورساغ و پاراســتنی مەزنایــەتی عێلاتی و وەبەرچاو گرتنی کار و خزمەتی لەمێژین، بێستوونبەگی کوڕی کۆسە ئەحمەدلووی ئەفشاری کردە فەرماندەهێزی ئازەربایجان و لەگەڵ پەڕرەوبــەگی برای و قۆشەنێک ناردی بۆ تەمێ کردنــی یوسـفپاشــا و گرتنــی قــەڵای دمدم. ڕایئەسپاردن کە دوای چوونە ورمێ و ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەر شانیان لە تەورێز بچنەوە خزمەت ڕکێفی بەرەو سەرکەوتنی.

بەکورتی کاتێک بێستوونبەگی ئەفشار قۆشەنی لینگ دا و بە غار گەیشتە گوندی «زۆرکاوا»[1]، بەیداخی سەرکەوتنی دایە دەست پەڕرووبەگی برای و ڕۆژێک پێشتر ناردی بۆ دمدم و خۆی بۆ سبەینێ بە دوایدا ڕۆیی و وێڕای عێلی بەرزەجێ کە بەپێی فەرمان لە ورمێڕا بە شیری ڕووت و ئاڵای شەکاوەوە ئامادە ببــوون، پەلاماری قەڵای دمدمیان دا.

---

1 - لە دەقی سەرەکیدا نووسراوە زۆرکئاباد. تۆبڵێی زورکاوا نەبێ؟ زورک - ئاوا کە بە کوردی دەبێتە شوێنێکی تەلان و بەردەلان.

# شەڕی چوارجارەی دمدم و چارەنووسی یۆسفپاشا

کاتێک هێزەکان گەیشتنە دمدم و لە باڵی باشوور و باکوورەوە دەورەیان دا و بەرەگەیان تەنی، لەبەروەی یۆسفپاشا چەکوچۆڵ و قۆرخانەی قەڵاداری بە دەستەوە نەبوو، هەر بە هرووژمێکی خەزاکەرانی ئەفشار و مەردازایانی زەبرومشێن سەری دانەواند و قەڵای بە دەستەوە دا. ئەم رووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١١٤٢ی کۆچی/١٧٢٩-١٧٣٠ی زایینی. پاشان بێستوونبەگ بە تۆڵەی خوێنی محەممەدقاسمخانی بەگلەربەگی مەزلووم ئامازەی کرد بە کوشتنی یۆسفپاشای گورگەبۆر و لە ناخی چاڵاوی گۆڕی هاویشت و زاڵ و بەختیار پێی نایە حەوشەی قەڵا. لەوێوە فەرمانی دا کە تەواوی ئەوانەی سەر بە ڕۆمییانن و نەیانتوانیوە دەرباز بن و لە سووچ و قوژبنان خۆیان مەڵاس داوە یان لە دەوروبەری دمدم پەرتەوازەن بیاندۆزنەوە و بیانکوژن و قەڵاکەش برووخێنن و داری لەسەر بەردی نەهێڵن.

دوای جێبەجێ کردنی ئەم کارە گرینگانە، بەپێی حوکمی بەڕێز تۆماسبقولیخان، دووهەزار سوارەی، اوبەدەرەوەی لە چاوناسان و سەرناسانی خێڵی ئەفشاری ورمێ ناونووس کرد کە هەمیشە لە خزمەت ڕکێفی سپاسالاردا بن. ئەوانەی دیار و بەرچاون بریتین لە : محەممەدمووساخانی کوڕی قاسمخانی بەگلەربەگ لە تیرەی قاسملوو و محەممەدعیساخانی برای؛ محەممەدسەمیعخان، محەممەدقولیخان و بارلامبەگ لە تیرەی ئەرەشلوو، فەتحعەلیبەگ و لۆهراسببەگی مەحموودلووی کوڕی کە دەبێتە باپیرەگەورەی منی نووسەری ئەم لاپەڕانە؛ مونمینبەگی ئەفشاری سائینقەلا، قاسمبەگی قاسملوو، قارەمانبەگی عەرەبلوو، شاریاربەگی[1] کوڕی سەفیاربەگی

---

1 - شەهریار لە زمانی کوردیدا بۆتە شاریار و شالیار. پیرشەهریار - پیرشالیار.

گۆندوزلوو، میرزا هەمزە و میرزا محەممەدی ئیمانلوو و چەند کەسێکی دیکە کە ئەگەر هەموویان بنووسم زۆر درێژ دەبێتەوە. پاشان پەرڕەوبەگی برا چووکەی دانایە سەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ و خۆی وێڕای دووهەزار سواری تەیاری ئەفشار و هی دیکەش بە ڕێگای سەڵماسدا رووی کردە تەورێز.

دوای ئەم سەرەتایە شەڕی نادرقولیبەگ واتە تۆماسبقولیخان لەگەڵ سپای عوسمانی و دەرپەڕاندنی ڕۆمییانی کەتنگێر لە تەورێز رووی دا، کە چەند سەرچاوەیەکی مێژوویی باسیان کردووە و بەتایبەت «جیهانگوشای نادری» بە قەڵەمی میرزا مەهدی ئەستەرابادی بە دوور و درێژی لە نووکەوە هەمووی تێدایە. دوای ڕاپەڕاندنی کاروباری قورس و گرانی ئازەربایجان و سەر بەتاڵ بوونی، کەوتە دانانەوەی سەرۆکان و مەزنەسەرداران و دیاریکردنی سنووروانان و حوکمڕانان و ژیاندنەوەی دەسەڵات. سەرەتا حکوومەتی ئازەربایجانی لەگەڵ نازناوی خانی باربووی بێستوونبەگی ئەفشار کرد و نازناوی خانی و حکوومەتی ورمێشی بەخشی بە پەرڕەوبەگی برای. لوتفعەلیبەگی کۆسە ئەحمەدلووی ئەفشاری ڕاسپارد کە دوازدەهەزار ماڵ و خێزانی خێڵی ئەفشاری ورمێ و موقەددەمی مەراغە و سایینقەڵا کە دوو هەزاریان سەر بە قیرەی قۆرقلوو بوون، لەوێوە ڕایانگوێزێ بۆ دەرەی جەز (دەرەگەز)ی سەر بە ئەبیوەردی خوراسان و سەدهەزار تمەنی تەوریزی بۆ خەرجوبەرجی ڕێیە و ڕاگواستنیان لە بەشە پیتاکی ئازەربایجان وەربگرێ.

☜تێبینی: لێرەدا نووسەری مێژووی ئەفشار چەند لاپەڕەیەکی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ شەڕەکانی نادر لەگەڵ سپای عوسمانی و بزووتنی بەرەو خوراسان و شەڕی شاتەهماسب لەتەک عوسمانییەکان ئەو کاتەی کە نادر بە دەستەوە نەبووە و بەزیوە. جا لەبەرەوەی باسەکان لەگەڵ دیرۆکی ئەفشاری ورمێ یەکتر ناگرنەوە و ئەم بابەتانە بە شێوەیەکی ورد و باریک و بەربلاو لە سەرچاوەی دیکەدا وەبەرچاو دێن و نووسراون. خۆمان لە گێڕانەوەیان دەپارێزین و ڕاستەوخۆ بادەدەینەوە سەر ڕووداوەکانی ورمێ. م. پ

# هێرشی عەلیپاشا بۆ سەر ورمێ؛ گەمارۆدرانی پەڕڕەوخان و شەڕی جێیشانازی قەرەسندووق

کاتێک نادر لە خوراسان سەرقاڵی مەیدانداری بوو، شاتۆماسب شەڕێکی کرد کە وا نەشکا خۆشەومێ و یەکسەر چووە تاران. هەر ئەو دەمە ئەحمەدپاشا لە هەمەدان و کرماشان بەیداخی دەسەڵاتی هەڵدا و عەلیپاشای سەرکردەیەکی دیکەی عوسمانیش بە ڕێگای خۆی و سەڵماسدا بەرەو مەڵبەندی ورمێ قۆشەنی دەنگ دا. پاش ئەوەی گەیشتە گوندی چواربەخش کە مەودا تیرێکی دەمێنێ بۆ قەڵای ورمێ، کوچک و کەڵەک و مەتەرێزی قایمی هەڵچنین و شارەکەی ئابلۆقە دا و تەنگی پێهەڵچنی. جەماوەری ئەفشاری گەمارۆدراو ئۆقرەیان لێهەڵگیرا و پەنای هێوریان نەما. لەبەرەوەی هەواڵی هاتوچۆی کەیخودا و نێردراوانی دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی بۆ پێکهاتن لە گۆڕێدا بوو، عەلیپاشا زیاتر هەڵدەسوورا کە خێرا قەڵای ورمێ بگرێ و بیکاتە تراتێن و داڕووتاندن و پێخوست کردنی وڵات. لەو لاشەوە پەڕڕەوخان بە ئامرازی قەڵاداری ئەیار و بۆ پاراستنی لانی چەقیبوو، بەڵام نەیدەزانی کە ڕۆمی لە لای دەروازەی گەرەکی «هیندوو»ڕا شەو و ڕۆژ خەریکی لیدانی ڕەهۆڵن. وەختایەک بوودرەکە گەیشتە ژێر دەروازە، باڕووتیان تێڕشت و بەجارێک ئاگریان پێوەنا و تەقی و لایەکی دیواری قەڵایە دارما و دەروازەشی پێوە هاتەخوار. لای بەیانی بوو کە ڕۆمی دەستەوشیر پەلاماری شار و کۆڵانانیان دا. خەڵکی باژێر کە لە شیرنخەودا بوون و بە هیچیان نەزانیبوو بەو گرمە و هەرا و هەڵلایەی کە دەتگوت قریوەقریوی قیامەتە لە خەو ڕاپەڕین و بە سەرلێشێواوی دەرپەڕین. وەیانزانی کە حەزرەتی ئیسرافیل بۆ سەری دووجارەی لە کەلەشاخی توورانــدووە و ڕۆژی

ڕابوونەوەیە. پەڕڕەوخان وێڕای کۆمەڵێک لە دلێرانی ئەفشار کەوتە شەڕ و بەرەنگاری، بەڵام هەتا ئەو گەیشتێ دەستەیەک ڕەجاڵە و قەلەوقوتەی گەڕەک لە گۆڕستانی قەرەسندووق بە گژ ڕۆمییاندا چووبوونەوە و بە شیری برندە کوژرابوون. پەڕرموخان کە وەکوو فیلی بەفیشقە و شێری ژیان شاڵاوی دەبرد، لە مەودای ڕێیەدا گوێی لێبوو کە ژنوژاڵی خێڵ بە یەکتریان دەگوت ئەوە پەڕرموخان هەڵدێ و ئەو نامەردە دەماندانە چنگ ئەم... بە دیل و داماوی بەجێمان‌دێڵێ. ئەگەر ئەوەی بیست ڕەگی غیرەتی ئەو نەڕەشێرە چەشنی نەشتەر سەری لە جەستەی دەرکێشا و شاعیر گوتەنی:

غیرەتی هێندەی ئـاور وەبـەرنا          کە مـووی لە کراسی سەری وەدەرنـا

بەکورتی لەوانە تێدەپەڕێ و لە زارکی گۆڕستانەکە دەگاتە سەر تۆرەمەی ئەفغانان و هێندە بە توورەیی هەڕادەکاتە سەریان کە لەڕێوە چوار گەنجی ناوبەدەرەوەی ئەفغان و ڕۆمی بە زەبری شیری جەوهەردار دەنێرێتە دنیای نەبوون. خەزاکەرانی ئەفشار بە دیتنی پەڕرەوخان ئاهێکیان دێتەوەبەری و ورەیان بەرز دەبێتەوە و هاوار دەکەنە دەروونی پاکی حەیدەری کەڕرار و دەکەونە شەڕ و بەربەرەکانێ.

بۆ نموونە قاسمخان لە لای ماڵی خۆیەوە و فەرهادخانی قـنسلوو لە باڵی باشوورەوە و ئەللاوێردیخان و لۆهراسبەگی مەحموودلوو لە قۆڵەکەی دیکەوە وێڕای پیاوەکانیان گەیشتنە سەر خەنیم و تێکگیران. لەو بگرە و بەردەیەدا زۆربەی سەرۆکانی ئەفشار بریندار بوون و هەتا ئێوارەیەکی درەنگ مەیدانی شەڕ لەبەر شێلاوگەی خوێنی کوژراوان دەتگوت دەریایە شەپۆلان دەدا. چوارسەت کەسێک ڕۆمی کوژران و سەرەنجام ختەیان دان و ڕاویان نان هەتا ئەودیوی دەروەرە. کەچی لەم کاتەدا چەکداری بێ‌هەژماری [کوردانی]

شەڕەنگێزی سەرسنوور داوەرین و دایانە پاڵ قۆشەنی ڕۆم و ئەفغان و سپای ورمێیان کشاندەوە. لەم سەروبەندەدا ڕێککەوتنی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی سەری گرت و بڕیاری سوڵح درا. ئەحمەدپاشای حوکمڕانی بەغدا نامەی بۆ هەموو سەرکردەکانی نێو هەرێمی ئازەربایجان نووسی کە هێزەکانیان لە هەر ناوچە و مەڵبەندێک وەستاونەوە یان خەریکی شەڕ و لێکدانن دەست هەڵگرن و بگەڕێنەوە. کاغەزێکیشی بۆ عەلیپاشا ناردبوو کە بەڕاستی تەواو تەنگی بە قەڵای ورێ هەڵچنیبوو و یەکبین دەستی لە لێدانی ڕەهەند و خەندەک هەڵنەدەگرت، بەڵام ئەویش بەگوێرەی فەرمان گەڕایەوە. کەچی پەڕڕەوخان سەری دە نووینان و ئەوەندەی بۆی کرا دەستی گەیاندە پاشەنگ و لێیکوشتن و بارگە و بنەی بەتاڵان بردن. وەکوو لە سەرچاوەکانی مێژوویی‌دا نووسراوە، ئەم ساڵە کە دەبێتە ١١٤٧ی کۆچی/١٧٣٤-١٧٣٥ی زایینی[1]، نادر بە ناوی نادرشای ئەفشار لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی ئێران پاڵ دەداتەوە.

[1] چەند سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو ساڵی ١١٤٨ی کۆچی/١٧٣٦ی زایینی بە دروست دەزانن.

## عاشوورخان

نادرشا دوای بوونە فەرمانڕەوا، عاشوورخانی پاپالووی ئەفشاری کـردە حوکمڕانی ورمێ و نازناوی خانی پێبەخشی و شانی بەرز کردەوە و پەڕرەوخانی حاکمی پێشووی ورمێی گاز کردە لای خۆی. هەروەها حکوومەتی عێراق و کاشانی کردە خەلاتی محەممەدمووسـاخانی کـوڕی محەممەدقاسـمخـانی بەگەربـەگی قاسملوو. محەممەدعیساخانی براشی کردە کەیخودا و دەمسپی تیرەی ئەفشاری قاسملوو. فەتحعەلیخانی کوڕی عەلیمەردانبەگی ئەرمشلووی خوێندەوە و بـە دەسخۆشانەی کارە شیاوەکانی کردی بە سەرکردەی پێشەنگی لەشکری نەبەزی. هەروابێتەوە بارامخانی سەرگەورەی بـەرەبابی ئەرمشـلووی کـردە حوکمـداری شێروانات و محەممەدقولیخانی براشـی دانـا بـە سەرکێـشکچی سـەراپەردەی شکۆداری. لەبەر خوتخوتەی بیری بەرزی سەبارەت بە سنوورەکانی ورمێ و ئەو مەلبەندەی کەوا کەوتۆتە سەر لێواری خـاکی عوسمـانی دلـی دانەدەسـەکنی، هەربۆیە بەکتاشخانی قۆرقلوو کە مام یان کوڕەمامی بوو کردی بـە سـەرهێز و وێرای کۆمەلێکی تیرە و تۆرەمەکانی ئەفشار و موقەددەم و مـوکری نـاردی بـۆ پاراستنی کەوشەن و قەلای دمدمـی ورمـێ و راپەسـپارد کـە هێـەی دابگـرێ و چاوەڕوانی فەرمانی پادشای جیهانگیر بێ.

## ئەسپاردنی حکوومەتی ورمێ بە محەممەدعیساخانی قاسملوو؛ داواکرانی عاشوورخان؛ شەڕی سابلاغ و لێخرانی محەممەدعیساخان

پێشتر ئاماژەیەکی پێکرا کە لوتفعەلیبەگی ئەفشار بەپێی فەرمانی نادری ناودار ڕائەسپێردرا کە دووهەزار کەس[1] لە ئەفشارەکانی ورمێ کۆچ بداتە ئەبیوەردی خوراسان. لەم کاتەدا کە هەمەدان بە تاوڵ و خێوەتی بە قەدرایە ئەستێران ڕازابۆوە، فەرمانێک نووسرا بۆ عاشوورخانی پاپالووی حوکمداری ورمێ کە دووسێهەزار ماڵ و خێزانی خێڵی جێگەورە و خانەدانی ئەفشاری ورمێ وەک پێشتر قسەی لێکرابوو، کۆچ و باریان پێ‌تێکەوەبپێچێتە سابڵاغ کە ڕەوگەی ڕابردنی لەشکری شکۆداری سەرکەوتەی دەبێ و لەوێیان ڕابنێ. هەر بۆیە عاشوورخان بەگوێرەی فەرمان، محەممەدعیساخانی قاسملووی دانایە سەر کورسی دەسەڵات و خۆی لەگەڵ کۆرەو بەرەو هۆردووی نادری کەوتەڕێ. لەو کات و ساتەدا عەشیرەتەکانی هۆزی بلباس کە دانیشتووی ناوچەی لاجانن، دەستیان درێژ دەکردە سەر مەڵبەندەکانی ورمێ و مەراغە و دەبانکردە شەڕانخێوی و هەرچی وەبەریان هاتبا ڕایاندەماڵی و خەساراتێکی زۆریان دەگەیاند دانیشتووانی ئەم دوو شار و مەڵبەندانە. محەممەدعیساخانی حاکمی ئەفشار ئەم هەواڵانەی خستەوە سەر یەکتر و بە حاکمی مەراغەدا ناردی و لە مێرگ و چیمەنی گەرمڕوود بە گوێی موبارەکی نادری کامڕەوا ڕاگەیەندرا. ئەویش لەڕێوە چەند دەستە و پەلێکی لە قۆشەنی بێئامانی کە هەر شەپۆلیان

---

1 - پێشتر نووسیویەتی دووهەزار سەر خێزان.

دەدا، سازی کردن و شازادە نەسرولڵامیرزای کوڕی هێزای خۆی و بــرایمخــانی زەهیرددەولەی برای کردنە سەرکردە و ناردنی بو لێدان و هەسدانەوەی هــۆزی بلباس. لەم بالەوە محەممەدعیساخانی بەگلەربەگی ئەفشار وێرای هێزێکی ورمێ کەوتــە بــزووتن و لــە دەورانپــشتی ســابلاغی مــوکری گەیــشتە لەشــکری نەسرولڵامیرزا و زەهیرودەولە. ئەم قۆشەنە وێکڕا لە مــاوەی شــەو و ڕۆژێکــا هەتا نیزیک ناوچەی لاجان چوون و هۆزی بلباسیش بێترس و دلەڕاوکە لە جێی خۆیان جوولانەوە و ئامادە بوون بۆ شەڕ و بەربەرەکانی. پاش شەڕ و لێکدان و بێنەوبەرە و هەلسووڕانێکی بێوچان و بێژمار، لەشکری نادری بە هێزی شان و باهۆی دەولەت و پالەوانەتی مەردازایانی، توانی خــەنیمان بــشکێنێ و هــۆزی بلباس بچوخسێنێ و بیانڕەتێنێ. ئەو کۆمەلــە تێــشکاوە لــە سەرکێــوی لای ترکەشی سەر بە مەلبەندی موکریــان خۆیــان گرتــەوە و کەوتنــە بــەرەنگاری. دلێرانی سپای هەمیشە زال بە باسک و بەندەن و تیرمشانی کێوەکەدا پەلاماریان دان و ئەگەرچی جێگایەکی چڕ و ئەستەم بوو، بەلام زۆر بە هاسانی گرتیان. ئەو چەکدارانە کە دووهەزار کەسێک دەبوون، دەستەیەکیان برینیان هێنا و تاقمێک گــیران و هێنــدێکیان بــە لەپەشــیران تێــداچوون. لــەم شــەڕەدا دەسکــەوت و خەنیمەتێکی بێژماری کەلوپەل و ئەسپ و بارگین و یەستر و بەختەرمە و ڕەوە کەوتنە چنــگ ســپای نــادری. پاشــان نەسرولــلامیرزا و زەهیرودەولــە زال و سەرکەوتوو بــە ڕێگــای ورمــێدا بــەرەو ڕکێــفڕامووســانی پاشــا بــزووتن و محەممەدعیــساخانیش گــەڕاوە ناوەنــدی دەســەلاتی خــۆی لــە ورمــێ و بــە کەیفخۆشی ئۆقرەی گرت. دوای جێبەجێ بوونی ئەم کارانە، قۆشەنی شکۆداری نادری لە قەزوێنی پایتەختەوە بــە مەبەســتی ســەرکوتی تــاقمی بــەختیاری و ئۆزبەک و بەلووچ کەوتەڕێ.

[نادرشا] سالی ١١٤٩ی کۆچی/ ١٧٣٦ ـ ١٧٣٧ی زایینی، تەمای هاتە ســەر گرتنی تورکستان. هەر لــەم سالــەدا بــرایمخــانی زەهیرودەولــە بــە دەســتی

لەگزییەکانی داغستان کوژرا، چونکە وەختایەک لەگزی[1] بۆیان دەرکەوت کە نادری جیهانگیر بەرەو خوراسان بزووتووە لە قوڵی داغستانەوە راپەڕین و ناوچەی شیروانیان کردە پێخوستی تراتێن و تالانوبرۆ و خەڵکیان ئێشاند و دایانپلۆسین.

زەهیروددەولە کە فەرمانڕەوای ئازەربایجان بوو بە ئامانجی بەرپەرچدانەوەیان لە باژێری تەورێزەوە پێی نایە رکێف و لەسەر دەستەجڵەوان ئەسپی لینگ دا و حوکمی نووسین بۆ حوکمدارانی ئازەربایجان کە بە قۆشەنی تەیار و پەرداخەوە برۆنە یارمەتی‌دان. بۆ وێنە فەرمانی بۆ محەممەدعیساخانی حاکمی ورمێش نارد، بەڵام ناوبراو لەبەر بادیهەوایی هەرەتی لاوەتی گوێی نەدایە و لایەکی وای لێنەکردەوە. بەکورتی زەهیروددەولە لەگەڵ لەشکری ئازەربایجان پەلاماری‌دان و شەڕێکی قورسیان لە مابەینی‌دا قەوما. سەرەتا لەگزییەکان بەزین و رەوین. پاشان کۆمەڵەیەکی بەرچاویان کە لە پەنا و پەسیوی نەدیوی چیایەک بۆسەیان نابوویە و تفەنگچییەکانیان مەتەرێزیان گرتبوو، وەختایەکی دیتیان زەهیروددەولە شوێنیان لە دوو دەگێڕێ و بەتاقی‌تەنیا لە بەرایی لەشکردا ئەسپی دارێ، ئاسۆگیان دا و دەسرێژیان لێکرد و گوللەیەکی کوشندە لە پەنجەی چارەنووسەوە فری و خوداوراستان جێیەکی ئەستەمی پێکا و لەرێوە ساردی کردەوە. ئێرانی بە دیتنی ئەم دیمەنە ئالۆزکان و ورەیان بەردا و بەجارێک رایانکرد و تەرمی زەهیروددەولەیان بردەوە تەورێز. وەختایەک ئەم هەواڵە سامناکە وەبەر گوێی نادری ناودار کەوت پەژارەیەکی زۆری بە سەر شانی‌دا هات و تازییەی داگرت. چونکە برایم‌خانی خوابەخشیو بێجگە لەوەی پشت و برای بوو، بە رووراستی و فیداکارانە لەگەڵی دەرۆیی. بۆیە رووحی بە فاتیحای بەخێر لاواندەوە و ئۆخژنی تێگیرا و

---

1 - نووسەر هەم «لەکزی» نووسیوە هەم «لەگزی» و هەردووک شێوە دروستن. بە «لەزگی»یش هاتووە و تۆردەیەکی رەشید و ئازای داغستانن.

نازناوەکەی بە شیاوی محەممەدعەلیبەگی کوڕی زانی و نـــاودێری کــرد بـــە بـــرایمخـــانی زەهیروددمولـــە. عـــەلیقولـــیخـــانی براشـــی کـــردە سپاســـالار. ئەمیرئەسلانخانی قۆرقلووی دانا بـــە ســـەردار و فەرمانـــڕەوای ئازەربایجـــان. عاشوورخانی پاپالوو و مەهدیخانی قاسملووی کردن بە سنووڕپارێزی چـۆمی ئاراس و کارگێڕی ئێرەوان. لەم کاتەدا محەممەدکەریمخانی ئەفشاری قـاسملوو کە یەکێک لە ڕکێفدارانی خزمـــەتی بـــوو، بـــە پـــشتیوانی ئەمیرئەســـلانخـــانی قۆرقلووی سەردار حکوومەتی ورمێی درایە دەســـتی و محەممەدعیـــساخان لادرا. لێخران و لابرانی دەگەڕایەوە سەر خەمـــساردی و جـــواب نەدانـــەوەی فـــەرمانی زەهیروددمولە لە شەڕی گورجییەکاندا.[1] پاشان سەرۆکان و حوکمدارانی ناوبراو ئیزنیان خواست و هەرکەس ڕۆیی بۆ شوێنی کاری خۆی. خـــاوەنشـــکۆ زۆر بـــە چڕی جەختی کردەوە کە دەبێ هەموویان یەکدڵ و یەکزمان سوور بـــن لەســـەر شـــەڕی گورجییـــەکانی[2] داغـــستان. هـــەروەک لـــە ســـەرچاوەکانی مێژوویـــیدا نووسراوە، دواتر پۆلی پێشەنگان و ڕکێفدارانی نـــادری بـــە ســـام و شـــەوکەتی شایانەوە بە ئامانجی گرتنی هیندووستان لە خوراسانەوە بزووتن.

---

1 - لەگزی دروستە نەک گورجی. لەبەروەی هەرێمی داغستان و گورجـــستان ســـنووریان پێکەوەیە و گورجی زیاتر و بەناوبانگ بوون. نووســـەر بـــە تۆرەمەیـــەکی دانـــاون یـــان نیشتمانی ئەوانیشی ئەو دەم بە گورجستان داناوە.

2 - لەگزی دروستە.

# راونانی سام‌میرزای ساخته‌چی

پاش ئه‌وه‌ی محه‌ممه‌دکه‌ریم‌خانی ئه‌فشاری قاسملوو له‌سه‌ر کورسی ده‌سه‌لاتی ورمێ پالی داوه، هه‌ر له‌ سنووری قه‌ره‌سووی ته‌مه‌ر تا خاکی ساین‌قه‌لا که‌ موئمین‌خانی ئه‌فشاری قاسملوو حوکمداری بوو، هه‌مووی که‌وته‌ ژێر ده‌سه‌لاتی و خه‌ڵک به‌ فه‌رمانی ئه‌و هه‌ڵده‌ستا و داده‌نیشت.

ئێستا لێره‌دا ده‌مه‌وێ ناوی چه‌ند سه‌رۆک و سه‌رکرده‌یه‌کی ده‌سه‌لاتداری ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی خێڵی ئه‌فشار بێنم و بۆ ئه‌وه‌ی درێژداریم نه‌کردبێ هه‌موویان نادرکێنم. ١- محه‌ممه‌دمووساخانی کوڕی خوابه‌خشیو قاسم‌خانی قاسملوو که‌ حوکمداری هه‌رێمی عێراق بوو. ٢- حه‌یده‌رقولی‌خانی قۆرقلوو که‌ له‌ مه‌لبه‌نده‌کانی شێروان ئالای ده‌سه‌لاتی ده‌شه‌کایه‌وه. ٣- بارام‌خانی ئه‌رمشلوو حاکمی دارولعیلمی شیراز. ٤- محه‌ممه‌دقولی‌خانی ئه‌رمشلوو حوکمداری سه‌بزه‌واری خوراسان. ٥- مه‌هدی‌خانی قاسملوو کوڕی حه‌سه‌ن‌خانی ناسراو به‌ قه‌ره‌مه‌هدی که‌ ئێره‌وانی ده‌پاراست. ٦- لوتفعه‌لی‌خانی کۆسه‌ ئه‌حمه‌دلوو جڵه‌وداری ده‌سه‌لاتی کرمان. ٧- مووساخانی ئایره‌ملوو که‌ ئارومی له‌ ژێر بالی‌دا ٨- سالح‌خانی قۆرقلووی ئه‌بیوه‌ردی که‌ خوراسانی هه‌ڵده‌سووراند. ٩- ئه‌میرئه‌سلان‌خانی قۆرقلووی سه‌ردار، ئه‌میرئه‌میرانی ئازه‌ربایجان. ١٠- عاشوورخانی پاپالوو ئه‌میری لێواری چۆمی ئاراس. ١١- فه‌تح‌عه‌لی‌خانی ئه‌ره‌شلوو سه‌رکرده‌ی پێشه‌نگانی قۆشه‌ن. ١٢- برایم‌خانی برای فه‌تح‌عه‌لی‌خانی ئه‌ره‌شلوو که‌ سه‌رۆکی دیوانی حکوومه‌تی ورمێ بوو. ١٣- قاسم‌خانی ئه‌رمشلوو و حوسێن‌عه‌لی‌خان که‌ سه‌رکرده‌ی سواره‌ی سکۆرتێ بوون. ١٤- بێستوون‌خان و

پەڕڕەوخانی کوڕانی باباعەلی‌بەگ کـە هـەردوو سەرلەشکر و لـە نیزیکـانی بارەگای میری بوون.

لەم ڕۆژگارەدا «سام»نـاوێکی خەڵـکی ئێـران لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی خودالێخۆشبوو زەهیروددەولە برایمخان‌دا لە ئازەربایجان کەوتـە بانگەشـەی ئەوەی کە کوڕی خوابەخشیو شاسولتان‌حوسێنە و جەماوەرێکی زۆری لە خـۆی هالاند و حەشامەتی ڕەمەکی وەکوو ڕەشەوڵاخ باوەڕیان بە درۆکەی کرد و کەوتنە شوێنی. بەپێی فەرمانی نادری قۆشەنێکی بـەرچاو چوونـە سـەری و گرتیـان. زەهیروددەولە لووتی عەیبـداری «سـام»ی بـڕی و هـەروا بـە لـووت‌بـڕاوی و لمبۆزشکاوی بەرەو داغـستان ڕەوی. لـەوێ بـوو بـە هاودەسـت و هاوپـشتی محەممەدی کوڕی سۆرخای لەگزی و بەناهەق خوێنی حەیدەرقولی‌خانی حاکمی مەڵبەندی شێروانیان ڕشت و بەیداخی بەدناوییان هەڵدا.

ئۆرەمەی لەگزی کە قەت بەرژەوەندی دوارۆژ و ئاکامی کارانیان وەبەرچاو نەگرتووە و هەر بە نەفامی تێکەڵی ئیشی گـەورە و دژوار بـوون، حەشـیمەتی خۆیان لە دەورەی «سام»ی سەرشێتی ماخولیا کۆ کردەوە کە کـەس نەیـدەزانی کوڕی کێیە و کەوتنە بیری ئاژاوەنانەوە. خوندکاری کامڕەوا نادرشای سەرناس هەر کە ئەم هەواڵانەی بیستەوە کاغـەزێکی نووسـی بـۆ محەممەدکـەریم‌خـانی بەگلەربەگی ورمێ و فەتح‌عـەلی‌خـانی سەرپێـشەنگ کـە خێرایـەکی قۆشـەنی ئەفشاری ورمێ کۆبکەنەوە و لە ڕکێفی شازادە نەسروڵڵامیرزادا بڕۆنە دەمکوتی لەگزییەکان و سامی گۆڕین. سـەرکردەکانیش بـەپێی فـەرمانی بـێ‌سـێ‌ودووی خاوەن‌شکۆ لە ورمێوە بزووتن و لە دەوروبەری تەورێز گەیشتنە خزمەت ڕکێفی شازادە. لەو لاشـەوە عاشـوورخانی پاپـالوو لـە قـەراخ چـۆمی ئاراسـەوە و مەهدی‌خانی قاسملوو لە ئێرەوانەوە هاتنە پاڵ هۆردوو. لەو کاتەدا بلاوبۆوە کە لەگزی لـە چـۆمی ئـاراس پەڕیونـەوە و گـەیشتوونـە «داغ‌بـاغی» خـۆی. فەتح‌عەلی‌خانی ئەرەشلوو لەسەر ئیزنی نەسروڵلامیرزا چەشنی هەورەبرووسکە

بە سەرڕەو رووی کردە خۆی و قۆشەنی بێپسانەوە کەوتنە شوێنی. لە کلکەی مانگی نێوجێژناندا سەرەتا فەتحعەلیخانی سەرپێشەنگ گەیشتە بەرایی سپای لەگزییەکان و ئەو شەوە دابەزی و هێزەکەی حەساندەوە و بەریبەیانی پێینایە مەیدانی ملانە و تێکهەڵچوون. چەکدارانی لەگزیش لە جێی خۆیان جووڵانەوە و هێزەکان دەگەڵ یەکتر راچوون و شەڕگە تەپوتۆزی لێهەستا. لە ماوەیەکی کورتی پێکداهاتن و زرمەوکوت و زەبروەشاندندا لەگزییەکان ورەیان بەردا و چەکوچۆڵیان لە خۆیان داڕنی و هەڵاتن. لەو بگرە و بەردەیەدا شازادە نەسروڵڵامیرزای هێژا کە بە قۆشەنی خۆیەوە مزلاومزڵ دەهات، گەیشتییە و کەوتە پەیکەردەی لەگزییەکان. لەناکاو ئەو دەمەی کە لەگزی رایاندەکرد و رێگایان هەڵدەبوارد، فریارەسێکی بێژمار گەیشتنە هانایان و وەریان پێیبەرز بۆوە و گەڕانەوە و خۆیان بە لەشکری ئێران دادا. دیسان شەڕێکی بەگەرمە هەڵگیرسایەوە و هێندە بەتەوژم دەستیان وەشاند کە پاشەکشەیان بە سپای شازادە نەسروڵڵامیرزا کرد. محەممەدکەریمخانی حاکمی ورمێ و فەتحعەلیخانی سەرپێشەنگ بە دیتنی ئەم دیمەنە چوونە هانای لەشکری تێشکاو و پێی بوێری و نەبەزینیان لە ئاوزەنگییان توند کرد و مەردانە تێکەوتن و دەستی چاکیان وەشاند. محەممەدی کوڕی سۆرخای برینێکی قووڵی هێنا و سامی گومناو کەوتە سەرسامی و دڵەڕاوکە.

بەناچار محەممەد و سام روویان کردە بیابانی چارمەشی و ـیرەگیانێکیان دەرباز کرد. لەگزی کە پتر لە دووهەزار کەس بوون، ژمارەیەکیان کەوتنە بەر دەمی شیران و تاقمێکیان بە چنگ غەزاکەرانی ئازا بە دیل گیران. محەممەدی سۆرخای پەنای بردە بەر قەڵای ئاقسوو. غەزاکەرانی ئێران گەڕانگەری شوورەی قەڵایان وەکوو نەقیمی ئەنگوستیلە دەورە دا. پاش رابردنی چەند رۆژێک بە سەر ماوەی گەمارۆدا، سەرەنجام تاریوێردیبەگ و بەهادوربەگ لە تیرەی مەحموودلووی ئەفشار سینگیان دایە پێش و گوتیان

قەلاکە دەگرین و هرووژمیان برد. تاریوێردیبەگ بە زامی گوللەیەکی کە لە حەوشەی قەلاوە هاویشتیان تێداچوو. بەلام بەهابوربەگ و خەزاکەرانی ئەفشار بیاوانە نەدەکشانەوە. محەممەد و سام وەختایەک خۆیان لە گێژاوی مەرگا هاتە بەرچاوی، لە بالێکەوە دیواری قەلایان بڕی و لە ناخافل بۆی دەرچوون و وایان خۆ ون کرد کە هیچکەس بە سۆراغی نەزانین. بەناچار قەلانشینان کەوتنە پاڕانەوە و پەناخواستن و بەردەست بوون. کاتێک هەوالی ئەم سەرکەوتنە دیار و ترووسکەدارە بە گوێی خاوەنشکۆی تاقانەی زەمان ئاشنا کرا، دەستووری فەرموو کە قۆشەنی زالی نوقلی سەر زمانان بگەڕێتەوە. هەر کە سەرکردەکان چوونە خزمەتی یەکەیەکە خەلاتێکی گرانبایی و شیاوی باربوو کردن و کەولی شانازی هاویشتنە سەرشانی و ئیزنی گەڕانەوەی دان. ئەم ڕووداوە دەچێتەوە سالی ١١٥٧ی کۆچی/١٧٤٤ ـ ١٧٤٥ی زایینی.

## کوێرکرانی محەممەدکەریمخانی ئەفشاری حوکمداری ورمێ و موئمینخانی حاکمی ساینقەڵا

ساڵی ١١٥٨ی کۆچی/١٧٤٥ ـ ١٧٤٦ی زایینی کە لەشکری شکۆداری نادری لە دەشتی مووسڵ بنەی خستبوو، ئەو باڵوێزەی کە نێردرابووبە بارگای میرانی عوسمانی، شانەبەرزەی گەڕانەوە خزمەت فەرمانڕەوای کامەرانی پێبڕا و لە لایەن خونکارەوە نامەیەکی هێنا کە کاکڵی ئاشتی و پێکهاتنی تێدا دڕکابوو. بەم شێوەیە دەس هەڵگیرا و بارگرژی کۆتایی پێهات. هەر بۆیە نادرشا لە دەشتی مووسڵەوە بزووت و سەری جڵەوی بە مەبەستی بەسەرکردنەوە و خوێندنەوەی خێڵ بەرەو ساینقەڵا شل کرد. لەوێ کە دەستەیەک لە ئەمیران و سەرۆکانی ئەفشار بە خزمەت ڕکێفی شکۆداری گەیشتن، سەرەتا محەممەدکەریمخانی حوکمداری ورمێ و محەممەدموئمینخانی حاکمی ساینقەڵای هەڵپێچا و هێنانییە پای حیساب و لێپرسینەوەی دیوانی دارایی و پاش سەرکۆنە و لێتووڕەبوونیان، ڕووی لێوەرسووڕاندن و گرشەی لە چاوی بڕین و کوێری کردن. ئەوسا حکوومەتی ورمێ درایە دەست فەتحعەلیخانی ئەرەشلووی سەرپێشەنگی لەشکر و ئەویش بەرەو شوێنی کاری خۆی بزووت. دوای چەند ڕۆژێکی دیکە ئاپۆرای بەشان و شەوکەتی ڕکێفداران و لەشکری کامڕەوای بە ڕێگای سابلاغ و سندووسدا ڕۆیشتن بۆ لای ورمێ. مێرگ و چیمەنی گوندی گوێکتەپەی[1] یەک فرسەخی شاری ورمێ بە تاوڵ و خێوەتی وەکوو پۆلی ئەستێرەی ورشەدار ڕازایەوە. لەو کاتەدا خەڵکی مەڵبەندەکە کە چووبوونە

---

[1] - نووسراوە گوگتەپە و ناوێکی تورکییە و دەبێتە گردەشین. کورد کردوویەتی بە گوێکتەپە و گۆبتەپە.

پێشوازی ڕکێفی مبارەکی، دەستیان کرد بە سکالا و گازندە نژی زوڵم و زۆرەملییەکانی بەگوێردیبەگی ئەفشار کە بە نوێنەر و دەمڕاستی مسکێنان داندرابوو. پادشای کامڕەوا پاش دڵنیابوونەوە لە ڕووڕاستی هاواری جەماوەر، فەرمووی بڕۆن بیهێنن و کە هات بە دەستی خۆی پەتی خستە ئەستۆی و خنکاندیان. لە بابەت چاو بە سەر خەڵکەوە بوون و دادپەروەرییەوە زۆر پتەو و پێداگر قسەی بۆ فەتحعەلیخان کرد و ڕایئەسپارد کە بەو ڕەوتەدا بڕوا. پاشان لەوێوە هۆردوو دەنگ درا و چەند ڕۆژێک لە چیمەنی «کچەباش»ی مەحموودلوو بنە داگیرا. لەوێ داوای بەهادوربەگی سەرۆک و گەورەی تایفەی مەحموودلووی کرد و بە بیانووی خەتایەک کوشتی. لەوێشەوە کۆچی لێنا و چەند ڕۆژێک لە «خانەقای سوور» هۆردووبەزی کرد و پاشان بۆ گەشت و سەیران بەرەو ناوچەی سۆما و برادۆست، بەتایبەت قەڵای سەختەکەوانی «بانیە» و «بەردەڕەش» هەڵکشا کە لەو مەڵبەندە لە تەواوی قەڵاکان قایمتر و مەنشوورترە. دوای گەڕانەوە سەرلەنوێ خەڵاتی حوکمڕانی و پلەی سەرکردایەتی کردە باربووی فەتحعەلیخان و فەرمانی دا کە پێنجهەزار سواری ئەفشار و موقەدەم وەکوو نۆکەری دیوان ئامادە بکا و هەمیشە چاوی بە سەر سنوور و مەڵبەند و پاراستنی بارودۆخەکەوە بێ و خۆی بە کەبکەبە و دەبدەبەوە لە مێرگ و چیمەنی «قزقەڵا»وە کۆچاوکۆچ ڕۆیشت و پێینایە تەوریزی ناوەندی دەسەڵاتی [ئازەربایجان].

# فەتح عەلی‌خانی ئەرەشلوو

دوای رۆیشتنی نادرشا و رکێفدارانی، فەتح عەلی‌خان لەسەر تەختی دەسەلاتی ورمێ پاڵی داوە و کۆمەلی خانان و تێکرای پیاوماقوولان و سەرناسانی ئەفشاری ورمێی دڵخۆشی دانەوە و کەوتە سارێژ کردنەوە زامی دەروونیان کە هێندێکیان کەوتبوونە بەر شەپۆلی گورمی توورەیی نادری و دەستەیەکیان بە رووداوەکانی رۆژگار تاسابوون و بە رووت‌وقووتی و پەرێشانی مەودای ژیانیان هەڵدەبوارد. هەر کەس شانی چۆنی هەڵدەگرت دەستی گرت و ئەرک و مووچەی بۆ دیاری کرد. بۆ نموونە محەممەدکەریم‌خانی قاسملووی حاکمی پێشووی ورمێ و بارلم‌خانی ئەرەشلوو کە نادر لە رووناکایی چاوانی بێبەری کردبوون. هەروەها بێستوون‌خانی کوری باباعەلی‌بەگ، قاسم‌خان و موئمین‌خانی ئەفشاری ساین‌قەلا کە ئەویش بە فەرمانی نادری سۆمایی لە چاوان برابوو لەگەڵ تێکرای دەمراست و گەورەپیاوانی ئەفشار هەمووی بەسەر کردنەوە. میرزا جەعفەری ردێن‌سپی بەرەبابی ئیمانلوو کە مەشهوورن بە عەبدولمەلیکی کردی بە دەمراستی بەشی دارایی دیوان. میرزا جەوادی زێرین‌قەڵەمی خەتخۆش کە یەکێک بوو لە چاوناسانی تایفەی ئۆستاجلوو داینا بە سەرۆکی نووسینگەی داهات و دەرکەوتی حکوومەت. پلەی چاوەدێری کاروباری دامودەزگای حکوومەتی بەخشی بە میران‌بەگی کوری لۆهراسب‌بەگی مەحموودلوو. حکوومەتی ساین‌قەلا دیسانەوە بۆ محەممەدموئمین‌خان نوێ‌کرایەوە. دەڵێن لە ئەمیرانی ئەفشاری ورمێ بێجگە لەوانەی کەوتبوونە بەر غەزەبی نادری و کوژرابوون، لەو جەنگەیەدا هەژدە کەسیان کوێر کرابوون و ئەو قارەمانە زەردایی لە چاوان بریبوون. دیارە ئەمەش خودا دەزانێ... .

# مەهدیخانی ئەفشاری قاسملوو

پاش نەمانی نادر[1] سەرەنجام بشێوی و بارگژی بە پانەوە ئازەربایجانیشی گرتەوە. بە چەشنێک کە ئەمیرئەسلانخانی قۆرقلوو بە زۆرەملی ئالای دەسەلاتی لەو هەرێمە هەڵدا و لەبەروەی کە لە پیاوێکی ئازا و ڕەشیدی وەکوو مەهدیخانی ئەفشار دەترسا گرێی وەبەر کاری بێنێ، گرتی و دایە چنگ محەممەدحوسێنخانی کرایلی حوکمداری ئێرموان هەتا لای ئەو دەسبەسەر بێ. لە سەروبەندی ئاژاوەی «سام»ی گۆڕیندا، محەممەدحوسێنخان سەری لە حاند فەرمانی ئەمیرئەسلانخان بادا و بەپێچەوانەی ویستی ئەو مەهدیخانی ئازاد کرد و ناردییەوە ورمێ. هێندێک پێیانوایە کە ئاپۆرای ئەفشاران بە ئامارە و دنەی محەممەدحوسێنخان تەپیان داوەتە سەر بەندیخانە و مەهدیخانیان قوتار کردووە. هەرچۆنێک بێ، مەهدیخان وەکوو تیری سارەکەوان بەرەو ورمێ باڵی گرت و بە خۆی سەلماند کە بە هاوپشتی و یارمەتی تیرەی قاسملوو و ئەوانی تر، چ بە خۆشی بێ و چ بە ناخۆشی دەتوانێ کەولی حکوومەت لە شانی فەتحعەلیخانی ئەرەشلوو داماڵێ و دەریبەرێنێ و جێی بگرێتەوە. کاتێک فەتحعەلیخان ئەو هەواڵەی پێگەیی لەبەروەی خۆی بە تاقانە و ئازای زەمانە دەزانی و بەڕاستیش وابوو، هەر وەسەر خۆشی نەهێنا و بێخەیاڵ و بێخەبەر بۆی دانیشت هەتا مەهدیخان

---

[1] - نادرشا وەختایەک کە بە مەبەستی سەرکوتی سەرهەڵدانی کورددکانی خەبووشانی هەرێمی خوراسان لەشکری دەنگ دابوو، لە «فەتحئاباد»ی نیزیک خەبووشان، شەوی دووی جیمادی دووەمی ساڵی ۱۱٦۰ی کۆچی / ۱۱ی ژوونی ۱۷٤۷ی زایینی لە خێوەت و نوێنوبانی خۆیدا بە دەست تاقمێک لە ئەمیرانی ئەفشار و قاجار کوژرا. وشەدانی دیهخودا، بەرگی ١٤، ل ۲۲۱۰۰.

گەیشتە نیزیک ورمێ. خێڵی ئەفشار کە لە چەنگ ئاکاری ناڵەبار و چاوچنۆکی و لەچەری فەتحعەلیخان وەزاڵە هاتبوون، هاتنی مەهدیخانیان بە هەل و دەرفەتێکی رووناک و زێڕین زانی، کە نەجیمزادەیەکی خێڵی بەرزەچێ و جوامێرێکی بێهاوتا بوو. حەشامەتی ئەفشار بێئیزنی فەتحعەلیخان چوونە پێشوازی و بە شێوەیەکی شایان بەخێریان هێنا و بە دەورەیدا هەڵسووران. هەر کە پێینایە شارەوە بردیانە سەر کورسی دەسەڵات و دەستەونەزەری راوەستان. فەتحعەلیخان بەم رووداوانە تۆقی و لە ماڵی خۆی بنەی داگرت و رێگای هاتوچۆی لە هەموو کەس گرت. مەهدیخان لە کاتی دیداری گشتیدا، پۆلێکی نارد و فەتحعەلیخان و دەستوپێوەندەکانیان گرت و هەر ماڵ و سامانێکی کە بە کوێرەوەری کۆی کردبۆوە و بە رۆدی وەسەر یەکی نابوو، دەرکێشرا و بە سەر گەورە و گچکە و دەستەنگانی ئەفشاردا دابەشی و پاشان وێرای براکانی هەر کەس لە ماڵی خۆی دەس بەسەرکرا.

وا دەگێرنەوە کە پاش ئەوەی مەهدیخان ئاوا بە سووک و هاسانی توانی جڵەوی حکوومەتی ورمێ بە دەستەوە بگرێ، جەماوەر بردیانە مزگەوتی گەورە و مامۆستا بەپێی داب و نەریت خودبەی دا و قاڵەزی مەهدیخانیشی خوێندەوە کە دەیگوت، خان بە زەبری شمشێری خۆی بۆتە حاکمی ورمێ نەک بە فەرمانی ئەمیرئەسلانخانی حوکمڕانی ئازەربایجان.

بەکورتی لەو سەردەمەدا تاقمێک لە خێڵ و عەشیرەتەکانی سەرسنوور ـوێرەی دابی کۆنی خۆیان، هەڵمەت و پەلاماریان دێنا و هەڵتۆزهەڵتۆزیان دەکرد. مەهدیخان لەگەڵ جەماوەرێکی بەرچاوی ئەفشاران هەڵیکردە سەریان و ئەوەندەی برستی بوو دەستی چاکی لێوەشاندن.

❖❖❖❖

## شەڕی ئەمیرئەسلانخان لەگەڵ مەهدیخانی حاکمی ورمێ و گەمارۆدانی و ئاشتبوونەوەی مەهدیخان و فەتحعەلیخان

پێشتر باسی کرا کە ئەمیرئەسلانخان بە هێزی شان و باهۆی خۆی توانی دەسەڵاتی بە سەر ئازەربایجاندا بشکێنێتەوە. لەم کاتەدا کە دوای کوژرانی نادر گێرە و کێشەی کەلەوەکێشی برایمخان لەگەڵ عادڵشای برای سەری هەڵدا، برایمخان بە ئامانجی شکاندنی، داوای یارمەتی لە ئەمیرئەسلانخان کرد و وەختایەک بەزاندی، ڕاستوخۆ سەرکردایەتی سپای ئازەربایجانی دایە دەست ئەمیرئەسلانخان.

لەم لایەوە پاش ئەوەی مەهدیخان بەخت باڵی بە سەر کێشا و توانی لەسەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ دابنیشێ و فەتحعەلیخانی ئەفشاری ئەرەشلوو بخاتە کۆت و بەندەوە، دەستەیەک گێرەشێوێنی دووزمانی تایفە چوونە بن کلێشەی مەهدیخان و دە گوێیان سرەواند ئێستا کە لە سایەی خوداوە توانیوتە دوژمنێکی ئاوا بەهێز بشکێنی، ڕاگرتن و نەکوشتنی هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نیە و بەڵکوو شەڕ و گەڕ و کەتنی گەورەی لێدەکەوێتەوە. مەهدیخان بەناچار فەرمانی کوژرانی ئەو دلێرە ناودارەی دا. تیرەی ئەرەشلوو کە بەدڵ فەتحعەلیخانیان خۆشدەویست هەڵتەزینەوە و کەوتنە دەربڕینی نارەزامەندی و لە حەسەنخانی باوکی مەهدیخانیان ڕاسپارد کە کورەکەی خۆت ئامۆژگاری بکە و مەهێڵە پەنجە بەرێ بۆ ئاکاری ئاوا نزێو و نالەبار. حەسەنخان لە نوو بە نوویدا بە مەهدیخانی گوت: کورم، فەتحعەلیخان حاکمێکی سەربەست و یەکجار پایەبەرز بوو، ئێستا کە یەزدانی مەزن بەوپەڕی

سووک و هاسانی و بێکوێرەوەری تۆی بە سەردا زاڵ کردووە و دەسەڵاتی باربوو کردووی، وا چاکە بە شوکرانەی ئەم خەڵاتە گەورە و بایەخدارە نەیکووژی. کورم کوشتنی حاکمی پێشوو ناکامی پێچەوانە و خراپی لێدەکەوێتەوە و ئەوەندەی بزانە کە ئەمیرئەسلانخانی حوکمداری ئازەربایجان بەرۆکت دەگرێ و تیرەی ئەرمشلووش کە زۆر گەورە و بوێرن دڵیان دێشێ و ڕووت لێوەردەگێڕن.

مەهدیخان ئەگەرچی پەند و ئامۆژگاری شایانی باوکی بەڕێزی بەپێچەوانەی پێشکەوتنی حکوومەت و بە کۆسپی سەرمەرێی سەرۆکایەتی دەزانی، بەڵام لەڕێوە بە گوێی کرد و فەتحعەلیخانی نەکوشت و چەشنی شێری نێو بەندی قەفەقەفی زنجیر ڕایگرت. کاتێک ئەم ڕووداوانە بە گوێی ئەمیرئەسلانخانی حوکمداری ئازەربایجان گەیشتنەوە کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەنگی دەهۆڵی دەسەڵاتی بەرزتر دەبۆوە و گرمە و زرمەی پتر دەنگی دەدایەوە، پرپشکاندنی و کەفیچاند، چونکە تەنینەوەی دەسەڵاتی مەهدیخانی بە دڵەوە نەدەنووسا و فەتحعەلیخان لەسەر داوای ئەو کرابوویە حاکمی ورمێ. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە ئەگەر بێتوو مەهدیخان بتاسێنێ و ببەزێنێ و فەتحعەلیخان لە زیندان دەربێنێ، بە هۆی پشتی ئەو هێز و برشتی لە ئازەربایجاندا باشتر پەلوپۆ داوێ و چاکتر گەشە دەکا.

ئەوسا شەهریارخانی کوڕی سەفیبەگی ئەفشاری گۆندوزلوو کە دەستوپێوەندی خۆی بوو ڕاپەسپارد تا بە ڕێگای مەراغەدا باژوێ و لەگەڵ بەماوەری کوردانی موکری و بلباس بەپێی فەرمانی ئەمیرئەسلانخان لە ناوچەی دۆڵ هۆردووی بخا و دەنگ و هەرای بزووتنی ئەمیرئەسلانخان بۆ ڕزگار کردنی فەتحعەلیخان بلاو بکاتەوە و بیگەیەنێتە گوێی مەهدیخان و خەڵکی ورمێ. شەهریارخان دوای چوونی بۆ ناوچەی مەراغە و سابلاغ، لە ماوەی چەند ڕۆژاندا سێهەزار چەکداری چاونەترسی زرێپۆشی نێزەداری لەو

هۆز و عێلانە کۆ کردەوە و لە گوێی چۆمی گادەر[1] لەنگەری خست و خەبەری ناردەوە بۆ ئەمیرئەسلانخان. ئەویش میرزا محەممەدعەلی ئەفشاری پیاوی خۆی وەکوو کەیخودا ناردە ورمێ و لە مەهدیخانی ڕاسپارد کە فەتحعەلیخان بەربدا و مل وەبەر چەلەمەی دەسەلات بێنێ، دەنا ئامادە و گوێقولاغ بێ کە ئێمە وەکوو لافاوی بەلووزەو لە کەلی قوشچی و قولنجیرا شۆڕدەبینەوە. پاشان خۆشی لە دواوەرا وێڕای هێزی ئەفغان و سپای خوراسان بەرەو ورمێ کەوتەڕێ.

لەم لایەوە کاتێک میرزا محەممەدعەلی گەیشتە ورمێ و ڕاسپاردەی ئەمیرئەسلانخانی گەیاندە مەهدیخان، حاکم وەکوو گڕالک گڕی گرت و بە گاڵتە و جەفەنگ گوتی: میرزا تۆ لە نێو زنجیرەی خێڵی ئەفشاردا پیاوێکی نەجیم و سەربەدەرەوەی ڕۆژگاری و بێگومان ئەگەر هاتوو ئێمە گیرۆدە بووین، لای ئەمیر ئەسلانشا! تکامان بۆ دەکەی. میرزا محەممەدعەلی بەختوەرگەڕاو گوتی: سەردار ئەو پیاوەی کە منی وەکوو ڕاسپاردە ناردووە، ئەمیرئەسلانخانی حوکمڕانی ئازەربایجانە و بۆ جەفەنگ نابێ. هەر ئێستا شەهریارخانی گۆندوزلوو وێڕای سێهەزار سوارەی کوردی نێزەدار لە بالی سندووسەوە دێ و خودی ئەمیرئەسلانخانیش بە دەریایەک لەشکرەوە لە تەوریزەوە داوەریوە. مەهدیخان دەرهەلبوو هەرای کرد جەللاد بێ و خێرا لەو کۆڕەدا دەستێک و زمانی میرزایان پەڕاند. هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە وێڕای کۆمەڵێکی بەرچاو، بۆ وێنە لەگەڵ حەوسەد کەس لاوی ناودار و پیرانی پڕچەک و بەکار، کە شێرانی مەیدانی بەرەنگاری بوون، بەرەو سندووس ئەسپی لینگ دا و جمی. لە هیچ شوێنێک شەوەری نەکرد و بەریبەیانی وەکوو بەلای لەناکاو یان هەورەتریشقەی بەگڕ و تین و تاو، خۆیان بە قوشەنی شەهریارخانی گۆندوزلوو دادا و ئەوانیش بە نێزەی ئاورینگدار و شمشێری تیژی جەوهەردار

---

[1] - لە دەقی فارسیدا نووسراوە «گۆدار».

لێیان وەدەس هاتن و کەوتنە بەرەنگاربوونەوەی خێڵی ئەفشار. لە هەموو لاوە کڵی ئاگری شەڕ و لێکدان وەها نێڵ درا کە دەتگوت ڕۆژگار و زەوی کەوتوونە جۆ لانە. مەهدی‌خان کە تاقەسوارەی مەیدانی ئاودرەوشانەوە و ناوزڕان و ئەهەنگی نێرینەی گۆمی شەڕ و لێکدان بوو، وەکوو شێر نەڕاندی و هەڵینگی دایە دەریای لەشکری بێ‌ئامان. لەو لاوە شەهریارخان و حاجی‌خانی برای وێڕای کوردانی دڵڕەق، شەڕی پیاوانە و ئازایانەیان دەکرد و چاکیان خۆ دەنواند، بەڵام سەرەنجام شنەی سەرکەوتن و باڵادەستی ئاڵای مەهدی‌خانی شەکاندەوە. ئاژاوەگێڕان تەق‌ورەویان تێکەوت و بوو بە هەڵاتهەڵاتی سواران و خەنیمەتێکی زۆریان بە دەستەوە دا و بلباس و موکری داڕووتان و خەزاکەرانی ئەفشار پێی خەنی بوون. هەر لەو تێکهەڵچوونەدا شەهریارخان و حاجی‌خان گیران. بەکورتی مەهدی‌خان سەربەرز و سەرکەوتە گەڕایەوە ورمێ و کاتێک گەیشتە مێرگ و چیمەنی ئاوایی گوێگتەپە بیستی کە ئەمیرئەسلان‌خانی سەردار بە خۆی و لەشکرێکی بێ‌هەژمار لە مێرگۆلانی گوندی قەرەحەسەنلووی نیوفرسەقی شار چادر و ئاوڵی هەڵداوە و چیغی ڕانەنگاوتووە و هۆردووگای داناوە. لەبەرەوەی خەزاکەرانی ئەفشار شل و شەکەتی مەیدانی بەرەنگاری بوون، بەناچار ئەو شەوە دەنگیان نەکرد و چوونەوە شار و شەهریارخان و حاجی‌خانی برایان خستە کۆت و بەندەوە. مەهدی‌خان ئەو شەوە دانەسەکنی و هەتا کازیوەی بەیانی هەر خەریکی ڕێکخستن و ئامادە کردنی چەک‌وچۆڵ و ئامرازی ـبەرەکانی بوو. جەنگەی بەیان بەربوون لەگەڵ قۆشەنی تێر و تەیار بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەمیرئەسلان‌خان لە شار دەرکەوت. کاتێک هێزەکانیان ئاوقای یەکتر بوون وا تێکهالان کە کار کەوتە شەڕی دەستەوەیەخە و شیرنگ‌وهۆڕی شیران و ترازانی کۆستەی خەنجەران و هەژانی نێزان. بەڕاستی هەردک لا ئازایەتی و پاڵەوانەتیان نواند. بەکورتی ماوەی حەفتا ڕۆژی

بێ‌پسانەوە شەڕ و کێشە درێژەی کێشا و سەروەی سەرکەوتن بەیداخی هیچ لایەکی نەشەکاندەوە.

دەڵێن فەتحعەلی‌خانی ئەرەشلوو لەم ماوەیەدا وەکوو شێری نێو قەفەی زنجیر دڵی لێی‌دەدا بۆ نێچیر و هەموو ڕۆژێ هەراوهوریای شەڕ و تەقەی تفەنگانی وەبەرگوێی دەکەوت. بۆیە ڕۆژێکی لە حەسەن‌خانی کۆنەساڵی جیهاندیدەی باوکی مەهدی‌خانی ڕاسپارد کە لە زمان منەوە بە مەهدی‌خان بڵێ بەڕاستی ئاوا ژیانم لێ‌هەڵگیراوە و چیدی تاقەتی بیستنی هاوار و ڕۆڕۆ و ناڵەی ژنانم نەماوە. تکای لێدەکەم ئەو کۆت و بەندە لەسەر شان و پیلی ئەم شێرە پیرە هەڵگرێ و چارەی کاری ئەمیرئەسلان‌خان و هۆزی ئەفغان بە من بسپێرێ، ئەگینا با سەرم لە قەلای لەشم جوێ کاتەوە. مەهدی‌خان وەختایەک لە زمان باوکییەوە ڕاسپاردەی فەتحعەلی‌خانی بیست، سەری دەبەر خۆی نا و تاوێک لە بیران ڕاچوو. پاشان بە میرئاخوڕی خۆی ئەسپارد کە یەکسمێکی تەپ و نالەبار بدا بە فەتحعەلی‌خان و لە گۆشەیەکی مەیدان وەکوو قەرەوڵ دایبنێ. بۆ بەیانی کە تەنووری شەڕ تینی تێکەڕا و گەرم داهات، فەتحعەلی‌خانیش لەسەر پشتی ئەسپێکی کز و لەجەر لە سووچێکی مەیدان چەقیبوو و دەیڕوانی. لە جەنگەی تێکهەڵچوون‌دا پێشەنگانی ئەفغان سەرکەوتن و هێزەکانی ئەفشاریان هەس دایەوە. وەختایەک مەهدی‌خان ئاوای بینی پیاوانە ڕاوەستا و هەڵمەتی بردە سەر تاقمی ئەفغان، بەڵام خێرایەکی دەرفەتیان لێ‌هێنا و بە چاردە پیاوان دەورەیان تەنی و ویستیان کۆتایی بە ژیانی بێنن. فەتحعەلی‌خان غیرەتی عێلاتی بزووت و هەی‌دێی لە یەکسمی کەلاکی کرد و تاوی دا و تەوری هەڵسووڕاند و بە گژ ئەفغانان‌دا چۆوە. بە زەبری دەستی، سوارەکانی دەوری مەهدی‌خان چەشنی ئەستێرەی حەوتەوانە لێک‌بڵاو بوون و مەهدی‌خان لە چنگیان دەرباز بوو. ئەمیرئەسلان‌خان کاتێک جوان خوردبۆوە فەتحعەلی‌خانی بە نیشانەی تەورەکەیەوە ناسییەوە و ئاواتی بوونە بڵقی سەر ئاو، چونکە زانی کە ئەو دوو

شێرە سڕ و ئازایە دیسان یەکتریان گرتۆتەوە و پالیان وەیەکتر داوە. بۆیە هەر ئەو شەوە لە مێرگۆلانی قەرەحەسەنلوو هەستا و سەری ڕکێفی وەرسووڕاند و بەرەو تەورێزی ناوەندی دەسەلاتی تێی‌تەقاند.

لە پیرەپیاوەکانی ئەفشاریان بیستووە کە دوای ئەوەی مەهدی‌خان بە هاوکاری و یارمەتی فەتحعەلی‌خان لە چنگ تۆرەمەی ئەفغانان ڕزگاری دەبێ و بە قوونەشەڕ بەرەو بازێر دەبێتەوە، هەتا بەر دەروازەی بالوو لە شەرمی فەتحعەلی‌خان سەری هەلناهێنێ و ئارەقەی پێدا دێتەخوار. بەلام لەپڕ ڕووبەڕووی فەتحعەلی‌خان دەبێ و هەستی دەبزوێ و باوەشی پێدا دەکا و هەردک چاوی ڕادەمووسێ و دەلێ: ئەی کەلەمێر بەڕاستی دایکی ڕۆژگار کەم پیاوی وەکوو تۆی لە داوێنی بەربۆتەوە و پەروەردەی کردووە. شوکرانە و سپاس بۆ خوداوەندی تاقی تەنیا کە قارەمانێکی چەشنی تۆی لە نەبوونەوە هێناوەتە نێو جەغزی بوون. ئێستا تێماوم و نازانم چۆن بە مەردی و ڕەندی تۆ هەلبلێم و زمانم لەنگ‌ولۆرە و دەبێ چۆنت چاکە بدەمەوە. جێی خۆی بوو کە تەورێکیشت لە سەری من دابا و تۆلەی دەرد و مەرەدی خۆت لێ‌کردبامەوە. فەتحعەلی‌خان لە ولامی‌دا دەلێ: ئەی بەڕێز شوکر بۆ خودا کە لە سایەی سەری تۆوە شەرەف و نامووسی خێل و خەلک پارێزراوە و دەستی ناپاک و خەیانەتباری خەنیمی نەگەیوەتێ. خودای نەخواستە ئەگەر سایەی موبارەکی ئێوە کەم بووبایەوە ناموس و ناوبانگی ئەفشاران با دەیبرد و کوێرەوەری و نەهامەتی چەند سالە دەفەوتا و بە خۆڕایی دەچوو. بەڕاستی لەو جەنگەدا دەماری خێل‌خۆشەویستیم بزووت و خۆم بۆ ڕانەگیرا و نەمتوانی بێ‌لایەن بم.

مەهدی‌خان بەم قسانە گرێی نێوچاوانی ڕەوین و گەشایەوە و لەگەل فەتحعەلی‌خان شان‌بەشان و ڕووگەش و لێو بە خەندە گەڕایەوە بنکەی دەسەلاتی. هەر کە گەیشتەوە کەس‌وکار و براکانی فەتحعەلی‌خانی لە گرتووخانە ئازاد کرد و بە دیاری و خەلاتی شیاو و گرانبایی دلی‌دانەوە. پاشان

بەگوێرەی سیایی تۆمارکراو، هەر شتێکی لە سامان و نێومال و دارایی بەرێزیان بەخشرابوو بە ئەفشاران، هەتا قـڕانی ئـاخر و بگـرە دووهێندەشـی بـۆ ڕەت کردەوە. نێوان‌ناخۆشی و دووبەرەکایەتی وەسەر خۆشەویـستی و دۆسـتایەتی گەڕا. پەیمانی پتەویان بەست و سوێندیان لەسەر خـوارد کـە لـەوەی بـەولاوە وەکوو برایان بۆ ڕێکخستنی کاروباری مەڵبەند و گەشە و نەشەی ژیانی خـێڵ و خەڵک بەوپەڕی تواناوە تێبکۆشن و هەنگاوی پێویست باوێن.

## شەڕی برایمخانی برازای نادر لەگەڵ ئەمیرئەسلانخان و بزووتنی بەپرتاوی مەهدیخانی حاکمی ورمێ بۆ یارمەتیدانی برایمخان و پاڵدانەوەی لەسەر تەختی دەسەڵاتی ئازەربایجان

ئەو ماوەیەی کە ئەمیرئەسلانخان دەورەی قەڵای ورمێی دابوو و لەگەڵ مەهدیخان شەڕی دەکرد، مەهدیخان بە نووسینی کاغەزێکی پڕ گلەیی و گازندە بۆ برایمخان داوای یارمەتیدانی لێکردبوو. برایمخان کە خەیاڵی وابوو ئەمیرئەسلانخان بشکێنێ و تۆزی لێ بە با کا، ئەم بیانووەشی خستە سەری و لە هەمەدانەوە لەشکری دەنگ دا بۆ ئازەربایجان. کاتێک ئەم هەواڵە لە ورمێ گەیشتە لای ئەمیرئەسلانخان، دەستی لە گەمارۆ و شەڕی مەهدیخان هەڵگرت و سەری جڵەوی بەرەو تەورێز وەرسووڕاند. لەم کاتەدا فەرمانێکی لە لایەن برایمخانەوە پێگەیشت کە دەبێ خێرایەکی تۆقی پێملبوون بخاتە ئەستۆی و بچێتە خزمەت ڕکێفی. ئەمیرئەسلانخان فەرمانەکەی بردەوە پاش و خۆی ساز کرد بۆ بەرەنگاری و شێلگیر و پتەو شاری تەورێزی بەرەو مەراغە کوتا. لە مێرگ و چیمەنی «لەیلان» لەشکری زۆر و زەوەندی بنەی خست. برایمخان کە بە ڕێگای سایینقەڵادا کۆچاوکۆچ دەهات، لە مەودای ڕێیەدا نامەیەکی ئاوای نووسی بۆ مەهدیخانی ئەفشار: ئێمە ئێستا بۆ گوێبادان و شکاندنی ئەمیر ئەسلان بەڕێوەین، فەتحعەلیخان وەکوو بریکار لە جێی خۆت دابنێ و حکوومەتی ورمێی بدە دەستی و خێرایەکی بە هەموو هێز و تواناوە بگە لامان لە مەراغە.

چونکە مەهدیخان ئەم کارەی بە درەوشانەوەی تەخت و بەختی دەزانی، لە میاندواو خۆی گەیاندە ڕکێفی برایمخان. لەوێوە یەکدڵ و یەکزمان بە مەبەستی چوونە شەڕی ئەمیرئەسلانخان لووزەویان بەست و خۆیان گەیاندە

چیمەنی «لەیلان». هەر کە بوو دەریای لەشکر تێکهەڵەنگووتن، شەڕێکی قورس قەوما و لە هەردک بالانەوە ئازایەتی ئاشی بە بای دەنایەوە. لەبەرەوەی دەسەڵاتی پێنج‌ودوو ڕۆژەی ژیان ڕووی لە ئەمیرئەسلانخان وەرگێرابوو، لە گەرمەی تێکهەڵچوونا کۆمەڵی [کوردی] شوقاقی پشتیان تێکرد و سەری جڵەویان بەرەو قۆشەنی برایمخان هەڵەنگاوت و زۆریان پێشوازی لێکرا. جەماوەری عێراقیش چاویان لە شوقاقییان کرد و چەشنی دڵۆپ چوونە نێو دەریای لەشکری برایمخان. وەختایەک ئەمیرئەسلانخان باروبۆخەکەی ئاوا هاتە بەرچاوی، بە تەگبیری کازمخانی قەرەچەداغی (قەرەچەداغی) ڕێی ڕاکردنی هەڵبژارد و بەرەو قەرەچەداغ ڕەوی. لەشکری برایمخان سپا و هۆردوو بەزی لێ‌تالان کرد. پاشان برایمخان بە شان و شەوکەتی شابانەوە پێی‌نایە شاری تەورێز و مەهدیخانی بە دیاری و خەڵاتی میرانە بەسەرکردەوە و بەگلەربەگایەتی تەورێزی باربوو کرد. برایمخان دیوانبەگی براشی کە وێڕای مەهدیخان بوو، خەڵاتی دایە و کردی بە سەرکردەی ئەفشارەکانی ورمێ، چونکە لە شەڕی لەیلاندا گەلێکی ئازایەتی نواندبوو. کاتێک ناوبانگی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتی برایمپادشا گۆشە و کەناری وڵاتی گرتەوە، ئەمیرانی ئازەربایجان گەلێکیان دیاری و پێشکەشی هێنایە بارەگای میری و بە خەڵات و پلە و پایەی شیاوی شانی خۆیانەوە گەڕانەوە. بۆ وێنە کازمخانی قەرەچەداغی کە وێڕای ئەمیرئەسلانخان لە چیمەنی لەیلان هەڵاتبوو، ناوبراوی بە دەس‌بەسەری هێنایە خزمەت برایمپادشا و پاساوی بۆ لێبووردنی تاوانەکانی خۆی هێنایەوە و گوتی: دیاری شوانەوێڵە ئاڵەکۆکە!

دەگێڕنەوە وەختایەکی ئەمیرئەسلانخانیان بردۆتە هەوێڵی برایمپادشا، ساری ئەسلانی برای کەوتۆتە لالانەوە و پاڕانەوە لەبەر میر و بەگلەرانی بارگا. ئەمیر ئەسلان کە پیاوێکی بەغیرەت و زۆر ڕەشید بووە، تووڕ دەبێ و دەرهەڵدەبێ و دەنگی هەڵدێنێ و دەڵێ:

سەت زیندووی سەرشۆڕ دێنێ، مردوویەکی بەناوبانگ

برایمپاشا وەختایەک چاوی بە ئەمیر ئەسلان کەوت بــە گــڕی‌دا هــات و تێی‌ڕاخوڕی و بە سەری‌دا گوڕانــد و گــوتی ئــەمیر ئەســلان تــۆش بانگەشــەی پادشایەتیت دەکرد و دەهۆلی فەرمانڕەوایەتیت دەژەنی. بۆ چما نەتبیستووە کە خواجە حافزی غەیبزان، ڕەحمەتی خودای لێبێ فەرموویەتی:

هەرکەسێکی بە گڕی، کلاو بــە لاری دانــێ

پێی وانەبێ کە میرە و لە سەروەریی دەزانێ

ئەمیرئەسلان‌خانی بەختوەرگەڕاو لە جوابی برایمشادا گوتی بــڕۆ هــەتا ماوی هەر دۆعایە بکە بۆ قەرەمەهدی ئەفشار کە لــە پــشتەسەرت ڕاوەســتاوە و چاو و گوێی کەوتوونە بەر حوکم و فەرمانت، دەنا ئــەتۆ ڕێــت‌نەدەکــەوت کــە ئەسلانێکی وەکوو من لێرە بەپێوە ڕابگری و بە قسەی تــاڵ و ســوێر بیچزێنــی. ئێستا کە هەلت بۆ ڕەخساوە و سکەی دەسەڵاتی پێنج‌ودوو ڕۆژە بە ناوی تــۆوە لێدراوە، ملم کەچە لەبەر قەڵەمی چارەنووسی پەروەردگار:

هەر ئێستێ سەرم ببڕە، چون حوکم حوکمی تۆیە

برایمپاشا کە دەروازەی دیداری بۆ خواروژووری جەماوەر خستۆتە سەر گازەرای پشت، کوا لە حاند ئەو قسانە خۆی بۆ ڕادەگیرێ؟ هــەر لــەڕێوە هــەرا دەکا پەتکان بێنن و بە دەستی خۆی دەیانخاتــە گــەردنی ئەمیرئەســلان‌خــان و ساری ئەسلانی برای و دەیانخنکێنن و گۆڕەهوویــان دەکــەن. هــەر لــەو ڕۆژەدا مەهدی‌خانی ئەفشار نازناوی «قــەرەقلیچ»ی بــاربوو کــرا. بــەکورتی هێنــدەی پێەچوو کە لە هەرێمەکانی ئازەربایجــان، کوردســتان، لوڕســتان، فــارس و لەنگەرگاکانی کرمان و هەروەها لە ڕەگەز و تۆرەمەکانی ئــەفغان و ئۆزبــەک، جەماوەرێکی یەکجار زۆر کۆبوونەوە و ژمارەی قۆشەنچییانی ســەری گەیــشتە ١٢٠هەزار کەس.

❖❖❖❖

# کوژرانی مەهدیخان و بڕانەوەی دەسەڵاتی

هەروەک پێشتر باسمان کرد، برایمپاشا، مەهدیخانی ئەفشاری کردە فەرمانفەرمای ئازەربایجان و لە تەورێزی سەقامگیر کرد و پاشان بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی شاروخشا بەرەو خوراسان ڕۆیی. مەهدیخان دوای ڕۆیشتنی ئەو، عەلیمرادخانی برا چووکەی خۆی کردە بریکاری حکوومەت و بێلەمپەر و بەرگر جڵەوی دەسەڵاتی دایە بەردەستی. عەلیمراد کە تازە دەگەیشتێ و هێشتا تەواو سارد و گەرمی ڕۆژگاری نەچێشتبوو، بەگوێرەی هەرەتی گەنجی کە چاخی ڕابواردن و کامەرانییە ئەسپی ئاواتی لینگ دا و تووشی هێندێک ئاکاری چەوت و نالەبار بۆوە و ئاگای لە کاروباری حوکمڕانی نەما. بۆیە کاربەدەستان وەخۆ کەوتن و ملیان نا لە زوڵم و زۆرەملی و چەوساندنەوەی خەڵک. جەماوەری ئەو هەرێمە کە پاش کرووسانەوەیان بە جەنگ لەشکری برایمپاشا و تەنینەوەی تەوژمی تەنگەژە و گرانی، وەگیان هاتبوون و کێردیان گەیبوویە یەسقانی، ئیدی بڕستیان نەمابوو کە شان بۆ چرووسانەوە و کەلەزەری ئاقەتپرووکێنی مەهدیخان شل بکەن. هەر بۆیە هەمیشە لە دەرفەتێک دەگەڕان لێیهەڵگەڕێنەوە و بیبڕنەوە. سەرەنجام وردەوردە هەواڵی شکانی برایمشا و چارەنووسی بڵاوبۆوە و هەلی دڵخواز ڕەخسا. لەم کاتەدا میرزا محەممەدڕەزا ئەفشار کە مەهدیخان دەست و زمانی میرزا محەممەدعەلی باوکی لەسەر شوو لێهەڵکێشان و زۆرەوەری بڕیبوو، لەگەڵ ئاوانباران و لات و شەلاتی تەورێز دەستی تێکەڵ کرد و بوو بە یەکئامانج لەگەڵیان و ئاگری کەتن و ئاژاوەی گەشاندەوە. میرزا محەممەدڕەزا کە ببوو بە

وەزیری مەهدیخان، شەوێکی کە لەگەڵ حاجیبابای سەردەستەی لاتەوپاتـەی تەورێز کـۆڕی بـاس و ڕاوێژیـان بـە خواردنـەوەی مـەی و بیـستنی گـۆرانی ڕازاندبۆوە، بە هەوای مەستی ڕووی لـە دانیـشتووانی کۆڕەکـە کـرد و گـوتی: هەڵبەت ئێوە دەزانن کە من پرێسکەی ڕازی مەهدیخانی حوکمڕانم و دەزانم چی لە دڵدایە. ئەم ڕۆژانە کۆمەڵێک خەڵکی تەورێزی یەکیەک ناونووس کردوون و دەیهەوێ بیانگرێ و خاشەیان بکێشێ. چەقۆکێش و چەپەڵکاران بە بیستنی ئـەم گوتەیە تووشی پەشێوی و دڵەڕاوکە بوون و یەکدڵ و یەکزمان سـاغ بوونـەوە لەسەر کوشتنی مەهدیخان. چەندین کۆبوونەوە و دیدار و هاتوچۆیان کرد هەتا شەوێکی بەرلەوەی گزینگی هەتاو تروویکی چیا بنگێوێ، خۆیان لـە چـەکاندا ڕمشهەڵگێرا و بە کۆمەڵ هرووژمیان بردە سەر حەوشەی مەهدیخان. لەبەرەوەی کێشکچی بلاوەیان لێکردبوو، بە پرکێشی تێراچوون و پێیاننایە ئەنـدەروونیی خان و چەند نۆکەر و غولامێکی بەستەزمانیان کوشتن. مەهدیخانی خوێنگیرتوو بە هاوار و قیژەی حەرەمخانە لە شیرنخەوی بێخەبەری ڕاپەڕی و ڕایکـرد. لـە نێو شریخوهۆڕی تفەنگاندا، لەناکاو بەهدیخان گوللەیەکی وەسینگی کەوت و بێسێودوو فریشتەی پێمردنی گەییە سەری و گیانی دەرچـوو. بەڵـێ بەراسـتی چارەنووس چی لەگەڵ ناکرێ و بەری پێناگیرێ. لەڕێوە لەگەڵ عەلیمرادی برای شڕیان کردن و کەلاکیان فڕێدانـە دەرەوە. کۆمەڵـی ئەفـشار بـە دیتنـی ئـەم بارودۆخ و دیمەنە بلاوەیان کرد و هەر کەسەی پەرەوازە بوو بۆ لایەک. ئەوسـا ئاژاوەگێڕانی تەورێز کەلوپەل و نێومالی مەهدیخانیان تالان کرد. بەلام مـیرزا محەممەدڕەزای وەزیر کە ڕێگای ئەم کـارەی خـۆش کردبـوو، لەبـەر هێنـدێک بەرژەوەندی خاوخێزانی خوابەخشیوی کـوژراوی پاراسـت و نەیهێـشت کـەس دەسدرێژییان بکاتە سەری و داوێنی پاکیان پەڵەی لێبنیشێ و بـە شـێوەیەکی کاتی تەرمی مەهدیخان و براکەی ناشتن.

دەڵێن ڕۆژێک بەر لە کوژرانی مەهدیخان، ژنێکی تەوریزی کە هاتوچۆی ئەندروونیی حکوومەتی دەکرد، دەچێتە لای خان و بە خزمەتی ڕادەگەیەنێ کە کۆمەڵێک پیاوخراپ و ئاژاوەچی دەیانهەوێ بتکووژن. مەهدیخان وەیزانی خوازەڵۆکە و بە ژنەکەی خۆی گوت شتێکی بدەن بەم ئافرەتە! ژنە گوتی بە زاتی خودا من سوالکەر نیم و هەر لەبەر دەولەتخوایی و نەمەکپەروەردەیی ئەم خەبەرەم هێناوە. مەهدیخان باوەڕی نەکرد هەتا ئەم ڕووداوە بۆ بەیانەی ئەو شەوە قەوما و وەڕاست گەڕا. کاتێک پیاوکوژان چوونە ژووری حەرەمخانە، مەهدیخان بە خزمەتکارەکانی گوت، ئاژاوەچی بە دوای شەڕەخۆریدا وێڵن و هەرچی کاڵای چاک و باشە بۆیان بخەنە حەوشە هەتا ئەوان خەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەل دەبن، منیش خۆم کۆ دەکەمەوە و چەکم دەست دەدەمێ. کارەکەر و خزمەتکار وایان سەر لێتێکدەچێ کە چەکوچۆڵی ئەویش دەپێچنەوە و دەیهاوێنەدەر. مەهدیخان قوتوولەیەک تیری وەبەر دەستی دێ و چەند کەسان دەگەوزێنێ، بەڵام کاتێک هیچی پێنامێنێ، بە کۆمەڵ تەپی دەدەنە سەری و وسنەی لێدەبڕن.

## نەقی ئەفشار

کاتێک هەواڵی کوژرانی مەهدیخان گەیشتە نەقیخانی برای کە ئەو لە ورمێ کردبوویە حاکم، بۆسۆی لە جەرگ و هەناوی هەستا. چەند ڕۆژێک لەگەڵ خێڵ و خانەدان سەرقاڵی سەرەخۆشی و تازیەداری بوو. پاشان لەگەڵ فەتحعەلیخانی ئەرمشلوو سەبارەت بە تۆڵەکردنەوەی برای کەوتە ڕاوێژ و لەشکرێکی ئەفشارانی کۆکردەوە و یارمەتی خواست لە شابازخانی دونبولی [کوردی] حاکمی خۆیە و ئازادخانی سەرکردەی ئەفغان کە لە ناوچەی «شارەزوور» سەر بە قەلاچوالان[1] بنەی داگرتبوو. کاتێک تێکرای ئەمانە لێکتر هالان، بە چەکوچۆڵ و جبەخانەوە بە ڕێگای سندوسدا بەرەو تەورێز بزووتن. وەختابەک خەلکی تەورێز بە هەستانی قۆشەنی نەقیخان و تەمای ئەویان زانی، تووشی سلم و سەرسوڕمانێکی سەیر بوون. بەناچار کەوتنە دابەستنی قەلا و تەگبیر لێکردن، چونکە هێزێکی دەسکەڕەوەی وایان بە دەستەوە نەبوو کە بتوانێ بەرەنگاری پەلامارەدران ڕاوەستێ. فەلا و جووتیارانی نزیک، ئەگەرچی وەرزی هاوین و جەنگەی دروێنە و کۆکردنەوەی خەلە و خرمان و بەرهەم بوو، دەستیان لێهەلگرتن و لە ترسی گیانیان بە خاوخێزانەوە چوونە بازێری تەورێز. لە مەودای ڕێگادا ئەگەر تۆرەمەی ئەفغان تووشیان دەبوون ئەوەندەی بۆیان دەکرا دەستیان لێنەدەپاراستن و ئەو بێچارانەیان دەکوشت یان بە دیلیان دەگرتن.

نەقیخان بەو لەشکرە بێئامانەوە شاری تەورێزی لە هەموو بالانەوە دەورە دا. ئاگری تۆپ و خۆمپارە بە سەر خەلک و دانیشتووانی قەلادا کەوتە بارین و شوورەی دلی گەمارۆدراوان لەبەر زرموکوت و ژاوەژاوی قۆشەنچییان

---

1 - نووسەر نووسیویەتی قەراچۆران.

رادەژا. بەکورتی چل شەو و ڕۆژ ئاوا تێپەڕی و لەبەرووەی سەرۆکانی تەورێز پێشتر بە نامە و ڕاسپاردە داوای کۆمەگیان کردبوو لە کازمخانی قەرەجەداغی، پەناخانی جەوانشێر، ئەحمەدخانی شاسەیوان[1] و عەلیخانی شوقاقی، هەموویان لە جێی خۆیانەوە ڕابوون و بە چاردەهەزار کەسەوە بە ئەقلەکوت هاتنە هانای خەلکی تەورێز. بەلام کۆمەلی ئەفغان و ئەفشار و دونبولی کە لە دەورەی شار سەنگەریان دابەستبوون، بە هاتنی لەشکریان نەزانیبوو. پاش ئەوەی بە داوەرینی هێزی یارمەتیدەریان زانی، لە مەتەریزان وەدەرکەوتن و بە کۆمەل بزووتن و لە بالی ڕۆژهەلاتی تەورێز فرسەخێک واوەتر چوون و ریزەکانی خۆیان بە ئامانجی شەڕ و لێکدان ڕێکخستن. ئاپۆرای ئەفغان و ئەفشار بە ئاماژەی نەقیخان و فەتحعەلیخانی ناودار چاویان لە تیر و تفەنگان نەترووکاند و پەلاماری کۆمەلی عێلاتیان دا و گێژاوی خوێناوی کوشتار سووری خوارد و کالای گیاننەستێن ڕمێنی پەیدا کرد. لە هەموو لایەکەوە هەر هەلمەت و زەبروەشاندن بوو کە بالی دەنگاوت. لەپڕ شنەی بالادەستی و سەرکەوتن ئالای نەقیخانی شەکاندەوە و ئێلجاڕی خێلاتی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و بەجارێک roوویان وەرگێرا و ڕەوین. زۆربەی خەلکی تەورێز بە کاسپکار و مسکینەوە کە هاتبوونە بەرەنگاری، بوونە چێشتەی دەمی شمشێر و شکستەیان ڕاپانکردەوە شار و دەرگایان لەسەر خۆیان گالە دا. کۆمەلی ئەفغان و ئەفشار تێکڕای باغ و بێستان و خانووبەرەی گەڕەکەکانی تەورێزیان ئاور تێبەردا و خاپووریان کردن.

ئاخرییەکەی حەشامەتی تەورێز بە درێژبوونەوەی مەودای گەمارۆ وەگیان هاتن و دەستیان بەردایەوە و سەریان نەوی کرد. هەر بۆیە نەقیخان سەرکەوتە و شادمان پێی نایە شارەوە و سێ ڕۆژی تازیە گێرا بۆ مەهدیخانی کاکی و ئەرمی ئەو خوابەخشیوەی لەگەل عەلیمورادی برای بردەوە ورمێ و

---

[1] - ـشاهسەودن-ی تورکی کە بە مانای شادۆست و شابەرستە لە کوردیدا بۆتە شاسەیوان

بکوژانیان گیران و کوژران و تۆڵەیان لێئەستێندرایەوە. ئەوسا تاوانانە و باج و خەراجی خستە ئەستۆی خەڵکی تەوریز و بە تکای جەماوەری شارەکە ئازادخانی کردە حوکمڕانی وێندەرێ و گەڕایەوە ورمێ.

پاش ئەوەی کە نەقیخان تۆڵەی مەهدیخانی برای کردەوە و ئۆخژنی بە ناخیدا گەڕا و ئازادخانی لەسەر تەختی دەسەڵاتی تەوریز دانا، هەڵم و هەوای خۆ بە زلزانی و بەرزەفڕی لــە مێشکی هـــەستا و کەوتــە زوڵــم و زۆرەملـــی و توندەتەبیاتی و کەسانی زەنگین و دەوڵەمەندی داڕووتاندن و دەستی لە کوژرانی ئادەمیزادان نەپاراست. بۆ وێنە حەوت کەس لــە ســەیدە گــەورەکانی ســەر بــە ڕەچەڵەکی زنجیرەی خانەدانی پایەبڵێندی سەفەوی بەم بیانۆوەوە کوشــتن کــە میرزا سەید محەممەدی موتەوەللی، کچەزای شاسولەیمانی سەفەوی ناسراو بە شاسولەیمانی دووەم و میر عەلەمخانی قائینی دەیانگوت دەبنە کانگای ئاژاوە و سەرهەڵدان و ئاسەی سەرۆکایەتییان لە سەری دایە. نــەقیخــان ئــەو حــەوت کەسەی گرتن و بە ڕۆژی ڕووناک لە مەیدانی شاردا هەستوخوســتی لــێبــڕین. میران‌بەگی مەحموودلوو کوڕی لۆهراسب‌بەگ باپیرەگــەورەی منـــی نووســەری شەرمەزار کە لە مەراغە پێشکاری برایم‌خانی ئەفشاری ئەرەشلووی حاکمی ئەوێ بوو، ئەم سەروبەندە بۆ سەردانی ماڵ و منداڵ و کــەسوکــار گــەڕابۆوە ورمـــێ. نەقیخان بە دوژمنایەتی برایم‌خان یان هەر بەهانەیەکی تر کە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ، بانگی دێڵێ و هەرەشەی لێدەکا و سێ‌هەزار تمەن ویشکەپــووڵ و بــایی هەزارتمەنیش ئەسپ و کەلوپەل و زێروزەمبەری وەکوو تاوانانە لــێدەســتێنێ. ئەو بێچارەیە دەڕووتێنێتەوە و دەیخاتە سەر ساجی عەلی. هەرکەسێکی پێشک هاتبا کە ماڵ و سامانێکی هەیە هەڵیدەپێچا و ئەشکەنجەی دەدا و لێی دەستاند. وردەوردە هەواڵی زوڵم و زۆرەملی خان تەواوی هەرێمەکەی تەنییەوە و بــوار و بەستێنی برانەوەی لە هەموو بالانەوە بۆ خۆش کرا. زۆربەی خەڵک نەیانتوانی لە ڕاست زوڵم و دەسدرێژی ئەو حاکمە چەوسێنەر و غلloورە خۆ ڕابگرن، هــەر

بۆیە بە ژن و منداڵەوە ڕۆیشتن و پەرەوازە بوون. بۆ نموونە میران‌بەگی مەحموودلوو کە لە ماڵی دنیا هیچی بە چنگەوە نەمابوو، بە ماڵ و کۆچەوە رووی کردە شنۆ و لەوێ شانی دایە کشتوکاڵ و فەلایی. لەم ڕۆژگارەدا میرزا محەممەدڕەزای کوڕی میرزا محەممەدعەلی ئەفشار کە بە فیتی وی مەهدی‌خان کوژرابوو، لە تەوریز وێرای چەند ئەفشارێک ڕێککەوتن کە بچنە ورمێ و لە هەلێکی لەباردا نەقی‌خان تێدابەرن و شەهریارخانی گۆندوزلوو کە هەتا ئەو دەم بەندکراوی نەقی‌خان بوو، بیکەنە حوکمڕان.

بەم ئامانج و بڕیارەوە خۆیان دە دەسک نا و باسکیان لێ‌هەڵماڵی و سەرەولێژ بوون. کاتێک سیخوڕان مەبەستی تاقمەکەیان بە گوێی نەقی‌خان ئاشنا کرد، خێرایەکی چەند کەسی باوەڕپێکراوی خۆی نارد کە لە مەودای ڕێگادا بەرەگەیان لێ‌بگرن و بە قوڵبەستراوی بیانهێننە ورمێ. بەکورتی راسپێردراوەکان لە ڕێیەدا گەیشتنە سەر میرزا محەممەدڕەزا و هاوڕێیانی و هەموویان گرتن و بە فەرمانی نەقی‌خان شەوێکی لە تۆپراق‌قەڵا کوشتیان و هەر لەوێش ناشتیانن! بۆ سبەینێ حوکمی کرد شاریارخان و حاجی‌خانی برای کە لە حەمامی قەراجە خۆیان دەشۆرد بە بۆنەی ئەم دوژمنایەتییەوە بیانگرن و سزایان بدەن. لەم بگرە و بەردەدا چونکە حاجی‌خان ئەجەلی نەهاتبوو، بە ڕۆچنەی توونی حەمامدا بۆی دەرچوو، بەڵام شاریارخان گیرا و کوژرا. ماوەیەک نەقی‌خان ئاوای رابوارد هەتا سەرەنجام بە چنگ ئازادخانی ئەفغان گیرا و دنیای روونی بەجێهێشت و ئاخری نەیتوانی لە بەند و داوی پەژاران ئازاد و دەرباز بێ.

❖❖❖❖

## شەڕی نەقی‌خان لەگەڵ ئازادخانی ئەفغان و کۆتایی دەسەڵاتی

ئازادخان لە درێژەی سێ‌مانگ‌دا کە لـە لایـەن نـەقی‌خانـەوە کرابوویـە حوکمرانی تەوریز و باج و خەراجی دەدایە، هەڵسووڕا و لەو ماوەیەدا نیزیکەی حەوت‌هەزار تفەنگچی و جەزایرچی[1] ئەفغانی و ئازەربایجانی لێی کۆبوونـەوە. بەرەبەرە شان و شەوکەت و سەربەخۆبوونی پەرەی ئەستاند و لەبەروەی خەڵکی تەوریز لە فێڵوفرت و دوژمنایەتی نەقی‌خان دڵـنیا نـەبوون، بـە ڕێـوی‌بـازی ئازادخانیان دنە دا و تامەزرۆیان کرد بۆ ڕاپەڕین و وەدەس هێنانی حوکمرانێتی تەواوی هەرێمی ئازەربایجان!

ڕۆژ بە ڕۆژ شوێنەواری دژایەتی و نافـەرمانی ئازادخـان سـەبارەت بـە نەقی‌خان خۆی نواند و زۆری گوێ نەدەدایە حوکمەکانی. کاتێک نەقی‌خان بـەم گرێ و گرفتەی زانی، ئاگری غیرەت لە سینەی پڕ کینەیەوە سەری هەڵدا و خۆی ساز کرد بۆ دەمکوت و تەمێ کردنی ئازادخانی ئەفغان و چاکی ڕق هەستا. هـەر بۆیە لە جەماوەری خۆی، سەڵماس، ورمێ و کوردەکانی دونبولی و حەشیمەتی ئێرە و ئەوێی ڕاسپارد و خێرایەکی سپایەکی ۲۰ هەزار کەسەی کـۆکردەوە و بـە مەبەستی شەڕی ئازادخان بزووت. ئازادخان لەگەڵ یۆسـف‌خـان و عـەتاخانی ئەبداڵی ڕاوێژی کرد و لە باروبۆخێکی ئەوتۆدا خۆی بە مەردی مەیدانی نەقی‌خان نەزانی و بەرەو نەخجەوان ڕەوی! نەقی‌خان وێڕای شابازخانی دونبولی حاکمی خۆی کەوتنە شوێنی و هێز و قۆشەنیان لە دووی نەکردەوە. لە لێـواری چـۆمی ئاراس (ئاراز) گەیشتنە سەری و شەڕیان لە نێوانی‌دا قـەوما و ئـاگری شـالاوی کوشت و کوشتار گرفەی هات. وەختایەک کۆمەڵی ئەفغانی دیتیـان کـە هـەموو

---

1 - تفەنگدار. جەزایر چەشنێک تفەنگی قورس بووە کە سێبەکیان بۆ داکوتاوە.

لایەکیان لێگیراوە و بێجگە لە بەرەنگاری و کوژران چارەیەکی تریان نەماوە، هانی ورەی خۆیان دا و پێیان چەقاند و چەشنی پۆلەگورگی برسی کە شالاو بەرنە سەر کەرەکە مەڕێ، هەرایانکردە سەر ئەفشار و دونبولی و کوردان و لە بەری‌بەیانەوە هەتا نیوەڕۆ تەنووری شەڕ هەر بڵێسەی دا. ڕۆژگار بە دیتنی ئازایەتی و چاونەترسی ئەفغانان سەری سوڕما و ئەنگوستی خۆی گەست. سەرەنجام ئەفغانی قۆشەنی ئەفشار و دونبولییەکانیان تێک‌وپێک شکاند. سەرەتا ئەفشارەکان ڕوویان لە مەیدانی شەڕگەی نەمان وەرگێڕا و دابڕدابڕ بوون، بەلام کۆمەڵی دونبولی ماوەیەک خۆیان ڕاگرت و زۆربەیان کەوتنە بەر مەودای شیری ئەفغانانی چەپەڵکار. ئاخرییەکەی ئەوانیش شەرمەزاریی ڕاکردنیان بە شیاوی شانی خۆیان زانی و بە دوای ڕاکردووان‌دا ڕەوین. نەقی‌خان هەڵات و بەپڕتاو خۆی گەیاندەوە ورمێ و سەری وەبەر پەساری دیواری شار هێنا و کەوتە دابەستنی قەلا و کۆکردنەوەی ئامرازی قەلاداری و لەو لاوە ئازادخان دەستی بە سەر قەلاتی خۆیە داگرت و بەرەو ورمێ کەوتەڕێ. لەو کاتەدا سەفی‌یارخانی سەر بە وەچەی ئەفشارەکانی ساین‌قەلا یان تیرەی گۆندوزلوو سەری وەبەر ئازادخان هێنا و چەڵەمەی فەرمانبەرداری خستە ئەستۆی. جا لەبەروەی نەقی‌خان و سەفی‌یارخان یەکتریان دەبوغزاند و کۆنەقینی مابەینان نەفەوتابوو، تکای لە ئازادخان کرد ڕێی بدا بچێتە ورمێ بۆ لای نەقی‌خان و بە فێڵ و دەهۆ هەڵیخەڵەتێنێ و بیخاتە بەند و بێ‌هیچ شەڕ و کێشەیەک کلیلی قەلا وەچنگ بێنێ و بیداتە ئازادخان. بۆ ئەم مەبەستە ماڵ و کۆچی خۆی بە بارمتە دانا و ئازاد کەیفی زۆر بەم کارە گوڵی کرد و ئیزنی دا و ناردی. سەفی‌یارخان کاتێک گەیشتە لای نەقی‌خان بەڕواڵەت وای نواند کە چۆتە پاریدەی. نەقی‌خانیش هەڵفریوا و پشتی لێکردەوە و کەوتە ساز و پەرداخ کردنی چەک‌وچۆڵ و چۆنیەتی پاراستنی قەلا. بەلام ڕۆژێکی کە سەفی‌یارخان هەلەکەی بە لەبار زانی و ئامۆی لە دەوروبەری نەدیتن، وێڕای چەند کەس لە پیاوەکانی

خۆی پەلاماری نەقی‌خانی دا و گرتی. هەردک دەستیان لە پشتەوەڕا توند بەست و چاویان لە قاپێلکان دەرهێنا. کۆمەڵی ئەفشار کە لەبەر زوڵم و زۆرەملی نەقی‌خان دەناڵین و وەتەنگ هاتبوون، ئەم ڕووداوەیان بە سەرکەوتنێکی گەورە دانا و سەریان وەبەر سەفی‌یارخان هێنا. ئازادخان کە لە ئاوایی «سەنگەر»ی ورمێ هۆردووبەزی کردبوو، لە کات و ساتێکی پیرۆزدا پێی‌نایە قەڵای ورمێ. بەپێی بەرژەوەندی ڕۆژگار و دڵدانەوەی ئەفشاران، لەڕێوە محەممەدمووساخانی قاسملوو کوڕی محەممەدخانی قاسملووی بەگەربەگی کردە بریکاری حکوومەت و کەیخودای خێڵ و خۆشی بە سەربەستی لەسەر تەختی شکۆمەندی دەسەڵات پاڵی داوە.

## حکوومەتی ئازادخان و کۆمەڵێک ڕووداوی

## سەیروسەمەرە و پڕ کارەساتی کە لەم سەردەمەدا قەومان

پاش ئەوەی کە قەڵای ورمێ کەوتە بەردەستی ئازادخان و ئەفشار چەڵەمەی ئەویان خستە گەردنیان، تەواوی خەڵکی ئازەربایجان سەریان وەبەر فەرمانەکانی هێنا. ڕووداوێکی سەیری ئەو ڕۆژگارە هەڵوێستی کابرایەک بوو کە لە دەوروبەری بازاڕ خەریکی قوڕەکاری و خانووبەرە سازکردن بوو کە چەند کووپەی مزی پڕ لە زێڕی سووری لە خەندەکاندا دیتنەوە و دانی بە ئازادخان. وەچنگ‌هێنانی خەزێنەیەکی ئاوا بێکوێرموەری ئازادخانی وا لێکرد کە وردەوردە مەیل و ئاسەی فەرمانڕەوایەتی لە کۆشکی مێشکیدا چەتر بنکێوێ و «لزئاقا»ی خوشکی محەممەدمووساخانی بەگلەربەگ بخوازێ و داوەتێکی گەورەی بۆ بکا. چونکە حەیدەرقولی‌خانی حاکمی نەخجەوان کەلەوەکێشی دەکرد، یۆسف‌خانی ئەبدالی لەگەڵ محەممەدمووساخانی بەگلەربەگی دانان بۆ پاراستنی سنووران و مەڵبەندەکە و فەتح‌عەلی‌خانی ئەرمشلووی کردە سەرۆک هێز و بە ئامانجی سزادانی حەیدەرقولی‌خان لەشکری دەنگ دا. دوای چەند شەڕێکی قورس و گران مات و داماوی کرد و کوشتی و زۆربەی خەڵکی نەخجەوان لەو هەرایەدا کوژران یان بە دیل گیران.

پاشان ئازادخان وەرزی زستان لە شارەدێی دێخورگانی[1] سەر بە تەوریز بنەی داکوتا. لەم کاتەدا خەبەر هات کە پەناخانی ئەنبارلوو لە خەمسەی قەزوێنەوە قۆشەنێکی تێر و تەیاری هێناوە و بەرێوەیە و ئامانجی گرتنی

---

1 - لە دەقەکەدا نووسراوە «دەخوارقان» و دەخوێندرێتەوە «دێهخارقان» و لە کوردیدا بۆتە دێخورگان. ئێستا پێی‌دەڵێن ئازەرشار.

ئازەربایجانە و ئێستا لە شەش فرسەخی تەوریز لەشکربەزی کردووە. ئازادخان، فەتحعەلیخانی ئەرمشلووی فەرماندەهێزی خۆی لەگەڵ چوارهەزار کەسان ناردە بەربەرچدانەوە. دوای هەڵگیرسانی شەڕ و تەقە و لێکدانێکی کەم، ئەنبارلوو خۆیان بۆ ڕانەگیرا و هەڵاتن و زۆربەی قەرەبشی و پیادەکانیان بوونە چێشتەی شمشێری ئەفغانان و ئەفشاران. دواتر ئازادخان بەشان و شەوکەتێکی گرشەدارەوە بە ئامانجی گرتنی ئێرموان لەشکری ئاژاوت.

## هێرشی ئازادخان بۆ سەر ئێرەوان و تێکشکانی

ئازادخان دوای وەرگرتنی سەرکەوتننامەی فەتحعەلیخان، بە مەبەستی گرتنی ئێرەوان قۆشەنی دەنگ دا و «چۆخوری سەعد»ی کەوشەنی ئەو هەرێمەی کردە لەشکرگای خۆی و تاوڵ و خێوەتی لێهەڵدا. لەبەرەوەی جەماوەری ئێرەوان خۆیان بە مەردی مەیدانی ئازاد نەدەزانی، دەستەوداوێنی حوکمڕانی گورجستان بوون و داوای کۆمەگیان لێکرد. حوکمدار بە لەشکرێکی پەرداخەوە بەرەو ئێرەوان بزووت و لە دوو فرسەخی ناوچەکە هێزەکانیان تووشی یەکتر هاتن و هەر کام لە باڵی خۆیان دامەزران و پاشان شیر و تیر و نێزەیان هەژاندن و شەڕێکی وا قەوما کە کەوچکی تێنەدەگەڕا. بۆ نموونە لە قۆشەنی ئەفغان و ئەفشارەوە دووهەزار کەس بەجارێک بە شیری ڕووتەوە هەڵیانکردە سەر جەرگەی لەشکری گورجییەکان. لەم کاتەدا حوکمڕان ئاماژەی کردە تفەنگچییانی گورجی و ئێرەوانی و لێزمەی فیشەکانیان بە سەردا باراندن. زۆربەی چەکدارانی ئەفغان و ئەفشار پێکران و کوژران. ئەوەی مابوون خۆیان بۆ ڕانەگیرا و ڕەوین. تاقمی گورجی کەوتنە سەریان و شکستێکی تاڵیان بە ئەستۆیدا برین و تەواوی بارگە و بنە و چەکوچۆڵ و تۆپخانەی نێو هۆردووگای قۆشەنی ئازادخان کەوتە چنگ گورجییەکان. بەناچار ئازادخان وێڕای پۆلەسوارێک لە چۆمی ئاراس پەڕییەوە و خۆی گەیاندە تەورێز و بە یارمەتی و پشتیوانی جەماوەری ئەو شارە دیسان دوو ساڵی دیکە بە سەربەستی فەرمانڕەوایەتی ئازەربایجانی کرد. فەزلعەلیخانی مەرەندی بە بریکار دانا و «میرزا نەسیر»ناوێکی کردە بەرپرس و سەرۆکی کۆکردنەوەی پیتاکی حکوومەتی و خۆی لە ورمێ بناغەی حکوومەتی داکوتا.

## ڕاپەڕینی تەورێز و شەڕی ئازادخانی ئەفغان لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە

ئازادخان دوای شکانی لە شەڕی ئێرەواندا، لەبەر سرشتی ناپاک و بێباکی و بێچاووڕوویی، دەستی کرد بە هەڵسوکەوتی نابەجێ و نالەبار لەگەڵ جەماوەر و پێی لەو قەراروبڕیبە نا کە فەزلعەلیخانی مەرەندی لەگەڵ تەورێزییان کردبووی و ملی پێوەنا و خەڵکی دەچەوساندەوە. تەورێزی لە بارمەتیدانی پەشیمان بوونەوە و دژی فەزلعەلیخانی حاکم ڕاپەڕین و میرزا نەسیری سەرۆکی کۆکردنەوەی پیتاکی حکوومەتیان لەو هەرایەدا کوشت. چونکە زانیان ئازادخان هەڵیاندەپێچێ و دێتە جەستەیان و دەیهەوێ بە توند و تیژی تولەیان لێبکاتەوە، قەڵایان دابەست و چەک و ئامرازی پێویستیان خستە سەریەک و دەستی هانایان درێژ کرد بۆ کازمخانی قەرەجەداغی، پەناخانی جەوانشێری قەرەباغی، تیرەی شوقاقی و حەشامەتی شاسەیوان. ئازادخان وەختایەک بە حاڵوڕۆژەکەی زانی لێوی لێکرۆشتن و قۆشەنێکی زۆر و زەوەندی پەرداخی کۆکردەوە و بە ئامانجی گرتنی قەڵای تەورێز کەوتەڕێ. هەر گەیشتێ شارەکەی دەورە دا و باوەشی تێوەراند. بۆ ماوەی دوو مانگ دانیشتووانی شار بە چنگ گەمارۆوە نالین. جەنگەی وەرزی بەهار بوو، هێشتا بەرهەم و حاسلاتی خەڵک لە دەری شار و لە گوندان نەگیبوون و هەڕەتی دروێنە دانەهاتبوو، بۆیە جەماوەر زەهەر و پاشەکەوتی ئازووخەیان کەوتە بران و نەهامەتی باڵی ئەنگاوت. هێزەکانی ئازادخان زۆربەی باغەکانی دەوروبەر و تاخەکانی شار و خانووبەرە و داچناوی خەڵکی تەورێزیان بە ئاگری بێڕوحمی سووتاند و پێخوستیان کردن و هیچ پەسار و پەسیو وماڵێکیان بە پێوە نەهێشت و

تێکیانڕووخاند. کۆمەڵی مسکێن و هەژارانی بەلەنگازی شار بۆ پەیداکردنی خواردنێکی نەمرنەژی دەچوونە دەرەوە بەڵکوو بتوانن لە گیاوگۆڵی مووچە و مەزرایان کروکاشێکی بکەن و شتێکی هەڵکەڕێنن و بینەوە ماڵ، کەچی دەیانگرتن و دەیانکوشتن یان لووت و گوێیان دەبڕین و بەڕەڵلایان دەکردنەوە قەلایە. باروئۆخەکە پەنجا رۆژی ئاوا بە سەردا تێپەڕی کە لەناکاو قۆشەنی خێلاتی قەرەجەداغ، شاسەیوان، شوقاقی و جەوانشێر، بە سەرکردایەتی کازمخان و پەناخان بەرەو هێزەکانی ئەفغان و مەتەرێزەکانیان داوەرین. قۆشەنی پارمەتیدەر وەکوو لافاو لە چیای سورخابەوە بەرەو شار لووزەوی بەست و ئەفغانی لە سەنگەرەکانیان دەرپەڕین و لە مەزرای ڕێواسانی تەورێز بنەیان داکوتا. کازمخان کە پیاوێک بوو کارزان و فامیدە و باوەڕی بە خۆڕاگری کۆمەڵی ئێلجاڕ نەبوو، فەرمووی با خەڵکی تەورێز تێکڕای تفەنگدارانیان لەگەڵ خۆیان بەرن بۆ شەڕگە و لەوێ دامەزرێن. پاشان کە هێزەکان تێکهەڵەنگووتن و ئاگری شەڕ هەڵگیرسا، خێلاتی وێڕای پیاوەکانی شار بە کۆمەڵ ڕوویان کردە مەیدان. سپای ئەفغانان وەختایەک بە لەشکری زۆری خێلات و تەورێزیان زانی و کەمبوونی خۆیان بۆ دەرکەوت، ترس و دڵەڕاوکە شانی گرتن و زانیان ئەگەر بێتوو لاقیان بترازێنن و ڕانەوەستن تازە ڕێی دەربازبوونیان نابێ، بەناچار دەستیان لە گیانی خۆیان شۆرد و کەوتنە بەر شەپۆلی چارەنووس و بە شیری ڕووتی ئەسپگەوزێنەوە پەلاماری قۆشەنی خێلاتیان دا. بازاڕی خوێنڕێژی گەرم داهات و کالای مەرگ وەهای برەو پەیدا کرد کە شریخوهۆڕی هەورەبریسکەی نەمان و بەلا بالی ئەنگاوت. کەچی لەناکاو شنەی سەرکەوتن پرچی ئالای ئازادخانی شەکاندەوە. ئێلجاڕ ورەیان بەردا و بەجارێک پشتیان کردەوە و ڕەوین. تەنیا پەناخانی جەوانشێر لەبەر پاراستنی شەرەفی خێڵ ماوەیەکی کەم لە بەرامبەر ئەو ڕێوی‌سرشتانەدا شێرانە خۆی ڕاگرت و کۆڵی نەدا، بەلام سەرەنجام ئەویش کە دیتی یارمەتیدەرێکی وای بە دەورەوە نەماوە

تابشتی نەهێنا و رایکرد. پیادەکانی شار لە مەیدانی لێکدان مانەوە و زۆربەیان بە شیری ئەفغانان گەوزین. بەگشتی خەڵکی تەورێز شکستێکی قورسیان بە سەر شانیدا هات و دەڵێن چوارهەزار کەسیان لێکوژراوە و دەتوانم بڵێم هەتا ئێستاش برینی دەروونیان سارێژ نەبۆتەوە. ئەم رووداوە دەگەڕێتەوە مانگی موبارەکی رەمەزانی ساڵی ١١٦٤ی کۆچی/ ژووئیە - ئووتی ١٧٥٠ی زایینی. زۆربەی جەماوەری تەورێزی ناوەندەی دەسەڵات کە توانیویانە لە جێی خۆیان ببزوون، هەر کە هەلیان بۆ رەخساوە دەستی ژن و منداڵیان گرتووە و پەرەوازە بوون و لە سەردەمی ئارامیشدا نەگەڕاونەوە.

دەڵێن لە رۆژی شەڕەکەدا، سێسەد پیادەیەکی تەورێزی لە حەوشەی شارا سەنگەریان بۆ پاراستنی خۆیان هەڵبەستوون و وا پیاوانەیان دەست کردۆتەوە کە ئەفغانی نەیانتوانیوە بیانبەزێنن. بەناچار ئازادخان پەنای داون و هیچی لێنەکردوون، بەلام پاش گیرۆدەبوون و دڵنیایی، هەموویان وەک یەخسیری کافران بە نرخێکی گران بە خەڵکی شار فرۆشتوونەوە. بەکورتی دوای گیرانی تەورێز ئازادخان بەرەو مەراغە رۆیی و لە ناوچەی «دیزەچ‌رووود» هۆردووبەزی کرد. لەوێ فەتحعەلیخانی ئەفشار، نەرەشلووی کردە بەگلەربەگی ئازەربایجان و ناردی بۆ تەورێز. جا لەبەروەی فەتحعەلیخان پیاوێکی رەشید و هێندێکش چنۆک بوو، دەرگای داکرووسین و شلتاغی بە رووی حەشامەتی تەورێزدا کردەوە و پاشماوەی دانیشتووانی کە لەتێک نان و برە بەرێچوونێکیان سەبوو، لە سایەی پرکێشی فەتحعەلیخانەوە دەس بەتاڵ و داماو کەوتنەوە. هەڵپەی خان وای کرد کە لە ماوەی شەش مانگدا توانی ٩٠ هەزار تمەن لە خەڵک بستێنێ. کاتێک ئازادخان بەم کارەی زانی، فەتحعەلیخانی لێخست و مەلا خدرناوێکی ئەفغانی کردە حاکمی تەورێز. لە ماوەی دوو ساڵ دەسەڵاتی ناوبراودا جەماوەری تەورێز تۆزێک حەسانەوە و بووژانەوە.

## شەڕی ئازادخان لەگەڵ کەریمخانی زەند
## و ئەو ڕووداوانەی کە قەومان

ساڵی ١١٦٦ی کۆچی مانگی/١٧٥٢ـ١٧٥٣ی زایینی، وەختایەک ئازادخان خەیاڵی سەبارەت بە سەربزێوانی ئازەربایجان ئاسوودە بوو، پاشان هەر شارەی حاکمێک و هەر سنوورەی سەرکردەیەکی بۆ دیاری کرد و شنگڵی لە خۆی دا و بانگەشەی دەسدرێژی بۆ سەر ئێراقی بڵاو کردەوە؛ چونکە لەو کاتیدا کەریمخانی زەند لە ئێراق و فارس و محەممەدحەسەنخانی کوڕی فەتحعەلیخانی قاجار لە ئەستەراباد و مازندەران ئاڵای هێز و دەسەڵات و پادشایەتییان هەڵدابوو. بەڵام لەشکر و شان و شەوکەتی کەریمخان پتری پەرەئەستاندبوو. پێنجهەزار لوڕ و قەشقایی و خەڵکی فارسی لە ڕکێفیدا بوون. ئازادخان هێشتا لەسەر شکاندنی یەکێک لەو دوو کەڵەدوژمنەی ساغ نەبۆوە کە سەرەتای کێشەی کوڕەی گۆڕین و ساختەچی شاسوڵتانحوسێنی [سەفەوی] لە بەغدا سەری هەڵدا و وردەوردە پەلوپۆی هاویشت. کەریمخان بە قۆشەنێکی زۆرەوە ڕووی کردە کرماشان کە ئەو درکە لەسەر ڕێگای دەسەڵاتی هەڵکەنێ و بنەبڕی بکا. دەبێ لە بیرمان بێ کە پیاوێکی کەسنەناس لە بەغدا دەیگوت کوڕی شاسوڵتانحوسێنی سەفەویم و تاج و تەختی فەرمانڕەوایەتی ئێران ئیمنە. ئەو کابرایە داوای لە دەوڵەتی ڕۆم دەکرد کە لەشکری وەبەرڕکێفی بنێ هەتا بەرەو وڵات ببزوێ و بگاتەوە و جڵەوی حکوومەت بە دەستەوە بگرێ. عەلیمەردانخانی بەختیاری کە خەنیمی کەریمخانی زەند بوو، شای ساختەی کردە داردەستی خۆی و لە کرماشان شەڕێکی سەختی لەگەڵ کرد، بەڵام بەختی قرچۆکی لاری هێنا و شکا. خانی بەختیاری بە ناردنی چەند کەیخودایەک و هێندێک دیاری هاواری بردە بەر ئازادخانی ئەفغان. ئازادخان کە لەمێژ بوو چاوەڕوانی هەلێکی

وابوو. بە هەشتهەزار چەکداری ئەفغان و ئەفشارەوە هەستا و رووی کردە کرماشان. وەختایەک نیزیک بۆوە بیستی کە عەلیمەردانخانی بەختیاری بە دەس کەریمخانی زەند شکاوە و پادشای ساختە لەو شەڕەدا کوژراوە یان کوێر کراوە. لەسەر ناکۆک بوونی هەواڵەکان ویستی بگەڕێتەوە. بەڵام کەریمخان لەبەر بادیهەوایی سەرەڕێی لێگرت هەتا نەهێڵێ نێچیرێکی ئاوای لە چنگی دەرباز بێ. ئازادخان بەناچار کەوتە شەڕ و بەرەنگاری و لەشکری کەریمخانی بەزاند و ڕەتاندی. کەریمخان بە شەقوشڕی ملی ڕێی ئیسفەهانی داگرت و لەوێوە چووە فارس. هەموو بارگە و بنە و تاوڵ و خێوەت و پاشەکەوتی جبەخانەی هۆرێووی بۆ لەشکری ئەفغان و ئەفشار بەجێما و تاڵان کرا. شێخالیخان و محەممەدخانی زەندی ئامۆزای کەریمخان پیلی ژن و منداڵی خانیان گرت و تێکڕا چوونە حەوشەی قەڵای پەری و بنەیان خست. ئازادخان رووی کردە مەلایر و دەورەی قەڵای پەری دا و هەر خێرایەکی گرتی و ماڵ و سامان و خەزێنەی زەندانی گەسک لێدا. شێخالیخان و محەممەدخانی لەگەڵ دایک و خاوخێزانی کەریمخان تەتەرپێچ کردن و راپێچی دان بۆ قەڵای ورمێ و عەلمخانی ئەفغانی لەسەر دانان کە دەرباز نەبن. جەماوەری ئەفغان و ئەفشاریش ئەو تاڵان و دەسکەوتەی کە وەگیریان کەوتبوو راپانگوێست بۆ ورمێ. ئازادخان پاش ئەم سەرکەوتن و درەوشانەوە بەرچاوە بەرەو ئیسفەهانی پایتەخت ئەسپی تاژوا. خەڵکی ئیسفەهان چوونە پێشوازی و مافوورە و ڕەیەندازیان خستە بەرپێی و گەلێک دیاری و پێشکەشییان بردە خزمەتی و هێنایانە شارەوە. ئازادخان لە کۆشکەڵی فەرمانڕەوایانی سەفەویدا ڕۆنیشتە سەر تەختی پادشایەتی و هێز و دەسەڵاتی پەرەی سەند. بە ناوی ئەو خوتبە خوێندرایەوە و سکە لێدرا کە ئاوای لەسەر نووسرابوو:

هەتاکوو ئازاد هەبێ و بمێنێ        سکەی لە دنیا بەرەو دەسێنێ

پاشان هەر ناوچە و مەڵبەندەی حاکمێکی بۆ دیاری کرد و ناردی و فەتحعەلیخانی ئەرمشلووشی دانا بە فەرماندەهێز و بە قۆشەنێکی تەیارەوە بۆ قوڵی برووجێردی بەڕێکرد هەتا دەستی بگەیەنێتە کەریمخان. ڕاست لەم سەروبەندەدا بوو کە عەلەمخانی ئەفغان بە خۆی و هەزار چەکدارەوە دە کەسی خاوخێزانی بە دیلگیراوی کەریمخانی ڕادەگواست بۆ ورمێ. شەوێک لە دەوروبەری سایینقەلا چەند ژنێکی زەندان خۆیان گەیاندە شێخالیخان و دوور لە چاوی پاسەوانانی خەوالووی خەوی بێخەبەری، بەند و زنجیریان لە دەست و پەل و شان و پیلی داماڵی. ئەویش وێڕای ژنان دەستی یەخسیرەکانی دیکەی کردەوە و تێکڕا کردیانە قریوە و هەرا کە ئەوە کەریمخان گەیشتێ! ئەفغانی بە پەشۆکاوی لە خەو ڕاپەڕین و بە گومانی هاتنی کەریمخان هەر یەکەی ڕایکردە قوژبنێک و پەنایەک. عەلەمخان کە تازە لە خەو ڕاپەڕیبوو بە چنگ زەندان کوژرا و بوو بە دەستەملانی مەرگ و بە جووت لێیخەوتن. تاقمێک لە هاوڕێیانی شەلالی خوێن کران و پۆلێکیان هەلاتن. پاشان شێخالیخان و محەممەدخان لەگەڵ دایک و ماڵ و منداڵی کەریمخان بە سلامەتی و بە دەستی پڕەوە لە شووشتەر گەیشتنەوە خزمەت زکێفی خان. کەریمخان سوژدەی شوکری برد بۆ پەروەردگار و بە لەشکرێکی پەرداخەوە ڕووی کردەوە ئیسفەهان بۆ شەڕی ئازادخان. وەختایەک ئازادخان هەواڵی کوژرانی عەلەمخان و قوتاربوونی ئەسیرانی زەند و بزووتنی کەریمخانی بیست، دووکەڵی غیرەت و شەرەف لە کاژەلاکی کەیلی بادیهەوایی هەستا و دوابەدوای فەتحعەلیخانی ئەرمشلوو بەرەو برووجێرد و نەهاوەند ئەسپی تاو دا. دەڵێن بەرلەوەی هۆردووی ئازادخان بگاتە ئەو مەڵبەندە، فەتحعەلیخان بە شێوەیەک ئاگری زوڵم و زۆرەملی تێدا هەلگراندبوو کە بۆسۆ و بۆچرووکی هاوار و ناڵەی چەوساوەکانی دەگەیشتە کەشکەلانی فەلەک.

بەکورتی ئازادخانی ئەفغان لە شارمدێی قومشە کە نۆ فرسەخی دەمێنێ بۆ ئیسفەهان گەیشتە هێزەکانی کەریمخان. پاش تەقە و لێکدانێکی کەم، لەشکری ئەفغان و ئەفشارەکانی ورمێ شکان و ڕەوین. ئەسکەندەرخانی دایکبرای کەریمخان کە لاوێکی ئازای نەترس بوو لەو کاتەدا کە لەشکری ئازادخانی هەڵدەبڕی و بیاوانە دەستی دەوەشاند، لەپڕ تیری ئەجەل لە سەرپەنجەی چارەنووسەوە دەرپەڕی و سینەی پێکا و لە ئەسپەوە هەڵیداشت و پشووی لێبڕی. خەڵک دەڵێن بە تیری فەتحعەلیخانی ئەفشار ئەنگواوە و کوژراوە و هەڵبەت خودا دەزانێ.

دوای ئەم ڕووداوە کەریمخان دەستی لە شەڕ هەڵگرت و چووە خورڕەمئاباد و لەوێ کۆمەڵێک لە خێلاتی پشتکۆ و سەمیرە تێیهاڵان. پاش مەوەیەک جارێکی تر ئازادخان، عەبدوڵلاخانی برازای خۆی بە قۆشەنێکی ئیسفەهانەوە نارده خورڕەمئاباد بۆ لێدانی کەریمخان و سەرلەنوێ خانی زەند سەرکەوت.

## شەڕی چوارجارەی ئازادخان لەگەڵ کەریمخانی زەند

لەم کاتەدا ئازادخان دیسان لەشکرێکی پەرداخ کرد و بە سەرکردایەتی فەتحعەلیخانی ئەفشار و ژمارەیەک لە سەردارانی ئۆزبەک و ئەفغان ناردی بۆ شەڕی کەریمخان. لەم لەشکرکێشانەدا فەتحعەلیخانی ئەفشار سەرکردەی تەواوی هێزەکان بوو. لە شوێنێک کە پێی دەڵێن «دوونـاو» و سەر بە «سیلاخور»ە، قۆشەنیان تێکهەڵەنگووتن. کەریمخان لەبەروەی جەماوەری هەزار کەسەی بەرکێفی لەچاو لەشکری ئازادخان کەمتر هاتە بەرچاوی، خاوخێزانی خۆی و ژن و منداڵی زەندانی هەڵاوارد و بەرەو هەرێمی خووزستانی ناردن. خۆی لەگەڵ کۆمەڵێکی کەم و شانبەشانی شێخالیخان و محەممەدخان بەرەورووی لەشکری بیست و پێنجهەزار کەسەی ئازادخان چەقی. پیاوانی زەند ئەوەندە چالاک و مەردانە هەڵدەسووڕان کە بە دە ئەفغان و ئەفشاران بە یەکیان نەدەوەستان. خانەدانی زەند هەموویان ئازا و شمشێروەشێن بوون و خودی کەریمخانیش کە لەم بار و بوارەدا تایبەت بوو. بەناچار فەتحعەلیخان هاواری شاڵاوی بەلێشاوی کرد و ئەو دەریا لەشکرە بەجارێک هرووژمیان برد و زەندیان وەپێش خۆیان دان و ڕەتاندیانن. بەڵام کەریمخان باوی هەنگاوی نەرم بوون و وردەوردە بە دوای ڕاکردووانێدا دەڕۆیی. کەس نەیدەوێرا کە لەو خانە دوژمنبەزێنە نیزیک بێتەوە و هەرکەس لە خۆی ڕادەدی و دەیوێرایە لەڕێوە بە زەبری شیری وی دادەهات و دەکوژرا. دەڵێن کەریمخان ڕمبەکەی چەقاندووە و پێیەکی لە ڕکێفێ دەرکێشاوە و ڕاوەستاوە هەتا ڕاکردووی زەند دوورتر بکەنەوە. ئەو بیست و پێنجهەزار کەسەی ئەفغان و ئەفشار و ئۆزبەکان سەریان لە چاونەترسی ئەو شێرە بوێرە سوڕ دەمێنێ. فەتحعەلیخانی ئەفشار بە سەرکردەکانی لەشکر دەڵێ هەر کەس بۆ کەریمخان بچێتە مەیدان و چ بە زیندوویی یان مردوویی بیهێنێ، لەڕێوە ئەم ئەسپە حدوودەی کە سواری بووم بە زین و لغاوی ئاڵتوونەوە دەیدەمێ و هەزار تمەن زێڕی سووری بۆ دەخەمە سەر و کچی پیاوماقووڵێکی ئیسفەهانیشی لێماره دەکەم. پیاوێکی حەبەلۆرەی

ئەفغانی کە بە ئازا مەنشوور بوو، گوتی ئەمن دەچم و بە وێرغە ئەسپی لینگ دا و هەڵیکوتایە سەر کەریمخان و بێشەرمانە تێیڕاخوڕی و جنێوی پێدا. کەریمخان گوتی ها چت دەوێ و بۆ وا دەکەی؟ گوتی هاتووم بتبەمە بەررکێفی فەتحعەلیخانی سەردار کە لە ژێر فەرمانی ئازادخانی ئەفغاندایە. کەریمخان گوتی برۆ دەسهەڵگرە لەو قسە هەڵەتپلێت و پووچانە. ئازاد سەگی کێیە و فەتحعەلیخان چیە هەتا من بچمە بەررکێفی؟ چ قسەیەکت پێیە بیلێ گوێم لێیە. کابرای ئەفغان گوتی ئەگەر بە گوێم نەکەی لە چنگم قوتار نابی. کەریمخان کە چوارمێردەکی دانیشتبوو لەسەر خوانی زین و ئانیشکی هاویشتبووە سەر ڕمبەکەی، هەرای کابرای کرد وەرە پێش. ئەفغانەی بەختوەرگەڕاو لێی نیزیک بۆوە و نێزەی بەرەو سینەی هەژاند. بەلام خان دەستی خۆی ڕمپێش دا و پڕیدایە نێزەکەی و لەسەر یەکسمی هەڵیداشت. کابرا هەستاوە و پەنجەی برد بۆ شیر و ویستی پەلاماری بدا و دایهێنێتە تۆقی سەری! کەچی خانی زەند بە توورەیی پێی لە ڕکێفی داگرت و شیری بێبەرگێرەوەی داهێنایە شانی ڕاستەی ئەو چارەڕەشە و لە بنهەنگلی چەپی سەری کرد. پاشان کەریمخان کەوتە دوای کۆچی قۆشەنی. ئازادخان کە دەیڕوانییە ئەم دیمەنە، تەماشای کرد ئەوە کەریمخان ڕۆیی، بەلام کابرای خەنیمی هەر وە پێوە ڕاوەستاوە و چورتە ناکا. پیاوی نارد و کەلاکیان هاویشتە سەر پشتی ئەسپ و هێنایانەوە. خانی ئەفغان کە چاوی بە جێزەبری کەریمخان کەوت مچوڕکی پێدا هات و لەرزی و هەر لەوێوە گەڕایەوە بۆ ئیسفەهان. کەریمخان لەوێڕا ڕۆیی بۆ چیاکانی ڕەکیلۆیە و بە ناوچەکانی فەهلەیاندا تێپەڕی و گەیشتە گازران. دەڵێن محەممەدخانی زەند کە یەکێک بووە لە گەورەسەرکردەکانی کەریمخان، لەم سەفەرەدا رووی لێومردەگێڕێ و دەڕوا بۆ ناوچەکانی کرماشان و لەوێ دەچێتە پاڵ قۆشەنی عەلیمەردانخان. بەلام ڕۆژایەکی کە دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێ بە خەنجەر عەلیمەردانخان دەکووژێ و دەڕواتە کرماشان و لەوێ بنە دادەکوتێ.

❖❖❖❖

## شەڕی پێنج‌جارەی ئازادخان و کەریم‌خان لە فارس

هەروەکوو باسی کرا، ئازادخانی ئەفغان دوای ڕەوینی کەریم‌خانی زەنـد بەرەو کەژ و کێوەکانی کۆهگیلۆیە، گەڕایەوە ئیسفەهان و فـەرمانی دا هـەموو کۆلان و شەقام و بازاڕی شـاریان ڕازاندنـەوە و کردیانـە جێـژن و چراخـان و دووتەپڵەی شادمانییان کوتا و سەرکەوتننامەیان نووسین بۆ هەموو هەرێمەکان.

پاش تێپەڕینی ئەم کارانە شابازخانی دونبولی لە «شارەزا» و ناوچەکانی گەرانگەڕی کردە حوکمدار. فەتحعەلی‌خانی ئەفشاری ئەرمشلووی کردە سەرهێزی مەڵبەندی برووجێرد و دەوروبەری. سێ مانـگ دوای ئـەم ڕووداوانـە دیـسان هات‌هاتی ڵۆشەنی کەریم‌خان لە باڵی گەرمەسێراتی فارسەوە بە گوێی ئازادخان دادرا و گوتیان سەری لە شەڕ دەخورێ و بـەرەو ئێـراق بزووتـووە. ئازادخـان برینەوەی هەرای کەریم‌خانی بە ئەرکی سـەر شـانی خـۆی دانـا و بەرلـەوەی کەریم‌خـان دەسـتی بوەشـێنێ، لەشـکرێکی سـاز و تـەیاری نایـە بـەرڕکێفی شابازخانی دونبولی و لەگەڵ تۆپخانە و جەزایرچی وەکوو پێـشەنگ نـاردنی. دوابەدوای ئەوان فەتحعەلی‌خانی ئەفشاری لە برووجێردەوە بانگهێشت و وێڕای دەهەزار کەس بەڕێی کردە شیراز. وەختایـەک ئـەم جـەماوەرە چوونـە شـیراز خەڵکیان گەوزاند و پێخوست و سەرکوتیان کردن و ئازادخانیش بە لەشـکرێکی زۆر و زەوەندەوە بە دوایاندا گەیشتێ.

لەو لاوە کەریم‌خانی زەند بە خۆی و سێ‌هەزار کەسەوە لە قەڵاتی خـشت ئازووخە و پاشەکەوتی داخستبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئازادخان کە ئەویش بە سی‌هەزار چەکدارەوە لە نیزیک خشت سەر و سۆراغی پەیـدا بـوو. کـەریم‌خـان پیادەکانی لەشکری خۆی لە شـاخەکانی دەوروبـەر دامەزرانـدبوون و بۆسـەی پێدانابوونەوە. پاشان دەشتێکی پان و بـەرینی بـۆ شـەڕ هەڵـبژارد و لەگـەڵ

سێ هەزار چەکداری شێرگەوزێن بەرەورووی سێ هەزار لەشکرچی ئەفغان و ئەفشار سەفیان بەست. دانیشتووانی قەلاتی خشت بەرەنگیان وەکوو بریشکە بەرەو هێزەکانی ئازادخان هەلدەتۆقاند.

کەریمخان لەگەڵ پێشەنگانی قۆشەنی ئازادخان بە گژ یەکدا چوون و بە هەلمەتێک لێکی بڵاو کردن و لاوانی زەند لە ئاست لەشکری ئەفغانییەکان بەراستی دەستوبرد و ئازایەتییان دەنواند. لە گەرمەی شەڕا دووهەزار چەکدارێکی کە بە سەرکردایەتی شێخاڵیخانی زەند لە کێو و دۆڵاندا خۆیان مەڵاس دابوو، بەجارێک کردیانە هەڵلا و گرمە و تەقە و ترس و سامێکی سەیریان خستە دڵ و دەروونی قۆشەنی ئازادخان. هێزە تۆقیوەکان حەجمینیان لێ هەڵگیرا و قوونەدزەیان دایە و خودی کەریمخان چەشنی شێرێکی دڕ کە هەڵکاتە سەر پۆلی ڕەوەی ئاسکان شالاوی دەبردە هەر لایەک تەرمەکێک تەرمی داویشتە سەر یەکتر. هەر چۆنێک بێ هێندەی پێنەچوو کە لەشکری ئازادخان خراپ شکا و سەرجەمی تۆپخانە و بارگە و بنەیان کەوتە بەر ڕامالی دامالینی زەندان.

ئازادخان بەوپەڕی بەدبەختی و سەرشۆڕی و بە هەزار کوێرەوەری و سووکایەتی خۆی گەیاندەوە شیراز و لەوێشی خۆ بۆ نەگیرا و تێیتەقاند بۆ ئیسفەهان. کەریمخان دوابەدوای ئەو گەیشتە شیراز و دەسەلاتی لە چنگ سالحخانی بەیات دەرهێنا کە ئازادخان دانابوو بە حاکم و بە کوتەکان وەندەی لێدا هەتا مرد! لەوێوە مزلاومزڵ ڕووی کردە ئیسفەهان و ئازادخانیش زانی تازە ئەوێ بۆ دانیشتن نابێ و یەکسەر بەرەو ئازەربایجان بزووت و ئیسفەهان و فارس پاک و سەرپاک بۆ کەریمخان بەجێما.

## شەڕی شەشجارەی ئازادخان و فەتحعەلیخانی ئەفشار لەگەڵ کەریمخانی زەند

ئازادخان دوای شکانی بە دەست کەریمخان هاتە ئازەربایجان و بۆ ماوەی دوو ساڵان لەو مەڵبەندە ئاڵای دەسەڵاتی هەڵدا و کەوتە سارێژ کردنەوەی برینەکانی پێشووی. سەرۆک و سەرکردەی وەکوو شابازخانی دونبولی و فەتحعەلیخان کەتبوونە ژێر فەرمانی و محەممەدمووساخانی بەگلەربەگی ئەفشاری حاکمی ورمێ وێڕای یۆسفخانی هەلووتەکی (هووتەکی) و عەتاخانی ئەبداڵی دانابوون بە ڕاسپاردە و بەرپرسی هەڵسووڕاندنی کاروباری ورمێ و سنووران. پاش ئەوەی دووبارە توانی هێزێک کۆبکاتەوە دیسان بەرەو عێراق بزووت و لە قەزوێنی ناوەندی دەسەڵات دەنگ و ئاوازەی شان و شەوکەتی ڕێزدار محەممەدحەسەنخانی قاجار کوڕی فەتحعەلیخانی خودالێخۆشبووی بە گوێ ئاشنا کرا و بیستنی کە لە ناوچەی ڕەشت و گیلان دەسەڵاتی پەرەی ئەستاندووە. سەرەتا کەوتە بیری شکاندنی ئەو نەکا لەوێوە پەلاماری قەزوێن بدا، بەلام چونکە خەیاڵی ئاسوودە نەبوو سەبارەت بە کەریمخان و دڵی ڕۆنەدەمرکا. شکاندنی هێزا محەممەدحەسەنخانی بە سانی دانا و ڕووی کردە ئیسفەهان و لە دوو مزلیی شار هۆردووبەزی کرد. کەریمخان هەر کە بیستی قۆشەنی ئازادخان گەیوەتێ، بەرەوپیری لەشکری دەنگ دا و هێزەکانیان تێکهەلەنگووتن. دیسان ئەو دوو خەنیمە بەهێزە شەڕی قورس و گران لە نێوانیاندا قەوما و ئەمجارەشیان کەریمخان بەزی و بەرەو شیراز ڕەوی و سەرلەنوێ ئیسفەهان کەوتەوە چنگ ئازادخان. ئەویش لە ماوەی شەش مانگدا کەوتە ئەستاندنی باج و خەراج لە ژێردەستان و دووبارە پەلامارداني فارس و شکاندنی کەریمخان مێشکی ورووژاند، بەلام کاتێک کەوتە باس و ڕاوێژ لەگەڵ

سەرۆک و سەرداران، ئەوان کێشانی خاشەی محەممەدحەسەنخانی قاجاریان بە گرینگتر و باشتر زانی. هەر بۆیە یەکی بزووتن بەرەو فارسی خست و دوای دانانی حوکمدار بۆ ئیسفەهان سەری چلەوی بەرەو هەرێمەکانی گیلان وەرسووراند و زۆر بەپرتاو رووی کردە ناوچەی خەلخال. لەوێوە رێگای رەشتی گرتەبەر و کاتێک گەیشتە فیرووزکۆ، بەپێی فەرمانی محەممەدحەسەنخان، محەممەدخانی قاجار بەرەگەی لێتەنی و خودی میری بەرزەشانیش لە عەلیئاباد کەوتە ئەدارەکی شەڕ و لێکدان و پیادەی گیلەکی دامەزراندن و لەسەر رموگەی تێپەڕینی چەکدارانی ئەفغان و ئەفشار بۆسەی پێنانەوە. دواتر لەگەڵ دەستەی قاجار و یەمووت و تورکمان و دەهەزار چەکدارێک بزووت و هات بەرەورووی سپای ئازادخان راوەستا و لەشکری دابەشی و قۆڵەکانی دیاری کرد و شەڕ قەوما. هێزی ئەفغان بەپێی نەریتی خۆیان شانبەشانی یەکتر و بە شیری رووتەوە هێرشیان برد و چاویان لە حاند تیر و تفەنگان نەترووکاند و ئەگەرچی کەلاکێکی زۆریان کەوتە سەر دەستی، بەلام نەکشانەوە و دریان بە ریزەکانی سپای محەممەدحەسەنخان دا و هەزارەزیلەیان بەرەو لێرەواران رموین. ئەفغان و ئەفشار کەوتنە شوێنیان، کەچی لەناکاو چەکدارانی گیلەک لە مەتەرێزەکانی خۆیان دەرپەڕین و وەبەر دەسڕێژی فیشەکانیان دان و ئەفغانی و ئەفشاری بێخەبەر بە تەڵەکەی رۆژگار بوونە خەزەڵوەری دەم بای بەتەوژمی نەمان و تاقمێکیان گیران. ئازادخان کە ئاوای دیت بە شکاوی و دەمکوتکراوی لە رەشتەوە رووی کردە خەلخال و سپای بەزیوی لە دارستانەکانی نێوان خەلخال و رەشتا بە هەزار کوێرەوەری بار و بارخانەیان فڕێ دا و گیانی خۆیان دەرباز کرد. ئازادخان هاتە قەزوێن و جەماوەری «چالخەیارە» سەریان لە ئاستی بادا و تفاق و خورد و خۆراکیان نەدایە و ئەویش بە هێزێکی کەم دەورەی تەنی و چی وای پێنەچوو گرتی و لە قەزوێن بنەی داکوتا و کەوتە قەرەبووی شکستی لەشکری خۆی. بەراستی ئەمساڵە زستانەکەی زۆر سەخت بوو. نوا

بەفری وا کەوتبوونەوە سەر یەک کە ڕێگاوبانی ئازەربایجـان گیرابـوون و لـە ماوەی ئەم سێ مانگەدا هاتوچۆی تەتەر و کاروانان دەستی نەدا. سەبارەت بـە شەڕی ئازادخان لەگەڵ خانزادە محەممەدحەسەنخـان و تێکـشکانی، هەواڵـی لەنگـولۆر لە ئازەربایجاندا دەماودەم دەگەڕان و دەیـانگوت ئازادخـان تـۆزی لێبەبا کراوە و دەسـەڵاتی محەممەدحەسـەنخـان گەیوەتـە ئەوپـەڕی خـۆی. محەممەدڕەزاخانی مەرەندی کە ئەو کاتی لە لایەن ئازادخانەوە حاکمی تـەورێز بوو، بە بیستنی هێندێک هەواڵ و نەهاتنی تەتەر و نامە تۆقی و خۆی هاویشتە ماڵی سەرجەلەی زانایان میرزا ئەسەدوڵلای شێخولئیسلامی تەورێز هـەتا لـە چنگ ئاپۆرای ئاژاوەچی بە دوور بـێ و کـەس نـەتوانێ دەسـتی بکاتـێ! لـەو جەنگەیـەدا پەساپەسـا خەبـەر لـە لای ئازادخانـەوە بلاوبوونـەوە کـە «چـاڵخـەیارە»ی گرتـووە و لـە قـەزوێن سـەربەخۆیە و حـوکمی دەڕوا. محەممەدڕەزاخان گیانێکی تازەی چۆوە بەر و گوتی لێـیدەن لـە سێتەپڵەی شـادمانی! دوای بیـست ڕۆژ یـان مانگێـک دەنـگ و هـەرای هـاتنی ڕێـزدار محەممەدحەسەنخان وڵاتی داگرت.

ساڵی ١١٧١ی کۆچی/١٧٥٧ـ١٧٥٨ زایینی، محەممەدحەسەنخانی قاجار کە لە مەڵبەندی ئەستەرابادی مازنـدەران ببـوو بـە خـاوەنی هێـز و دەسـەڵات و توانیبووی ئازادخان بشکێنێ و ببەزێنێ، لەبـەروەی کـە دەیزانـی لەشکری ئازادخان پشتی بە فەتحعەلیخانی ئەفـشار و شـابازخانی دونبـولی گەرمـە، نامەیەکی نەرم و پڕخۆشەویستی نارد بۆ فەتحعەلیخانی سەردار و دنەی دا بۆ یەکانگیری لەگەڵ خۆی و دابڕانی لە خانی ئەفغان. کاتێک نامەکەی پێگەیـشت لەگەڵ برایمخانی ئەفشاری دیوانبەگی ورمێ و شـابازخانی دونبـولی دیـدار و ڕاوێژی کرد. سەرەنجام هەموویان هاتنە سەر ئەم باوەڕە و گوتیـان ئەگـەرچی ئەمڕۆ ئازادخان باڵی بەختی بە سەر کـشاوە و توانیویـەتی ببێتـە حوکمـڕانی ئازەربایجـان و دەهۆڵـی دەسـەڵات دەکوتـێ، بـەڵام لەبـەروەی دژی ڕێبـازی

شیعەیە، بەڕاستی پێچەوانەی شەرەف و دماری ئایینییە کە هەوساری خێڵ و خێزان و نامووس و ئابڕوومان بە چنگ ئەفغانەوە بێ. جا بۆیە وا باشترە کە لەگەڵ بەڕێز محەممەدحەسەنخان ڕێککەوین و بە پشتیوانی تیشکی دەروونی پادشای جەلەودار [ئیمامی عەلی]، ڕەگ و ریشەی ئەفغانان لە خاکی ئازەربایجان هەڵکێشین کە دوژمنی ئێمەن.

ئەوسا وڵامی کاغەزی خاوەنشکۆیان نووسییەوە و پیاوەکەیان بەوپەڕی ڕێزەوە ناردەوە. خانی قاجار لە قزڵئەیاغی موغان بوو کە جوابی نامەکەی پێگەیشتەوە و لەڕێوە لەشکری بەرەو ئازەربایجان گاڵ دا. کاتێک گەیشتە دوور و نیزیکی تەورێز، جەماوەرێکی بەرچاوی شار بە شادی و پێکەنینەوە چوونە پێشوازی. ڕۆژی جێژنی نەورۆزی میری بوو کە سەرکردەی پایەبەرز پێینایە تەورێز. لەوێ کازمخانی قەرەجەداغی و پەناخانی جەوانشێر دایانە پاڵ هۆردووی و بەسەرکرانەوە. دوای چوار ڕۆژ مانەوە محەممەدحوسێنبەگی تورکمانی کردە حاکمی تەورێز و بە ئامانجی قەلاچۆی ئەفغان و گرتنی قەلای ورمێ کەوتەڕێ. وەختایەک گەیشتە خاکی ورمێ لە گوندی «سەنگەر» لەشکریان دانا و دەورەی شارەکەی دا. یۆسفخانی هووتەکی و محەممەدمووساخانی بەگلەربەگی ئەفشار وەختایەک زانیان دەستیان بۆ ناکرێتەوە خۆیان کێشایە ژێر پەساری دیواری قەلا.

لەو سەروبەندەدا کە ئازادخان لە ئێراق و فەراهان شەڕی دەکرد هەواڵی شالاوی محەممەدحەسەنخانی بۆ سەر ورمێ و گەمارۆدرانی محەممەدمووساخان و یۆسفخانی پێگەیی و تۆقی و بە سەرڕەو فڕی و چەشنی بای شەماڵ باڵی گرت و قەزوینی هەڵبوارد و بە ناوچەی گەڕووس و ساینقەلادا شۆڕ بۆوە و بۆ یۆسفخانی نووسی کە شلەی نەداتێیە و قەلا ڕابگرێ و هاکا من گەیشتمێیە. کاتێک قۆشەنی ئازاد کۆچاوکۆچ لە سابلاخی موکری و سندووس نیزیک بۆوە و هەواڵی هاتنی بلاوبۆوە، ڕێزدار محەممەدحەسەنخان سێهەزار

سوارە و پیادەی بە سەرکردایەتی کازمخانی قەرەجەداغی لە دەوری شار بەجێهێشت و خۆی بە لەشکرێکی ساز و پەرداخەوە رۆیی بەرەوپیری. لە مێرگ و چیمەنی پان و بەرینی «دۆلاما»ی پێنج فرسەخی شاری ورمێ هێزەکانیان بەرەورووی یەکتر راوەستان و دامەزران و خۆیان حازر کرد بۆ تێکهەڵچوون. جەماوەری ئەفغان لەبەر پاراستنی ماڵ و ژن و منداڵیان لە ورمێ دەستیان لە گیانی خۆیان هەڵگرت و شالاویان برد. حەشامەتی قاجار و تورکمان و خەڵکی ئازەربایجانیش کە لە ژێر فەرمانی ئازادخان دەرچووبوون، غەیری بەربەرەکانی و راوەستان هیچ چارەیەکی تریان نەبوو. بەکورتی باڵەکان تێکگیران و شەڕی قورسیان لە مابەینیدا قەوما. لەو گرمە و هەرایەدا هێندێک لە ریزەکانی لەشکری محەممەدحەسەنخانی هێژا کە تاقمی جەوانشێر و خێلاتی قەرەجەداغ بوون، خۆیان لە بەرامبەر هێرشی ئەفغانەکان و کوردانداپێرانەگیرا و تەقورەویان تێکەوت و پرشوبڵاو بوون. محەممەدحەسەنخان بەناچار وێڕای لاوانی قاجار دەستی هاویشتە پەتی قایم و پتەوی لۆتکەی رزگاری [کە ئیمامی حوسێنە] و هاواری کرد یا وەلی خودا [ئیمامی زەمان] دەفریامان وەرە! راکردووانیان گێڕانەوە و سەرلەنوێ وێڕای دووهەزار چەکداری پەنجە بە خوێن ئاورگی شەڕیان نێڵ دایەوە.

لەم جەنگەدا فەتحعەلیخانی ئەفشار و شابازخانی دونبولی بەگوێرەی گفتێکی کە دابوویان بە محەممەدحەسەنخان لە جەرگەی لەشکری ئازادخان دابڕان و وێڕای سوارەکانیان بەیداخی خۆیان چەشنی بەختی ئازاد سەرەونخوون کرد و دایانە پاڵ خانی قاجار. ئەم دیمەنە ورە و شان و شەوکەتی قزلباش و قاجارانی دەوشاندەوە و چێتر تێراچوون. ئاخرییەکەی ئەفغانی جڵەوی برشت و تابشت دەرچوو لە پەنجەیان و خۆیان بۆ رانەگیرا و بە تێشکاوی رایانکرد. تورکمان و قاجار بە پشتیوانی دونبولی و ئەفشاران کەوتنە پەیکەردەیان و زۆریان لێکوشتن و بە دیلیان گرتن و ئازادخان وێرای

بۆ لەچەکدارێک بەرەو کوردانی هەکاری تێی‌تەقاند. ئینجا رێزدار محەممەدحەسەن‌خان سەری یەکسمی بەرەو قەلای ورمێ وەرسووڕاند و فەرمانی گرتنی دا. بەلام هەرچەندی کردیان و کراندیان قەلاکەیان بۆ نەگیرا. لەم کاتەدا فەتح‌عەلی‌خانی ئەفشار بە مەبەستی دەرخستنی نیازپاکی و تێهەلێنانەوە و قەرەبووی کارەکانی رابردووی کە لە دامودەزگای ئازادخان‌دا بە زولم و زۆرەملی دەرهەق بە خەلکی عێراق ئەنجامی دابوو، بە خزمەت محەممەدحەسەن‌خانی راگەیاند کە رابەراندنی ئەرکی گرتنی قەلا بە من بسپێرە، بەلکوو فێل و تەلەکە بتوانێ دەروازەکانی بخاتە سەرپشت. وەختایەک ئیزنی ئەم کارەی درا، پیاوی نارده لای یۆسف‌خانی هووتەکی قەلادار و محەممەدمووساخانی بەگلەربەگ و قاقەزی لێ‌نووسین و گەلێکی گفت و بەلێن پێدان و دلنیای کردنەوە و بە هەرەشەش گوێی زرینگاندنەوە. یۆسف‌خان دوای خوێندنەوەی نامەکە چونکە هیچ رێ‌چارەیەکی بێ‌شک نەدەهات بە ناسەرسەنگی سەری نەوی کرد و لە قەلا هاتەدەر و گەردنی غلوورانەی خستە نێو کەمەندی دەسەلاتی خانی قاجارەوە و قەلاتی بە دەستەوە دا. محەممەدحەسەن‌خان لە کات و ساتێکی موبارەکدا پێی‌نایە ورمێ و لەسەر کورسی حکوومەتی ئازادی سەرلێ‌شێواو پالی دایەوە. هەر مال و سامان و خەزێنەیەکی نێژراو کە لە ماوەی نۆ سالان‌دا لە ئازەربایجان و عێراق و فارس کۆی کردبۆوە بە نەغدینە و کووتالی هەرەباش و کەلوپەلی زێرینەوە دەستی بە سەردا گرت و دابەشین و سەرۆکانی قاجار و

ردارانی تورکمانی پڕوەر کردن. دوای داڕووتاندن و چزدان و پێوەبەستنی تاوانانە، ئەفغانەکانی ورمێی بە مال و کۆچەوە رادان بۆ مازندەران و خانووبەرە و کۆشکەلی ئازادخان و گەورەپیاوانی ئەفغانی بە تەمای دۆزینەوەی خەزنەی شاراوە کاول و تەخت کرد! پاشان ماوەی شەش مانگ لە قەلای ورمێ بنەی داگرت.

❖❖❖❖

## چارەنووسی محەممەدمووساخانی بەگلەربەگی ئەفشار

محەممەدمووساخان کوڕی قاسمخان کوڕی خودادادخانی قاسملوو کە سەرۆکایەتی خێڵی بەرزمجێی ئەفشاری لە ئەستۆ بوو، بەراستی چۆن خراپە بەختی ئاوا لار و دەمەونخوونی دێنا و حکوومەتێکی لەرزۆک و سەرشکستەی هەڵدەسووڕاند. دیارە زۆربەشی دەگەڕایەوە سەر تێکچوونی دەوڵەتی ئێرانی دوای نادرشای ئەفشار و تەنینەوەی دەسەڵاتی ئازادخانی ئەفغان لە ئازەربایجان. وەکوو دیارە ئەم بەگلەربەگە بەناچاری سەری نەوی کردبوو بۆ ئازادخان و تەنانەت «قزئاقا»ی خوشکیشی دابوویە. لە ماوەی دەسەڵات و دەسڕۆیشتوویی ئازادخاندا وێڕای یۆسفخانی ئەفغان کاروباری حوکمڕانی و سەرۆکایەتی ئەفشارانی رادەپەڕاند. هەروەک پێشتر باسی کرا ڕێزدار محەممەدحەسەنخانی قاجار توانی ئازادخان بشکێنێ و بۆ نێو کوردانی بڕەتێنێ و فەتحعەلیخانی ئەفشاریش چووە ژێرکێفی و گەلێک خزمەتی شیاوی ئەنجام دا. خێڵی ئەفشار کە لەم ماوەیەدا زۆر بە دەست ئەفغانان چەوسابوونەوە کەوتنە تێچاندن بۆ محەممەدمووساخانی بەگلەربەگ و لای خانی قاجار تۆمەتباریان کرد کە لە ئازادخانی ئەفغان نیزیکە و بۆتە خزمی، هەر بۆیە محەممەدحەسەنخانی بەرزەجێ، محەممەدمووساخانی بە کەسوکارەوە گرت. ئەمیر گۆنەخانی قاجاری ڕانەسپارد کە هەرچی هەیەتی بە ویشکەپووڵ و قورسەماڵ و کەلوپەلی زێڕ و زیو و ڕەوەی یەکسمان هەمووی لێبستێنێ. بایی پەنجاهەزار ئەشرەفی ئالتوونی لە ماڵی دنیایەی خرایە سەر

یەک، کەچی بەمەش وازیان نەهێنا و فەرمانی کوژانی بەکۆمەڵی مەزلوومیان دا و خاکی بەدبەختی و چارەڕەشییان بە تۆقی سەری ئەفشاراندا کرد!

با هەموو کەس بزانێ و پاش دەوەن نەبێ کە ئـاگری تۆڵـەی ئـەم کـارە ناچارە، واتە کوژرانی محەممەدمووساخان، کە بە دنە و فیتی فەتحعەلیخـانی ئەرەشلوو ئەنجام درابوو، لەڕێوە بێ و پلی فەتحعەلیخان و کوڕانی گرتەوە و دیـارە لــە جێـی خـۆیدا باســی دەکـرێ. بــەکورتی پاشــەواری نێرینــەی محەممەدمووساخان تەنیا کوڕێک بوو بە ناوی ڕەزاقولیخان... .

## شەڕی محەممەدحەسەنخان لەگەڵ کەریمخان

پاش ئەوەی محەممەدحەسەنخانی پایەبەرز کێشەی ئازادخانی لە کۆڵ خۆی کردەوە و کاروباری ئازەربایجانی ڕێکخست و حوکمڕانی بۆ ناوچە و مەڵبەندەکانی قەڵەمڕەوی دانا، ئاغامحەممەدخانی کوڕە گەورەی لە تەوریز نیشتەجێ کرد. دواتر وێڕای سیهەزار کەس لە خەزاکەرانی ئازەربایجان و فەتحعەلیخانی ئەفشار و شابازخانی دونبولی و جەزایرچییەکانی ئازادخان و تۆپخانە و جبەخانەیەکی شایان لە تەوریزی ناوەندی دەسەڵاتەوە بەرەو قەزوین بزووت و لەوێوە بە مەبەستی لێدانی کەریمخانی زەند شۆڕ بۆوە. کەریمخان کە هێشتا زامی شەڕ و تێشکانی پەیتاپەیتای سارێژ نەبووبوونەوە و زەبری ئازادخانی ئەفغان و فەتحعەلیخانی ئەفشار تاساندبوویان، بە بیستنی داوەرینی محەممەدحەسەنخانی قاجار بەناچار لە ئیسفەهان دەرکەوت و بەرەگەی لە خاوەنشکۆ گرت و لەو هەرێمە شەڕێکی قورسیان لە نێوانیدا قەوما. دوای مرخێشمرخێش و ملبەملەیەکی دژوار، کەریمخانی زەند نەیتوانی خۆی لەبەر هێرش و گوڕمی شاڵاوی خێڵی ئەفشار و قاجار و ئەفغانییە گیانباز و بەڕاستی خزمەتکارەکانی محەممەدحەسەنخانی پایەبڵند ڕابگرێ و بەرەو فارس ڕەوی. محەممەدحەسەنخان بەشان و شەوکەتی میرانەوە پێینایە ئیسفەهان و بە دابی جاران سکە بە ناوی پیرۆزی حەزرەتی ساحێبزەمان - خودای مەزن لە ڕۆژی تەنگانەدا بینێرێ - لێدرا و ماوەی دوو مانگ تەشریفی لەم شارەدا مایەوە. وا هەڵکەوت کە ڕاست لەو کاتەدا قاتیوقڕی باڵی ئەنگاوت و زۆربەی جەماوەر لە برسان و لە سایەی هەلومەرجی نالەبار ڕوویان کردە هەرێمی نەمان. دوای دوو مانگ خانزادەی مەزن وێڕای لەشکرێکی تەیار بەرەو شیراز بزووت. لەو کاتەدا کە کەریمخان سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئازووخە و پاشەکەوتی لەشکر و چەکوچۆڵ و ئامرازی قەڵاداری بوو، هۆردووی محەممەدحەسەنخان لە یەک فرسەقی شیراز خێوەت و ڕەشماڵی هەڵدا و بۆ

بەیانی خۆی ڕێکخست و دامەزرا و ساز و ئامادە جەنگی دەرکرد بۆ پێکهەڵپرژان. کەریمخان وێڕای بۆلەچەکدارێک لـە قـەڵا دەرکـەوت و پـاش سـەفبەسـتن و خۆنواندن هیچی بۆ نەکرا و گەڕایەوە. چەند ڕۆژێکی بێپشوو هەردوو لا شـەڕی پیاوانەیان کردن و زەندان و لـوڕان دەسـتیان وەشـاند و تاقمێـک لەشـکرچی محەممەدحەسـەنخانیـان بـە دیـل گـرت و بردیـانن بـۆ شـار. بـەڵام سپای محەممەدحەسەنخان لەبەر کـەمبـوونی پاشـەکەوت و هەڵـتەکانی هەمبانـەی خۆراک و برسیایەتی کەوتبوونە تەنگـەژەوە. وای لێهـات کـە دەسـتەیەک لـە سەرکردەکانی سپای خانی قاجار پێکەوە تەگبیریان لێکرد و پەیمانیان بەست کە وەختایەک گڕی ئاگری شەڕ بەرز بۆوە و گرفەی هات، وێـڕای هێزەکانیـان لـە هۆردووی خانی مەزن هەڵبڕێن و بچنە پاڵ خانی زەند. کەریمخان بەم تەمایـەی دەزانی، بەڵام سەبارەت بە فێڵ و تەڵـەکەیان دڵـنیا نـەبوو. بـۆ سـبەینێ بـە قۆشەنێکی تەیارەوە لە قەڵا دەرکەوت و تەواو هەنگاوی بـەپارێزی هاویـشتن و شێلگیر و پتەو هێزی خۆی دامەزراند و جەرگە و پاشـەنگ و پێـشەنگ و باڵـی ڕاست و چەپی دیاری کرد. فەرمانی دا بـە شێخاڵـیخـان و محەممـەدخان، دوو مەردازا و دوژمنبەزێنی زەند کـە وێـڕای سـەرکردەکان هـەرکام لـە شـوێنێک ڕاوەستن و چاوەڕوانی دەرفەت بن. لە گەرمەی شەڕ و تێکهەڵچووندا، کۆمەڵێکی چوارهـەزار کەسـەی ئـەفغان و دەسـتەیەکی تـر لـە سـپای خـانی قاجـار بەیداخەکانیان وەکوو بەختی محەممەدحەسەنخان سەرەونخوون کرد و دایانـە پاڵ لەشکری کەریمخان. بەناچار قۆشەنی محەممەدحەسەنخان شکستی بە سەر شانیدا سەپی و خۆی بۆ ڕانەگیرا و هەڵبڕدابڕیان وێخستن. ئەفغانی کـە تـازە هەڵگەڕابوونەوە، ئیزنیان خواست بکەونە شوێنیان، بەڵام لەبـەرەوەی هێـشتا متمانەیان پێنەدەکرا، ڕێگا نەدران. کەچی شێخاڵیخـان و محەممـەدخان هـەتا ئیـسفەهان سـەریان لـە دوو نەکردنـەوە و نەیانهێـشت هەزارمزیلـەی محەممەدحەسەنخان وەخۆ بێتەوە.

کەریمخان دوای ئەم سەرکەوتنە چەند ڕۆژێک لە دەرەوەی شاری شیراز لەنگەری گرت و پاشان بە لەشکرێکی گەورە و گران و تەیارەوە ڕووی کردە ئیسفەهانی ناوەندی دەسەلات. کاتێک لە مەودای ڕێیەدا بیستی محەممەدحەسەنخان بەرەو مازندەران ئەسپی لینگ داوە، محەممەدخانی زەندی خستە شوێنی و ئەویش کە پیاوێکی غللوور بوو سڵەی نەکرد و بێباکانە ڕۆچوو بە لێرەواردا و تاقمێکی کوشتن. بەڵام لەپڕ کۆمەڵێکی قاجار هرووژمیان کردە سەری و بە کەمەندی ئازایەتی گرتیان و بە شەتەکدراوی بردیانە لای محەممەدحەسەنخان و ئەویش فەرمانی کوژرانی خۆی و هاوڕێیانی گیراوی دا و بەرەو بیابانی نەبوونیان بەڕێکردن. جارێکی تر محەممەدحەسەنخان لەشکرێکی کۆ کردەوە و هاتەوە قەزوێن و لێبڕا کە دەست لە کەریمخان هەڵنەگرێ. دەڵێن فەرمانیدا دارەچنارەکانی سەر شەقامی قەزوێن کە لە سەردەمی سوڵتانەکانی سەفەویدا نێژرابوون، ببڕدرێن و بیانکەنە بەرداوێژی تۆپخانە، بەڵام ئەم کارەی پێوەنەهات و بوو بە هۆی بڕانەوەی ئەمەن و دەسەڵاتی و دیارە لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ.

بەکورتی وەختایەک کەریمخان تەمای خانی قاجاری بۆ روون بۆوە، بە ئامانجی لێدانی لە ئیسفەهانەوە ئاڵاکانی سەرکەوتنیشانی هەڵدا. محەممەدحەسەنخان لە قەزوێنەوە چووە تاران کە پردێکە و عێراق و مازندەران پێکەوە دەبەستێتەوە. لەو لاوە کەریمخان بە بیستنی هەواڵی کوژرانی محەممەدخانی زەند وەها دەرهەڵبوو کە بەپرتاو ئەسپی غار دەدا و ڕێگای دەکوتا. لە دەوروبەری وەرامین هێزەکانیان تێکهەڵنگووتن و شەڕێکی قورس لە نێوانی ئەو دوو ماکە بەپێزەی ئاژاوەیەدا قەوما و چاونەترسانی ئەو باڵەوباڵان بەراستی ئازایەتییان نواند. بەڵام سەرەنجام قاجار و گیلەک خۆیان لە حاند شاڵاوی زەند و باجیلوەند بۆ ڕانەگیرا و شلەیان دایە و ڕەوین. تۆرەمەی ئەفغان کە خاوخێزانیان بە فەرمانی محەممەدحەسەنخان ڕاگوێزرابوونە مازندەران و دەسبەسەر بوون، کەوتنە پەیکەردەی ڕاکردووان و ئەوەندەی شیریان بڕی کرد

دەستیان لە کوشتار و تالان نەپاراست. محەممەدحەسەنخان بە دیتنی ئەم بارودۆخە کەوتە نێو گێژاوی دڵەڕاوکە و هەڵات بەرەو ئەستەراباد. لە مەودای ڕێگادا یەکسەر ژێر ڕانی ئەو مەزنەپیاوە کە بە «جیهانپەیما»[1] ناودێر بوو، بە سینەی زۆنگاوێکا ڕۆچوو. لەو کاتەدا چەند کەس لە هاوڕێیانی بێبەروپشتی کە یەکیان سەبزعەلی کوردی ئەستەرابادی بوو لەگەڵ محەممەدعەلیئاغای دەوانلوو برای حوسێنخانی قاجار بە دە سوارانەوە گەیشتنە سەری و ویستیان بیگرن و دوای ئەوە دوو کەس بە زەبری شمشێری ئەو پیاوە ناودارە لە خوێنی خۆیان گەوزین، یەکێک فیشەکێکی پێوەنا و ئەنگاوتی و لە خوانی ژینەوە هەڵیداشت و لەڕێوە گیانی دایە دەست پەروەرندەی. لە ڕاستیدا خەڵکی ئەستەراباد و مازندەران خۆڵی چارەڕەشی بە سەریاندا بێژرا! خێرایەکی کابرای بکوژ بە تەمای وەرگرتنی دەسخۆشانە، مزگێنی کوژرانی مەزن و سایەچەوری خۆی برد بۆ کەریمخان. هێندێک دەڵێن کە سەری لە قەڵای جەستەی کردۆتەوە و لە ئەرگی[2] تاران خستوویەتە بەرچاوی کەریمخان، بەڵکوو لە داوێنی هەرەخوارەوەی بەدبەختیڕا بگاتە پەرپەرۆچکەی بەختەوەری. کەریمخان ئەگەرچی بە بیستنی ئەم هەواڵە شادی لە ناخ و دەروونی گەڕا، بەڵام بێزی لەم کارە چەپەڵە هەستا و لەبری خەڵات کردن ئابرای کوشت و بەرەو بیابانی نەبوونی ڕادا، هەتا ئاکاری نالەباری نەبێتە ڕێوشوێنی کەسانێکی دیکە. پاش ئەم کارانە کەریمخان لە تاران بنەی داکوتا و زەکیخانی برای وەکوو سەردار ناردە مازندەران و خۆی کەوتە کەڵتە و سازکردنەوەی قەڵا و باڵەخانەکانی ـوومەتیی ئەم شارە. لە تارانەوە ناردی بە شوێن ڕێزدار ئاغامحەممەدخانی کوڕە گەورەی محەممەدحەسەنخان و حەوت کەس لە براکانیدا و لە ئەستەرابادەوە هێنایانن و دڵخۆشی دانەوە و دەستی ڕێزی لێنان و بردنی بۆ شیراز.

---

1 - جیهانپێو. بریتییە لە ئەسپی خۆشبەزی ماندوویینەناس.

2 قەڵابیچە. جەرگەقەڵا. ئەو قەڵا بچکۆلانەی دەکەوێتە نێوەڕاستی قەڵای گەورەوە.

کەریمخان دوای ئەم سەرکەوتنە چەند ڕۆژێک لە دەرەوەی شاری شیراز لەنگەری گرت و پاشان بە لەشکرێکی گەورە و گران و تەیارەوە ڕووی کردە ئیسفەهانی ناوەندی دەسەلات. کاتێک لە مەودای ڕێیەدا بیستی محەممەدحەسەنخان بەرەو مازندەران ئەسپی لینگ داوە، محەممەدخانی زەندی خستە شوێنی و ئەویش کە پیاوێکی غللوور بوو سڵەی نەکرد و بێباکانە ڕۆچوو بە لێرەواردا و تاقمێکی کوشتن. بەڵام لەپڕ کۆمەڵێکی قاجار هرووژمیان کردە سەری و بە کەمەندی ئازایەتی گرتیان و بە شەتەکدراوی بردیانە لای محەممەدحەسەنخان و ئەویش فەرمانی کوژرانی خۆی و هاوڕێیانی گیراوی دا و بەرەو بیابانی نەبوونیان بەڕێکردن. جارێکی تر محەممەدحەسەنخان لەشکرێکی کۆ کردەوە و هاتەوە قەزوێن و لێبڕا کە دەست لە کەریمخان هەڵنەگرێ. دەڵێن فەرمانیدا دارەچنارەکانی سەر شەقامی قەزوێن کە لە سەردەمی سوڵتانەکانی سەفەویدا نێژرابوون، ببڕدرێن و بیانکەنە بەرداوێژی تۆپخانە، بەڵام ئەم کارەی پێوەنەهات و بوو بە هۆی برانەوەی تەمەن و دەسەڵاتی و دیارە لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ.

بەکورتی وەختایەک کەریمخان تەمای خانی قاجاری بۆ ڕوون بۆوە، بە ئامانجی لێدانی لە ئیسفەهانەوە ئاڵاکانی سەرکەوتنیشانی هەڵدا. محەممەدحەسەنخان لە قەزوێنەوە چووە تاران کە پردێکە و عێراق و مازندەران پێکەوە دەبەستێتەوە. لەو لاوە کەریمخان بە بیستنی هەواڵی کوژرانی محەممەدخانی زەند وەها دەرهەڵبیوو کە بەپرتاو ئەسپی غار دەدا و ڕێگای دەکوتا. لە دەوروبەری وەرامین هێزەکانیان تێکهەڵەنگووتن و شەڕێکی قورس لە نێوانی ئەو دوو ماکە بەپێزەی ئاژاوەیەدا قەوما و چاونەترسانی ئەو باڵەوباڵان بەڕاستی ئازایەتییان نواند، بەڵام سەرەنجام قاجار و گیلەک خۆیان لە حاندی شاڵاوی زەند و باجیلوەند بۆ ڕانەگیرا و شلەیان دایە و ڕەوین. تۆرەمەی ئەفغان کە خاوخێزانیان بە فەرمانی محەممەدحەسەنخان ڕاگوێزرابوونە مازندەران و دەسبەسەر بوون، کەوتنە پەیکەردەی ڕاکردووان و ئەوەندەی شیریان بڕی کرد

دەستیان لە کوشتار و تالان نەپاراست. محەممەدحەسەنخـان بـە دیتنـی ئـەم بارودۆخە کەوتە نێو گێژاوی دڵەڕاوکە و هەڵات بەرەو ئەستەراباد. لـە مـەودای ڕێگادا یەکسمی ژێر ڕانی ئەو مەزنەپیاوە کە بە «جیهانپەیما»[1] ناودێر بوو، بـە سینەی زۆنگاوێکا ڕۆچوو. لەو کاتەدا چەند کەس لە هاوڕێیانی بێبەروپشتی کە یەکیان سەبزعەلی کـوردی ئەسـتەرابادی بـوو لەگـەڵ محەممەدعـەلیئاغـای دەوانلوو برای حوسێنخانی قاجار بە دە سوارانەوە گەیشتنە سەری و ویستیان بیگرن و دوای ئەوە دوو کەس بە زەبری شمشێری ئەو پیاوە ناودارە لە خـوێنی خۆیان گەوزین، یەکێک فیشەکێکی پێوەنا و ئـەنگاوتی و لـە خـوانی ژینـەوە هەڵیداشت و لەوێوە گیـانی دایـە دەسـت پەروەرنـدەی. لـە ڕاسـتیدا خەڵـکی ئەستەراباد و مازندەران خۆڵی چارەڕەشی بە سەریاندا بێژرا! خێرایەکی کابرای بکوژ بە تەمای وەرگرتنی دەسخۆشانە، مزگێنی کوژرانی مەزن و سـایەچەوری خۆی برد بۆ کەریمخان. هێندێک دەڵێن کە سەری لە قەڵای جەستەی کردۆتەوە و لە ئەرگی[2] تـاران خـستوویەتە بـەرچاوی کـەریمخـان، بەڵـکوو لـە داوێنـی هەرمخوارمەوەی بەدبەختیڕا بگاتـە پەرپەڕۆچکـەی بەختـەوەری. کـەریمخـان ئەگەرچی بە بیستنی ئەم هەواڵە شادی لە ناخ و دەروونی گەڕا، بەڵام بێزی لەم کارە چەپەڵە هەستا و لەبری خەڵات کـردن کـابرای کوشـت و بـەرەو بیابـانی نەبوونی ڕادا، هەتا ئاکاری ناڵەباری نەبێتە ڕێوشوێنی کەسانێکی دیکە. پـاش ئەم کارانە کەریمخان لە تاران بنەی داکوتا و زەکیخانی برای وەکـوو سـەردار ناردە مازندەران و خۆی کەوتە کەڵتە و سـازکردنەوەی قـەڵا و باڵـەخانەکانی حوومەتیی ئەم شارە. لە تارانەوە ناردی بە شوێن ڕێـزدار ئاغامحەممـەدخانی کـوڕە گـەورەی محەممەدحەسـەنخـان و حـەوت کـەس لـە براکـانیدا و لـە ئەستەرابادەوە هێنایانن و دڵخۆشی دانەوە و دەستی ڕێزی لێنان و بردنـی بـۆ شیراز.

---

1 - جیهانپێو. بریتییە لە ئەسپی خۆشبەزی ماندوویینەناس.

2 - قەڵاییچە. جەرگەقەڵا. ئەو قەڵا بچکۆلانەی دەکەوێتە نێوەراستی قەڵای گەورەوە.

## [چوونەوەی] فەتحعەلیخانی ئەفشاری ئەرەشلوو بۆ ئازەربایجان

پاش ئەوەی کە محەممەدحەسەنخان بارگەی ژیانی لەم دنیا پڕ کەتن و ئاژاوەیە پێچایەوە و بوو بە ڕێبواری مەڵبەندی جیهانی پاشین، هێندەی پێنەچوو کە خێڵ و خزم و دەستوپێوەندەکانی چەند ڕۆژەی لێکبڵاو بوون. بۆ وێنە فەتحعەلیخانی ئەفشار و شابازخانی دونبولی بەوپەڕی پەشێوی و پەرێشانی وێڕای بۆلێک لە یاران و ڕکێفدارانیان لە ترسی کەریمخان ڕوویان کردە ئازەربایجان. بە بڕوای چەند مێژوونووسێک وەختایەک فەتحعەلیخان و شابازخان وردبوونەوە و تەماشایان کرد ئەستێرەی بەختی خانی قاجار بەرەو ئاوابوونە، هەر لە سەردەمی ژیانیدا لێیهەڵبڕان و گەڕانەوە ئازەربایجان. چونکە لەو سەروبەندەدا تەورێزی ناوەندی دەسەڵات کەسێکی شیاوی حکوومەت و سەرۆکایەتی لێنەبوو کە بتوانێ جەماوەری هەرێمەکە لە بەرامبەر شاڵاوی دوژمنانی بەهێزدا بپارێزێ، خەڵکی شار کە ناوبانگی فەتحعەلیخانی ئەفشاریان بیستبوو، گەشانەوە و چوونە پێشوازی. خانی ئەفشار کە زۆربەی سەرۆکان و گەردنکەشانی ئازەربایجان لەبەری بەزیبوون، خەڵک بەوپەڕی ڕێزەوە بردیانە نێو تەورێزەوە و دایاننا بە حوکمڕان و سەرداری خۆیان و چی پێویستە بۆ شان و شەوکەتی حاکم هەموویان لە دەوری کۆکردەوە. فەتحعەلیخان لە ماوەی چوار مانگدا بە لێوەشاوەیی و کارزانی خۆی ئەوەی پێویستی سەرۆکایەتی بوو ئامادەی کرد و نۆکەر و خزمەتکار و جەزایرچی و سوارە و پیادەی ڕێکخستن و تۆپخانەی دانا و بەگشتی سیهەزار کەسی لە سان دا. خێڵاتی ئازەربایجان کە کەوتبوونە باز و برد و پرکێشی سەری هەموویانی بردە ژێر نیری دەسەڵاتی و سام و ترسی سێبەری هاویشتە سەر دڵی هەموو لایەک. پێنسەد پیاوێکی ئەفغانی کە لە دەورانی نەمانی دەسەڵاتی ئازادخاندا

بەرەو هەرێمی شێروان ڕەویبوون، بە بەخشینی مـاڵ کەوتـە دڵـدانەوەیان و هێنانی بۆ لای خۆی. لەم کاتەدا سەرۆکی ئەم تاقمە محەممەدخانی ئەفغان بـوو کە بە پیاوێکی خوێنڕێژ و دڵڕەق و بێباک دەناسرا. پاش داوەرینـی ئـەمان بـۆ خزمەت ڕکێفی فەتحعەلیخان، هەر کەسانێکی تۆرەمەی ئەفغان کـە پـەرەوازە کەوتبوونەوە یان خۆیان حەشـار دابـوو بـێسـێودوو سـەریان لـە کـەلێنان هێنایەدەر و بەرەو بارگای فەتحعەلیخان بزووتن بە ئومێدی ئەوەی کە وەکـوو زەمانی ئازادخان دیسان دەسەڵاتیان پـەرە بگرێتـەوە. دوای ئـەوەی بوونـەوە خاوەنی ئەسپ و چەک و مووچەی مانگانە، وردەوردە چوونـەوە سـەر دۆخـی جاران و دەستیان درێژ کردە سەر ماڵ و دارایی خەڵک و لە ئـازار و ئێـشاندنی جەماوەر نەپرینگاوە. خەڵکی تەورێز بەتێکڕایی چوونە لای فەتحعەلیخان و بە خزمەتیان ڕاگەیاند کە خاشەکێشانی ئەم تۆرەمە گومڕایە بێگومان دەبێتە هـۆی ڕاوەستان و سەقامگیری دەسـەڵاتی سـەردار و جـەماوەری بـێبڕسـتی شـار و گوندانیش پێیانخۆش دەبێ و دەحەسێنەوە. لەبەروەی فەتحعەلیخـان هێـشتا دەسەڵاتی هەر نەبەگە بوو، خوایینەخوایی ڕەزامەندیی جەماوەری وەبـەرچاو گرت و کەوتە بیری بڕینەوەیان. ئەو کاتی خانی بـەرزەجێ ماڵـی لـە دەرەوەی شاری تەورێز و لە شوێنێک بوو بە ناوی باغی تەلیسوڵتان. هێزەکانی خۆی لە بەرێک بوون و ئەفغانییانی گومڕا لە بەرەکەی تر. فەرمووی کـە تفـەنگچییانی لەشکر و خەڵکی تەورێز نیوەشەوێ لە پشت دیوارەکانی باغ خۆیـان دابگـرن و فەرمان درا بە خێڵی ئەفشار و دونبولیش کە ئەو شەوە دیـاریکـراوە ئامـادە و لەسەر تێزە بن و بەرێبەیانی هەڵـکەنە سـەر ئـەفغانان و ئەوەنـدەی دەکـرێ دەستیان لێنەپارێزن و هەموویان بکووژن. جا لەو کاتەدا کە ئەفغانی لە کار و کردە و قین پێڕشتنی ڕۆژگار بێخەبەر بوون، بەجارێک هێرشیان کردنە سەر و وەبەر تیر و تفەنگانیان دان. ئەفغانی کە خرپ خەوتبوون و سۆسـەی هیچیـان نەکردبوو، بە پەشۆکاوی لە خەو ڕاپەڕین و کەوتنە بەرەنگاری. لـەو هەرایـەدا

تاقمێکیان کوژران و هێندێکیان خۆیان بۆ ڕانەگیرا و ئاوارەی کێو و سەحرا بوون. فەتحعەلیخانی سەردار فەرمانی دا بە نەجەفقولیخانی دونبولی کە دەستەسوارێک هەلگرێ و بکەوێتە پەیکەردەیان و تۆویان لێبرێ.

نەجەفقولیخان بەپێی فەرمان وێڕای کۆمەڵی چەکداران هەتا شەش فرسەخان کەوتە شوێنیان و هەرچی تووشی بوون کوشتیان و خاشەیان کێشان، مەگین ئەوانەی هێشتا چارەیان نەنووسرابوو لە نەمان و توانیان دەربازبن نیوەگیان.

فەتحعەلیخان پاش لێدانی ئەفغانان تەواو دەسەلاتی پەلوپۆی داکوتا و خەلکی هەرێمەکەش ئۆخژنیان بە دەروونیدا گەڕا و دلنیا و ئاسوودە بوون. دوای ئەم هەرایە فەتحعەلیخانی ئەفشار، شابازخانی دونبولی کردە شەریکی دەسەلات و شاکۆلەکەی فەرمانڕەوایەتی و میرزا محەممەدجەعفەری ئیمانلووی ئورووحی[1] بوو بە وەزیر و ڕاوێژکار. لەم کاتەدا میرانبەگی مەحموودلوو باپیرەگەورەی منی نووسەر کە پێشتر لەبەر داڕووتان و چەوسانەوەی بە چنگ نەقیخانی حاکمی ورمێ پەرێشان و تێماو وێڕای خاوخێزانی لە خاکی شنۆی زەرزایان دەژیا، چووە خزمەت فەتحعەلیخان و ئەویش بە گۆشەنیگای میرانە بەسەری کردەوە. دەلێن دووهێندەی ئەوەی کە نەقیخان لێیئەستاندبوو لە ماوەیەکی کەمدا بۆی قەرەبوو کردۆتەوە. بەڕاستی مەزنەپیاوان هەر ئەو کارانە دەکەن کە شانیان هەلیدەگرێ و دەبێ بکرێ.

---

[1] خەلکی ئورووميیە. خەلکی ورمێ.

## شەڕی فەتحعەلیخانی ئەفشار لەگەڵ ئازادخان

ساڵی ۱۱۷٤ی کۆچی/۱۷٦۰ــ۱۷٦۱ی زایینی بوو کە خودالێخۆشبووی بەرزەجێ محەممەدحەسەنخانی قاجار لە ورمێ ئازادخانی شکاند و بەرەو بەغدای ڕەتاند. تەواوی ئەو ماوەیە گوێقوڵاغ بوو بزانێ لە ئێران چ دەقەومێ و وەختایەک سەرکەوتنی کەریمخانی زەند و کارەساتی تاڵی محەممەدحەسەنخانی خوابەخشیوی بیست، هەلەکەی بە لەبار زانی و لە بەغداوە ڕووی کردە کوردستان و داوای لە خێڵ و خزمانی هەکاری خۆی کرد کە یاریدەی بدەن. ئەوانیش لەبەر خزمایەتی و بزووتنی دەماری خێڵاتی پازدەهەزار کەسێک لە دەورەی کۆبوونەوە. ئازاد بەم قۆشەنەوە کەیفی بزووت و بە مەبەستی گرتنی تەوریزی ناوەندی دەسەڵات و کوشتار و تاڵانی جەماوەری ئەو مەڵبەندە دڵبزوێنە مامزەی لە کەلەکەی ئەسپی ئاوات و ئامانجی ئەنگاوت، چونکە بەڕاستی ڕقی لە خەڵکی تەوریز هەڵگرتبوو، بەڵام خواست و ویستی یەزدانی کۆسپ و تەگەرەی خستە سەر ڕێگای پیلانەکانی ئەو بەدفەڕە. بەکورتی وێڕای ئەو قۆشەنە ڕێگای هەڵبوارد و گەیشتە شارۆچکەی بناو کە لەوێوە هەتا مەراغە دوو فرسەخە. ئەو کاتە حاکمی مەراغە حاجی عەلیمحەممەدئاغا موقەددەم بوو کە بۆ وریایی و دەستوبرد و بوێری لە هاوشانەکانی خۆی تێپەڕاندبوو. عێل و عاشیرەتی موقەددەم هەموویان بە مەزنی خۆیان دەزانی و باج و خەراجی نەدەدا بە حوکمدارانی ئازەربایجان. بە بیستنی پەیدابوونی ئازادخان و لەشکری بێئامانی لە دەوروبەری مەراغە کەوتە دڵەخورتە و شێواوی و بەناچار نامەی نووسی بۆ فەتحعەلیخان و سەری وەبەرهێنا و

دەروازەی دۆستایەتی بە ڕوودا کردەوە و داوای یارمەتی لێکرد بۆ لێدانی ئازادخان. حوکمڕانی ئازەربایجان چونکە زانی ئامانجی سەرەکی ئەم هێرشەی ئازاد گرتنی تەورێزە، بە تەواوی کەوتە بەرەنگاربوونەوەی گەرداوی ئەم ئاژاوەیە و فەرمانی دا بە سەرجەم هێزەکانی وەخۆکەون و جەماوەری گوندنشینی نیزیکەشار ڕاگوێزنە ژێر پەساری شوورەی تەورێز. ئەوسا نەجەفقولیخانی دونبولی کوڕی شابازخانی لەگەڵ هەزار سوارە و پیادەی تفەنگچی وەکوو پێشەنگ ناردنی بۆ یاریدەی حاجی عەلیمحەممەدئاغا.

بەڵام لەم لایەوە وەختایەک ئازادخانی ئەفغان گەیشتە شارەدێی بناو، ئاوری زوڵمی وەها هەڵگیرساند کە دووکەڵی ئاهـ و ناڵە و شیوەنی جەماوەری هەتا میچی گومبەزی ئاسمان تێکڕاچوو. زۆربەی پیاوماقووڵانیان کوشتن و نێر و مێیان بە دیل گرتن. لەو لاوە کاتێک فەتحعەلیخان ئەم هەواڵانەی لە پەنا خۆیەوە بیستن، ئاراوقارای لێهەڵگیرا و بەهەشتاو لە تەورێز دەرپەڕی و بەرەو ئەو باڵە باڵی گرت و لە مەراغەش حاجی عەلیمحەممەدئاغای ڕەگەڵ کەوت. لە مێرگ و پاوانی بناو هێزەکانیان بەرەوڕووی یەکتر ڕاوەستان. بەرایی لەشکری ئازادخان هەزار کەسێکی ئەفغانی بوون. فەتحعەلیخانیش لە چەکدارانی موقەددەم و دونبولی هەزار کەسی بە سەرکردایەتی نەجەفقولیخان کردنە پێشەنگ و خۆشی شانبەشانی شابازخان و حاجی عەلیمحەممەدئاغا لە جەرگەی سپا دامەزران. مێرخاسانی قزڵباش بەرەوڕووی پیاوانی ئەفغانی ئەسپی ئازایەتییان لینگ دا و شانیان دایە شەڕ و لێکدان، بەڵام لە سەرکەوتنی کوردان تۆقیبوون. بەناچار پەنایان بردە بە سیلەچاوی یەزدانی و حەزرەتی پێغەمبەری پشتیوان و هاواریان لێکردن بگەنە فریایان و بە شەوقی شانەبەرزەی شەهید بوون و بەختەوەری بە گیان و دڵ تێدەکۆشان. ئەو ڕۆژە لە بەریبەیانەوە هەتا دەمی نیوەڕۆ، لە مێرگ و چیمەنی بناو هەدایان نەدا و هەڵسووران. قرچەقرچی نیوەڕۆ وڵات وەکوو کوورەی ئاسنگەران بلێسەی دا و

پریشکی لێبۆوە. دەروونیش لەبەر ئاگری ناخۆشەویستی دوژمنان هەر کولەکولی بوو. هێندەی نەمابوو کە قۆشەنی ئازادخان سەرکەوێ، بەلام دووهەزار پیاوی بەشەرەف و ئازا و بەکار و دیار و دنیادیدەی قزلباش بە شیری رووتەوە، چەشنی شێرانی چاوبرسی چاویان قووچاند لە حاند تیر و نێزەی کوردان و خۆیان بە نێرینەی لەشکری دادان. هەتا ئێوارەیەکی درەنگ گڕی ئاگری شەڕ هەر گرفەی هات، کەچی لەپڕ بە پشتیوانی پەروەردگار و هیممەت و بەرەکەتی خاوەنی زولفەقار، شنەی سەرکەوتن و بالادەستی برچی ئالای فەتحعەلیخانی راوەشاند و لەشکری ئازادخان شکا. خانی ئەفغان ئەمجارەشیان خۆی بۆ رانەگیرا و رەوی و چونکە هیچ پەنا و پەسیوێکی پێشک نەدەهات رۆیی بۆ گورجستان و پەنای بردە بەر فەرمانڕەوای ئەو هەرێمە. حوکمرانی دادپەروەر زۆر بەرێزەوە دەست بە سەری کرد.

دەلێن کۆمەلێکی کەمی قۆشەنی ئازاد کە توانیبوویان لە جنگ قزلباشان دەرباز بن و گەیبوونەوە شوێنی خۆیان، یەکیەک گیرۆدەی نەخۆشی و ناسازی بوون و دەستیان لە داوێنی دنیا بەردا. دوای ئەم سەرکەوتنە بەرچاوە فەتحعەلیخانی ئەفشار گەڕایەوە تەوریز و دەنگ و ئاوازەی دەسەلات و نەبەزینی هەموو لایەکی گرتەوە و رۆژ بە رۆژ جەماوەرێکی پتری تێدەهالا و شەوکەتی زیاتری دەتەنییەوە. وای لێهات کە لە ماوەی شەش مانگا دەهەزار کەسی سوارە و پیادەی خستە بەرڕکێفی.

# شەڕی فەتحعەلیخان لەگەڵ پەناخانی جەوانشێر

لەم ڕۆژگارەدا کە فەتحعەلیخانی ئەفشاری سەرۆک تیرەی ئەرەشلوو شانبەشانی شابازخانی دونبولی لە ئازەربایجان دەسەلاتی پەرەی ئەستاند و بوو بە فەرمانڕەوا؛ هەر لە قافلانکۆوە هەتا دەربەند کە بە شادەروازە[1] و پۆلادمرگا[2] ناوبانگی ڕۆیشتووە، یەکسەر حوکمی بڕی کرد. هەر کەس کەلەوەکێشی کردبا هەلێدەکردە سەری و دەیشکاند و سەری پێدەچەماند. بێجگە لە پەناخانی جەوانشێر کە زۆر بە شان و شەوکەت و دەسەلات و سامان و دارایی و هێزەکانی خۆی دەخوڕی و دەنازی و فەتحعەلیخانی بە هیچ دانەدەنا و ملی بۆ ڕانەدەکێشا. خانی بەرزەجێ سەرەتا میرزا جەعفەری ئەفشاری ئیمانلووی سەرۆکی بەشی داهاتی پیتاکی ئازەربایجان کە پیاوێکی تەواو و کارزان بوو ناردییە لای پەناخان لە قەلای شووشی هەتا داوای لێبکا سەری وەبەر بێنێ و لە ئاکامی تاڵ و ناخۆشی دژایەتی بیتۆقێنێ. وەختایەک ئامۆژگاری خێرخوازانەی میرزا جەعفەری زانا بە گوێی پەناخاندا نەچوون، بۆئەوەی ئامانجی پێکابێ گەڕایەوە و باس و بابەتێکی سەبارەت بە لووتبەرزی ئەو سەربزێو و یاغییە و نازینی بە قەلای سەختی شووشی(شووشە) خستەڕوو. هەر بۆیە فەتحعەلیخان دەستووری دا کە هێزەکانی ئازەربایجانی ئالای سەرکەوتنیشان بەرەو قەرەباغ هەلبدەن. کاتێک دەنگدانەوەی بزووتنی قۆشەنی ئازەربایجان گەیشتە گوێی پەناخانی جەوانشێر، ئەویش لەشکری کۆکردەوە و خۆی ساز دا بۆ شەڕ و بەرەنگاری. پاش چەندجارێک تێکهەلچوون،

---

1 - بابولئەبواب

2 - دەمیرقابوو

پەناخان کە زانی دەروەستی فەتحعەلیخان نایە، باریکەی دایە بۆ نێو قەڵای پەناهئاباد و بە نەفامی حەسارێکی ئاوێنەبەندی کردە مەتەرێز و پەنا و پەسار. پاشان فەتحعەلیخان فەرمووی کە چەند سەنگەرێکی قایم بەرەورووی قەڵا لێدەن.

دەڵێن ئێستاش شوێن و شوێنەواری ئەو سەنگەرانە لەوێ ماون و بە سەنگەری فەتحعەلیخان مەشهوورن. بەکورتی ماوەی گەمارۆ سێ مانگی بە سەردا تێپەڕی و گرتنی قەڵا بە هیچ شێوەیەک نەگونجا و دەستی نەدا. سەرەنجام پەناخان بە ناردنی ڕاسپاردە و کاغەزان بوو بە دەسپێشخەری پێکهاتن و دانی باج و پیتاکی وەئەستۆی گرت و مەرجی نێردرانی برایمخەلیلخانی کوڕی وەکوو بارمتە قبووڵ کرد هەتا بتوانێ ئەو سێڵاوی نەهامەتی و بەڵایە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. فەتحعەلیخان سەری ڕەزامەندی بۆ مەرجەکان لەقاند. پاشان کە برایمخەلیلخان وێڕای چەند کەیخودای ئاقلمەند و قەشەی ئەرمەنییەکانی قەرەباغ بە کۆڵێک دیاری و پێشکەشییەوە هاتنە خزمەت فەتحعەلیخان، دوو ڕۆژان بۆ میوانی ڕایگرتن و سەری سێ ڕۆژە لەو خاک و مەڵبەندە بزووت و برایمخەلیلخانیشی لە ڕکێفی خۆیدا بردە تەورێز و لەوێوە وێڕای عەلیخانی برای بە دەس بە سەری ناردی بۆ ورمێ و زستانی ئەو ساڵە لە تەورێز خێڵبەزی کرد.

# چوونی کەریمخانی زەند بەرەو ئازەربایجان

پاش ئەوەی وەرزی زستان تۆماری تەمەنی پێچرایەوە و میری نەورۆز بە سەربەرزی و خۆشی و کامەرانی گەیشتێ، باس‌وخواسی بزووتنی کەریمخان لە باڵی ئێراقەوە بە گوێی خوار و ژووری کۆمەڵ ئاشنا کرا. کاتێک لە سنووری ئازەربایجان نیزیک بۆوە، چەند پیاوێکی کارزانی ناردن هەتا ئەمیران و بەگلەرانی ئەم هەرێمە وێڕای دەمڕاست و پیاوماقووڵانی تەورێز بچنە خزمەت ڕکێفی. فەتحعەلیخان دوای بیستنی نێوەرۆکی ڕاسپاردەکانی خانی زەند هەڵچوو و قسەی سارد و سووکی نایە پارسەنگی نێردراوەکان! پاش ئەوەی ئەوان بە دڵشکاوی و نامرادی گەڕانەوە، فەتحعەلیخان لە قەڵای تەورێز کەوتە سازکردنی ئامرازی قەڵاداری و داخستنی پاشەکەوت و دانیشتووانی دێیەکانی دەوروبەری تەورێزی کۆچدایە شارەوە و دەستووری دا تەواوی ئەو بەرهەم و دەغڵ و دانەی گەیشتوون و وەختی هەڵگرتنەوە و دەسکەنە و دروونەوەیان هاتووە بیانسووتێنن. چەند حوکمێکی نووسین کە لە خۆی و ورمێ و مەراغەش هەر وا بکەن. کەریمخانی وەکیل کە دڵنیکی پتر نەمابوو بۆ تەورێز، دیسان پیاوێکی فامیدەی باوەڕپێکراوی ناردە لای فەتحعەلیخان کە بە قسەی خۆش و نەرم بیهێنێتە ڕەدایە و دەستی پێ لە سەرپێچی و ملهادان هەڵگرێ و بە گفت و بە پەیمانی بڕبڕاو هیوای وەبەربنێ. فەتحعەلیخان لەبەر کار و کرداری نالەبار و زۆرەملییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ئازادخانی ئەفغان کە لە عێراق ئەنجامی دابوون و دژایەتییەکانی سەبارەت بە کەریمخان، لە وەکیل دەترسا و سەرلەنوێ کەیخوداکەی بە وەڵامی ساردەوە ناردەوە. فەرمانی دا کە دەورەی قەڵای تەورێز

تەخت بکرێ و هەر کۆختــە و خانووبەرەیــەکی لێیــەتی داری لـــەسەر بــەردی نەمێنێ و کانیاوەکان کوێر بکرێنەوە و ڕێگاوبانەکانیش ببەسترێن.

بەکورتی کەریمخان سەرەتا چــووە شــاری مەراغــە و بــێ هــیچ شــەڕ و پەلامارێک گرتی و پاشان کەوتە ئەمێ کــردن و گــوێبــادانی خێــلی شــوقاقی و شاسەیوان کە لە ڕێگای فەرمانبەرداری ترازابوون و بە لاســاری دەجوولانــەوە. دواتر بەشان و شەوکەتەوە لە ڕووکاری تەورێز ڕکێفی بەتاڵ کرد. جارێکی تر بۆ ئەوەی قسەی خۆی بڕبینێتەوە میرزا عەلیئەکبەری مەزنەمەلای خۆی نــاردە لای فەتحعەلیخان و تێکڕای سەرۆک و سەرکردەکانی ئازەربایجان و گەورەپیاوانی تەورێز و داوای لێکردن دەس هەڵگرن لە کەللەڕەقی و بلــەوەزی و لــە تــرس و تۆقین و پارێز کــردن لادەن و بێنە بەرڕکێفی وەکیل و نەبنە هــۆی تێکچــوونی وڵات و تێداچوونی خەڵک و ماڵ و سامانی مــسوڵمانان؛ کــورە دەنــا پەشــیمان دەبنەوە و پەشیمانبوونەوەش سوودی نابێ. هەروەها بە نووســینی کاخــەزێک بەڵێنی دابوو بە فەتحعەلیخان کە دەیکاتە سەرداری ئازەربایجان و بۆ پتــەوی پەیمانەکــەی ســوێندی بــە یــەزدانی پــاکی بــێهاوتــا خواردبــوو. دووبــارە فەتحعەلیخان وڵامی تاڵ و ناخۆشی دایــەوە بـــە نێـــردراوی کــەریمخــان و گــوتــی بچــۆوە و لــە زمــان منەوە بە وەکیل بڵێ:

برۆ ئــەم داوە دانــێ بــۆ مــەلێ تــر      کە عــەنقا لانەکــەی بــەرز و بــڵیندە

مەزنەمەلا بە سەرساردی گەڕایەوە و وڵامی فەتحعەلیخانی هێنایەوە بۆ جەنابی وەکیل. لەبەروەی کەریمخان ئەمجارەیان بەبێ تۆپخانە و پێداویستی و پاشــەکەوتێکی تــەواو دەرکــەوتبوو و زســتانیش ســەری دە ســوێیە نــابوو و فەتحعەلیخانیش پشتی لــە قــەڵا نــەکردبۆوە و شــەڕی نــەدەکرد. بــڕیاری دا بگەڕێتەوە مەڵبەندی هەســتبزوێنــی خۆیــە و لــەوێوە ڕووی کــردە ناوچــەی

شادیهێنی ورمێ و لەبەر نەبوونی ئازووخە و تفاقی لەشکری هەتا مەراغە گیر نەبوو، لەوێشەوە کۆچاوکۆچ ڕۆیی بۆ تاران. پاش ڕۆیشتنی وی فەتحعەلیخان لەم گێژاوی ئەمانە خەلەست و کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی کۆمەلانی خەلک و قۆشەنی. دوای دوو سال فەرمانڕەوایەتی و سەرکردایەتی ئازەربایجان دەستی درێژ کرد بۆ هەرێم و مەلبەندەکانی قەرەباغ، بەرکەشات، قەرەجەداغ، نەخجەوان و ئەردەوێل و دەسەلاتی پتر لە جاران چەتری ئەنگاوت و ژمارەی چەکدارانی هەتا دوازدەهەزار کەس پێهەلاچوون. دیسان سێسەد کەسی ئەفغانی هێنانەوە ژێرڕکێفی و هەزار تفەنگچی ئەرمەنی قەرەباغی ڕەگەل هێزی خۆی خستن.

## گەڕانەوەی کەریمخان بۆ ئازەربایجان

ساڵی ١١٧٦ی کۆچی/١٧٦٢ ـ ١٧٦٣ی زایینی دیسان کەریمخان داڵـغەی چوونە ئازەربایجان کەوتە مێشکی. هەروەک پێشتر باسی کرا پەناخانی جەوانشێر نەیتوانی خۆی لەبەر فەتحعەلیخان ڕابگرێ و پەنای بردە بەر شوورەی قەڵا و برایمخەلیلخانی کوڕی وەکوو بارمتە نارده لای خانی ئەفشار و ئەویش بە دەسبەسەری بەڕێی کردە ورمێ. لەو کاتەوە پەناخان سەبارەت بە ڕزگاربوونی کوڕەکەی زۆری بیر و تەگبیر دێنان و دەبردن، بەڵام هیچ ڕۆچنە و دەرگایەکی هومێدی بە ڕوویدا نەدەکرایەوە. بۆیە بەناچار داڵـدەی بردە بەر وەکیلی ئێران و بە ناردنی کۆمەڵێک نامە و گەلێک دیاری شیاو، لەبەری پاڕایەوە کە بەرەو ئازەربایجان ببزوێ. بەختی چاکی هێنابوو چونکە خودی خانیش لەم کاتەدا خۆی سازکردبوو بۆ ئەم سەفەرە سەرەوخێرە. ئەوسا تێر و پڕ و پەرداخ بە تۆپخانە و چەکوچۆڵ و ئازورخە و پاشەکەوتی سێ مانگەی لەشکرەوە کەوتەڕێ و سەردارانی خەڵـکی ئێراق و لۆڕشەنی وەک دەریای بێئامانی دەنگ دا بەرەو ئازەربایجان. دوای بڕینی چەند مزڵ و مەودایەک لە میانەج(میانە) کە سەرهەدی هەرێمی ئازەربایجانە تەشریفی ڕکێفی بەتاڵ کرد. فەتحعەلیخان کە ئەم هەواڵەی بیست تۆقی و زۆری ترس ڕێنیشت، بەڵام هیچ چارە و ڕێدەربازبوونێکی جگە لە بەربەرەکانی بۆخۆی بەدی نەکرد. دیسان مەر بە دابی جاران جەماوەری گوندەکانی دەوروبەری ڕاگوێستە شار و قەڵای دایە دەست گەورەپیاوانی تەوریز و خۆی شانبەشانی شابازخانی دونبولی و هێزەکانی بۆ کەریمخان وەدەرکەوت و لە مێرگ و چیمەنی ئۆجان هۆردووبەزی کرد کە دوازدە فرسەخی مەودا بوو لەگەڵ لۆڕشەنی خەنیم. خانی زەند بە

دەرکەوتنی فەتحعەلیخان و هەنگاونانی بۆ لێکدان و بەرەنگاری کەوتە بیرەوە و ماوەی دە ڕۆژان هەڵگیرسانی شەڕی وەدوا دا. سەری یازدە ڕۆژە کە سەرەتای مانگی قوربان بوو لە قەرەچەمەن دابەزی و هەردوو لا کەوتنە خۆ ئامادە کردن و ڕیزبەستن بۆ پێکداهاتن و تێکهەڵچوون. پاش لێدرانی تەپڵی شەڕ و دیاریکرانی باڵی ڕاست و چەپ و جەرگە و نوا و دوا، پێشەنگانی هەردک لا ئەسپی خۆیان تاو دا و شەڕکەرانی بەئەزموون و شۆڕەسوارانی زەند ڕووبەری شەرگەیان بە زەبری شیری جەوهەردار و ڕشتنی خوێنی کوژراوان وەسەر ڕەنگی گوڵاڵە دەگێڕا.

لاوانی ئەفشار و دونبولی چونکە لە ڕۆژگاری پێشووتری پەلامارەکانی ئازادی ئەفغاندا دەستوبرد و ئازایەتی هۆزی زەندیان دیتبوو، دەیانزانی کە بە شەڕی دەستەویەخە دەرەقەتیان نایەن. هەر بۆیە فەتحعەلیخان کەوتە دڵدانەوەی قۆشەنی خۆی و بە گفت و پەیمانی دەسخۆشانەی بە پێی فیلان دنەی دان و دەیگوت جەماوەری عێراق و زەند خوێڕی و ترسەنۆکن و بەرگەتان ناگرن. ئەوسا فەرمانی دا کە سوارانی ئەفشار و دونبولی بەجارێک هەڕاکەنە سەر نێرینەی قۆشەنی عێراق و شیر و نێزەیان لێبوەشێنن و چاو لە حاند تیر و تفەنگان نەترووکێنن و پشتیان لێنەکەنەوە. ئەوانیش بەکۆمەڵ کردیانە قریشکە و هەرا و تۆز و خۆڵی شەرگەیان گەیاندە گومبەزی بەرزی گەردوونی گەردان. لەو بگرە و بەردەیەدا کەریمخانی وەکیل لە پشتەوەی تۆپخانە و لە نێو ڕیزەکانی جەزایرچیدا سەرقاڵی ڕێکخستنی شێوەی بەرەنگاربوونەوەی پیادان بوو. شێخاڵیخانی زەند کە پیاوێکی دوژمنبەزێن بوو لە باڵی ڕاستی قۆشەنی خۆیەوە شیری دەوەشاند. فەتحعەلیخان پەلاماریدان و ئەم باڵە ڕاستەی قۆشەن شکا و نارخانی زەند و تێکڕای پاسەوان و پارێزەران وایانزانی کە تەواوی لەشکری وەکیل تێکشکاوە، هەر بۆیە خێرایەکی بارگە و بنە و ژنوزاڵیان هەڵگرت و ڕەپێچەکیان دان و بەرەو هەرێمی عێراق ڕەوین. چەند پۆلێکی دیکەش ڕایانکرد و سوارانی ئەفشار و دونبولی دەم لەسەر پشت کەوتنە دوویان.

نادرخان وێڕای هاوڕێیانی خۆی گەیاندە هەمەدان و بەشێکی شکستەیان هەتا ئیسفەهان سەری جڵەویان هەڵنەنگاوت. فەتح‌عەلی‌خان بە دیتنی ئەم سەرکەوتنە بەرچاوە کەیفی گوڵی کرد و ئۆخژنی لە دڵی گەڕا، بەڵام بە سەرەنجامی کارانی نەدەزانی. شابازخانی دونبولی ئازایانە لە بەرامبەر هێزەکانی شێخالی‌خانی زەندا چەقیبوو، کەچی وەختایەک هەواڵی تەقورەوی هێزەکانی عێراق گەیشتە شێخالی‌خان بە یارمەتی زەکی‌خانی ئامۆزای کەریم‌خان و فەرماندەی باڵی چەپ خۆیان بە جەرگەی لەشکری شابازخانی دونبولی دادا و هێزەکەی بەرگەی نەگرت و شکا و بوو بە هەڵاتهەڵات و خودی شابازخانیش گیرا و بە دەست بەستراوی بردیانە لای وەکیلی پایەبەرز. لەو جەنگەدا پێنسەد کەس لە دەستەی زەندان هێرشیان بردە سەر جەرگەی ڕیزەکانی فەتح‌عەلی‌خان و وەختایەک سەرداری ئازەربایجان هەستی بە بوونی کەریم‌خان و شێخالی‌خان و گیرانی شابازخان کرد، هیوای بە ژیانی خۆی نەما و بەناچار ڕاکردنی پێ چاکتر بوو لە ڕاوەستان. شێخالی‌خان هەتا یەک فرسەخی تەورێز کەوتە شوێنی و ڕاوی نا، بەڵام تۆزی نەشکاند. ئەو دەم بوو کە کەریم‌خان پێی‌زانی هێندێک لە هێزەکانی ڕەریون و بارگە و بنەشیان لەگەڵ خۆیان بردووە. ئەوسا سەرکردایەتی لەشکری خستە ئەستۆی شێخالی‌خان و خۆی وێڕای جلەودارانی بەررکێفی بەرەو بنە ئەسپی ئاژاوت. لە مەودای ڕێگادا گەیشتە کۆمەڵێکی سپای فەتح‌عەلی‌خان کە بەشێکی زۆری بار و بارخانەی ـکری زەندیان بە تاڵان هێنابوو و بێ‌خەیاڵ و بێ‌خەبەر لە شکانی سەرکردەکەیان بە دێروژوانەوە دەگەڕانەوە. شێری زەند پەلاماری دان و تاقمێکی بە زەبری شیر کوشتن و لە شوێنی بنە شەومری کرد و چەند قاسیدێکی تیژبەزی ناردن بە دوای نادرخان و ڕاکردووان‌دا و بۆ بەیانی گەڕایەوە نێو هۆردووی خۆی. لە ماوەی دە ڕۆژاندا هەزارەزیلەی لەشکری هاتنەوە و لێی‌کۆبوونەوە. کەسانێک لە سەرکردەکانی ئازەربایجان وەکوو کازم‌خانی قەرەجەداغی، شابازخانی

دونبولی و ئەحمەدبەگی برای و پەناخانی جەوانشێری قەرەباغی سەریان وەبەر کەمەندی کەریمخان هێنا و پاشان هۆردووی دەنگ دا و تەشریفی لە دوور و نیزیکی تەورێز خێوەت و بارەگای هەڵدا. لەوێڕا محەممەدحوسێنخانی زەند و محەممەدڕەزاخانی مەرەندی بە سێ سوارانەوە ناردنە تەورێز و حکوومەتی شارەکەی دایە دەس محەممەدڕەزاخان. پاش چوونی ڕاسپاردەکان بۆ نێو تەورێز، دەستەیەک لە لایەنگرانی فەتحعەلیخان و لاتەوپاتە و ئاژاوەچی کە هێشتاش دڵیان بە سەرکەوتن و سەربەخۆیی خانی ئەفشار خۆش بوو، کەوتنە سەر ڕێی خەیالاتی پووچ و جەماوەری ساکار و ڕەمەکییان هەڵفریواند و دژی وەکیل پاڵیان پێوەنان. فەتحعەلیخان لەو دەمەدا چووبووە مەراغە و بە خۆی و پۆلەچەکدارێکی دەستەژمێر لە چیمەنی «لەیلان»ی میاندواو چەواشە و سەرگەردان و نیگەران بنەی داکوتابوو. هەر چۆنێک بێ پیلانی ئاژاوەگێران گرتی و محەممەدحوسێنخانی زەندیان وێرای سوارەکانی دەسبەسەر کرد و گوتیان دەیاندەینە دەست فەتحعەلیخان. چەند سوارێکی لات و شەلاتیان بەپڕتاو ناردە لای فەتحعەلیخان کە وا باشە هەرچی زووە بگەیە یاریدەمان و خۆیان کەوتنە دابەستنی قەلا و پاراستنی هێلانەیان.

بەلام میرزا ئەسەدولڵای شێخولئیسلامی تەورێز کە پیاوێکی ناوبەدەرەوەی زەمانە بوو، وەختایەک بە ئاکاری نالەباری لاتولووت و شەڕخوازانی زانی و تێگەیشت ڕەنگە کرداری ئاوا خێرایەکی کێشەی تاڵ و ناخۆش و گەورەی لێبکەوێتەوە، بانگیهێشتن و قسەی بۆ کردن و بە ئامۆژگاری و گفت و پەیمان هێنانییەوە سەر ڕێگای ڕاست. پاشان خۆی بۆ کووژاندنەوەی ئاگری ئاژاوە و هەرا و هەڵلا پەشیماننامەیەکی خەلکی تەورێزی هەلگرت و ڕووی کردە هۆردووی وەکیلی بەرزەجێ و وێرای میرزا عەبدولفەتاحی برای، جڵەودارانی کۆمەڵی ئاژاوەگێڕانیشیان لەگەڵ خۆیان برد و دڵنیایان کردن کە ناهێڵن کەریمخان سزایان بدا. هەموویان لە تاوڵ و خێوەتی میرزا

محەممەدعەلی مەزنەمەلا دابەزین. بۆ سبەینێ شێخولئیسلامی بەڕێز لە ڕێگـای میرزا محەممەدعەلی مەزنەمەلای هێژاوە توانی بچێتە خزمەت وەکیـل و چـاوی پێیبکەوێ. خان زۆری ڕێز بۆ دانا و دوای دیدار و وتوێژ تکای کرد کە لە تاوانی نەفامانی خەلکی تەورێز خۆش بێ. پاشـان جـەنابی شێخولئیـسلام دیـاری و خەلاتی میرانەی پێبەخشرا و دلنوایی کرا و تەشریفی گەڕایەوە. بۆ بەیانی کـە ڕۆژی ٢٧ی مانگی قوربان بوو، هۆردووی وەکیل لە بالـی ڕۆژاوای شـارەوە بـە تەنتەنە و شەوکەتەوە پێشوازی شایانی لێکرا و پێی‌نایە خانەمیری تـەورێز و سکەی زێڕی لێدا و لایەکی بە نـاوی موبـارەکی ئیمامـان و لایەکـەی تـری بـە دەستەواژەی «یا کەریم» ڕازایەوە و دوو ڕۆژ لەو شارە مایەوە.

## گەمارۆدرانی ورمێ و خۆی بە دەستەوەدانی فەتحعەلیخان دوای تێپەڕینی تۆمانگ بە سەر ئابلۆقەدرانی شارا

پاش ئـەوەی وەکیلی خاوەنشکۆ، توانـی مەراغـە، خـۆی، سەلـماس، تەوریز و تێکرای ناوچەکانی ئازەربایجان لە خلتەوخاڵ داماڵێ و دەستیان بـە سەر و رووی دابێنێ، تەنیا لەو نێوەدا ورمێ بەجێما. وەکوو پێشتر باسـی کـرا خان و بەگەرانی ئازەربایجان سەریان وەبەرهێنا و حکوومەتی تـەوریز درایـە دەست محەممەدرەزاخانی مەرەندی کە لە کۆنەوە غـولام و خزمـەتکاری وەکیـل بوو. پاشان بە مەبەستی وەچنگ‌هێنانی فەتحعەلیخان ئالای بەختەوەری بەرەو باڵی ورمێ هەڵدا و سـەرەتا شێخاڵـیخـانی وەکـوو پێـشقەرەوڵ بـە رێگـای سەلماسدا بەرێکرد. بەخت چاکی هێنابوو، چونکە بـرایمخـەلیلخـانی کـوڕی پەناخانی جەوانشێر و مەلا پەنـای قەرەباغی کە توانیبوویان بە فـێڵوفـرت لـە بەندیخانەی ورمێ دەربازبن و رابکـەن، لـە مـەودای رێگـادا گەیـشتنە سـپای شێخاڵیخان و رەگەڵی کەوتن. لەشکری وەکیلیش دوابـەدوایان بـە تۆپخانـە و هێزی پەرداخەوە رووی کردە ورمێ. لەم لایەوە فەتحعەلیخانی سەردار کـە لـە مێرگ و چیمەنی «لەیلان»ی میاندواو بنەی داگرتبوو، بە بیستنی جمینی خـانی زەند بەرەو ورمێ، بە هەزار دڵەکوتە و نیگەرانی و پەلەپرووزێ کۆچاوکۆچ خۆی گەیاندە ئەم شارە. پاش چوونـە ژوورەوە، پـارێزەرانی چاوسـوور و بەسـامی چەشنی هەسارەی بارام و کەیوانی لە سەرۆکانی ئەفـشار هەڵـبژارد و لەسـەر کلاوقووچان و دەروازەکانی قەڵا داینان و رێگـای هـاتوچـۆی لـە شـەش لاوە داخست.

فەتحعەلیخـان سـەرکردەکانی بـەم چەشـنە دابەشـین و دایمەزرانـدن: شـامحەممەدبەگی ئەفـشار سـەرۆکی تـیرەی کۆهـەکلوو ویـرای مـیرانبـەگی مـەحموودلوو باپیرەگـەورەی منـی نووسـەری رووڕەش! کەوتنـە دەروازەی تۆپراقەلا؛ میرزا محەممەدبەگ و شامحەممەدبەگی ئەفـشاری سـەعیدلوو لـە دەروازەی هـەزاران جـێگیر بـوون؛ محەممەدبـەگی قەرەحەسـەنلوو و عـەلی شەشپەڕبەگ دەروازەی بازارباش کەوتە ئەستۆیان؛ دەروازەی یوورتشا درایـە دەست قارەمانبەگ و جەلیلبەگی عەرەبلو؛ فـەتحعـەلیبـەگ و قولـیبـەگی بەکەشلوو لە دەروازەی هیندوو مەتەریزیان گرت و دەروازەی بالوو مەشهوور بە دەروازەی مەشەد ئەسپاردەی عەلیمستەفابەگی ئەرەشلوو کرا. شەش تۆپ کە لە دەورانی عوسمانییەوە بەجێمابوون، بردیانن بۆ سەر بورجان و سوارە و پیادەی ئەفشار خرانە ژێرڕکێفی برایمخانی سەرۆکدیوان. ئەو گەورەپیاوانەی کـە لـە ماوەی گەمارۆدا شەڕیان دەکرد بریتی بوون لە: قاسمخـانی گەنجالـیخـانی، ڕۆستەمخانی قاسملوو، حوسێنعەلیخانی ئەرەشلوو، عەلیخان و برایمخانی ئەرەشلوو براکانی فەتحعەلیخانی سـەردار، فـەرهادخان و عـەلیمرادخـانی قاسملوو و چەند کەسێکی تر.

بەکورتی کاتێک هۆردووی کەریمخان گەیشتە خاکی ورمـێ لـــە گونـدی سێداقە و لای سەرووی تەپۆلکەی دێکالە بە شانی ڕۆژهەلاتی شاردا لەشـکرگای دامەزراند. دیسانیش بۆ ئەوەی قسەکەی بڕیبێتەوە چەند ئاقلمەندێکی ناردنە لای فەتحعەلیخان و لێیڕاسپارد ئەگەر بێتوو نەیکاتە شەڕ و هەلـلا و پێمـل بـێ، ئەوە دەکەوێتە بەر لێخۆشبوون و دەلاوێندرێتەوە. وەکیل سوێندی بە ڕوحـانەتی ئەسکەندەربەگی کوژراوی برای خواردبوو، ئەگەر فەتحعەلیخان بەراستی سەری وەبـەربێنێ وەکـوو سـەردەمی دەسـەلاتی ئازادخـان دەیکاتـەوە سـەرداری ئازەربایجان و سەری دەگەیەنێتە ئەستێران. فەتحعەلیخان دیـسانیش سـەری بادا و داواکەی وەکیلی بەردەوە پـاش و خـۆی دایـە قـەلاداری. ئەوسـا وەکیـل

فەرمانی دا بە هێزەکانی کە خەریکی لێدانی سەنگەر و هەڵبەستنی مەتەرێز و هێنانە گۆڕی ئامرازی قەڵاگیری بن. بۆ سبەینێ فەتحعەلیخان بە مەبەستی لێکدان دەرکەوت و لە گەرانگەڕی قەڵا شەڕێکی سەختی کرد، کەچی لە بەختی کەچی بە شکاوی گەڕایەوە، بەڵام لە گەرمەی تێکهەڵچوونا، عەلیخانی کورد کە یەکێک بوو لە ناودارانی لەشکری وەکیل بە زەبری نێزەی شامحەممەدبەگی سەرۆکی تیرەی کۆهەکلوو برینێکی قووڵی هێنا.

بەکورتی سێ شەڕی پەیتاپەیتا لە نێوان زەند و ئەفشاراندا قەوما و هیچ لایەک سەرنەکەوتن. بەڵام هەتا دەهات بارودۆخەکە نالەبارتر باڵی دەنگاوت و درێژبوونەوەی گەمارۆ قاتیوقڕی و برانی ئازووخە و پاشەکەوتی لێکەوتەوە و دەرد و مەرەد و سۆزەی سەرمای سەرەتای زستانی قەمچیومشێن تەنگەی بە دانیشتووانی قەڵا و لەشکری کەریمخان هەڵچنی. لەو کاتەدا چەند کەسێکی هۆردووی وەکیل کە بەدڵ لایەنگری فەتحعەلیخان بوون، پەنامەکی یەکتریان بینی و پێکەوە ڕاوێژیان کرد و نامەیان نووسی بۆ خانی ئەفشار کە ئێمە دۆست و لاگیری تۆین و هەر لەسەر گفت و پەیمانی پێشوومان ماوین. پاشان لە جەرگەی شەوێکی تاریکدا کاغەزەکەیان بەڕێکردە قەڵا، بەڵام وا هات کە کێشکچی هۆردوو کابرای نامەبەریان گرت و بە نامەوە بردیانە لای وەکیل. نێوەرۆکی کاغەزەکە ئەمە بوو کە لە گەرمەی شەڕا، بەیداخەکانیان سەراوبن دەکەن و دەچنە پاڵ فەتحعەلیخان. کەریمخان وەختایەک بە کاکڵی نووسراوەکەی زانی سوژدەی شوکری بەجێهێنا و نووسەرانی کە حەوت کەس بوون گرتنی و کوشتنی و سەرەکانی بە نامەکەوە نارده لای فەتحعەلیخان و بۆی نووسی کە لایەنگران و یاوەرانی تۆمان بە سەر نارد نەک بە پێ! جا هەر وەختایەک ئامادەی بۆ شەڕ فەرموو با ناوی خودای لێبێ....

فەتحعەلیخان بەم ڕووداوە تووشی پەشۆکان و دڵەخورتێ بۆوە. لەم ماوەیەدا داوای لە حاکمانی شێروان و گەنجە و گورجستان کردبوو کە بگەنە

هانای، بەڵام وەڵامی ناهومێدانەی وەرگرتەوە. ئەمەش بوو بە سەرباری دەردانی، چونکە حاکمانی باسکراو لە شان و شەوکەت و دەسەڵاتی وەکیل تۆقیبوون و تێکڕا دیاری و پێشکەشی هەرەباش و بەنرخیان دەنارده خزمەتی. تەنانەت ئەرکلیخانی حوکمڕانی گورجستانیش کە بۆ لەشکرزۆری و دەوڵەمەندی ناوبانگی تەنیبوویەوە و لە سەردەمی نادرشای ئەفشارەوە هەتا ئەم زەمانە کە بیست ساڵی پێچوو بوو، هیچکام لە میران و فەرمانڕەوایانی ئێران نەیانتوانیبوو بە سەریدا بشکێنەوە و بە گژیدا بچن، ئەویش باربوویەکی شاز و شایانی وێڕای ئازادخان کە ماوەی چوار ساڵ لای خۆی گل دابۆوە و کەس نەیدەزانی کە ماوە یان مردووە، نارده ژێرپێچکەی تەختی بەرزی دەسەڵاتی خانی زەند. کەریمخانیش چۆن چاکە ئاوای ڕێزی ئازادخان گرت و بە نەرمی لەگەڵی جووڵایەوە و هاتنی ئەوی بە ڕووداوێکی سەرەوخێر و دەرموشانەوەی بەختی خۆی دانا. هەر بۆیە کرایە قلیوبلی و شادمانی و تەپڵ و زوڕنایان ژەنی و شێلگیر و پتەو شانیان لە گرتنی قەڵای ورمێ توند کرد.

لەبەروەی شێخاڵیخانی زەند کە سپاسالاری تێکڕای هێزەکانی وەکیل بوو، لە ڕێسا بەدەر پسوولەی وەرگرتنی پیتاک و پاڕانەی دەنووسین بۆ مەلبەندەکانی ئازەربایجان و خەڵک لە چنگ باجئەستێنەکانی وەزاڵە هاتبوون و سکالایان نووسیبوون بۆ وەکیل، کاتێک وەکیلی دادپەروەر پێیزانی گڕی گرت و هەردک چاوی جیهانبینی شێخاڵیخانی بێبەری کرد لە سۆمایی. پاشان بۆ گرتنی قەڵا و دەستڕاگەیشتن وە فەتحعەلیخان بەگەرمەتر هەڵسووڕا و قۆشەنچییانی دژەکەیان گرتە باوەش و لە هەموو لاوە دەستیان تێوەرێنا. بەناچار قەڵانشینان بارودۆخیان لە قافیەی «قەلعە» تەنگتر خۆی نواند و خورد و خۆراکیان هەڵتەکا و بنەی بڕا. گەلێک لە دانیشتووانی قەڵا بوونە ڕێبواری ڕێگای نەمان و بە برسێتی سەریان نایەوە. ماوەی حەوت مانگ و بە گوتەیەکی ڕاست و ڕوونتر هەتا نۆ مانگ بارودۆخەکە ئاوا ڕۆیی. نان و ئاو و

پێخۆر زۆر بە بژواری ئەویش هەر لە ماڵی دەوڵەمەندان و گەورەپیاوان وەدەست دەکەوت. بەپێی شەرعی پاکی [ئیسلام] خواردنی کەلاکی مردووان بۆ هەژاران و نەداران حەلاڵ کرا. جگە لە بۆسۆی ئاخ‌وداخی بەئێش و ژانی کەسانی برسی لە هیچ وەجاخێکدا شوێنەواری دووکەڵی ئاگر وەبەرچاو نەدەهات.

خۆلاسەی کەلام ڕۆژ بە ڕۆژ قەلانشینان پتر هێزیان بە بەرەوە نەما و شوێنەواری سەرکەوتنی خەنیم ڕەنگی دایەوە. ژمارەیەک لە بێ‌وەفاکانی ئەفشاریش مانەوەیان بە بەرژەوەند نەزانی و ڕایانکردە بن ڕکێفی زەندان. فەتح‌عەلی‌خانی سەردار وەختایەک بە چاوی خۆی بێ‌وەفایی هاوکاران و دەست‌وپێوەندەکانی بینی و سەبارەت بە هاتنی یاریدە و پشتیوانیش هیوابڕاو بوو، تەواو لە گێژاوی بەختی داماوی‌دا تێما. ڕۆژێک دەستەیەک لە سەرۆکانی ئەفشار و پیاوانی بەشەرەفی لە خەلوەتخانەی خۆی کۆکردەوە و هەرجارەی باسێکی خستەگۆڕ و گوتی خودای تاق و تەنیا و بێ‌هاوتا دەزانێ کە ئەم هەمووە هەوڵ و هەڵسووران و شەڕ و کێشەیەم لەگەڵ کەریم‌خان بۆ دامرکاندنی مەیل و تاسەی دەروون و نەدۆڕاندنی پلەی سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی نیە و تەنیا دەمهەوێ کە ناو و ئابڕووی چەندین ساڵەم لە کیس نەچێ و خێڵ و خێزان نەدەمە چنگ بێگانە. بەلام چ کەردەن کە تەقدیر تەگبیران بەتاڵ دەکاتەوە و جڵەوی هەموو کاران کەوتوونە دەست گارگێڕانی چارەنووس و ئەوەی خودا نووسیبێتی هەر ئەوەیە. هەروەکوو بە ئاشکرا دیارە هەستانی لەشکری بەلا و پەیدابوونی قاتی‌وقڕی نیشانەی گۆڕانی دنیای نەمێن و رووخەکن. ئەگەر گەڕانی گەردوون بە مەیلی ئادەمی بێ، جاری واشە بەپێچەوانە و چەوت و چەوێڵ دەسووڕێ و هەر جارەی بە بارێکدایە. دنیا لە قەرارێکی نەماوە و نامێنێ و هەر ئەویشە وای کردووە کە زۆرجاران سەرکەشان و خەنیمانم شکاندووە. ئێستا ماوەتەوە تێشکان و مەترسی و ڕوون و ئاشکرایە کە هەر شەرەفێک وەبال بە ئەستۆی کەسێکە و بێ‌گومان هەلاتنی خۆر و مانگ و ئەستێران ئاوابوونیان لە

دوایە. هەروەک ئەوەی کە سـەرەوخوار بوونـەوە، تێهەڵـچوونەوە و کاڵـی و نەکولیوی، پێگەیشتن و کولینی بە دوودا دێ. بەڵێ ئێستا هاتوومە سـەر ئـەو باوەڕە کە لەگەڵ کەریمخانی وەکیل کوڕی ئیناقی زەند پێکبێم و دەرگای ئاشتی بخەمە سەرپشت، چونکـە ئیـدی بەڕاسـتی تاقـەتی بیـستنی کرووزانـەوە و نیوەنووزەی منالانی برسی و بێوەژنانی بێوەفام نەماوە؛ باشە ئێوە دەڵێن چی؟ چونکە ئەم قسانە خێـر و بەرژەوەنـدی هـەزاران و بەلـەنگازانی پێـوە بـوو، سەرکردەکانی ئەفشار دڵیان وەکوڵ هات و ڕوحمیان بـزووت و هـەموویان بـە یەکدەنگ گوتیان ئەوەی ئەتۆ بیڵێی و بیکەی لێـیدەرنـاچین. ئەگـەر سـەردار خوازیاری شەڕە ئێمەش ئامادەین و ناکشێینەوە و پەرژینەی بەزین ناخەینـە سەر شانمان و چما ئاشتی و پێکهانیشی بێچاکە سەری وەبەر دێنین.

ئەودەم فەتحعەلیخانی سەردار سەرەتا میرزا محەممەدجەعفەری سەرۆکی کۆکردنەوەی پیتاکی بۆ ڕاگەیاندنی هەڵوێستەکە ناردە لای وەکیلی پایەبـەرز و پاشان خۆشی وێڕای چەند سەرۆک و سەرکردەیەکی ئەفشار و دەمڕاسـتی ئـەم ناوچەیە دەستی لە گیانی خۆی شۆرد و حەسانەوە و بەرژەوەنـدی جـەماوەری وەبەرچاو گرت و بەرەو هۆردووی کەریمخان بزووت. وەختایەک گەیشتە نیزیک هۆردووگا، کەریمخان لەڕێوە چەند کەسێکی ناردە پێشوازی پیاوێکی ئـاوا کـە شانی لە شانی ئـەو دەدا و دەسـتی ڕێـزی لێنـا و خۆشـی هـەتا بـەر بـێلای سەراپەردەی هاتەپێش و ئاماژەی فەرموو کە تەپڵی شادمانی و مزگانی بکوتن و ~ردوو شـان بـە شـان چوونـە ژوورەوە و لەسـەر دۆشـەگەلان ڕۆنیـشتن. فەتحعەلیخان ئارەقی شەرمەزاری بە نێوچاوانیدا هاتـەخوار و سـەبارەت بـە ڕابردوو داوای لێبووردن و پەشیمانی کرد. کەریمخان بە تەوسەوە گـوتی ئێمـە تۆمان لە جێی ئەسکەندرخانی برای جوانەمەرگمان داناوە. خۆ دیارە کە وەکیـل مەبەستی لەم پلارە چ بوو، هەروەک هێندەی پێنەچوو کە ئامانجەکەی لەودیو پەردەی غەیبـەوە خـۆی نوانـد. بـەلام وەکـوو قـەدیمی گوتوویانـە: «ئەگـەر

چارەنووسرا ئادەمی چاوی دەنووسێ» و فـەتحعـەلیخـانیش چـاوی دیـتن و تێگەیشتنی دادروابوو؛ هەڵبەت فێری قسەی ئاوا ورد و باریک نەبیوو.

بەکورتی سەرۆکان و سەردارانی ئەفشار بە شـادی و کـەیفخۆشـی لـە هـوردوو گەڕانـەوە و بـۆ سـبەینێ لەشکـری وەکیـل دیکاڵـە[1] و سـێداقەیان بـەجێهێشت و پێیان نایە قەڵای ورمێ. ڕاست لەو جەنگەدا کە وەکیل چووە نێـو شاری ورمێ ئاغا میرحوسێنی شێخولئیسلام کە سـەیدێکی گـەورە و زانایـەکی پایەبەرز بوو چۆوە بەر دلۆڤانی خودا. پاش ئەوەی کـەریمخـان بـە یاریـدەی پەروەردگار توانی قەڵا بگرێ و فەتحعـەلیخـان وەچنـگ بێنـێ، لـە کـاتێکی موبارەکدا پێینایە کۆشکی دەسەڵاتی ئازادخانی ئـەفغان کـە کەوتۆتـە پـەنا خوێندنگەی مزگەوتی گەورەی شار بە شانی ڕۆژهەڵاتا و لەوێ جێژنی نەورۆزی بە خۆشی و کامـەرانی تێبـەڕ کـرد. پیاومـاقووڵان و مامۆسـتایانی ئەفـشار و سەرناسانی ناوچەکە تێکڕا چوونە سڵاوی. ئیمامجومعـەی ورمـێ خوتبەیـەکی باش و بەپێزی پێشکەش کرد. ئینجا خانی زەند لەبەرچاوی جـەماوەر خـەڵاتی حوکمڕانێتی ورمێی لە فەتحعەلیخان وەرگرتەوە و لێیخست و ڕۆسـتەمخـانی کوڕی مەهدیخانی قاسملووی لە جێـی دانـا. پاشـان شـیرێکی گەوهەربەنـد و ئەسپێکی تایبەت و دەستێک جلوبەرگی ڕایەڵزێڕینی بەخشی بە فەتحعەلیخانی سەردار و ڕایئەسپارد کە هەمیشە وێڕای پۆلێـک لـە مەزنـەپیاوانی بنەماڵـەی ئەفشار بە ماڵ و کۆچەوە لە ڕکێفیدا بـن و بکەونـە ڕیـزی لەشکری نەبـەزی. ئەوەندەی توانی زەرەد و زیـانی مـلکداران و خەسـاربارانی مـاوەی گـەمارۆی قەرەبوو کردەوە و چاکەی لەگـەڵ کـردن. مـیرزا محەممەدجەعفـەری سـەرۆکی کۆکردنەوەی پیتاک کە جلەوداری تایفەی عەبدولمەلیکی بوو هەر لەسەر کـاری خۆی مایەوە. میرزا بابای برای میرزا محەممەدجەعفەر و میرزا کـەبیر و مـیرزا

---

[1] جارێک بە دیگاڵە و جارێک بە وێکاڵە نووسراوە، بەڵام دیکاڵە دروستە.

زەهیری ئۆستاجلوو کە برابوون، لەگەڵ میرزا مستەفا سەیدلوو و میرزا جەوادی ئۆستاجلوو ناسراو بە زێڕینقەڵەم، هەموویان لە دیوانی حکوومەت ئەرکیان پێئەسپێردرا و دامەزران. پلەی شێخولئیسلامەتی درایە بەڕێز ئاغا میرحەسەنی کوڕە گەورەی خوالێخۆشبوو میرحوسێن. هەروەها جەنابی قازی مووسارەزای کوڕی قازی ئاغا ڕەزا کرایە پێشنوێژ و ئیمامجومعەی شار. با شاراوە نەبێ کە لەو سەردەمەدا داهاتی دیوانی مەڵبەندی شادیهێنی ورمێ لە سایینقەڵاوە هەتا قەرەسووی سەڵماس سەری دەگەیشتە سیهەزار تمەنی نەغدی تەوریزی و دووهەزار خاڵوار[1] دەغڵودان. بەکورتی غولامان و کاربەدەستانی وەکیل دوای ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی ورمێ، ڕەزاقولیخانی کوڕی مووساخانی بەگلەربەگی قاسملوو، فەتحعەلیخانی ئەرەشلوو و تێکڕای پیاوماقوولانی ئەفشاری ورمێیان لەگەڵ ڕکێفی وەکیل بەرەو ناوچەی خۆش و دڵبزوێنی خۆی وەڕێخست. ئەحمەدخانی برای شابازخان کوڕی مورتەزاقولیخانی دونبولی چووە پێشواز و ڕکێفڕامووسانی وەکیل و مەودای دووهەزار هەنگاوێکی لە چیای غەزەنفەرەوە هەتا دەروازەی شەقامی مەعرووف بە ڕایەخ و پایەندازی گرانبایی و کووتاڵی کشمیری و کرمانی تێکخستبۆوە کە کەریمخان پێیدا ڕابرێ. پاش چوونە نێو شاری خۆی بە نان و خوانێکی شاهانە میوانداری کردن و یەکجار زۆر بە دڵەوە نووسا و ئافەریمی لێکرا. پاشان جڵەوی حکوومەتی خۆی دایە دەس ئەحمەدخان و ماڵ و کۆچی نەجەفقولیخان و شابازخانیشی لە خۆیەوە بەڕێکردە هەرێمی عێراق و خۆشی پێی پیرۆزی بەرەو تەوریز نایە ئاوزەنگی.

[1] خەروار- خەربار، باری کەر، ئەوەندەی گوێدرێژێکی چاک توانیبیتی. هێندێک زیاتر لە ١٨ پووت. نیزیکەی ٣٠٠ کیلۆ.

# دوایین شەڕی فەتحعەلیخانی ئەرمشلوو

کاتێک ئالاکانی لەشکری خزمەت ڕکێفی کەریمخان لە مەرەند شەکانەوە، خەبەریان دایە کە تیرە و تۆرەمەکانی مەنگوڕ و مامەش و پیران و جەماوەری لاجان پەلاماری مەڵبەندەکانی ورمێیان داوە. چونکە وەکیل زانی کە لێدان و جزدانی ئەو خێلاتە لە هەموو کارێک گرینگترە و پیاوی ئەم مەیدانەش فەتحعەلیخانی سەرداره، خێرایەکی لەگەڵ عەلیمحەممەدخانی زەند و هەشتهەزار مەردازای بە دەستوبرد ناردنی بۆ سەرکوتانەوەیان. سەرداری ناوبراو بەم هێز و قۆشەنەوە ڕۆیشت و گەیشتە سەریان و پاش چەند شەڕێکی قورس و گران توانی هۆزی بلباس و عێلاتەکەی دیکە زۆر چاک بناسێنێ و سەربەرز و سەرکەوتە بگەڕێتەوە.

ڕۆژێکی برایمخانی برای و تاقمێکی لایەنگرانی، نوور لە چاوی خەنیمان لەگەڵی دانیشتن و دواندیان و پێیانگوت کە وەکیلی زەند دوژمنایەتی کۆنی لەگەڵ تۆ هەیە و قەت تۆڵەی ئەسکەندەرخانی برای لە بیر ناباتەوە کە بە دەست تۆ تێداچووە. هەمیشە لە هەلێک دەگەڕێ کە بتفەوتێنێ و کولی دلی دامرکێنێ. ئێستا کە لەو داوە دەربازبووی و لەو کۆت و بەندە خەلەستووی وا باشترە کە خۆ کەنار کەی هەتا ئەو دنیا تێکەولێکەیە هێور دەبێتەوە.

فەتحعەلیخان گوێی بۆ قسەی خێرخوازانەی شل نەکردن و بە هیوای یەزدانی پاکی توانا بە ڕێگای بناودا ڕووی کردە تەورێز و گەیشتە ڕکێفی بەشان و شەوکەتی وەکیل.

## داكووژانی چارەنووسی فەتحعەلیخانی سەردار

وەختایەک ئاوازەی سەربەخۆیی و دەسەلاتی کەریمخان لە مەلبەندەکانی ئازەربایجان دەنگی دایەوە، گەردنکەشان و سەربزێوانی هەموو لایەک ملیان بۆ ئەوی کرد. بۆ نموونە حاجی عەلیمحەممەدئاغای حاکمی مەراغـە کـە لـە نێـو سەرۆکانی ئازەربایجاندا بە دەولەمەندی و دەسڕۆیشتوویی بـەناوبانگ بـوو، هەستا و هەر ماڵ و ملکوماشێکی کە هەیبوو سیایی لێگرت و لە پـێش وەکیلـی دانا و بە ڕووراستی پێشکەشی کرد. ماوەی سێ مانگ مانەوەی هۆردووی وەکیـل لە ئازەربایجان بە ماڵی حەلاڵی خۆی وای بەخێو کردن کە پیـاوان و غولامـانی خان هیچ دان و دانەوێڵە و ڕۆن و برینج و مـەڕ و ئەنانـەت پتێـک و کوتێـک و کولۆیەکیان شت لە کەس وەرنەگرت. ئەوەی حاجی عەلیمحەممەدئاغا کردبوویە دیاری هەمووی دایەوە بە خۆی و لەسەر کورسی دەسەلاتی مەراغەی لانـەبرد و دەستی وەبەرنەهێنا. پاشان دوو ڕۆژان لە شارۆکەی مەرەنـد بـوو بـە میـوانی محەممـەدڕەزاخانی مەرەنـدی و بـە خـاوخێزان و دەسـتوپێوەنـدەوە بـەرەو قەرەچەداغیان بەڕێکرد و ماڵ و کۆچی کازمخانی قەرەچەداغییان نارده هەرێمی ئێراق. لەم ڕۆژانەدا هەواڵی سەرهەڵدان و زوڵم و زۆرەملی زەکیخانی زەند کـە لە لایەن وەکیلەوە کرابوویە دەسەلاتداری بێبەرگێـرەوەی ئێـراق و فـارس بـە خزمەت کەریمخان ڕاگەیەندرا. وەکیل بە بیستنی ئەم خەبەرانە ئاڵۆزکا و تووشی دڵەڕاوکەیەکی زۆر بۆوە و ئەگەرچی لێبڕابوو کاروباری گرینگی مەڵـبەندەکانی شێروان ڕابەڕێنێ و ڕێکیان بخا، بەلام یەکی سـەفەرەکەی خـستەوە و بایـەخی زیاتری دانا بۆ دەمکوتی دوژمنی خۆماڵی. بۆیە بەناچار سـەری ڕکێفـی بـەرەو ئێراق وەرسووڕاند و کۆچ پێکردنی ماڵ و خێزانی پەناخانی جەوانـشێر سـەری

نەگرت. خودی پەناخانی جەوانشێر و سابقخان و نەسیرخانی کورانی عەلیسولتانی شوقاقی و نەزەرعەلیخان لە خزمەت ڕکێفیدا بەپرتاو ڕوویان کردە ئێراق.

کاتێک شارۆچکەی قومشە(شارمزا)ی ئیسفەهان تاوڵ و خێوەتی هۆردووی لێهەڵدرا، هەر کە وەکیل چاوی بە گلکۆی ئەسکەندەرخانی برای کەوت، خودبەخود گڕی دمرد و پەژارە لە جەرگ و هەناو و سینەی پڕ کینەی هەستا و ئاوی داخ و کەسەر لە چاوەی هەرنک چاویڕا شۆڕ بوونەوە. لەو کاتەدا ئەمیرانی زەند و کەسانی تر بەتایبەت ئازادخانی ئەفغان کە فەتحعەلیخانیان دەبوغزاند و دڵیان لێیپڕ بوو، سەری هەمبانەی ڕق و ناخۆشەویستی و بەرچاوتەنگییان کردەوە و کەوتنە شۆفاری و دووزمانی. چوونە بن کلیشەی وەکیل و هارووژاندیان و هانیان دا کە بیکووژی و لە کۆڵی بکاتەوە. لەو شەوەدا وەکیل بە ناسەرسەنگی ناردی بە شوێن فەتحعەلیخاندا و هەر کە هات لەرێوە لێیپرسی: دەی فەتحعەلیخان دەزانی ئێرە کوێیە؟ سەرداری ئەفشار بێئەوەی ڕاوەستێ وڵامی داوە: بەڵێ ئێرە قومشەیە و ڕاست ئەو شوێنەیە کە تۆ خۆت لە بەرامبەر هێرش و پەلاماری پاڵەوانانی ئەفغان و ئەفشاردا بۆ ڕانەگیرا و هەڵاتی و ئەسکەندەرخانی براشت هەر لێرە ئەسپی بەختی سەرسمی دا و بوو بە ئامانجی تیری ئەجەل کە لە سەرپەنجەی منەوە باڵی گرت! چاک دەزانم کە بەم نیوەشەوە بۆچی بانگت کردووم و مەبەست لەم پرسیارە بەدئاکامە چیە. من هەر لە یەکەم ڕۆژەوە پەیمانی تۆم بە ڕوونی نەدەهاتە بەرچاوی و ئیمانی تۆم وەکوو بەڵێنەکەت بە درۆ دەزانی. لێی گەڕێ با وابێ. بەڵام ئەزبەنی سێ داوام هەیە لە جەنابت: یەکەم ئەوەی پاش کوژرانم کە ئامانجی سەرەکی تۆیە لە پەنا گۆڕی خوابەخشیو ئەسکەندەرخان بمنێژن. دووەم ئەو کۆچ و بار و خاوخێزانەی خێڵی ئەفشار کە لە خزمەت ڕکێفی موبارەکدان، لە دەسدرێژی خەڵکی عێراق و فارس و جەماوەری زەندان پارێزراوبن، هەتا ڕووحم لە قالبەندمدا و قالبەندم

لە گۆڕدا نەڕەنجێن. سێهەم ئەوەی کە پلەی من بدرێتە جانگیری کوڕە گەورەم و حکوومەتی ورمێ باربووی ڕەشیدی برای بکرێ کە چکۆلەترە. وەکیل هەرسێک داواکەی لێقبووڵ کرد.

ئەوسا فەتحعەلیخان ئامادە بوو بۆ سزادران و نەمان و کەوتە شوکرانەبژێری و پێداهەڵدانی یەزدانی سەرچاوەی چاکی و گوتی لە سایەی خوداوەندی مەزنەوە لەم دنیایە بە هەموو ئاواتەکانم گەیشتووم و هیچ ئاسەیەکم لە دڵدا نەماوە. هەتا ئێستا زۆرم هەوراز و لێژی دنیا بڕیوە و پلە و پایەی بەرز و سەرکەوتنی پەیتاپەیتام بە خۆمەوە دیوە. تەنیا ئارەزوویەکی هەمە و ئومێدم وایە بێتەدی، لێبووردنی پەروەردگاری دڵاوا و بەڕەحمە و هیچی دیکە.

ئەمەی گوت و گریا و دڵۆپی فرمێسکان لە سەرینچاوەی چاویڕا سەرەولێژ بوون. پۆلێک لە سەرۆک و سەردارانی ئەفشار کە لە گۆشە و کەناری تاوڵ و خێوەتی سەرسەرای فەرمانڕەوایەتی ڕاوەستابوون و ئەم قسانەیان گوێ لێدەبوو، خۆیان بۆ ڕانەگیرا و بەجارێک لە پرمەی گریانیان دا و کردیانە شین و گابۆڕ و باوکەڕۆ. لێرەدا وەکیل هەڵەتەی بە لەبار زانی و وەدوادانی خاشەکێشانی ملۆزمی بە بەرژەوەند نەزانی و لەڕێوە ئاماژەی کرد بیکووژن. میرغەزەبان هەر ئەو شەوە لەبەر ڕووناکایی مەشخەڵان پەتی مەرگیان خستە ئەستۆی و چرای ژیانیان کووژاندەوە. وەکیل دوای داکووژانی چارەنووسی [illegible]عەلیخان فەرمووی کە بەپێی وەسێتی خۆی لە پەنا گڵکۆی ئەسکەندەرخان بینێژن و گومبەزێکی بەرزیان لەسەر مەرقەدی هەردکیان ساز کرد کە ئێستاش لە قومشە ماوە. پاشان سێ ڕۆژیان سەرەخۆشی بۆ دانا و تازیەیان بۆ داگرت. جانگیرخانی کوڕە گەورەی ئەو خوابەخشیوەی کردە یەکێک لە یاران و هاودەمانی کۆڕ و دیمەنی دیار و نادیار خۆی و بە ناو پلەی سەردارێتی دا بە ڕەشیدخانی کوڕەکەی دیکەی.

## سەربزێوی هۆزی بلباس لە ورمێ و شالاوی ڕۆستەمخان بۆ بەرەنگاربوونەوەیان

پاش ئەوەی هەواڵی چارەنووسی سامناکی فەتحعەلیخان گەیشتە لای ڕۆستەمخانی حاکمی ورمێ و ئەوەندەی بلێی یەک و دوو هەموو لایەکی گرتەوە، هۆزی بلباسی دانیشتووی مەڵبەندی لاجان کە بە چنگ فەتحعەلیخانی خوابەخشیو تاسابوون، هەمیشە لە دەرفەتێک دەگەڕان بۆ تۆڵە کردنەوە. قەدیمی لەمێژە گوتوویانە: «نە مار کلکی لە بیر دەچێ و نە باغەوان کوڕی.» بەکورتی دوای ئەوەی بە ڕووداوی نەمانی فەتحعەلیخانیان زانی، عەشیرەتی زمرزای شنۆش کە سەریان لێدەخورا لەگەڵ خۆیان کردیانن بە هاودەنگ و هاوپشت و کەوتنە سەرهەڵدان و جووڵانەوە. سەرەتا ناوچەی دۆڵی سەر بە ورمێ کە مڵکی سەرۆکانی تیرەی گۆندوزلوویە وەبەر ڕامالیان هات و دایانڕووتاند و تالانیان کرد.

کاتێک ڕۆستەمخان هەواڵی ئەم ڕووداوانەی بیستەوە، بەرگرتنی ئەم لافاوی بەلایەی بە گرینگ زانی و کەوتە کۆکردنەوە خێڵ. سەرەتا مۆئمینخانی کوێرکراوی حاکمی ساینقەڵای وێرای محەممەدبەگی ڕیشسپی تایفەی قەرەحەسەنلوو کە بۆ دەستوبرد و ئازایەتی پیاوێکی بەناوبانگ بوو، لەگەڵ دەستەسوارێک بە ڕێگای گەلی قاسملوودا گالی دان و خۆشی شانبەشانی سوارانی ئەفشار و دلێرانی ناودار بە ڕێی جاریجان و کەلی «قاشقە گەدووک»دا بەرەو لاجان فڕی.

لەو لاوە کابایزی[1] مەزنی هۆزی بلباس بنەماڵـە و خـاوخێزان و کـۆچ و بارێکی بێ‌هەژماری وێـرای کۆمەڵـێک ناردبوونـە چیـای قەنـدیل کـە پـەنا و پەسیوێکی قایم و پتەوە و خۆی وێرای سوارانی مامـەش[2] و مـەنگوڕ و پـیران، شارەدێی شنۆی کردبوو بە لەشکرگا. کاتێک ڕۆستەم‌خان لەگەڵ سپای ئەفـشار گەیشتە نیزیک چیای قەندیل، هـۆزی بـلباس لێیـان‌وەدەرکـەوتن و شـەڕێکی قورسیان لە مابەینی‌دا قەوما. ئاخرییەکەی بلباس شکان و بە ترس و تۆقینەوە کشانەوە بۆ پەنا و پەساران. سوارانی ئەفشار دەورەیان گرتن و پاش لێکـدان و بێنەوبەرەیەکی زۆر دەستیان گەیاندە ئەو کەلێن و حەشـارگەیە و خۆیـان لـە کوشتنی نێرەوەزان و تالانی ماڵ و سامانیان نەپاراست. پاش ئەوەی ڕۆستەم‌خان وەکوو ڕۆستەمی داستان شەڕەکەی بردەوە و بە سەرکەوتوویی گەڕایـەوە، لـە بناوی سەهناباد کـە بـە باراندووزچایی (چـۆمی بـارانـدێز) بـەنـاوبانگە بنەی داگرت و گوێی بۆ خەبەر و باسی شنۆ هەڵخست.

پێشتر باسی کرا کە موئمین‌خان وێرای محەممەدبەگی قەرەحەسەنلوو بـە ڕێگای گەڵـی قـاسملوودا بـەرەو شـنۆ چـوون. لـە مـەودای ڕێیـەدا تووشـی کۆمەڵەپیاوێکی عەشیرەتی زەرزا هاتن کە لـە ناوچـەی دەشـتەبێڵ ڕەوگـەیان لێ‌تەنیبوون. محەممەدبەگی پاڵەوان شان‌بەشانی دلێرانی ئەفشار پەلاماری‌دان و بەڕاستی ئازایەتی و مەردایەتی نواند و گەلێک لە سەرناسانی زەرزای بە زەبری شیر لە خوێنی نەمان گەوزاندن. سوارانی زەرزا کە پێیان‌وابوو بۆ سـوارچاکی و نێزەداری کەس تایان ناکا بە دیتنی ئەو شان و باهۆ و هێـز و چاونەترسانە، تۆقین و ڕەوین و سوارانی ئەفشار هەتا هەورازی شنۆیە هەڵیانبڕین. لەو کاتەدا کابایزی مەزنی بلباسان کە لە شـوێنێک لەنگـەری گرتبـوو، وەختایـەک بـە

---

1 - بە هەڵە نووسراوە کەبایز. کابایز هەمان کاک بایز. کاک بازید و کاک بایەزیـدە و کورت کراوەتەوە.

2 - لە دەقی سەرەکی‌دا نووسراوە مەماش.

ڕاکردنی سوارانی زەرزای زانی، لەگەڵ حەشامەتی خۆی پێی‌نایە ڕکێف و سەرەرێی لە محەممەدبەگ گرت کە چەشنی شێری درندە بە شیرەوە دەم لەسەر پشت بە دوویاندا ئەسپی لینگ دەدا. کابایزی بڵباس کە پیاوێکی بەقەڵافەت و چوارشانە و سینگ پانوپۆڕ و باسک و مەچەک ئەستوور و فیلەتەنێک بوو بەهێز و دەنگوت کێوە بە پێوە، لەگەڵ ئەو شێرەی لانەوبانی ئازایەتی کە محەممەدبەگ بێ کەوتە مەیدانداری. هەردک پاڵەوان دەستیان برد بۆ شیر و مەتاڵ و نێزان و پێکداهاتن و تێکراچوون و کردیانە تەپوتۆزی بەرەنگاری و سەرەنجام محەممەدبەگ ئەگەرچی لە چەند جێوە برینی قووڵی هێنابوو، بەڵام دیسانیش شیرێکی وای داهێنایە شان و شەپیلکی کابایز کە لە خوانی زینەوە هەڵیداشت و قریوەقریوی دەسخۆش دەسخۆش لە دۆست و دوژمنەوە کۆڵەکەی بەست بەرەو چەرخی گەردوونی دوور لە سوان و پوان. کەچی ڕاست لەم کاتەدا سمی ئەسپی محەممەدبەگ لە قەڵشتێک گیرا و ئەویش نسکۆی برد و سەرکردەی ئەفشار چونکە خوێنێکی زۆر داچوڕابوو لە برینانی و بڕستی لێبڕابوو لەسەر پشتی ئەسپەوە هەڵدێرا و لەرێوە مرد و گیانی دایە دەس فریشتەی پێمردن. لەو لاشەوە کابایز بوو بە ڕێبواری ڕێگای نەمان. هاورکێفان و دەستوپێوەندەکانی کە ئەم دیمەنەیان چاو پێکەوت لێک‌بڵاو بوون. سوارانی ئەفشار تەرمی محەممەدبەگیان لەوێوە ڕاگوێستە گوندی حەساری تورکمانی زێد و نیشتمانی. لە نێو تیرە و تۆرەمەی ئەفشاری قەرەحەسەنلوودا وا دەگێڕنەوە کە وەختایەک خەبەری کوژرانی کابایز دەگاتەوە دایکی بڕوا ناکا هەتا دەیهێننە سەر تەرمی کوڕەکەی. پاش ئەوەی بە چاوی خۆی دیتی کوژراوە و شەڵاڵی خوێنە، کردی بە شین و گابۆڕ و قژی ڕنینەوە و لەوێوە بەرەو حەساری تورکمان کەوتەڕێ. وەختایەک گەیشتێ کە مەیتی محەممەدبەگیان سێ وسڵ دابوو دەیانویست بینێژن. خەڵکەکە هەموویان بە دیتنی دایکی کابایز سەریان سوڕما و بەپێچەوانەی داب و نەریتان دانا و گوتیان چۆنە هاتووی؟ ئەو پیرێژنە کەوتە

گریان و کڕووزانەوە و پاڕانەوە و داوای لە کەس‌وکاری بکوژی کوڕی خۆی کرد کە با چاوی بە تەرمی ئەو خوابەخشیوە بکەوێ. پاش ئەوەی خاتریان گرت و قایل بوون کفنەکەی کردەوە و بە وردی لە قەلافەتی ڕوانی و گوتی: بە خولای و بە پێغەمبەری نازدار تازە لەبۆ کوڕی خۆم ناگریم و خەمی لەبۆ ناخۆم چونکە بە دەست کەلێکی وەکی خۆی گوژراوە. پاشان چەند ڕۆژێک لەگەل بنەمالەی محەممەدبەگ دانیشت بۆ سەرەخۆشی و تازیەداری و شینگێران. کاتێک ئیزنی خواست بگەڕێتەوە، بە تەدارەک و گەرم‌وگوڕی ناردیانەوە لاجان.

## برانەوەی چارەنووسی ڕۆستەمخان

پاش ئەوەی ڕۆستەمخانی حاکمی ورمێ بە سەرکەوتوویی و دەسەڵاتەوە گەڕایەوە بنکەی حکوومەتی، هەروەکوو جاران کەوتەوە ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی ورمێ و ئەم ڕووداوانە دەگەڕێنەوە بۆ سالی ١١٧٨ی کۆچی/١٧٦٤ـ١٧٦٥ی زایینی. پاش سالێک یانی لە سالی ١١٧٩ی کۆچی/١٧٦٥ـ١٧٦٦ی زایینی‌دا کە ڕۆستەمخان بەوپەڕی سەربەستی خەریکی حوکمڕانی بوو لە ورمێ خەبەر هات ئەوە خوسرەوخانی ئەردەڵان دوای شکانی لە بەرامبەر دوژمنێکی بەهێزدا بەپێی دۆستایەتی پێشووی لەگەڵ ڕۆستەمخانی حاکمی ئەفشار، لە مەڵبەندی سنەوە داوەڕیوە بۆ ئەم ناوچەیەی کە دەڵێن بەهەشتە و لە بناوی سەهەناباد بنەی داناوە. خانی حوکمدار بە بیستنی هاتنی حوکمڕانی بەرزەشان، کەیفی گولی کرد و کۆمەلێک لە گەورەپیاوانی ئەفشار و خزمەتکارانی بارەگای ناردنە پێشوازی. ئەو ڕۆژەش کە گەیشتێ خودی ڕۆستەمخان هەستا و دەستی ڕێزی بە سینگییەوە نا و تا بەر دەروازەی بازارباش کە کەوتۆتە پەنا بنکە و بارەگای حکوومەت تەشریفی بەپیریەوە چووە. گەلێکی بەخێر هێنا و سپاسی بە سەرکردنەوەی کرد و کەوتە تاریفاتی و دەستووری فەرموو کە جێ‌ورێیەکی شایان و بە جوێ لە تەنیشت بارەگای حکوومەت بۆ خوسرەوخان چۆل و دیاری بکرێ و زۆری بە دەورەدا هاتن‌وچوون. خولاسە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری ڕێزی میوانەکەی دەگرت و لەبەرەوەی حاکمانی سنە بەتایبەتی و خەلکی کوردستان بەگشتی، زۆربەی کات و ساتان خەریکی عەیش و نۆش و گەشت و گەڕان و ڕاو و هەلدانی پیالەی شەرابن و پێوەیان گیرۆدە بوون! ڕۆستەمخان جارجارە دەیبردە ڕاو و سەیران و دەشت و کەژان و چ شتێک کەیفی پێ‌ساز

دەبێ و دەروون پێی‌دەگەشێتەوە بۆی پێکدێنا هەتا تۆزی غەمی غەریبی نەیڕاکێنێ و دڵی بە دڕکوداڵی ڕۆژگار دانەڕووشێ. سەرەنجام لەبەر شەیتانی و شۆفاری چەند کەسێکی چەپەڵ کە تۆماتی ناکاری دزێو و خەیانەتیان پێوەبەست، ڕۆستەمخان هەقی نان و نمەکی خۆی زایە کرد و کەوتە بیری تێدابردنی! بۆیە نیوەشەوێک کە خوسرەوخان مەست و کەلەلا لە خەوی شیرینی بێخەبەری‌دا سەری دەخەولاوە بە ئاماژەی ڕۆستەمخان چرای ژیانیان کووژاندەوە و کردیانە دەنگۆ کە هێندەی شەراب خواردۆتەوە کە پێی‌مردووە. جا هەر بەڕاستی ڕۆستەمخان ئەم کارەی پێوە نەهات کە وەکوو زاڵی ڕۆژگار بەناز و لەنجەولار و میوانکوژ بوو. ساڵی تێوەرنەسووڕاوە کە بە چنگ «باقربەگ»ناوێکی ئەفشار تۆڵەی لێکرایەوە و تۆماری تەمەنی پێچرایەوە[1].

لێرەدا شیکردنەوەی ئەم باسە پێویستە و دەبێ بڵێم کە کەریمخانی وەکیل لە شیرازەوە بۆ هەرکلم لە سەرۆکانی ئەفشاری ورمێ کە بە خاوخێزانەوە دەس‌بەسەر بوون خەڵاتی چاک و گرانبایی دەنارد. بۆ نموونە «باقربەگ»ناوێکی ئەفشاری قاسملووی ڕاتەسپارد کە دیارییەکی تایبەت و حوکمێک سەبارەت بە دەسەلات و سەرەبەخۆیی بەرێ بۆ ڕۆستەمخان. کاتێک فەرمانی بەسەرکرانەوە و خەڵات گەیشتە ورمێ، بەپێی داب و نەریتی وڵات ڕۆستەمخان زۆر جوانی پێشوازی لێکرد. لەبەروەی کە باقربەگ خزم و مەحرەمێکی زۆر نیزیکی بوو لە

---

[1] - نووسەری مێژووی ئەفشار لە دەقی دەسنووسەکەی خۆی نووسیویەتی: با شاراوە نەبێ کە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە سەر دەقی نووسراوەکەی مەلا مەحموودی موئەزینی ئەفشاری مەحموودلوو، کوڕە مامێکی دایکی منی ڕووسیا و لە دیرۆکی «گولشەنوتتەواریخ»ی خۆی‌دا تۆماری کردووە، ئەگینا منی ڕووڕەش لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی‌دا نەمدیوە و سەرەنجم نەکەوتۆتە سەری. م.پ تۆبڵێی میرزا ڕەشید لە دەقی دەسنووسەکەی‌دا وای نووسیبێ یان پەراوێزی بۆ داناوە؟! بەداخەوە ئەو کەسانەی پێی‌داچوونەوە و ڕێکیان خستووە مەبەستەکەیان بە وردی وەردنەداوەتەوە. بەڕاستی دەترسم چەند جێگایەکیان بەپێی بەرژەوەندی ڕۆژگار هەڵپەرتاوتبێ.

کۆشکی حکوومەتیی‌دا جێی بۆ دابین کـرد و ئەلیاسـی ئەفـشاری سەرکێـشکچی ڕاسپارد کە لە خزمەتی‌دا بێ. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری دەخوێنـدەوە هـەتا وردەوردە زۆر پێکەوە هۆگر بوون و پەردەیان لە نێوانی‌دا نـەما. باقربەگ شەو و ڕۆژ لـە دەر و ژووری ئەنـــدەروون و دیوەخـــان لەگەڵـــی هەڵدەســـتا و ڕۆدەنیـــشت. ڕۆستەمخانی ئەجەڵهاتوو لێکدالێکدا نـەردێنی خۆشەویـستی پـێدەنۆرانـد و بناغەی دۆسـتایەتی لەگـەڵ پتـەوتر دەکـرد و نەیـدەزانی کـە بـەدزی وێـرای میحرابەگ و سادقبەگ کلکیان لێکهاڵاندووە و دەیانهەوێ بیکووژن. بەگـشتی باقربەگ و سادقبەگ و عابیدبەگ و میحرابەگ هەمیشە پەنامـەکی سـەریان دێناودەبرد و سەبارەت بە فەوتاندنی ڕۆستەمخان و تێدابردنی پێکـەوە دەدوان. ئەم بەگانە دەیانویست خانی ئەفـشار نـەمێنێ و باقربـەگ جێـی بگرێتـەوە و نەیاندەزانی کە ئەم بەرگە لە هەموو کـەس ناکالـێتەوە و هـەر گەنـدەپیاوێک ڕێی‌ناکەوێ بیکاتەبەری.

هەتا شەوێکی کە ئەلیاسبەگ لەگەڵ چەند کێشکچییان قەراری دانا بانگی بەیانی بچنە حەمام. ئەو شەوە باقربەگ خۆی نەخۆش کرد و بۆ خواردنی شێوی شەو نەچووە ئەندەروون بۆ لای ڕۆستەمخان. ڕۆسـتەمخـان دوای نـان و چـا خواردن سەری نایە سەر سەرینی حەسانەوە و لە نوێنوبانی خزا و بێخەبەر لە هەموو شتێک لێفەی خەوی مەرگی بە سەر خۆی هەڵکێشا، بەڵام باقربەگ هەتا نیزیک کازیوەی بەیانی نەخەوت و لـەو کاتـەدا یـەکێکی نـاردە سـەربان کـە بێوەعدە بانگ بدا. ئەلیاسبەگ وەیزانی بەیانەیە و ڕۆیـی بـۆ حـەمام. هـەر لەڕێوە باقربەگ لەگەڵ سادقبەگ و عابیدبەگی هاوپەیمانانی خۆی، پرچەک و تەماگرتوو چوونە نێو حەرەمخانـە. ڕاست لـەو وەختـەدا ڕۆسـتەمخـان زوو هەستابوو کە بچێتە سەر پێشاو. باقربەگی کەمدەرفەت پرسی ڕۆستەمخان کـوا؟ ئاماژەیان کردە ئەو شوێنە و کاتێک خان هاتەدەر، باقربـەگی زاڵـم شـیرێکی تیژی داهێنایە و برینێکی کاریگەری تێکرد. پاشان یارانی لە پەستا دایگرانـێ و

نەیانپاراست. گۆیا ڕۆستەمخان ئافتاوەی مسینەی[١] بە دەستەوە بووە و هێندێکیش هەڵسووڕاوە، بەڵام هیچی بۆ نەکراوە و ئاخرییەکەی ئەو بێچارەیان خستووە و لەڕێوە گیانی داوە. کچی ئەو خوابەخشیوە کە دەبێتە دایکی محەممەدعیساخان، خودادادخان و لوتفعەلیخان و خێزانی ئیمامقولیخانی بەگەربەگ، خۆی دەخاتە بەرپێی بکوژانی و چەند شەقەزللەی وای لە ئەستۆی دەدەن کە هەتاهەتایە ملی خوار بوو. بەکورتی شین و شەپۆر و گریان لە ئەندەروونیی ڕۆستەمخانەوە دەگاتە گەڕەکی بازاڕباش و تێکرای ژن و پیاو بە پەشۆکاوی وەخەبەر دێن و لە دەوری کۆشکەڵی حکوومەت کۆدەبنەوە و دەیکەنە هاوار و قوڕپێوان. لەو هەراوهوریایەدا باقربەگ فەرمان دەدا کەلاکی ڕۆستەمخان هەڵگرن و بیبەنە مەیدانی بازاڕباشی. لە لایەکی دیکەوە تەپڵی دەسەڵاتی بۆ لێدەدرێ و هەرا دەکرێ کە دەور دەوری باقربەگی ئەفشارە و دەیکەنە دەمگۆ کە کەسوکاری خوسرەوخانی ئەردەڵان ڕۆستەمخانیان کوشتووە و بۆی دەرباز بوون. خێڵی ئەفشار بەناچار ملیان بە چەڵەمەی دەسەڵاتی باقربەگدا هێنا و بە حاکمی خۆیان دانا.

لەسەر ئەم حاڵەدا حەوت شەو و ڕۆژ ،ەیتی ڕۆستەمخان لەو مەیدانە دەمێنێتەوە و کەس لە خۆی ڕانابینێ کە بچێ و بینێژێ. سەری هەشت ڕۆژەی میرزا محەممەدجەعفەری ئیمانلووی سەرۆکی باج و بیتاک وێڕای جەماوەرێکی زۆری بەرەبابی عەبدولمەلیکی و خەڵکی دیکەش دەچن و تەرمەکەی دەگرنەوە و دەیبەن و دەیشۆن و کفنی دەکەن و لە گۆڕخانەی بازاڕباشی دەینێژن. وەختایەک هەواڵی ئەم کارەساتە سامناکە بڵاو بۆوە و بە گوێی

---

[١] - مسینە- هەر شتێکی کە لە مس سازکرابێ. وەکوو قوربنە، گلینە و بەردینە. لە زمانی کوردیدا بۆتە مەسینە و تەنانەت جێی ئافتاوەشی گرتۆتەوە. مەسینەکەی دەستدایە یانی ئافتاوەکەی هەڵگرت. جا جیاوازی ناکا چ مس و تەنەکە بێ و چ مەفرەق یان باغە.

موئمین‌خانی حاکمی ساین‌قەڵا گەیشت. خەمێکی یەکجار زۆر دایگرت و سەرەڕای نابینایی بەهەشتاو ئەسپی لینگ دا و ڕێگای هەڵبوارد و ڕۆژی دووشەممۆ وێڕای جەماوەرێکی بەرچاو پێی‌نایە حەوشەی قەڵای ورمێ. لەوێ یەکێک لە پیاوەکانی خۆی بە ناوی قارەمــان ڕاتەســپارد کــە بۆلەچەکـدارێک بــەرێ و باقربــەگ و هاوڕێیانی بگرێ و ئەویش خێرایەکی فەرمانەکەی ڕاپەڕاند و بکوژانی دەردەست کرد. پاشان لەسەر حوکمی موئمین‌خان و بە ڕۆژی ڕوون لە مەیدانی بازاڕباشــی پەل‌پەل و کوت‌کوتیان کردن. بەکورتی دوای خاشەکێشانی بکوژانی ڕۆستەم‌خان، موئمین‌خانی بێ‌چاو ئۆخژنێکی لــە دەروونــی گــەڕا و جــارێ لەســەر تــەختی حکوومەتی ورمێ لەنگــەرێکی گــرت و کەوتــە ڕاپەڕانــدنی کاروبــاری گرینگــی مەڵبەندەکە. ڕۆستەم‌خانی خوابەخشیو تەنیا نێرینەیەکی لــە پــاش بــەجێما و چونکە دوای نــەمانی بــاوکی پێــی‌نایــە جــەغزی ژیــان، ئەویــشیان نــاو نــا ڕۆستەم‌خان. عەبدولغەفاربەگ و خان‌جان‌بەگ لــە پــشتی ئــەم ڕۆســتەم‌خانــە کەوتوونەوە.

## ڕاسپێردرانی میرزا جەعفەر بە مەبەستی چوونە شیراز و گەیاندنی ڕاسپاردەی موئمین‌خان بە دەمڕاستی مسکێنان سەبارەت بە حاکمی ورمێ

لەبەروەی کە موئمین‌خانی قاسملووی حاکمی ساین‌قەڵا بە هاوکاری پیاوماقووڵان و ئەفشارانی ورمێ بکوژانی ڕۆستەم‌خانی گرتن و کوشتنی و هەرا و بگرە و بەردەی مەڵبەندەکەی ڕۆمرکاندەوە، ڕۆژێکی کۆمەڵێک لە گەورەپیاوان و کەیخودایانی ئەفشاری کۆکردنەوە و سەبارەت بە هەڵبژاردنی حوکمدارێکی ڕەسەن و شیاو بۆ ورمێ و پاراستنی سنووران و سەرۆکایەتی خێڵی بەرزەجێ قسەی کردن و پرسی کە ئێوە دەڵێن چی و کێتان وەبەرچاو گرتووە. هەموویان یەکدەنگ گوتیان بەڕاستی تەنیا ڕەزاقولی‌خانی کوڕی محەممەدموساخانی خودابەخشیو لەمڕۆدا شایانی سەرۆکایەتی ئەفشار و حوکمدارێتی ئەم مەڵبەندەیە و ئەویش ئێستا لە شیراز بارمتەیە. جا چونکە ئەم بەرەبابە هەر لە کۆنەوە بە وەجاخی خانەدانی ئەفشار و بەگلەربەگی ئەم مەڵبەندە ناسراون، دەبێ کاغەزێک بنووسرێ بۆ بارگای کەریم‌خانی وەکیلی ئێران و تکای گەڕانەوەی بکرێ.

میرزا جەعفەری دەمڕاستی مەڵبەند ئەم کارەی وەئەستۆی خۆی گرت و سوکات وێڕای لوتفوڵلابەگی سەرۆکی تیرەی ئۆستاجلوو و کەلبالی‌بەگی ئەفشار یەکێک لە کۆنەسەربازانی نادرشای ئەفشار خۆیان ساز کرد و بەرەو شیرزا وەڕێکەوتن. پاش بڕینی مەودای ڕێگا گەیشتنە ئەو شارە و نووسراوەکەی خێڵی ئەفشاریان لەگەڵ دیارییەکی بێژمار بە کاربەدەستانی وەکیل نیشان دا. کەریم‌خان بە بیستنی ڕووداوی ڕۆستەم‌خان زۆر کەسەربار بوو. دواتر لەسەر تکای موئمین‌خان و سەرۆکانی ئەفشار و لەبەر خاتری ئەوەی کە ڕەزاقولی‌خان

ژنبرای بوو کردی بە حوکمداری ورمێ و بەگلەربەگی خێڵی ئەفشار. حوکمی بۆ نووسرا و لەو کاتەدا لە زمان غولامانی وەکیلەوە ئەم شێعرە بە گوێی دانیشتووانی کۆڕەکە دادرا:

ئەگەر بەم کارە ڕازیم کە داخوازی ئێومیە
پێم وایە خێروبێری هەموو خەلکی پێوەیە

بەکورتی دوای وەرگرتنی حوکم و پۆشینی جلوبەرگی حوکمڕانی، میرزا جەعفەری وەکیلیش خەلاتی سەرۆکایەتی بەشی دارایی درایە و ئەوانی تریش دیاری میرانەیان باربوو کرا و هەر کەس بەگوێرەی پلە و پایەی بەسەرکرایەوە و لە وەختێکی موبارەکدا عیلماوای شیرازیان بەجێهێشت و گەڕانەوە. دوای بڕینی ڕێگای دوور و درێژ گەیشتنەوە خاکی ورمێ و لە مێرگ و چیمەنی عەلیبەگلووی وەققاسلوو دابەزین و ئەو شوێنەیان کردە جێوچان. کاتێک مزگێنی شادیهێنی ئەم کۆچ و گەڕانەوەیە بە گوێی موئمینخانی بریکاری حکوومەت و جەماوەری ئەفشار و خەلکی ناوچەکە ئاشنا کرا، گەلێک شادمان بوون و بەکۆمەڵ چوونە پێشواز و پاش ماوەیەکی درێژ بە دیداری هەستبزوێنی بەگلەربەگزادە گەشانەوە و ڕووحێکی تازەیان بە بەردا کرایەوە. ڕەزاقولیخانی بەگلەربەگیش چۆن چاکە ئاوا خێڵ و خزمانی بەسەرکردەوە و کەوتە دڵدانەوە و لاواندنەوەیان. بۆ بەیانی تەشریفی لە چیمەنی عەلیبەگلووڕا بەشان و شەوکەتەوە وەڕێکەوت و بێینایە ورمێ.

❖❖❖❖

# ڕەزاقولیخانی بەگەربەگ و ڕووداوەکانی سەردەمی دەسەلاتی

ئەوەی وا پێشتر باسی کرا سالی ١١٨٢ی کۆچی/١٧٦٨ ـ ١٧٦٩ ی زایینی بوو کە ڕەزاقولیخان لەسەر کورسی دەسەلات پالیدایەوە و لە ماوەیەکی کورتدا بە ئازایەتی و لێوەشاوەیی زگماکی و سروشتی خۆی و بە هێز و پشتیوانی خێلی ئەفشار توانی ئاژاوەگێرانی سنوورنشین کە خراپە و شەڕنانەوە و پرکێشی لەگەلیان ئاوەلدووانەیە، وەها بشکێنێ کە هەرگیز نەتوانن سەری نەفەسیان هەلاوێن. وای دانابوو ئەگەر یەکێک لە سەربزێوان پێی بە خواری دانێ و خەلکی سەر شەقام چاویان لێبێ، هەقیانە لەڕێوە سەری بپەڕێنن و هیچکەسیش بۆی نیە دەستیان وەبەربێنێ و هەلیانپێچێ و لێیانبپرسێتەوە. بەڕاستی دەسەلات و سەربەخۆیی حاکمی پایەبەرز لەو تەمەنی کالی و هەرەتی لاوەتی و چاخی گەشە و هەلدانی توولەی ژیانیدا پتر لە ڕابردووان پەرەی ئەستاند. ناوبانگی سام و سزادانی لەوپەڕەوپەڕان دەنگی دایەوە و هەتا دووراودووران ڕۆیی. لە سەردەمی سەرۆکایەتی ئەودا ولات ئاوەدان و سنوورەکان هێور و هێمن بوون. یەکێک لە کار و ئاسەوارە چاک و خێرەکانی کە هەتا ئێستاش ماوە و لە جێی خۆیەتی سازکردنی حوسێنیخانەی مزگەوتی گەورەی ورمێیە کە لە پەنا گومبەزی هەلکەوتووە. ئەم شوێنە پاش تێپەڕینی جێژنی نەورۆز و لە سالی ١١٨٣ی کۆچی مانگیدا بە هاوکاری نۆژیاروانانی هونەرمەند و بە هەول و هەلسووڕانی وەستاکارانی پەنجەنەخشین ساز کرا و پوولێکی زۆری تێچوو. دەلێن هەموو ڕۆژێ تەشریفی مەبارەکی بۆ خۆی دەهات و لەوێ ڕادەوەستا و دنەی وەستا و کرێکارانی دەدا و دەیفەرموو شلەی مەدەنێ و تەواوی کەن. لە ماوەی سالێکدا حوسێنیخانە و حوجرەکانی دەوروبەری و دەر و ژووری خوێندنگا و دوو منارەی بەرز داندران. خوداوەندی پیاوچاکان ڕووحی شاد و مالی ئاخیرەتی ئاوەدان بکاتەوە.

❖❖❖❖

## شەڕی ڕەزاقولیخان لەگەڵ سەربزێوان و نەمانی

ساڵی ١١٨٤ی کۆچی / ١٧٧٠ ـ ١٧٧١ی زایینی، ڕەزاقولیخانی بەگلەربەگ دوای لێبوونەوە لە جێژنی نەورۆزی میری، بەپێی داب و نەریت سەرۆکانی ئەفشار و غولامانی بارەگای بە سەر کردنەوە و دیاری و خەڵاتێکی باش و زۆری بە سەردا دابەش کردن. لەم کاتەدا بیستی کە عەشیرەتی دونبولی بە هاودەستی کوردانی حەیدەرانلوو ڕامالیان بردۆتە سەر ناوچەی قەرەباغی ئەنزەلی ورمێ کە ملکی تایبەتی بەگلەربەگییە و مەڕ و ماڵاتیان ڕاداوە و دایانمالیوە. ڕەزاقولیخان لەبەر پاراستنی دراوسێیەتی و پێشینەی لەمێژینەی دۆستایەتی سەرەتا چەند کەیخودایەکی ناردنە لای ئەحمەدخانی حوکمڕانی خۆی و بە نامە لێیڕاسپارد کە ماڵ و سامانی تاڵانکراوی خەڵکی ئەنزەل لە تاوانباران وەرگرنەوە و بیاندەنەوە. ئەحمەدخان لەبەر فیز و دەماری هەرەتی گەنجی وڵامێکی سەرەوخێری نەدایەوە و هێندێکی بڕوبیانووی پڕوپووچ هێنایەوە. بەناچار نێردراوەکانی ڕەزاقولیخان یا بە دەست گەڕانەوە و چۆنیەتی دیدارەکەیان بە خزمەتی ڕاگەیاند. حاکمی بەرزەجێ گڕی ئاگری قەڵسی و دەرهەڵبوونی گرفەی هات و گوتی بە شیری جەوهەردار نەبێ ناکووژێتەوە و دانامرکێ. ئەنجا فەرمووی کە کۆمەڵەی سوارانی ئەفشار و بوێرانی ناودار بە لەشکرێکی بێئامانەوە بۆ لێدان و گەوزاندنی ئەحمەدخان و سەربزێوان بکەونەڕێ. پاش ئەوەی لێواری ڕووباری قەرەسوو کە مەشهوورە بە خانتەختی تاوڵ و خێوەتی قۆشەنی لێهەڵدرا، ئەحمەدخانیش وێڕای کوردانی حەیدەرانلوو و جەماوەرێکی زۆر و زەوەندی دونبولی و سەڵماسی بە مەبەستی بەرەنگاری داوەری و لەو شوێنە هێزەکانیان بەرەورووی یەکتر بوونەوە. لە سەرەتای تێکهەڵچوونەکەدا

سام و هەیبەتی مەردازایانی خوێنخۆرەوەی ئەفشار ترس و خۆفی خستە نـاخی تفەنگدارانی خۆی و سەلماس و کوردانی حەیدەرانلوو. بۆ سبەینێ پاش ئـەوەی خونکاری هەساران ئالای جیهانگیری هەلدا لەسەر تیفەرە و ترووپکی کۆساران، قرمـەقرمی تـەپـلی شـەڕی هـەرئک لا بـەرز بـۆوە و پێشەنگـان ئـاوری تێکهەلچوونەکەیان داگیرساند. لەبەر هـاتوهـاوار و هـەیدێـی خەزاکـەران و هەلمەتی پالەوانان سلم و ترسی ڕۆژی ڕابوونەوە خۆی نواند.

لە پێشدا سوارانی ئەفشار ئازایەتی و دەسـتوبردیـان نیـشان دا و بـە ئاماژەی ڕەزاقولیخانی بەگلەربەگ پۆلپۆل و دەستەدەسـتە کەوتنـە شـالاو و بەربەرەکانی. جەماوەری دونبولی کە چاویان بەو شەوکەت و دەریای لەشـکرە کەوت هەموو ئازای ئەندامیان وەک شەقشەقە لەرزی و تێکوپێک شکان. بـەلام لەو جەنگەیەدا کوردانی حەیدەرانلوو بەجارێک لە حەشارگە دەرپەڕین و تەپیان دایە مەیدان و تفـەنگچی سەلماسـیش کەوتنـە شـوێنیان و گوڕمیـان بەسـت. ڕیزەکـانی سـپای ئەفـشار نـەیانتوانی خۆیـان لـە بەرامبـەر هەلـمەتی خەساربارییاندا ڕابگرن و تێکشکان و بەشێکیان بـەرەو دەریـای شـاهی (گـۆلی ورمێ) ڕەوین و تاقمێکیان بە کەلی «وەرگوێز»دا بۆی دەرباز بوون. ئەحمەدخان بە لەشکری بەرکێفی خـۆی ڕاکردووانـی هـەتا کـەلی قـولنجی ڕاونـا و بـە دەسکەوت و خەنیمەتەوە گەڕایەوە.

ڕەزاقولیخان بەم بەزینە بە دڵشکاوی و سەرشۆڕی پێینایەوە حەوشەی ڕرمێ. ئەحمەدخانی حاکمی خۆی ئەگەرچی دەسکەوت و سـەرکەوتنێکی ئـاوای وەچنگ هێنا، بەلام بـۆ ماوەیـەک پەشـیمان بـۆوە و لـە تۆلـەی ئـەم کـارە نابەخێرەی تۆقیبوو، چونکە دەیزانی کە غیرەتی ئەفشاران ئـەوەی بـۆ قـووت ناچێ و ئاخرییەکەی هەر پێیدەردەکەن و ڕقی پێدەرێژن.

ڕەزاقولیخانی بەگلەربەگ لەم سالە سەرانسەر پرئێش و ئازارەدا تەمای وابوو کە دیسان هێز و قۆشەنێک کۆبکاتەوە و تۆلە لە ئەحمەدخانی حوکمرانی

خۆی بستێنێتەوە. جا چونکە ئاژاوەگێرانی سەرسنووران کەتبوونە هەڵبەزدابەز و کەڵەوەکێشی، تەشریفی موبارەکی پێی‌نایە ڕکێف و وێڕای هێزی ئەفشار بۆ لووتشکاندن و گوێ‌بادانی ئەوان کەوتەڕێ و سەرکوتی ئەم خەنیمانەی بە گرینگتر دانا.

پاش ئەوەی کە بە زەبری شیری تیژی دەمهەراش توانی سەربزێوان بشکێنێ، چونکە سەرەتای وەرزی بەهار و هەرەتی گەشت و گەڕان و ڕاوشکار بوو، چەند ڕۆژێک لە قەڵای باراندێز بنەی خست و چوو بۆ ڕاو و سەیران. لەگەڵ ئەمەشدا هەمیشە بە کاروبار و باروودۆخی مسکێنان و جەماوەری وڵاتەکەی ڕادەگەیشت. وا هات کە لە سەرەتای مانگی شابان‌دا نەخۆشییەکی سەختی پێوەنووسا و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری لێ پیس کرد. بەڕێز میرموفیدی برای شێخولئیسلام کە حەکمێکی شارەزای ئەو سەردەمە بوو، کەوتە داوەرمانی بەگەربەگ و بە دەورەی‌دا هاتوچوو. بەڵام وەختایەک مەرگ هات کوا دەرمان دەتوانێ بەری بگرێ؟ کاتێک بە هەموو بۆچوون و نیشانەیەکی ڕوون و شارەزایانە دەرکەوت کە ڕەزاقولی‌خان دەردی پێمردنی گەیوەتە سەری و خەریکە لە چنگ هەرا و هوریای دنیای ڕووخەک دەرباز بێ، سەبارەت بە ئیمامقولی‌خان و محەممەدقولی‌خان و قاسم‌خانی کورانی کە هەرسێکیان لە شیراز بە حوکمی وەکیل دەس‌بەسەر بوون وەسێتی کرد و ماڵاوایی خواست لە سەرۆکان و خاوخێزانی و ڕۆژی چوارشەممۆ چاردەی مانگی شابان چوو بەرەوپیری بانگاوازی فریشتەی گیان‌کێشان. ئەمیران و پیاوماقووڵان و غولام و نۆکەرانی قەڵای باراندێز تەرمەکەیان هەڵگرت و بردیانە سەر تاتەشوار و پاش وسڵدان و کفن کردن ڕایانگواستە شار و گەورەپیاوان و سەرۆکان لێی‌کۆبوونەوە و لە گۆڕستانی «خان» تەسلیم بە خاکیان کرد.

❖❖❖❖

# ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ

پاش کۆچیدوایی ڕەزاقولیخان، سەرۆکانی ئەفشار هەموویان پێکەوە کاغەزێکی نیازمەندانەیان نووسی بۆ بارگای کەریمخانی وەکیل و لەبەری پاڕانەوە کە ئیمامقولیخانی کوڕە گەورەی ڕەزاقولیخان ئیزن بفەرموێ بگەڕێتەوە. هەر بۆیە میرزا جەعفەری ئیمانلوو خۆی ساز کرد و کۆمەڵێک دیاری و شتومەکی جوان و شایانی هەڵگرت و لە کلکەی مانگی شابان‌دا بەرەو شیراز بزووت. میرزا لەسەر پێوشوێنی تەنەران ڕۆژی سێی مانگی شەشەکان گەیشتە لاشیپانەڕاموسانی غولامانی دەرکوبانی وەکیل و کاغەزەکەی وێڕای ئەو دیاریانەی کە بردبوونی لە خزمەتی پیرۆزی دانا. وەختایەک کەریمخان بە نێوک و نێوەرۆکی کاغەزەکەی زانی زۆری داخ و پەژارە دەربڕی بۆ نەمانی ڕەزاقولیخان و لەڕێوە ناردی بە شوێن ئیمامقولیخان‌دا و سەرەخۆشی لێکرد و دڵداری داوە و ئەوسا لەسەر تکای جەماوەری ئەفشار بە دڵنیایی حوکماتی ورمێ و پلەی بەگلەربەگایەتی ئەفشاری بار بوو کرد و حوکم و فەرمانی تەواوی بۆ نووسرا و بە خەڵاتی مۆری میرانە ڕازایەوە. پاشان لە سەرەتای مانگی نێوجێژنان‌دا وێڕای میرزا جەعفەر و چەند کەیخودایەک لە شیرازەوە بەرەو ورمێ کەوتنەڕێ و مزڵ بە مزڵ ڕۆیشتن و لە بنەبانی مانگی قوربان‌دا گەیشتنە دەشتی سندووس. لەوێ سەرۆکی هۆز و عەشیرەتەکانی بلباس و موکری و زەرزا لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر چوونە پێشوازی و بەخێریان هێنا و گەلێکیان دیاری و پێشکەشی بردە خزمەتی. پاشان لەوێوە ڕێگایان هەڵبوارد و هەتا مێرگ و چیمەنی گوێگتەپەی نێوفرسەخی ورمێ بەند نەبوون. بۆ سبەینێ کە خۆری ڕووناکیدەری جیهان چەشنی «جەمشید» لە بان تەختی پیرۆزەڕەنگ پاڵی

دایەوە، بەگەربەگی لاو بە قسەی میرزا جەعفەری وەکیل کـە پیرێکـی شـارەزا بوو، بەرگەخەلاتی حوکماتی پۆشی و قەلافەتی شەنگ و شۆخی پێ‌رازانـدەوە و کەوتەڕێ. لەو کاتەدا سەرگەورە و سەرۆکانی مەلبەند و جەماوەری ئەفشار کـە چووبوونە پێشوازی گەیـشتنییە و بەگەربـەگیان بـــە شـــان و شـەوکەتێکی میرانەوە و بە ڕێگای دەرەی «ئەللاهوونەکبەر»دا بردە نێو قەلای ورمێ و ئەویش بە تەشریفی موبارەکی کورسی دەسـەلاتی رازانـدەوە. لەبـەر نـەمانی بـاوکی خوابەخشیوی بە جلوبەرگی ڕەشەوە خۆی نواند و چونکە دە ڕۆژەی عاشووراش بەڕێوە بوو، نەیانکردە هەرا و بەزم و ڕەزمێکی ئاوا کە پێویستی بەخێرهێنانە و هەر گەیشتەوە ڕێورەسمی لە خۆدان و تازیەداری دەستـــی پێکـــرد و هــەموو ملیان لێنا.

بــەپێی گێڕانــەوەی پیرەپیـــاوان، ئیمـــامقولـــیخـــان کـــوڕە گـــەورەی ڕەزاقولیخان، سالی ١١٨٦ی کۆچی/ ١٧٧٢ی زایینی لە تەمەنی چاردە سالـیدا! بۆتە حوکمداری ورمێ و بەگەربەگی ئەفشار و ماوەی دوازدە سالەی حوکمـانی زۆری هەلداوە و گەشەی بەرچاوی بە خۆیەوە دیتووە و ڕۆژ بــە ڕۆژ دەسـەلاتی پــەرەی ئەسـتاندووە. هێـز و بڕشـتی وا تێهەلـچووە کـە حاکمـانی ناوچـە و مەلبەندەکانی ئازەربایجان لە قافلانکۆوە هەتا ساین‌قەلا و لەوێوە تا لێـواری ڕووباری ئاراس سەریان وەبەر فەرمانی بکە و نەکەی هێناوە و باج و پیتاکیــان ناردۆتە خزمەتی. ژمارەی قۆشەنچییانی کە ئەو ڕۆژگارە سـوارە و جـەزایرچی بوون، لە تیرە و تۆرەمەکانی ئەفـشار و عێـل و عاشـیرەتی دیکـە و پیـاوانی سنوورپارێزان پێکهاتوون و گۆیا گەیشتوونە دوازدە هەتا چاردەهەزار کەس و لە جەنگەی شەڕدا چوونە خزمەت ڕکێفی. خۆی لە ڕۆژی شـەڕا زرێ و بەرگـەپۆلای تەبەقتەبەقی گەوچنی پۆشـیوە و کلاوخـوودی لەسـەر نـاوە و بەڕاسـتی بـۆ ئازایەتی و بوێری لە نێو هاوشانەکانی خۆیدا بە تاقانــە دادەنــدراوە و کـاری گەوردی کردوون.

گەورەپیاوانی خێڵی ئەفشار کە لە سەردەمی ئەودا ژیاون بریتین لە: میرزا جەعفەر و میرزا سولتانحوسێن ڕیشسپییەکانی تیرەی عەبدولمەلیکی کە ناسراون بە ئیمانلوو؛ میرزا کەبیر و میرزا زەهیر کوڕی خوابەخشیو میرزا نەسیر لە تیرەی ئۆستاجلوو کە سەرحیسابی داهاتی پیتاک بوون؛ میرزا محەممەدحەسەن و میرزا کەلبحوسێن کوڕانی میرزا محەممەدجەوادی زێڕینقەڵەم لە تۆرەمەی ئۆستاجلوو کە یەکیان سەرحیسێبی بەشی پیتاک و ئەوی دیکەیان بە سەر خەرجوبەرجی لەشکر ڕادەگەیشت و لە خزمەت ڕکێفیدا بوو؛ میرزا مستەفای باپیری فەزانئاغای سەرکردەی تۆپخانە لە ڕمچەلاکی سەعیدلوو؛ سەرمەستبەگ لە تۆخمەی ئەحمەدوەندی ئێشیکئاغاسی و عەسکەرئاغای کوڕی میرزا جەعفەری عەبدولمەلیکی کە جڵەودار و میرئاخوڕ بوو؛ میرزا ئەبولحەسەنی بەرپرسی بەشی دارایی؛ برایمخانی ئەرەشلووی ئەفشار سەرۆکی دیوان و سپاسالاری سەرجەم هێزەکان؛ محەممەدخانبەگی قاسملوو؛ ئەڵلایاربەگی ئەرەشلوو؛ لوتفوڵلابەگی ئۆستاجلوو؛ ڕۆستەمبەگی کوڕی ڕۆستەمخانی قاسملوو حاکمی پێشوو کە بە فیتی باقربەگ کوژرا؛ ئەمیرخانبەگی قاسملوو و ئاغاتەقیبەگی کەیخودا و دەمسپی تیرەی قەرەحەسەنلوو؛ ساقیبەگی بەرەی بۆربۆر؛ عەلیڕەزاخانی قاسملوو کە بە چاوەدێر داندرابوو؛ حوسێنقولیبەگی کوڕی محەممەدقولیخانی ڕیشچەرمگی ئەرەشلوو؛ ڕەحیمبەگی قاسملوو کوڕی نەقیخانی نابینا کە چۆنیەتی سەرهاتی ئەو لە ڕەوتی ڕووداوەکانی زەمانی ئازادخاندا خرایە بەرچاوان؛ ڕەحیمبەگ کە دواتر پاشناوی خانی درایە و کۆمەڵێکی دیکەی مەزن و ماقووڵ کە بوورەیان لە دەوری دابوو.

بەکورتی ئەو تازەلاوە بەختیارە ئەوەندەی بۆی کرابا هەموو ڕۆژێک زۆر بە تامەزرۆیی و ئیشتیاوە لە مەیدان خەریکی غار و ڕمبازی و تەقەڵەلێدان و تفەنگهاویشتن بوو، بەلام هەرگیز لە ڕابەڕاندنی کاروباری حکوومەت و

بە سەرکردنەوەی کۆمەڵ و دادەوانیدا کۆتایی نەدەکرد. ساڵی ١١٨٧ی کۆچی/١٧٧٣ـ١٧٧٤ی زایینی، بەپێی تەمەنی شەنگەلاوی و بار و هەوای حوکمرانی، لە بان کێوی «سیرداغی حەیدەرلوو» کە دیمەنگایەکی بەرز و سەیر و زەنوێرە، خێوەتی شەوکەتی هەڵدا و لەسەر چاوەی خانبلاغی دەستێک خانووبەرەی هەرەچاکی ساز کرد و باغێکی خۆش و دڵگری لێدا کە هەتا ئێستاش شوێنەوارێکی ماوە. شازادە مەلیکقاسممیرزا کوڕی فەتحعەلیشای قاجار کە لە داوێنی کچی ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ بەربێوە، ساڵی ١٢٥٨ی کۆچی/١٨٤٢ـ١٨٤٣ی زایینی، لە سەردەمی حوکماتی خۆیدا لە ورمێ ئەو باڵەخانە چۆڵوهۆڵەی کەلتە کردەوە و دەستێکی بە سەر و ڕوویدا هێنا. هەروەها ساڵی ١١٨٨ی کۆچی/١٧٧٤ـ١٧٧٥ی زایینی، بە فەرمانی ئیمامقولیخان بەرەوڕووی دەروازەی یوورتشا بە باڵی چەپەوە باغێکی دڵگر لێدرا و بە دڵگوشا ناوێر کرا.

بەکورتی دوای ئەم کارانە مەیلی زەماوەند و ژنهێنانی بزووت و کیژی خوابەخشبو ڕۆستەمخانی قاسملووی خواست و پێشتریش کچێکی خێڵی خەلەجی باراندێزی هێنابوو. نیزیکەی مانگێک بەزم و شادی گێڕا و کەولی شادمانی و نانوخوانی ڕازاندەوە. بەڵام ئێستا جەنگەی ئەوە هاتووە کە ئەسپی خۆشاژۆی قەڵەم بە مەبەستی نووسینەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژگاری حکوومەتی ئەو بەگلەربەگە لە دەر و ژوورەوە تاو بدرێ. لە سەرەتای ساڵی ١١٩٠ی کۆچی/١٧٧٦ـ١٧٧٧ی زایینیدا، باش تێپەڕینی جێژنی نەورۆزی پیرۆز، فسکەفسکی ئەم هەواڵە گەیشتە گوێی دوور و نیزیکی ئەم وڵاتە کە کەریمخانی وەکیل حکوومەتی ورمێی بەخشیوە بە جانگیرخانی کوڕە گەورەی خوالێخۆشبوو فەتحعەلیخان و دەیهەوێ لەگەڵ عەبدوڕڕەشیدخانی برای و کۆچ و بار و دەستوپێوەندەکانیان بیانێرێ بۆ ورمێ.

کاتێک ئەم خەبەر بە خزمەت ئیمامقولیخان ڕاگەیەندرا، میرزا جەعفەری ئیمانلووی بە کۆمەڵێک دیاری شایانەوە ناردە شیراز هەتا هەم حیسابی پیتاکی چەند ساڵە بدا و پاکی بکا و هەمیش بزانێ قسەکە تا کوێ ڕاستە. وەختایەک میرزا جەعفەر دوای بڕینی چەند قۆناغ و هەڵبواردنی هەودای ڕێگا پێی نایە شیرازی چەشنی بەهەشت و بە خزمەت وەکیلی ئێران گەیشت، سەرەتا ئەو پێشکەشییانەی بڕبوونی خستنییە بەرچاوی کەریمخان و پاشان کەوتە تاریفات و پێداهەڵدان و سپاس و پێزانین. کەریمخان لە بابەت چۆنیەتی بارودۆخی ورمێوە لێیپرسی. میرزا جەعفەریش پێداهات و لە نێوبەندی قسەکانیدا شێوەی هەڵسوکەوت و دادەوانی و دلۆڤانیی ئیمام قولیخانی بەگەربەگی ئەفشاری سەبارەت بە خێڵ و جەماوەر و دابینکردنی هێمنایەتی سنووران و ڕێکخستنی کاروباری گرینگی مەڵبەندەکەی بە زمانێکی تەڕ و پاراو ڕازاندەوە. وەکیل کە دەیهەویست جانگیرخانی کوڕی خوابەخشیو فەتحعەلیخان دابنێ بە حوکمداری ورمێ و بینێرێ، بە بیستنی ئەم وتانە ئۆخژنی بە ناخی موبارەکیدا گەڕا و لەو بیر و بۆچوونەی پەشیمان بۆوە و دووبارە خەڵات و شمشێری لەگەڵ فەرمانی حکوومەتی ورمێ و بەگەربەگایەتی ئەفشاری ناردەوە بۆ ئیمامقولیخان. کەریمخان فەرمووی کە میرزا جەعفەری وەکیل وێڕای ڕاسپێراوان و کارگێڕانی حکوومەت کە دەبێ فەرمان و خەڵاتەکە بەرن، هەرچی زووتر وەڕێ کەوێ، نەکا بڵاوبوونەوەی هەواڵی گۆڕانی حوکمدار ئاژاوە و بشێوی لێبکەوێتەوە و سنوورەکانی ئەو مەڵبەندە بگرێتەوە. بەکورتی میرزا جەعفەر ساڵی ۱۱۹۱ی کۆچی/۱۷۷۷ــ۱۷۷۸ی زایینی بە فەرمان و خەڵاتی حوکماتەوە، وێڕای چەند کارگێڕێک بەپرتاو بەرەو ورمێ ئەسپیان لینگ دا. لە جەنگەیەکدا گەیشتنەوە ورمێ کە قولیخانی بەگەربەگ سەرقاڵی دیدار و جێژنەپیرۆزەی نەورۆزی سولتانی بوو. دوای پێشوازی و بەخێرهێنانەوە، تەشریفی بەرەو باغی دلگوشا هەنگاوی نا و خوانی شادی و شادمانی ڕاخرا.

سەرۆک و سەرکردە و سەید و مەلا و قازی و پیاوماقووڵ و نەجیمزادە و توخم و تۆرەمەیان هەموو لەوێ بوون. لەو شوێنە قەلافەتی بە بەرگەخەلاتی حوکمڕانی ڕازاندەوە و فەرمانی بەسەرکرانەوەی لە مزگەوتی گەورەی ورمێ خوێندرایەوە. پاشان بەگلەربەگ تەشریفی بردە کۆشکەلی چوار بورجی ڕەزاقولی‌خانی. بۆ سبەینێ چەند کەس لە تیرەی ئەفشاری ئەرەشلوو کە بە لایەنگری لە کوڕانی فەتحعەلی‌خانی خوابەخشیو هێندێک قسەی پروپووچیان بلاو کردبۆوە، گیران و زۆر چاک سزادران. ئەوسا ئیمامقولی‌خان بەوپەڕی سەربەخۆیی کەوتە سەر باری حوکمڕانی و تێپەڕکردنی تەمەن بە شادی و کامەرانی.

# کۆچیدوایی کەریمخانی زەند و کوژرانی جانگیرخان و ڕەشیدخانی کوڕانی فەتحعەلیخانی ئەرەشلوو

پێشتر باسی کرا کە پاش ئەوەی کەریمخانی وەکیل لە شارۆچکەی قومشە فەتحعەلیخانی ئەفشاری بەرەو هەرێمی نەمان بەڕێکرد، لەسەر وەسێتی خانی ئەفشار بەڵێنی دابوو کە جانگیرخان و ڕەشیدخانی کوڕانی یەکیان بکاتە سەرداری ئازەربایجان و ئەوی دیکەیان دانێ بە حوکمڕانی ورمێ. بەڵام لەم رۆژگارەدا کە کەریمخان لە عیلمابادی شیراز توانیبووی کۆتایی بێنێ بە سازکردنی بازاڕ و مزگەوت و کاروانسەرا و گەرماوی شارەکە، لەبەر سەرهەڵدانەوە و تێهەڵچوونەوەی نەخۆشیی ئازارەباریکە کە ماوەیەکی زۆر پێوەی نالیبوو، حالی شێوا و ناسازی لە بیری بردەوە کە مەرد و مەردانە گفتی خۆی بەرێتە سەر و ویست و داخوازی فەتحعەلیخان وەدی بێنێ. هەر بۆیە رۆژێکی جانگیرخان و ڕەشیدخانی بانگهێشتن و داوای لێبووردن و کەرەنئازایی لێکردن و ئیزنی دان کە بە ماڵ و کۆچ و بارگە و بنە و دەستوپێوەندەکانیانەوە بڕۆنەوە ئازەربایجان. ئەوانیش زۆریان پێداهەڵگوت و دۆعای بەخێریان بۆ کرد و لە شیرازەوە چوونە ئیسفەهان. لەوێ بەستامخانی زەند کە سەردار و حاکمی عێراق بوو، چوونەوەی کوڕانی فەتحعەلیخانی بە چاک و بەرژەوەند نەزانی و بە تەگبیری ناحەزانی خانەدان و خانانی ئازەربایجان، هەردک برای بە کەمەندی فێڵ و تەڵەکە لە ئیسفەهان بەستنەوە. ئەوەندەی ڕاگرتن کە خەیاڵی حکوومەت و تاسەی خۆشەویستی نیشتمان لە یادی ئەو دوو لاوە ساکار و گێلۆکەیە پاک بۆوە. لاتولووتانی ئیسفەهان و بەرەڵاوحەرەڵای ماڵ بە کۆڵی ژێر پردانیش تێیانهاڵان و بوونە بەپوولەی دەوری ئەو دوو شەمە و لە بەستێنی

مەستی‌دا بە تەما و تاسەی سەرۆکایەتی عێراق هەڵـیانفڕیواندن و شـەو و ڕۆژ خەریکی خواردنەوەی شەرابی ئاڵ و گوێ شل کردن بـوون بـۆ هـەوای عـوود و گۆرانی. بەڵام ڕۆژایەک کە کەریم‌خانی وەکیل مەرگی بـێ‌بەرگێـڕەوە بـەربینگی پێگرت و دەستی پێ لە دنیا بەردا، زەکی‌خانی دایک‌برای کە ماوەی دوازدە سـاڵ بوو لەسەر ئاکاری ناڵەباری لەبەر چاوی وەکیل کەوتبوو و هیچ دەورێکـی لـە کاروباری فەرمانڕەوایەتی‌دا نەدەگێڕا، بە فێڵەبازی تەختی دەسەڵاتی گرتەوە و چەند سەرکردەیەکی سەرناسی زەنـدان و شێخاڵـی‌خـان و شـابازخانی وێکـڕا کوشتن. پاشان کە بیستی کوڕانی فەتح‌عەلی‌خان بە قسەی لاتەوپاتان لە خشتە چوون و خۆیان لە حکوومەت و دەسەڵاتی ئێراق خۆش کردووە، بەسـتام‌خـانی ناردنە سەری کە تازە کردبوویە سپاسالار. بەسـتام لـــە ترسـی سەرهەڵـدانی خەڵک و شێوانی ئیسفەهان، دەستی لە کـوڕانی فـەتح‌عـەلی‌خـان نـەبزاوت و هەلەکەی بە لەبار نەزانی و نێوانی لەگـەڵ خـۆش کـردن. کـەچی سـەرەنجام شەوێک هەردووکیانی وێڕای کەڵەپیاوانی ئەفشار بانگهێشتن کرد و لـە کـۆڕی بەزم و مەستی‌دا جانگیرخان و ڕەشیدخانی لەگەڵ هەژدە کەس لە پیاوماقووڵانی ئەفشاری ئەرەشلوو تێدابردن. دەڵێن بێجگە لـە شـەریف‌بـەگێکی ئەفـشار کـە مەردانە هەڵیکردۆتە سەر بەستام‌خان و زۆر چاک ئەنگاوتوویەتی و توانیویەتی خۆی دەرباز بکا، هیچکەسی دیکە قوتار نەبووە... بەکورتی بەستام‌خانی زامار دوای کوشتنی کوڕانی فەتح‌عەلی‌خان و یارانیان، دەستوبەجێ لە ئیسفەهانەوە بەرەو شیراز فڕی و کاتێک گەیشتێ کە جەعفەرخانی کوڕی سادق‌خـان بـرازای وەکیل لەگەڵ زەکی‌خانی دایک‌برای خۆی سەرقاڵی هەرا و کێشە بوو. زەکی‌خـان دامرکاندنەوەی کەڵەوکێشی جەعفەرخانی خستە ئەستۆی بەستام‌خانی خوێنڕێژ. هەر بۆیە لە دەوروبەری شیراز شەڕێکی قورسیان لە مابەینی‌دا قـەوما و پـاش تێکهەڵچوون و لێکدانێکی زۆر، سپای زەکی‌خان شـکا و بەسـتام‌خـانیش لـەو هەرایەدا برینێکی قووڵی هێنا و پێی‌مرد و بەرەو مەڵبەندی نـەبوون تێـڕاچوو.

زەکیخان بە بەزیوی و شکاوی پەنای بردە بەر گومبەزی ئیمامزادەی شیراز و جەعفەرخان لە بان تەختی خۆنەگری دەسەڵات لەنگەری گرت.

پێشتر باسی کرا کە شەریفبەگی ئەفشار توانی لە گەرداوی کوژرانی کورانی فەتحعەلیخان ڕزگاری بێ. دەڵێن بە جلی ژنانەوە لە نیسفەهان دەرکەوتووە و وەکوو بای شەماڵ فڕیوە و خۆی گەیاندۆتە ورمێ و چۆنیەتی ڕووداوەکە و نەمانی کەریمخانی زەندی بە ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ ڕاگەیاندووە.

## کوژرانی حاجی عەلی‌محەممەدی حاکمی مەراغە و یەکترگرتنەوەی لەگەڵ ڕووداوەکانی ورمێ

ڕوون و ئاشکرایە عێلی موقەددەمی مەراغە کە لـە ڕاسـتی‌دا بـە ڕەسـەن بێگدلی بوون، هەتا سەردەمی نادرشای ئەفشار جڵەوی حکوومەتی مەراغەیان بە دەستەوە بوو. دوای نادر حاجی «عەلی‌محەممەد»ناوێکی کوڕە ملکداری گوندێکی مەراغە کە بە دەوڵەمەند مەشهوور بووە و لە ڕێگـای کـشتوکاڵـەوە سـامانی خستۆتە سەر یەک، بۆتە حاکمی مەراغە و بە هێزی بـاهۆی دەسڕۆیـشتوویی، سەرپەنجەی سەرۆکانی خێڵی موقەددەمی شکاندۆتەوە و لەسەر کورسی دەسەڵات باڵی داوەتەوە. بەگشتی ئەوەندە سایەچەور بوو کە خوانی ڕازاوەی بۆ خـوار و ژووری کۆمەڵ ڕاخست و خەڵکی جاڕ دا کە بێن و تێرهاڵێن و پارووی لێ‌بـادەن. وای لێهات کە لە ماوەیەکی کەم‌دا ناوبانگی تـەواوی ئازەربایجـان و هـەرێم و مەڵبەندەکانی دیکەی گرتەوە و حکوومەتی مەراغـەی کـە بـە زێـڕ و زۆرەملـی کردبوویە ئی خۆی لە لایەن کاربەدەستانی ئەو ڕۆژگارەوە وەباڵی بۆ کێـشرا و باربووی کرا. بەڵام بادیەهەوایی و خۆ بەزل‌زانی حاجی ئەوەندەی پەرەسەند کـە سەری لە حاند فەرمانی بەگەربەگی تەورێز کە نەجەف‌قولی‌خانی دونبولی بوو بادا. گەلێک جار نەجەف‌قولی‌خان کەوتە دڵدانەوەی و بە کەمەنـدی تـەگبیران بەرەو تەورێزی ڕاکێشا بەڵکوو بتوانێ لـووتی بـشکێنێ، بـەڵام هەمیـشە بـە گەندەڵفێڵان خۆی پەراندەوە و غاری دایەوە مەراغە. دەسەڵاتی وای تەنیبۆوە کە جاروبارە دەسدرێژی دەکردە سەر ناوچەکانی تەورێز و ماڵ و سـامانی خەڵـکی دادەپاچی و تاڵانی دەکرد. هەتا وای لێهات کە ئیدی نەجەف‌قولی‌خان بـە چنـگ

کار و کرداری حاجییەوە ئەوەندە وەرەز بوو کە لەشکرێکی تەیاری بردە سەری. هەڵبەت ئاواش دەگێڕنەوە کە حاجی میرزا عەلی برای حاجی عەلیمحەممەد کە لەسەر سەرۆکایەتی لەگەڵی نەدەحاواوە، لە چەنگانی رایکرد و هاواری بردە لای نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی تەوریز و هارووژاندی کە بیتەزێنێ. هەر چۆنێک بووبێ، بەگلەربەگ لەشکری بردۆتە دێخورگان و لەوێ بنەی داکوتاوە و حاجی عەلیمحەممەدیش ئەگەرچی گیرۆدەی نەخۆشیی ئاوبەند و ناسازی بووە و نەیتوانیوە سوار بێ، غیرەتی بزووتووە و بە مەبەستی شەڕ و بەرەنگاری دەرکەوتووە و بەرامبەر قۆشەنی نەجەفقولیخان سینگی داکوتاوە و زۆربەی هێزەکانیشی لەگەڵ نەبوون و چوونە کۆکردنەوەی سووروسات. نەجەفقولیخان لەشکری دادەمەزرێنێ و حاجی عەلیمحەممەدیش بەناچار بەو برە لەشکرەیەوە شانی دەداتە تێکهەڵچوون، بەڵام هێندەی پێناچێ کە قۆشەنی دەشکێ و پیاوەکانی تەقورەویان تێدەکەوێ و هەڵدێن. حاجی عەلیمحەممەد لەبەروەی نەیتوانیوە ئەسپی تاو دا دەگیرێ و دەیبەنە لای نەجەفقولیخان. بەگلەربەگ پەلاماری قەڵای مەراغە دەدا و گەری تێدەهاڵێنێ، بەڵام لەبەر شوورەی سەخت و دەس نەدانی دانیشتووانی بە ناهومێدی بەرەو تەوریز دەبێتەوە. پاش برینی دانەرێیەک حاجی عەلیمحەممەدئاغا بانگ دەکا و زۆری بە سەر دەروا و لێیتوورە دەبێ و دەڵێ بیکووژن. مەیتەکەی دەبەنەوە مەراغە و ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١١٩٠ی کۆچی /١٧٧٦-١٧٧٧ی زایینی. ئەوسا ـ رماقووڵان و کوێخودایانی مەراغە کورە گەورەی حاجی خوابەخشیو لە جێی باوکی دادەنێن و ئەحمەدئاغاش ئەوەندەی لە توانای دابوو سەبارەت بە کاروباری دەسەڵات کۆتایی نەکرد و پاراستنی خێڵ و خەڵک و خاکی خستە سەرشانی و بەوپەڕی ئازایەتی و لێوەشاوەیی هەڵسووڕا. بەڵام کورەکانی حاجی میرزا عەلی مامی کە سمایلبەگ و زەینولعابیدین بوون دانیان بە دەسەڵاتی دانەهێنا و نارەزامەند مانەوە و هەمیشە لە هەلێک دەگەڕان کە تەخت و بەختی

ئاوژوو بکەنەوە. هەر بۆیە ڕۆژێکی کە ئەحمەدئاغا بە مەبەستی دەمکوتی تاقمێک سەربزێو لە شار دەرکەوتبوو، وەختایەک گەڕایەوە دەروازەکانی قەلایان بە ڕوویدا گالە دا و نەیانهێشت وەژوورکەوێتەوە و لەسەر لاساری خۆیان ڕاوەستان. ئەحمەدئاغا هەلات و پەنای بردەبەر ئەحمەدخانی دونبولی حوکمڕانی [کوردی] خۆیە. ئەحمەدخانیش لەبەر ئاشنایەتی کۆنی لەگەل باوکی زۆر بە گەرموگوڕی وەریگرت و پاشان نامەیەکی نووسی بۆ سەرکردەکانی سپای موقەددەم و کەیخوداکانی مەراغە و ڕاینەسپاردن کە سمایلئاغای ئامۆزای لێبخەن. کاتێک ئەحمەدئاغا بە کامڕەوایی گەڕایەوە مەراغە، خەلکی شارەکە بەدل پێیان‌خۆش نەبوو سمایلئاغا حوکمدار بێ، بە گەڕانەوەی ئەحمەدئاغا و هێنانی نامەی ئەحمەدخانی دونبولی کە برازای نەجەفقولی‌خانی بەگەربەگی تەورێز بوو، گەشانەوە و شوکرانەیان بژارد. ئەحمەدئاغا سەرلەنوێ بۆوە حاکمی مەراغە و خەلک سەریان وەبەرهێنا و ئەویش چۆن چاکە ئاوا کەوتە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلبەندی ژێر دەسەلاتی و هەژارانی لاواندەوە و سەربزێوانی تەمێ کرد و دز و ڕێگر و ئاژاوەگێرانی مەراغەی هەلبڕین و لە خاکی چارەڕەشی وەردان. وای لێهات کە ناوبانگی دەنگی دایەوە و بوو بە دۆستی ئامپاکانی خۆی و بەپێچەوانەی باوکی لەگەل ئەمیرانی ئازەربایجان کەوتە ئاشنایەتی و حاوانەوە و کەس دوژمنایەتی نەدەکرد. هەر وەختایەک خەنیمێک لە سەرۆک و سەرکردەیەکی ئازەربایجان قوت بووبایەوە، هەنگاوی دەنا بۆ یارمەتیدانی و ئەوەندەی بۆی کرا بەرامبەری ئەو نەیارە ڕادەوەستا. جا لەبەروەی هۆزی بلباسی دانیشتووی ناوچەی لاجانی ورمێ و سندووس هەمیشە شالاویان دەبردە سەر خاکی ورمێ و مەراغە و دەستیان نەدەپاراست لە تالان و کوشتار و هەرچی بۆیان کرابا، ئەحمەدئاغا باسکی هیممەتی بەرزی لێهەلمالی و خۆی خۆش کرد لە چزدان و سەرکوت و تەنانەت برینەوەی ئەو تۆرەمە یاغییەی ئاخرشەڕ. لەو کاتەدا سەرۆکی بلباسان کە بۆخۆیان پێی‌دەلێن

«مەزن» باپیرئاغای مەنگوڕ[1] بوو کە بە ئازا و دەسکەرەوە دەناسرا. ئەحمەدئاغا بە ناردنی چەند کاغەز و ڕاسپاردەیەک بناغەی دۆستایەتی گەرموگوڕی لەگەڵ باپیرئاغا دامەزراند و وردەوردە بە ماڵی دنیایە دانەخۆرەی کرد و ڕایکێشایە نێو داوی فێڵ و تەڵەکان. لە باپیرئاغای نووسی کە هەموو کەس دەزانێ دوژمنایەتی نێوان من و نەجەفقوڵیخانی بەگەربەگی تەوریز چەندەیە، چونکە ئەو حاجی عەلیمحەممەدی خوابەخشیوی باوکمی بە فێڵوفرت و غەدر کوشتووە و تۆڵەی خوێنی باوک دەکەوێتە سەر شانی کوڕ. بۆیە تکام وایە کە وێڕای پۆلەسوارێکی خێڵی خۆت بێیە یارمەتیم و هەقی دۆستایەتی و جیرانەتی بەجێبێنی و دەبێ بشزانی کە ماڵ و دەسکەوت و خەنیمەتێکی زۆری تەوریز و ناوچەکانی دەوروبەری بە تالان دەکەوێتە چنگ هێزەکان. باپیری مەنگوڕ بۆ تەماحی ماڵی دنیایە هەڵخەڵەتا و وێڕای هەزار گەنجی بڕ و ئازا و سوارانی شەڕدیدەی مەنگوڕ و مامەشی تەیار و چەکدار ڕووی کردە مەراغە. ئەحمەدئاغا هاتەدەر و پێشوازی لێکردن و بردنی بۆ نێو شار و هەر پێنج کەس و دە کەس لە ماڵێکی دانان و ئاغاکانی چاک بەسەر کردنەوە و هەرچی پێویستە بۆی ناردنە شوێنی حاوانەوەیان. بەڵام بەر لەوەی کە بێن لەگەڵ پیاوماقوولان و کەیخودایان و سەرکردەکانی سپای موقەددەم تەگبیری کوشتنی کردبوون. وا داندرابوو ئەو چەند کەسەی کە لە هەر ماڵێک میوان دەبن، دەبێ خانەخوێ لە کاتی دیاریکراودا بە بیستنی تەقەی تفەنگێ، لە خەودا بیانکووژێ و ڕایانبدا بەرەو هەرێمی نەمان. جا بۆیە بەپێی کات و ساتی خۆی لە نیومشەودا خانەخوێی هەموو ماڵان کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی خۆیان نەخەوتبوون، هەر بە بیستنی شریخەی تفەنگ بێسێودوو بە سەریان دادان و هەیدێیان لێکردن بەرەو نەمان و تەنانەت لەو هەزار کەسە یەکیان دەرنەچوو...!

---

[1] - لە دەقە فارسییەکەدا نووسراوە «مەزین» و «باپورئاقا».

کازیوەی بەیانی کاژەلاکی نەخس و بێفەڕی کوژراوەکانیان بە دوور و درێژی خستە بەردیدەی ئەحمەدئاغا و کەلاکی باپیری سەرۆکیان لە دەروازەی شار هەڵاوەسی و کردیانە پەند بۆ چاوترسێن کردنی خەڵک. بەریبەیانی هێشتا ئەم هەواڵە بلاو نەبۆوە کە پێی‌نایە ڕکێف و بە قۆشەنێکی پەرداخەوە هەلینگی دایە ناوچەی لاجان و سەربزێوانی خانەبگیر کرد و دەستی لێومشاندن و ماڵ و سامانی بە تاڵان بردن و بە خەنیمەتێکی زۆرەوە گەڕایەوە. پاش ئەم ڕووداوە سامناکەی کە بە سەر هۆزی بلباس هات، تێکڕای سەربزێوان لە ترسی ئەوەی نەکا ئەم بەلا ناگەهانە داوێنی ئەوانیش بگرێتەوە، هەموویان پشتیان وێکدا و سوێندیان خوارد کە بە تۆڵەی خوێنی باپیر و هاوڕێیانی هێرش بەرنە سەر مەڵبەندی مەراغە و قەرەبووی قەوماوەکە بکەنەوە. ئەحمەدئاغا بە بیستنی ئەم پیلانەی شەڕەنگێزان کەوتە دڵەخورتێ و بەناچار خۆی ساز کرد بۆ بەرەنگاری. وەختایەک هێشتا ئەوان لە شارۆچکەی سابلاغی موکری بوون خوتوخافڵ لە چۆمی جەغەتوو و تەتەهوو[1] پەڕییەوە و بە سەری دادان و نەیهێشت سەر بکەنەوە و پرش‌وبلاوی کردن. هەر بۆیە پیاوانی موقەددەم ئازاتر لە پێشوو هەڵیانکوتانە سەری و بوولەرزە کەوتە کۆڵەکەی خۆراگری و ورەی ئاژاوەگێڕان. سەرەنجام چارەی ئەم کۆسپەیان پێنەکرا و پەنایان بردە بەر حاکمی قەلاچوالان و نامەیەکیشیان نووسی بۆ عەلی‌مرادخانی زەند کە ئەو کاتی فەرمانڕەوای فارس و عێراق بوو. لەسەر تکا و داوای ئەوان عەلی‌مرادخان فەرمانێکی نووسی بۆ مەحموودپاشای قەلاچوالان کە یاریدەی کوردان بدا و ماڵ و دارایی تالانکراوی سەرۆکانی بلباس لە ئەحمەدئاغای حاکمی مەراغە بستێنێتەوە و بیانداتەوە و حاکمی مەراغە لابەرێ و بوداقخانی سابلاغی موکری لە جێی دابنێ. کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتەوە گوێی ئەحمەدئاغا بە کاغەز و

---

1 - بە «جۆغاتوو» و «تاتائوو» نووسراون.

ڕاسپاردان داوای یارمەتی کرد لە ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ورمێ و ئەحمەدخانی دونبولی حاکمی خۆی. بە هاوکاری هێزەکانی ئەفشار و دونبولی توانی مەحموودپاشا بشکێنێ و لەو شەڕەدا حوکمداری قەڵاچوالان بە گوللەی گەرمەوە گیانی دا. هێندێک دەڵێن ئەم ڕووداوە دەچێتەوە ساڵی ١١٩٨ی کۆچی/١٧٨٣ـ١٧٨٤ی زایینی. بەگوێرەی گێڕانەوەی «گولشەنوتتەواریخ» پاش ئەم هەرایە ئەحمەدئاغا چۆتە ورمێ و نازناوی خانی لە دەست ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار وەرگرتووە کە لە ڕاستیدا تەوەری سەرەکی ئازەربایجان بووە و بۆتە ئەحمەدخانی موقەددەم.

## بوولەرزەی بەناوبانگی تەورێز و هاوار بردنی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ بۆ ئیمامقولیخانی حاکمی ورمێ بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی خێلاتی شاسەیوان و شوقاقی

سالی ١١٩٤ی کۆچی/١٧٨٠ی زایینی، لە سەردەمی حوکمانی نەجەفقوولیخانی دونبولی بەگلەربەگی تەورێز و لە شەوی شەممەی سەرەتای مانگی محەررەمدا، کاتەژمێر و نیوێک دوای تاوپەڕین، لەو کاتەدا کە هەتاو بیست و حەوت ڕۆژێ لە مانگی بەفرانبار هەلبواردبوو، لەبەر تۆف و بەند و تەوژمی سۆزەی سەرمای زستان، هەموو دانیشتووانی ئەو شارە لە کەلێن و قوژبنان خزیبوون و هیچ هەستیان بە بەلای ئاسمانی نەدەکرد. بەلام لەپڕ هەورێکی ڕەش بالی بە سەر ولات کێشا و بایەکی سوور هەلیکردێ و بوو بە قیامەتێک وەرە سەیرێ. لەم کاتەدا زەوی ڕاتلەکا و بوولەرزەیەکی وا بەسام قەوما کە هیچکەس نەیتوانی لە شوێنی خۆی چورتە بکا و زۆربەی دانیشتووانی ئەو خاکە بوونە ڕێبواری ڕێگای نەمان، مەگین بەمەلکەوت ئەوانەی کە هێشتا مەرگیان لە چارەی نەنووسرابوو. کامە قەلا و بالەخانە و خانووبەرە زۆر باش بوون و بۆ قایمی و پتەوی چەشنی سەددی ئەسکەندەر خۆیان دەنواند و بە بوومەلەرزەی ڕۆژگارانی پێشوو نەڕووخابوون، ئێستا تێکچمین. جێگایەکی وەکوو مزگەوتی گەورەی تەورێز کە شاتۆماسبی یەکەمی بەهەشتەلان لە خوێندنگای تالبییە سازی کردبوو، داری لەسەر بەردی نەما. هەروابێتەوە مزگەوتی عەلیشای وەزیر کە بە تاقی عەلیشا دەناسرا و بۆ بەرزی شانی لە شانی تاقی کیسرا دەدا، تەنیا دیواری میحرابی بە پاوە مابوو. هەروەها مزگەوتی حەزرەتی ساحێب و مزگەوتی حەسەنپاشا و مزگەوتی کەبوودی

جیهانشای تورکمان و گومبەزی شەنبیغازان و هەرچی کەرماو و خوێندنگا و سەهۆڵخانە و کاروانسەرای کۆن و لەمێژنە بوون شتێکی وایان بە بەرمو نەما و تێکڕووخان. لە نێو خەڵکدا وا باوە و دەڵێن کە نیزیکەی هەشتاهەزار کەسی نێر و مێ لە ژێر هەرەساندا مردوون. هەر لەم هەژانەدا فەزلعەلیبەگ و چەند حەولادێکی نەجەفقولیخانی بەگەربەگیش لە ژێر دار و پەردووی بە سەریەکا تەپیو تێداچوون. خودی بەگەربەگیش هەتا نێوقەدی تێدەمێنێ و تووشی ژان و ئەقوستانی دەبێ و هەردک پێی لە جوولە دەکەون.

ئەم ڕۆژگارەی کە ئیمامقولیخان لە مەڵبەندی ورمێ ئالای دەسەلاتی هەڵدابوو، چەندین کەس لە سەرۆکانی ئازەربایجانی خۆیان بە حوکمدار و فەرمانڕەوا دەزانی و هەر یەکەی لە لایەکەوە وەکوو ڕێوشوێنی خانخانی دەهۆڵی دەسەلاتیان دەکوتا و هیچکەسیان بێجگە لە خۆیان وەبەرچاو نەدەهات. بۆ نموونە نەزەرعەلیخانی شاسەیوانی ئەردەوێل کە بە خزمایەتی برایمخەلیلخانی جەوانشێری حوکمرانی قەرەباغ دەخوری، سالێک پێشتر پەلاماری دابوویە ڕەشت و گیلان و دەستی لە کوشتار و تالان نەگێڕابۆوە و خەڵخاڵ و تارومیشی لەم بەلا و نەهامەتییە بێبەش نەکردبوو و پاشان گەڕابۆوە ئەردەوێل. هێشتا ماوەیەکی وا تێنەپەڕیبوو بە سەر بوولەرزەی تەورێزدا و شوورە و حەساری نەجەفقولیخان تەواو نەببوو کە نەزەرعەلیخان بە تەمای گرتنی تەورێز ئالای گومڕایی هەڵدا و بەرەو ئەو بالە بزووت. لە کەوشەنی سەراب و گەرمڕوود، عەلیسولتانی شوقاقی کە پارێزەری ئەو مەڵبەند و ناوچەیە بوو، ئەگەرچی هەمیشە سینگی ڕمپێش دەدا و دەیگوت لەگەڵ نەجەفقولیخان ڕۆستەم و شان لە شانی ناکەمەوە، هەر کە سپای نەزەرعەلیخان گەیشتێ بێسێودوو دایە پاڵی و هێندەی فوو لە دۆ نەکرد. هەر بۆیە چەندی و چۆنی لۆشەن و شان و شەوکەتی ناوبراو پەری هەڵدا و پێکەوە بەرەو تەورێز وەڕێکەوتن. بەگەربەگ و چەند کەسێکی هاوڕێ و

دەستوپێوەندی لە مێرگ و لەوەرگەی دەرەوەی قەڵا بوون کە هەواڵی هێرشی ئەوان گەیشتێ و چونکە خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا چوونەوە ژوور و سەریان بردەوە بەر پەساری دیواری شار. بۆ سبەینێ نەجەفقولی‌خان وێڕای دەستەیەک دەرکەوت و شانی شل کرد بۆ شەڕ و بەرەنگاری، بەڵام هیچی بۆ نەکرا و گەڕاوە. لە مەودای شەودا نەجەفقولی‌خان بە سەبرایەکی بەرەو خۆی باریکەی دایە و نەزەرعەلی‌خان پێی‌نایە تەورێز و دەستی لە هیچ چەشنە زوڵم و چەوساندنەوەیەک نەپاراست.

بەڵام وەختایەک نەجەفقولی‌خان گەیشتە خۆی، ئەحمەدخان و سەلمان‌خان و محەممەدبەگ کە هەرسێکیان برازای بوون چوونە خزمەتی و سەبارەت بە باروبۆخی مامیان پەژارە و دڵتەنگی خۆیان دەربڕی. پاشان چەکدارێکی زۆری عاشیرەتی دونبولی و کوردەکانی ئەو کەوشەنە کۆبوونەوە و تەمایان گرت بەرەورووی نەزەرعەلی‌خان ڕاوەستن، بەڵام دەیانزانی کە بێ پشتیوانی ئیمامقولی‌خانی بەگلەربەگی ئەفشار هیچیان بۆ ناکرێ و گرێوگۆڵی هەودای ئەم کارەیان بۆ ناکرێتەوە. چونکە دەسەڵاتی ئەو میرە ناودارە هەر لە ساین‌قەڵاوە هەتا خاکی سەڵماس و خۆی پەڕی هەڵدابوو. هەروەها گەلێک تایفەی ئەفشار و سەرۆک‌عێل و خێڵاتی سەرسنووران وەک خیز و خۆڵ لە ژێر ئاڵای شەکاوەی‌دا بوون. هەر بۆیە بە ناردنی کاغەز و ڕاسپاردان دەرگای دۆستایەتی و یەکێتییان خستە سەرپشت و ئەویشیان لەگەڵ خۆیان کردە هاوبیر و هاوهەنگاو، بەم مەرجە کە ئیمامقولی‌خانی بەگلەربەگ بە سەرداری خۆیان بزانن و لە قسەی دەرنەچن. ئەنجا بەگلەربەگی ئەفشار بە هێزی تەیار و شەوکەتەوە پشتی لە ورمێ کردەوە و لە خۆی گەیشتە لایان. نەجەفقولی‌خان و خانانی دونبولی بە هاتنی ئیمامقولی‌خان گەشانەوە و شادی لە دەروونیان گەڕا و شان‌بەشانی بزووتن و چەند ڕۆژێک لە زەوی‌وزاری تەسووج وەکوو پۆلی ئەستێران تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا و پاش ئەوەی بەجێماوی لەشکر هەمووی

گەیشتنەجێ، بەرەو سەراب(سەراو) ئەسپیان تاودا. عەلیسولتانی شوقاقی کە دەیزانی خۆی بۆ ناگیرێ و ناتوانێ بەرەنگاری هێزەکانی دونبولی و ئەفشار ببێتەوە، بەهەشتاو خێل و خێزانی هەلگرت و بەرەو تاروم و خەلخال ڕەوی. ئەوسا خەلکی سەراب و گەرمڕوود پێمل بوون و پاڕانەیان دا و نەکەوتنە بەر گوڕمی تالان و کوشتاری لەشکری.

نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی تەوریز کە ئامانجی سەرەکی لێدان و دەمکوتی نەزەرعەلیخانی شاسەیوان و عەلیسولتانی شوقاقی بوو، ویستی بە شوێن عەلیسولتاندا بڕوا و هەتا تاروم و خەلخال لغاو بە دمم یەکسمیدا نەداتەوە. بەلام ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار کە بە سەرکردە دانرابوو، پەیکەردەی بە بەرژەوەند نەزانی و تێکڕا گەڕانەوە تەوریز و دوای هەشت ڕۆژ مانەوە لەو شارە بەرەو خۆی و ورمێ جلەویان شل کرد.

## شەڕی ئیمامقولیخان لەگەڵ قەرەنیئاغا

پاش ئەوەی کە قەرەنیئاغای مامەشی[1] مەزنی هۆزی بلباسان لە تەوریز ئیزنی لە ئیمامقولیخانی سەردار خواست، هەستا و بە ڕێگای مەراغەدا بەرەو لاجان گەڕایەوە. لە مەودای ڕێیەدا بە خزمەت سەرداریان ڕاگەیاند کە قەرەنی لە ناوچەی سندووس تووشی چەند کاروان و ڕێبوارێک بووە و دەستی لە کوشتوبڕ و رووتکردنیان نەپاراستووە. سەردار بە بیستنی ئەم هەواڵە ڕقی هەستا و هەر لەڕێوە حوکمێکی نووسی بۆ سەرمەستبەگی ئەفشاری شێری مەستی مێشەی بەرەنگاری کە ماڵی تالانیی لە قەرەنیئاغا بستێنێتەوە و بیداتەوە بە خاوەنەکانیان و ئەگەر کار گەیشتە شەڕ و لێکدان نەکشێتەوە و بە گژیدا بچێ. بەپێی حوکمی حاکم سەرمەستبەگ کەوتە شوێنی و سەرداریش سەری جلەوی وەرسووڕاند و بە دوایاندا بەرەو لاجان هێزی دەنگ دا. چونکە دەیزانی کە سەرمەستبەگ ناتوانێ مەردی مەیدانی قەرەنیئاغا بێ و ڕەنگە ئەوەندەی دیکە گڕی ئاگری هەراکە خۆشتر بێ. بەکورتی وەختایەک سەرمەست گەیشتە قەرەنیئاغا و حوکمی سەرداری پێڕاگەیاند، قەرەنیئاغا گوێی بۆ شل نەکرد و کەوتە دەرهەڵبوون و کار گەیشتە شەڕ و لێکدان و لە هەردک بەران سپا سەفیان بەست و پێکیان دادا. دوای زرەوکوت و تێکهەڵچوونێکی زۆر سەرمەستبەگ خۆی بۆ ڕانەگیرا و سەری جلەوی وەرسووڕاند و هەڵات و قەرەنیئاغا کەوتە سەری و نێزەیەکی هاویشتییە و بەرەوپشت هەڵیداشت و بەمەش لێینەبۆوە و سەری سەرمەستبەگی لە قەلای قەلافەتی کردەوە و

---

[1] - ڕەنگە ئەم قەرەنیئاغایە باوکی محەممەدئاغای مامەش و باپیری قەرەنیئاغای هاوچەرخ بێ.

هەڵیکوتایە سەر قۆشەنچییانی و ئەوانیش بە دیتنی ئەم دیمەنە رایانکرد. بەڵام لەناکاو بەیداخی بەرایی سپای ئەفشار کە لە ژێرکێفی ئیمامقولیخانی سەرداردا کۆچاوکۆچ دەهات خۆی نواند. کاتێک سەردار بە پرکێشی بڵباس و کوژرانی سەرمەستبەگی زانی، بەجارێک پەلاماری دان و خودی خۆی کەوتە شەڕ و بەرەنگاری و هەرکە لا جەماوەرێکی زۆریان لێئەنگوا و لێکوژرا.

قەرەنیئاغا وەختایەک دیمەنی رووداوەکەی بەپێچەوانەی بانگەشەی خۆی وەبەرچاوی هات، وازی لە شەڕ هێنا و ئەسپی بەرەو پەنا و پەسارێک غار دا و هێزەکەی پشتیان لێکبەردا و لەو شەڕەدا خەزاکەرانی ئەفشار دەسکەوت و خەنیمەتێکی زۆریان وەچنگ کەوت. پاشان سەرداری ناودار سەربەرز و سەرکەوتە گەڕایەوە ناوەندی دەسەڵاتی کە ورمێ بێ و فەرمووی کە تەرمی سەرمەست لە گۆڕستانی «خان» بنێژن و ناشتیان و چاکەی زۆری لەگەڵ پاشەوارەکانی کرد. هەر لەم ساڵەدا ئاخوند مەلا محەممەدباقری ئەفشاری قاسملوو کە بە یەکێک لە گەورەمەلاکان دەناسرا و بە پیاوچاک و خۆپارێز و زیرەک و زانا بەناوبانگ بوو، چوو بە پیر بانگەوازی یەزدانەوە و لە گۆڕخانەی «قەرەسندووق» نێژرا و بە فەرمانی بەگلەربەگ گومبەزێکیان لەسەر ساز کرد. کورانی خودالێخۆشبوو یەکیان حاجی مەلا محەممەدە و ئەوی دیکەیان ئاخوند مەلا عەلیعارفە کە موغبەرەی بە پوولی عەسکەرخانی سەرتیپ کوڕی لوتفعەلیخانی سەرتیپی ئەفشاری قاسملوو بۆ ساز کراوە و کەوتۆتە نیزیک ...ڕ و شانبەشانی دیوەخانی خانی خوابەخشیوە و بریتییە لە مزگەوت و چەند حوجرەیەک. پاش کۆچیدوایی ئاخوند مەلا محەممەدباقری ئیمامجومعەی ورمێ، رێزدار مەلا محەممەدحوسێنی ئەفشار کە بە بنەماڵە قازی و ئیمامجومعە بوون جێیگرتەوە. میرزا محەممەدجەعفەری سەرۆکی دیوانی پیتاک و دارایی ورمێش هەر لەم ساڵەدا ماڵاوایی لە دنیای رووخەک و نەمێن کرد و لە گۆڕستانی خان و لای سەرووی خوابەخشیو رەزاقولیخانی بەگلەربەگ نێژرا. ناوبراو پێنج

کوڕی هەبوو: ١- میرزا ئەبولحەسەن کە پاش باوکی جێی ئەوی گرتەوە. ٢- میرزا محەممەدشەفیع کە ماوەیەک لە ڕکێفی زەکیخانی زەندا بوو. ٣- عەسکەرخان کە سەرەتا میرئاخوری ئیمامقولیخانی سەردار بوو، پاشان لە دەسپێکی دەسەلاتی قاجاراندا چاکی گەشە کرد و دواتر باسی بەسەرهاتی دەکرێ. ٤- عەبدوسسەمەدخان کە ماوەیەک سەرکردەی سوارەی سکۆرتی بوو. ٥- میرزا حوسێنی مستەوفی.

لێرەدا پێویستە ڕوونی بکەمەوە کە ئەو ڕووداوانەی باسیان کرا هەموویان سالێک دوای بوولەرزەی تەورێز قەوماون.

## شەڕی زەکیخانی زەند لەگەڵ ئەمانوڵلاخانی والی سنە و هانابردنی ناوبراو بۆ ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ

پاش ئەوەی کەریمخان بارگە و بنەی گواستەوە بۆ دنیای هەرمان و نۆرەی دەسەلاتی پێنجودوو ڕۆژەی عێراق و فارس کەوتە دەس عەلیمرادخانی برازای وەکیل، زەکیخان کە هەتا ئەو دەم لە ترسی جەعفەرخانی کوری سادقخانی زەند لە ئیمامزادەی شیراز پەنای گرتبوو، دەریکێشا و کردی بە سەرداری هێزەکانی و ناردی بۆ زگ ئەمانوڵلاخانی والی کوردستان کە ئالای دژایەتی و بەربەرەکانی هەڵدابوو. کاتێک ئەمانوڵلاخان ئەم باسوخواسەی بیستەوە، زانی کە دەرەقەتی قۆشەنی زەندان نایا و لەسەر پێوشوێنی دۆستایەتی پێشووی لەگەڵ ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار بە هەلاتن ڕووی کردە ورمێ. بەگلەربەگی ئەفشاریش چاکی بە خێرهێنا و هەرچی شیاوی شانی والی بوو کردی و بەڵێنی پێدا کە ببێتە پشتیوانی و یاریدەی بدا. لەو لاوە کاتێک زەکیخان بە هێزێکی زۆرەوە گەیشتە دەوری سنە و زانی والی هەلاتووە، شوورەی شاری ئابلۆقە دا و تەنگەی پێهەلچنی. ئەوسا میرزا محەممەدشەفیعی وەزیری خۆی کە کوری میرزا جەعفەری وەکیلی ئەفشاری ورمێ بوو وەکوو ڕاسپاردە ناردی بۆ لای ئیمامقولیخان و پەیامی بۆ نارد کە من بە حوکمی عەلیمرادخان کە ئەمڕۆ سەرمانڕەوای عێراق و فارسە هاتووم بۆ لێدان و گوێبادانی والی کوردستان. جا ئێستا کە حاکمی کوردستان لە ترسی هێرش و زەبروزەنگی لەشکری بالادەست رایکردووە و پەنای هێناوەتە بەر سێبەری ئەو سەردارە ڕەسەنزادەیە، دەبێ کە بە دەسبەسراوی بیدەیە جنگ میرزا محەممەدشەفیع و خۆت لە دژایەتی و دوژمنایەتی سوڵتانی سەردەم بپارێزی.

بەکورتی پاش ئەوەی میرزا محەممەدشەفیع پێی‌نایە ورمێ سەرەتا چووە دەس ماچ‌کردنی بەگلەربەگی ئەفشار و دوایە کەوتە تازیەداری بۆ باوکی چونکە نەیتوانیبوو بگاتەوە پرسەی. پاش سەرەخۆشی و تازیەتباری و دیداری خزمان و براکانی، لە دووبەدوویی‌دا کاکلی ڕاسپاردەکەی زەکی‌خانی زەندی بە خزمەت ئیمامقولی‌خان ڕاگەیاند. بە بیستنی هەڕەشەوگوڕەشەی زەکی‌خان، سەرداری ئەفشار غیرەتی بڵێسەی دا و لەڕێوە فەرمانی دا بە کۆمەڵی پاڵەوانانی ئەفشار و جەماوەری سنوورەکانی ورمێ کە ئامادە بن. سەرەتا برایم‌خانی دیوان‌بەگی سەرکردەی سوارانی ئەفشاری وێڕای چوارهەزار کەسێک لەگەڵ ئەمانوڵلاخانی والی ناردن بۆ سنە هەتا ئەوەندەی بۆیان دەکرێ ئەم لافاوی بەڵایە لە دەوروبەری کوردستان دوور بخەنەوە. لەبەر دەمماری خێڵاتی میرزا محەممەدشەفیعی خەڵات کرد و بێ‌ئەوەی مرادی وەدی هاتبێ ناردییەوە. ناوبراو بەپەلە و بەر لەوەی لەشکر بگاتێ خۆی گەیاندەوە لای زەکی‌خان و چۆنیەتی جواب و هەڵوێست و دیدارەکەی بۆ گێڕایەوە. زەکی‌خانی غللوور میرزا محەممەدشەفیعی بە درۆزن و تاوانبار دانا و لە بەندی توند کرد و بەوپەڕی تواناوە کەوتە هەڵسووڕان بۆ قەڵاگرتن. کاتێک برایم‌خانی ئەفشار شان‌بەشانی والی و ئەو هەموو هێز و چەکدارەی ئەفشار و کوردان گەیشتنە دوور و نیزیکی سنە و دەنگ و ئاوازەی لەشکرێکی ئاوا کە هەر لە کۆمەڵی پێشەنگانی‌را دیار بوو سەرکەوتنی بە دەستەوە دێ، زەکی‌خانی تۆقاند. خانی زەند کە بە مەبەستی گرتنی قەڵای سنە داوی کەمەندی تەگبیری نابۆوە و قەڵانشینانی وەتەنگ هێنابوو، زانی هیچی بۆ ناکرێ و نەیوێرا بکەوێتە شەڕ و بەرەنگاری و بەناچار هەستا و قۆشەنی کۆکردەوە و یەکرێکێ لە خاکی ئێراق تێپەڕی.

دەڵێن لە مەودای ڕێگادا فەرمانی دا کە میرزا محەممەدشەفیعی ئەفشاری ئیمانلووی وەزیری بخنکێنن کە وەکوو ڕاسپاردە ناربوویە لای ئیمامقولی‌خان و

دوای گەڕانەوەی لێی دڕدۆنگ ببوو. خانی زەند ئەم کارەی پێوەنەهات! چونکە ئەویش پاش چوونە شیراز بە چەنگ عەلیمرادخان کوژرا.

دوای ڕاکردنی زەکیخان، برایمخانی سەرکردەی سوارانی ئەفشار، لەسەر پێوشوێنی جاران ئەمانوڵلاخانی بردەوە سەر تەختی دەسەڵات و بە دەسکەوت و دیاری و خەڵاتێکی بێژمارەوە گەڕایەوە هەوێل ئیمامقولیخان و بە دوور و درێژی چۆنیەتی ڕووداوەکانی بە خزمەت ڕاگەیاند.

## هێرشی خێڵی جەوانشێری قەرەباغ بۆ سەر خۆی و سەڵماس و هاوار بردنی ئەحمەدخانی دونبولی حاکمی خۆی بۆ ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ

پێشتر باسی کرا کە ساڵی ١١٩٥ی کۆچی/١٧٨٠ـــ١٧٨١ی زایینی، نەزەرعەلیخانی ئێلخانی شاسەیوانی ئەردەوێڵ وێڕای عەلیخانی شوقاقی و دەستەی جەوانشێر بە ئامانجی گرتنی تەورێز هرووژمیان برد و دوای ڕەوینی نەجەفقولیخانی دونبولی توانیان دەست بە سەر مەڵبەندی تەورێزدا بگرن. وەختایەک ئیمامقولیخانی ئەفشار بە مەبەستی یارمەتیدانی نەجەفقولیخان لە ورمێڕا لەشکری بردنە سەر، ئەوان خۆیان بۆ ڕانەگیرا و ڕایانکرد. لەم جەنگەدا کە دوو ساڵ بە سەر بوولەرزەی تەورێزدا تێدەپەڕی، برایمخەلیلخانی جەوانشێر بە هەڵفریوان و دنەی مەلا پەنای ئەستێرەگەری قەرەباغی کە ڕەمڵ و تالحەی بۆ دەگرتەوە، خۆی دانابوو کە حکوومەتی ئازەربایجان وەچنگ بێنێ. بۆیە بەم خەیاڵە خاوە سەری دەخولاوە و هێزێکی زۆری قەرەباغ و شێروانی کۆکردبۆوە و سوورەداڵی تاسە و ئاواتی بە تەمای گرتنی مەڵبەندەکانی ئازەربایجان و سەر پێچەماندنی سەرۆکانی بەناوبانگ، بۆ وێنە ئیمامقولیخان باڵی گرت. سەرەتا کۆمەڵێکی بە سەرکردایەتی عەبدوسسەمەدبەگ و میرزا عەلیبەگ ڕائەسپاردن کە بڕۆن و خۆی و سەڵماس بگرن. قۆشەنی بە ژاوەژاوی ئەوان لووزەوی بەست و لە باڵی نەخجەوانەوە شالاویان بردە سەر «ئاسکەقەلا»ی سەر بە خۆیە و کردیانە هەرا و تراتێن. قەلانشینانی ئەو شوێنە کە دەستیان بۆ نەدەکراوە و دەروەستیان نەدەهاتن، بەناچار چوونە بەر پەساری شوورەی قەلا و کەوتنە خۆپاراستن. ئەحمەدخانی دونبولی هەرچی ویستی بە فێڵوفرت و قسەی نەرمونیان ئەم سێڵاوی بەڵایە لە

خاکی خۆی دوور بکاتــە، هیچــی بــۆ نــەکرا و ســەرەنجام پــەنای بــردە بــەر ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار و داوای یارمەتی لێکرد. ئیمــامقولــیخــان پرکێشی و شالاوی تۆرەمەی جەوانــشێری پــێقبــوول نــەکرا و فــەرمانی دا بــە هێزەکانی و لە ماوەیەکی کورتا تێــر و تــەیاری کــردن و هــەر دەســتەیەی بــە سەرکردەیەکی لێوەشاوەی ئەسپاردن. بەرەبابی عەبدولمەلیکی عەسکەرئاغای میرئاخور و عەلیڕەزاسولتانی قاسملووی لەسەر دانان. خانئەمیربەگی خەلەج لەگەڵ تۆرەمەی خۆی کە لە باراندێز بوون کەوتــەخــۆ. حوسێنعــەلیخــانی ئەرمشلوو، محەممەدخانبەگی قاسملوو، حوسێنقولیبەگی ڕیشســپی تــیرەی ئەرمشلوو، تاهیرسولتانی سەرۆکی گۆندوزلوو و چەند کەسێکی تــر کــە بــاس کردنیان دەبێتە درێژدادڕی، قۆشەنیان ساز و ئامادە کرد. هۆز و عەشیرەتەکانی سنووران بۆ نموونە شێخالیخانی موکری حاکمی سابلاغ، قەرەنیئاغای مەزنی بلباسان، میرزائاغای سەرخێلی شکاکان و جافرەسولتانی[1] زەرزای حاکمی شنۆ، هەرکام بە لەشکری خۆیانەوە پێیان لە ڕکێفان توند کرد. ئەوسا ئیمامقولیخانی بەگلەربەگ بەر لە جوولان و بزووتن، سپای برایمخــانی ســەرۆکدیــوانی بــە قۆرخانە و تۆپخانەوە وەکوو پێشەنگ گاڵ دا بۆ لای شاری خۆی. خۆشــی بــەم هەموو هێزەوە لە شارەوە کەوتە شوێنیان و ڕۆژێک بە مەبەستی لە ساندان لە مێرگ و چیمەنی عەلیبەگلووی وەققاسلوو ئیستێکی کرد. بۆ ســبەینێ لــەوێوە هەواری گواستەوە و کۆچاوکۆچ هەتا مێرگی باغی «خۆی» ڕۆیی.

ئەحمەدخانی دونبولی حاکمی خۆی بەر لە چوونی ئیمامقولیخــان چــی پێویستە بۆ جێژن و شــادمانی و پێــشوازی هــەمووی کۆکردبــۆوە و دوو ڕۆژی میوانداری کــردن. پاشــان ســەرداری نــاوبراو وێــرای قۆشــەنی زۆر و زەوەنــد وەڕێبوون و وەختایــەک گەیــشتنە دەوروبــەری ئاسکەقەڵا کــە مــەلا پــەنا و

1 - جەعفەرسولتان.

عەبدوسسەمەدئاغا و میرزا عەلیبەگی جەوانشێر بە لەشکرەوە مەچەکەیان ئەنگاوتبوو لە بەژنی و تەنگەیان بە قەلانشینان هەڵچنیبوو. هەر کە گەیشتنێ لەرێوە پەلاماری لەشکری بەرەورووویان دا و خێرایەکی ئاگری شەڕ هەڵگیرسا و گرفەی کرد و دەنگی تەپڵ و زوڕنا بەرەو حەویقی ئاسمان بازرەقەی بەست. لەبەروەی تەشریفی موبارەکی ئیمامقولیخان راستەوخۆ بەشداری شەڕ و لێکدان بوو، سەرۆکانی ئەفشار و عێلاتی ناودار بە پشتیوانی وی بەراستی ئازایەتی و مەردایەتییان دەنواند. سەرەنجام ئەستێرەی بەختی جەوانشێر کەوتە راخوشین و سەرۆک و سەردارانی ئەو خێڵە و پیاوانی سەرناس گیران و ئەوانی تر روویان وەرگێڕا و هەڵاتن و بەرێی چارەرەشیدا رۆیشتن. پالەوانانی ئەفشار و دونبولی کەوتنە دوویان و بە دەستێ پڕ خەنیمەتەوە گەڕانەوە. ئیمامقولیخان، مەلا پەنا و عەبدوسسەمەدئاغا و میرزا عەلیبەگ کە بە دیل گیرابوون، ئەسپاردەی ئەحمەدخانی دونبولی حاکمی خۆی کردن کە چاوی بە سەریانەوە بێ. پاشان دوای رێکوپێک کردنی کاروباری ئەو ناوچەیە و دانان و برینەوەی دیارییەکی کە دەبێ بدرێ، ئیمامقولیخان وێرای ئەحمەدخانی [کورد] لە ئاسکەقەلاوە لەشکریان دەنگ دا و ئالای سەرکەوتنیان بەرەو تەورێز هەڵدا. پاش ئەوەی رکێفی بەشان و شەوکەتی لە چیمەنی قەرەتەپەی تەسووج بنەی دانا، نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی تەورێز هەڵومەرجەکەی وەبەرچاو گرت و هات و پێشکەشی باش و گرانبایی هێنان و گوتی کە بە دیداری ئیمامقولیخان گەشاوەتەوە و کەیفی سازە. هەروەها وەئەستۆی خۆی گرت کە هەموو ساڵێ بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی سپا بری پێنجهەزار تمەنی تەورێزی بە نەغد و پێنجهەزار خالواری هەشت عەبباسی[1] دەغڵودان و تفاق بنێرێتە خزمەتی. هەروەها ئەمانوڵلاخانی والی سنە، شەمخاڵخانی ئەفشاری حاکمی سائینقەلا،

---

1 - هەر عەبباسییەک چوار شایی بووە. سکەی زێر و زیوی سەردەمی سەفەوی. ئەم وردەپوولە بە ناوی شاعەبباسی سەفەوی ناودێر کراوە.

بوداق‌خانی موکری حوکمداری سابلاغ، ئەحمەدخانی موقەددەمی حاکمی مەراغە و ئەحمەدخانی دونبولی حوکمڕانی خۆی ملیان وەبەر چەڵەمەی دەسەڵاتی ئیمام‌قولی‌خان هێنا. ئەوانەش کە لەوێ نەبوون بە نامە و ڕاسپاردان خوایی‌نەخوایی پێملی بوون و زۆریان قاقەز نووسین و بەڵێن و پەیمانی پتەویان دا و سوێندیان خوارد کە لە قافلانکۆوە بەرەو ئێرە هەموو لایەک بە فەرمانی ئیمام‌قولی‌خانی سەردار هەستن و دانیشن. دەبێ بزانین کە لەم سەردەمەدا عەلی‌مرادخانی زەند لە هەرێمەکانی ئێراق و فارس‌دا دەهۆڵی فەرمانڕەوایەتی دەکوتا و دەیگوت هەر من میرم. لەو لاشەوە خانزادە ئاغامحەممەدخانی کوڕی محەممەدحەسەن‌خانی قاجار کە ماوەی پازدە ساڵ دوای شەهیدکرانی باوکی بە حوکمی کەریم‌خانی وەکیل لە شیراز بەڕێزەوە دەس‌بەسەر بوو، پاش کۆچی‌دوایی وەکیل بە فرت‌وفێڵ توانیبووی خۆی دەرباز بکا و ئێستا لە ئەستەرابادی مازندەران دەنگەشەی دەسەڵاتی دەنگی دابۆوە. دیارە بە پشتیوانی خودای تاق و تەنیا کورتەباسێک سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی ئەم پاشایە لەم کتێبەدا دەخرێتەڕوو.

بەکورتی دوای ڕاپەڕاندنی ئەم کارانە لە چیمەنی قەرەتەپەی تەسووجەوە هوردووی سەردار بەرەو ورمێ بزووت و چەند کەس لە حاکمانی ئازەربایجان کە لە ڕکێفی‌دا بوون، ئیزنیان لێ‌خواست و هەرکام گەڕانەوە مەوتەن و ناوەندی دەسەڵاتی خۆیان. ئیمام‌قولی‌خانی بەگلەربەگ چەند ڕۆژێک لە قەرەباغی ...لی ملکی خۆی بنەی داکوتا و کەوتە سەیران و ڕاوەکەو و پاشان تەشریفی بردەوە ورمێ. هەر لەم سەروبەندەدا ئیمام‌قولی‌خان کچی ئەحمەدخانی حوکمڕانی خۆی مارە کرد.

## پەیمانشکاندنی نەجەفقولیخانی حاکمی تەوریز و چوونی ئیمامقولیخان بۆ گرتنی شارەکە و لێدانی حوکمڕان

لە سەرەتای سالی سەرموخێری ۱۱۹٦ی کۆچی/۱۷۸۱ـــ۱۷۸۲ی زایینـــیدا، پاش بـەڕێـوەچـوونی جێژنـی نـــەورۆزی سـولتانـــی، ئیمـامقولـیخـــان تیشکـەی بە سەرکردنەوەی هاویشتە سەر سەرۆکانی ئەفـشاری ورمـێ و هـەر کەس شانی چەندی هەلدەگرت دیاری و خەلاتی دایە. ئەوانـەی بـە سـیلەنیگای میرانە خوێندرانەوە بریتی بوون لە: میرزا ئەبولحەسەنی ئیمانلووی سەرۆک و دەمراستی دیوانی پیتاک و عەسـکەرخانی میرئـاخوری بـرای؛ مـەحموودخانی سەرۆکی تیرەی ئەفشاری سایینقەلا؛ خانئەمیربەگی ریشسپی تایفەی خەلەجی باراندیز؛ ئەللایاربەگ و حوسێنقولیسولتانی ردێنسپی ئەرەشلوو. هـەروەها پلەی ئیشیکئاغایەتی کە پێشتر خوابەخشیو سەرمەستبەگ بەرپرسـی بـوو، وێرای نازناوی خانی بـاربووی عـەلیڕەزاسولـتانی قـاسملووی کـرد و کچـی لێخواست.

هەرچۆنێک بێ دوای ڕێکوپێک کردنی کاروبـاری لەشـکر و ڕێکخـستنی ڕێوشوێنی گرینگی ولاتەکە، چەند پیاوێکی بە ڕێوجێی ئەفشاری دەنـاردن بـۆ وەرگرتنی ئەو پوول و کەلوپەلەی پارەکە حاکمانی ئازەربایجان بەلێنیان دابوو بیدەن. بۆ وێنـە خـانئەمیربـەگی سـەرۆکی تایفـەی خەلـەجی بـەڕێکردە لای نەجەفقولیخانی بەگەربەگی تەوریز و نامەیەکی ئاوای لـێنووسـی: وەکـوو ئاگاداری پێشتر برایمخەلیلخانی جەوانشێر و نەزەرعەلیخـانی شاسـەیوان و عەلیخانی شوقاقی هەلیانکوتایە سەر قەلای تەوریز و شـوویان لێهەلکێـشا و زەرەد و زیانێکی زۆر بە سەر شانی دانیشتووانیدا هات. ئەگـەرچی هـەموویان کەوتنە بەر شەپۆلی هێرشی خەزاکەرانی ئەفـشار و زەبـری دەسـتی کـوردان و

لێیان‌درا و هەلاتن، بەلام من ئەودەم پەیکەردەیانم بە بەرژەوەند نەزانی و لە ڕاستی‌دا ئەو جۆرەی شیاوە دەمکوت نەکران. جا بۆیە ئێستا تەواو لێبڕاوین کە پێکەوە کوانووی ئاگری دووبەرەکایەتی دوژمنانی خۆمالی تەفروتونا بکەین و پاشان بکەوینە بەرپەرچدانەوەی خەنیمانی لاوەکی. ئەرکی دراوسێیەتی هەلدەگرێ کە ئێوەش بکەونە ساز کردنی لەشکر و شانبەشانمان بن. هەروەها ئەو برە دراو و مردەمالەی قەرار وابوو بیکەیە دیاری بەم ڕاسپاردەیەدا بینێرە هەتا بتوانین قۆشەنی پێ تەیار بکەین و خێرایەکی لە ورمێوە ببزووین و وێرای سپای ئەحمەدخانی دونبولی بەرەو شوێنی مەبەست بکەوینەڕێ.

پاش ئەوەی خان‌ئەمیربەگ لە ماوەیەکی کەم‌دا گەیشتە ورمێ و نامەکەی خستە بەرچاوی نەجەفقولی‌خان، لەڕێوە بەگلەربەگی تەورێز لێی‌کەوتە گومان و پێی‌وابوو فێلوفرت و ناڕاستی بە دواوەیە و وەلامێکی چاکی نەدایەوە. بەڕوالەت خان‌ئەمیربەگی وەرگرت و لە مالی میرزا زەمانی دەمڕاستی تەورێز دایمەزراند. خانی ڕاسپاردە بە زیرەکی و وریایی خۆی زانی کە بەگلەربەگی تەورێز چی لە دەروونی‌دایە و ناتەبایە لەگەل ئیمامقولی‌خانی سەردار و هاوڕێیەتی ناکا. هەر بۆیە مانەوەی خۆی لەو شارە بە بەرژەوەند نەزانی و بێ‌ئێزن گەڕایەوە ورمێ و ئەوەی بیستبووی و تێی‌گەیبوو بە خزمەتی ڕاگەیاند. بۆیە ئاگری توورەیی لە ئاورگی سینەی‌دا سەری هەلدا و لەڕێوە هەشت‌هەزار سوارەی ناوداری ئەفشار، زەرزا، موکری، بابانی سنە، موقەددەمی مەراغە و ئەفشاری سائین‌قەلا کە لەوێ ئامادە بوون و دەیانویست سەرەتا بچنە شەڕی سەربزێوانی ئازەربایجان و پاشان بەرەنگاری عەلی‌مرادخانی زەند ڕاوەستن، وەکوو بەرایی لەشکر گالی دان بۆ تەورێز و تۆپخانەی ڕەگەل خستن و وای دانا کە خۆشی دوابەدوایان ببزوێ.

بەکورتی وەختایەک بەرایی لەشکر گەیشتنە نوور و نیزیکی تەورێز، تەماشایان کرد کە نەجەفقولی‌خان پێشتر گوندنشینانی نیزیکەشاری

راگواستوون و لە پەساری شوورە و قەلادا دایمەزراندوون و سەرقالی پاراستنی قەلایە، چونکە دەیزانی کە ئیمامقولیخانی سەردار دەست لە هەرا و هێرش هەڵناگرێ و ناحەجمێ و بە ئامانجی شەڕ تێهالاندنی دەجمێ. سەرکردەکانی سپا لەسەر راسپاردەی سەرداری نـاودار کەیخودایەکی باوەڕپێکراویـان نـاردە لای نەجەفقولیخان و لێیانراسپارد کە ئێمە دەچینە شەڕی عەلیخانی شوقاقی و نەزمرعەلیخانی شاسەیوان و ئەگەر بەگلەربەگ دەیهەوێ بـە دانـی پادارانـە و ناردنی قۆشەن یارمەتیمان بدا با بفەرموێ. نەجەفقولیخان دەقودۆغر جوابی دانەوە کـە نـاتوانم ڕەگەڵـیان بکەوم و پادارانەشم بۆ نـانرێ. وەختایەک سەرکردەکانی سپا وڵامی سارد و سڕ و ڕێوڕاستی بەگلەربەگی تەورێزیان بۆ هاتەوە ئەوەندەی بۆیان کرا دەستیان لە تالان و داڕووتاندنی دێهات و ناوچەکان نەپاراست. لەم کاتەدا نەجەفقولیخانی شاسەیوان و حوسێنقولیسولتانی [کوردی] شوقاقی کە پێشتر لایەنگری بەگلەربەگی تەورێز بوون، روویان لە عەلیخانی شوقاقی وەرگێڕا و هاتنە ژێر ئالای لەشکری ئیمامقولیخانی سەرداری ئەفشار. وێککەوتنی ئەم دوو قۆشەنە بوو بە هۆی بەدیهاتنی خەسارێکی زۆر و تێکرای ناوچەکانی تەورێز و سەراب پێخوست کران. بەناچار عەلیخانی شوقاقی داوای یارمەتی کرد لە نەزمرعەلیخانی شاسەیوانی ئەردەوێل و ئەویش لە ناوەندی دەسەلاتیڕا بزووت و گەیشتە سەراب و لەگەڵ عەلیخان هەرووژمیان بردە سەر نەجەفقولیخانی شاسەیوان و حوسێنقولیسولتانی شوقاقی. لە دەوروبەری سەراب هێزەکانیان تێکهەڵەنگووت و شەڕێکی قورس قەوما. ئاخرییەکەی نەزمرعەلیخان سەرکەوت و حوسێنقولیخان ڕەوی بەرەو مەراغە و ئەویش کەوتە شوێنی و بارگە و بنەی راکردووانی تالان کرد و هەر لەسەر ئەم ڕکێف و هەوایە رۆیشت و دەورەی قەلای مەراغەی دا. ڕاست لەو جەنگەدا ئەحمەدخانی موقەددەم چووبوو بۆ لای ئیمامقولیخانی سەردار، بەلام دیسانیش خەڵکی مەراغە وەدەستهاتن و

کەوتنە بەرپەرچدانەوەی هێرشی جەماوەری شاسەیوان و شوقاقی و پاراستنی خۆیان. پاش تێپەڕینی بیست ڕۆژ بە سەر ماوەی گەمارۆدا و دیاری نەدانی هیچ نیشانەیەکی سەرکەوتن، نەزەرعەلیخان ئەوەندی توانی دەستی لە تالان و داڕووتاندنی گوندەکانی سەر بە مەراغە نەگێڕایەوە و بەرەو ئەردەوێل گەڕایەوە. پاش ڕۆیشتنەوەی خانی شاسەیوان، ئیمامقولیخانی سەردار کە هێزێکی زۆری کۆکردبۆوە و ئامانجی شکاندنی نەزەرعەلیخان بوو، شانبەشانی ئەحمەدخانی موقەددەم و قۆشەنی بەرکێفی بەرەو تەورێز کەوتەڕێ و لە دوو فرسەخی ئەو شارە لەشکری خست و داوای کرد کە دەبێ نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی [کوردی] تەورێزیش ڕەگەلم بکەوێ. بەڵام وەختایەک ئەمجاریش وڵامی نابەخێری بۆ هاتەوە، لەوێوە کۆچی لێنا و لە شەنبیغازانی سولتان مەحموودخان هۆردووگای دانا و خۆی خۆش کرد لە گرتنی قەڵای تەورێز. بە حوکمی نەجەفقولیخان دەروازەکانی شار داخران و ڕێگای هاتوچۆ گیران و وای لێهات کە دانیشتووانی تەورێز دەستیان بە باغ و مووچە و مەزرای خۆیان ڕانەدەگەیشت و تەواوی ئەو بەرهەم و حاسڵاتەی کەوتبوونە دەرەوە تێداچوون. بەکورتی هەردک لا شەو و ڕۆژ لە دەر و ژوورەوە بە تۆپ و تفەنگ وڵامی یەکتریان دەدایەوە. چەند جارێک دەستەیەک خێرخواز و کەیخودا بوونە نێوبژیوان و قسەیان لە پێکهاتن و بڕانەوەی شەڕ کرد، بەڵام هەوڵەکانیان هیچی لێشین نەبوو. مەودای گەمارۆ هەتا شەش مانگی خایاند و هەوا ئەوەندەی سارد کردبوو کە لەشکرچی زۆر تاڵ و سوێریان ڕادەبوارد و قەڵادارانیش کەوتبوونە گێژاوی دەرد و کوێرەوەری. وای لێهات کە ئیمامقولیخان هەم بەزەیی بە قەڵانشینان و هەم بە قۆشەنچییانیدا هات و دەستی هەڵگرت و بێئەوەی مورادی وەدیبێ گەڕاوە.

❖❖❖❖

## چوونی ئیمامقولیخانی سەردار بۆ شەڕ لەگەڵ عەلیمرادخانی زەند و گەڕانەوەیەکی کاتی بۆ ورمێ

هەروەکوو باسی کرا ئیمامقولیخان بە هێزێکی زۆر و زەوەند و بە شەوکەتەوە ماوەی شەش مانگ نەجەفقولیخانی دونبولی گەمارۆ دا. لەو بەینەدا ناوبراو خودادادخانی کوڕی بە کاغەزێکی پڕ تکا و پاڕانەوە نارد بۆ لای عەلیمرادخانی زەند کە تەنیا لە هەرێمی فارس و ئێراق دەستی دەڕۆیی و داوای یارمەتی لێکرد. دیارە دەبێ ئەمەش بزانین کە تاقمێک لە حاکمان و خانانی بێوەفای ئازەربایجانیش لەگەڵی هاودەنگ و هاوئامانج بوون. لەم کاتەدا کە ڕۆژی ۲۰ی مانگی نێوجێژنان بووە، خودادادخان بە وەرگرتنی خەڵات و حوکمی سەرکردایەتی لە دەستی عەلیمرادخان دەگاتەوە تەورێز. بەگوێرەی حوکمی حاکم و بە تەگبیری نەجەفقولیخانی باوکی، خوداداخان دەکەوێتە ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی قۆشەن و جەماوەری ئاسایی. ئیمامقولیخان وەختابەک دەسەڵات و سەربەخۆیی نەجەفقولیخان و هەڵگەڕانەوەی پۆلێک لە ئەمیران و بەگەرانی ئازەربایجانی بیستەوە و زانی فیتی عەلیمرادخانی زەندە، لێوی کرۆشت و گوتی وای ناخوا. بۆیە فەرمانی دا بە لەشکری کە سەرەتا بڕۆنە هەرێمی عێراق و فارس و ناوچە و مەڵبەندەکانی ئەو خاکە لە چەنگ عەلیمرادخان دەربێنن و پاشان بۆ لێدان و گوێبادانی نەجەفقولیخان و سەرۆک و سەردارانی تری ئازەربایجان بادەنەوە سەر ئەم باڵە. بە مەبەستی وەدیهێنانی ئەم ئاواتە بە لەشکری بێئامان و شکۆمەندەوە بە ڕێگای سابلاغی موکریدا بەرەو سایینقەڵا کەوتەڕێ هەتا گەیشتە سنووری سنە و ئەردەڵان. لە مەودای ڕێگادا ڕۆژ بە ڕۆژ هێزەکانی زیادیان دەکرد و پاشەکەوت و پادارانەی سپای لە خەڵکی ئەو ناوچە و مەڵبەندانە وەردەگرت کە پێیدا دەڕۆیی...

ئەمانوڵلاخانی ئەردەڵانی والی سنەش دایە پاڵ هۆردووی و هێزێکی زۆری سنە و مەڵبەندەکانی کۆکردەوە و سەری وەبەر فەرمانی سەردار هێنا و لەبەرەوەی عەلیخانی ئەفشاری خەمسەیی حوکمڕانی سەربەدەرەوەی زەنجان ماوەیەک بوو

سەری وەبەر عەلیمرادخانی زەند نەدێنا و لێیهەڵگەڕابۆوە و دەستەوداوێنی ئیمامقولیخان ببوو، سەردار لە [خاکی] ئەردەڵانەوە سەری ڕکێفی بەرەو زەنجان وەرسووڕاند و ڕۆیی و چەند ڕۆژێک لەوێ میوانداری کرا و دەستی ڕێزی بۆ لەسەر سینگ داندرا. وەختایەک عەلیخانی ئەفشار سەبارەت بە پەلاماردانی عێراق ڕاوێژی پێکرا، چوونەکەی بە بەرژەوەند نەزانی و گوتی هەتا ناوچە و مەڵبەندەکانی ئازەربایجان بۆ سەردار پاک نەکرێنەوە و دوژمنانی خۆماڵی لە بنەوپاڵەوە سەربەخۆبن، چوونە سەر هەرێم و خەنیمانی دوورەدەست کارێکی نابەجێیە و پیاوی فامیدە و دووربین شتی وا ناکا. سەردار ئەم باس و تەگبیرەی بە دڵەوە نووسا و وازی لە چوونە عێراق هێنا. عەلیخان بە پێشنیاری خۆی پیاوێکی باوەڕپێکراوی بە ناوی وەلیبەگ وێڕای کۆمەڵەچەکدارێک بەرەو ئازەربایجان گاڵ دا و سەرداریش ڕەزامەندی دەربڕی و پاشان خۆشیان کەوتنە شوێنیان. لە شارەدێی میانە فەرەجوڵلاخانی حاکمی خەڵخاڵ دایە پاڵ لەشکری سەردار و عەلیخانی شوقاقی حاکمی سەرابیش سادقسوڵتانی کوڕە گەورەی خۆی کە لاوێکی ناوبەدەرەوە بوو، لەگەڵ کۆمەڵێک کوردی شوقاقی و جەماوەرێکی دیکە ناردی بۆ هۆردووی سەردار و بۆخۆی سەبارەت بە نەچوونی هێندێکی بروبیانوو هێنانەوە.

لێرەدا پێویست بە ڕوون کردنەوەیە کە لە بابەت نەچوون و تێکدانەوەی سەفەرەکەی ئیمامقولیخان بۆ ئێراق بەم هەمووە هێز و لەشکرەوە چەند جۆرە گێڕانەوە لە گۆڕێدایە. هێندێک دەڵێن کە عەلیخان و سایری بەدخوازانی چاویان بەرایی نەدا و نەیانهێشت بچێ و دەستەیەک پێیانوایە سەردار لەبەر خاتری ژنێکی جوان و دڵفڕێنی کە هیچکەس تای نەکردووە و وێدەچێ کچی ئەحمەدخانی دونبولی بووبێ نەچووە و هێرشەکەی هەڵوەشاندۆتەوە. هەرچۆنێک بێ ئیمامقولیخان بەرەو ئازەربایجان دەکەوێتەڕێ و لە یەک فرسەخی تەورێز خێوەت و بارگا هەڵدەدا و ئەمجارەشیان لەبەر سۆزەی سەرما کەمەند ناوێتە بەژنی قەڵای شار و ڕوو دەکاتەوە ورمێ.

## چوونەوەی ئیمامقولیخان بۆ شەڕ لەگەڵ عەلیمرادخانی زەند و بڕانەوەی چارەنووسی

لەم بەینانەدا ڕووداویکی سەیروسەمەرەی ئاسمانی خۆی نواند و لە سەرەتای مانگی ڕەجەبەوە هەتا چل ڕۆژان وڵات تار هەڵگەڕا و بە ڕۆژ و شەو دەفەی خۆر و مانگ دەتگوت کاسەی کەیلی خوینن و وای لیهات خەڵکی ڕەشۆکی کە پییانوابوو ڕۆژگیراوە کەوتنە بەجیهینانی نویژی ڕۆژگیران. بەڵام ئەستیرەناسان لایان وابوو کە هەرا و هەڵلا و خوینڕشتنیکی بە پانەوە تەواوی هەریمەکانی ئیران بەگشتی و خاکی ئازەربایجان بەتایبەتی دەگریتەوە.

هەروەکوو پیشتر باسی کرا ئیمامقولیخانی سەردار کە لە سەرەتای ئەم ساڵەدا دەیهەویست بچیتە شەڕی عەلیمرادخانی زەند بە چەند هۆیەک یەکی پەلامارەکەی خستەوە و گرتنی تەوریزیش وەدوا کەوت. لەم سەروبەندەدا دیسان هەوای لەشکرکیشان و گرتنی خاک و هەریمان لە سەری دا و خۆی لە چوونە ئیراق خۆش کرد و گوتەی ئەستیرەگەران کە دەیانگوت دەبی بە پاشا ئەوەندەی دیکەی هان دا و پاڵی پیوەنا. وەختایەک دەنگ و هەرای ئەم هیرشە بڵاوبۆوە و هەموو کەس بیستی، نەجەفقولیخانی بەگەربەگی تەوریز یەکجار زۆر حەجمینی لیهەڵگیرا و بەناچار چەندین پیاوی ئاقڵمەند و زانای سەرناسی ناردنە لای سەردار و بۆی نووسی کە وەرە پیاوی چا بە و واز لە لاساری و پرکیشی بینە و بە بەشەدەسەڵاتی خۆت ڕازی بە. ئیستا ماوەیەکە جەماوەر بە پانەوە کەوتوونە ژیر باڵی تەناهی و ئاسوودەیی و با لەخۆڕا خوینی خەڵک بەناهەق نەڕژی، چونکە لە ڕۆژی ڕابوونەوەدا بەرۆکی سەبەبکاران دەگیری. ئەم

ئامۆژگارییانە هەرگیز بە گوێی سەرداردا رۆنەچوون و تەنانەت لەسەر بلەوەزی و دوژمنایەتی سوورتریان کرد. ئەحمەدخانی دونبولی خەزووریشی بە باری لایەنگری‌دا قاقەزێکی لێنووسی و داوای لێکرد کە نەچێ، بەلام دیسانیش هەر پەشیمان نەبۆوە. سەردار کەوتە کۆکردنەوەی قۆشەن و لە مێرگ و لەوەرگەی گوێکتەپەی نێو فرسەخی شار چادر و چیغی رائەنگاوت و بە قەدرایە پۆلی ئەستێران تاولی هەلدا و کەوتە شادی و عەیش و نۆش و خۆش رابواردن. لەو لاوە وەختایەک نەجەفقولی‌خانی بەگلەربەگی تەورێز بە لانی ئیمامقولی‌خان‌دا هیچ هیوایەکی نەما، لەبەروەی دوای بوولەرزەی تەورێز نەیدەتوانی ببزوێ و گێروگەوال ببوو، بە سواری کەژاوە چوو بۆ کن ئەحمەدخانی برازای لە خۆیە. هەردک خانی دونبولی وایان قسە لێکرد و گوتیان ئەمرۆ کە تەپلی فەرمانرەوایەتی خۆنەگری ئێران لە ئێراق و فارس بە ناوی عەلی‌مرادخانەوە لێدەدرێ و زرمەی دێ، وا وێدەچێ کە بەم زووانە ناوچە و مەلبەندەکانی ئازەربایجان ببنە پێشێلی سمی رەوەی یەکسمی هێزەکانی ئەو، باشە لەسەر چی ئێمە دژایەتی بکەین و هەوساری دەسەلاتی خۆمان بدەینە دەست ئیمامقولی‌خانی ئەفشار کە لاوێکی بادیەهوایە و ئەوەی دەیکا لە رێبازی قامین تلاسایە و هەنگاوی بەپارێزی تێدا نیە؟ نەخێر وا ناکەین و وا چاکە نامەیەک بنووسین بۆ عەلی‌مرادخان و بانگهێشتنی بکەین بۆ ئەم مەلبەندە و پەنجە باوێینە ئاتەگی دەسەلاتی. ئەم باس و راوێژەی نەجەفقولی‌خان لەگەل ئەحمەدخان بۆیە بوو کە بەگلەربەگی تەورێز دلنیا نەبوو لە هەلوێست و هەلسوکەوتی سەربزێوان و خێلاتی ئازەربایجان، چونکە هیچیان سەریان وەبەرنەدێنا جگە لە ئەحمەدخانی موقەددەمی حاکمی مەراغە کە ئەو کاتی لەبەر چەند هۆیەک لە ئیمامقولی‌خان هەلگەرابۆوە و پەنای بردبووە بەر سێبەری نەجەفقولی‌خان.

بەکورتی وەختایەک نامەی نیازمەندانەی نەجەفقولیخان و تاڵمێک لە ئەمیرانی ئازەربایجان لە فارس گەیشتە دەستی عەلیمرادخانی زەند، چونکە ناوبانگ و سام و شەوکەتی ئیمامقولیخان سێبەری ترسی بە سەر دڵی جەماوەری عێراق و خانی زەندا کێشابوو، تەنیا باوەڕیان بە نووسراوەکانی نەجەفقولیخان و ئەحمەدخان نەدەکرد. سەرەنجام بەپێی راوێژی سەرکردەکان و گەورەپیاوانی دەسەڵات، حوکمی حکوومەتی ورمێ نووسرا بۆ ئەمیرئەسلانخانی ئەفشاری ساینقەڵا ناسراو بە کوڕەبەچە[1] و نێردرا و هەزار کەسیشیان ڕەگەڵ خست تا بە هاوکاری نەجەفقولیخان و کۆمەڵی دونبولی و خەڵکانی تر خاشەی توخمی ناتەبایی و گێرە و کێشەی ئیمامقولیخان بکێشن! کاتێک ئەمیرئەسلانخان گەیشتە تەورێز و نێوەرۆکی حوکمی خانی زەندی بە حاکمانی ئازەربایجان راگەیاند، هەموویان بەناچار ڕوویان کردە ڕەوگەی بێوەفایی و چوونە پاڵ ئەمیرئەسلانخان. عەلیمرادخان نووسیبووی ئەمڕۆکە ئیمامقولیخان لە ڕێی نەزانی و بادیهەواییڕا بۆتە خەنیمی دەوڵەت و لێیهەڵگەڕاوەتەوە و ئەمیرئەسلانخان بەپێی ئەم حوکمە ڕاسپێردراوە کە ئاوری ئاژاوەی ئیمامقولی بە ئاوی تیغی تیژی ئاودارەوە ڕۆمرکێنێ و هەر کەس بچێتە ژێر سایەی بەیداخی و بکەوێتە گیانبازی، گۆشەنیگای بەسەر کردنەوەی میرانە دەیگرێتەوە و دەنا چۆنی پێویستە ئاوا سزا دەدرێ. سەرۆک و سەردارانی ئازەربایجان پاش بادانەوە، شانبەشانی ئەمیرئەسلانخان لە تەورێز دەرکەوتن و بەرەو شوێنی مەبەست ئەسپیان لینگ دا. لە ناوچەی سەڵماس ئەحمەدخانی دونبولیش وێڕای هێزەکانی ڕەگەڵیان کەوت. بەڵام لەم لایەوە ئیمامقولیخان کە لە مێرگۆلانی گوێگتەپە لەشکرگای دانابوو، شەو و ڕۆژ بە خاپاندنی عەلیڕەزاخانی ئێشیکئاغاسی ڕایبوارد و گاڵەی بە پیاڵەی مەی کرد و

---

[1] - کوڕەکورد.

بە دەستەملانی تلایەوە. لە ١٥ی مانگی قوربان‌دا نەقی‌بەگی ئەفشاری سەرکردەی ناوچەی ئەنزەل، کاغەزێکی نووسی و بە کابرایەک‌دا ناردی و ڕوونی کردەوە کە ئەمیرئەسلان‌خانی کوردبەچە لە لایەن عەلی‌مرادخانی زەندەوە نێردراوەتە شەڕی ئیمام‌قولی‌خان و خان و بەگەرانی ئازەربایجان بەتایبەت نەجەف‌قولی‌خان و ئەحمەدخانی دونبولی خەزووری سەردار پالیان وەپالی داوە و ئێستا لە چیمەنی دۆرشەکی سەلماس بە لەشکرێکی وەکوو خیز و خۆڵ بنەیان داکوتاوە و هاکا ئەمرۆ و سبەی لە کەلی قوشچی وەسەرکەون و بەرەو ورمێ داوەرن، بۆیە وا باشە غولامان و نۆکەرانی سەردار ئاگار بن و خۆیان ساز بکەن بۆ بەرەنگاری. سەردار کە هەتا ئەودەم هەرگیز خەیالێکی ئاوای بە مێشکی‌دا نەدەهات و پێی‌وانەبوو کە کەس بوێری بۆی بێتە مەیدان، بە خوێندنەوەی ئەو کاغەزە ترسێنەرە و بە بیستنی ئەم خەبەرە ئەغیار بۆوە و لە خەوی بێ‌خەیالی ڕاپەڕی. ڕۆژی ١٧ی مانگی قوربان سەرەتا برایم‌خانی ئەفشار کە پێشەنگی لەشکر و پیاوێکی زرینگ و ناوبەدەرەوە بوو، وێڕای کۆمەڵەچەکدارێک بەڕێی‌کرد و دوابەدوایان قەرەنی‌ئاغای بلباسی لەگەڵ کوردان نارد. وایان دانا کە ئەم قۆشەنە لە چیمە،ی عەلی‌بەگلووی وەققاسلوو کۆببنەوە و لە سان بدرێن و پاشان باژوێن. خۆشی لەگەڵ عەلی‌خانی ئەفشاری حاکمی خەمسە و سەرکردە ناودارەکان بە پشتیوانی پەروەردگاری گەورە لە کات و ساتێکی موبارەک‌دا شاری بەجێهێشت. هێشتا تەواوی هێزەکان -ببوونە مێرگی عەلی‌بەگلوو و کۆنەببوونەوە کە بەرایی قۆشەنی ئەمیرئەسلان‌خان لە بالی قوشچی‌ڕا دەرکەوت و خۆی نواند کە بریتی بوون لە: ئەحمەدخانی حاکمی مەراغە وێڕای چەکدارانی موقەددەم؛ نەجەف‌قولی‌خان و ئەحمەدخان لەگەڵ کۆمەڵی تەورێز و [کوردانی] دونبولی؛ سادق‌سولتانی حوکمداری سەراب بە سەرکردایەتی خێڵی شوقاقی؛ عەبباس‌قولی‌خانی کەنگرلوو وێڕای جەماوەری نەخجەوان و نێرەوان و دیسانەوە هێزێکی بەرچاوی دونبولی

کە شابازخان و سولەیمانخان جڵەوداریان بوون. ئەم هێزانە چەشنی لافاوی بەڵا لە کەلی قوشچیڕا لووزەویان بەست و وای لێهات کە دەشتی بەرپالی کەژ و کۆی «ئیمامکەندی» و لێواری گۆلی شاهی (ورمێ) لەبەر هاژانی لەشکر دەنگوت دەریایە شەپۆلان دەدا. سەرداری بوێر بە فیز و دەماری گەنجی تێکەوت و هێندە ڕانەوەستا کە قۆشەن هەمووی سوار بن و جاڕدەری ناردن تا ئەوانەی بارگە و بنەیان دانابوو و خەریکی حەسانەوە و دەرکردنی شەکەتی و وچانی یەکسمیان بوون وریایان بکەنەوە. خۆی وێڕای سوارانی مەنگوڕ و مامەش و پیرانی ژێرکێفی قەرەنیئاغا بەرەوپیری هێزەکانی ئەمیرئەسلانخان مامزەیان کوتا و بە دابی پێشووی کە لە ڕۆژی شەڕا خوودی دەنایە سەری و زرێی گەوچن و چوارئاوێنەی دەکردە بەری؛ سینگی دایە پێش بۆ تێکهەڵچوون و بەرەنگاری. پاش ئەوەی لەشکر بەرەورووی یەکتر ڕاوەستان، نەجەفقولیخانی بەگەربەگی تەورێز کە بە مەزنەخان ناویان دێنا، بۆ ئەوەی قسەی بڕیبێتەوە، پیاوی ناردە لای ئیمامقولیخان و بە پەند و ئامۆژگاری لێیڕاسپارد بەڵکوو سەردار دەسبەرداری لاساری و دوژمنایەتی بێ و شانی بداتە ئاشتی و پێکهاتن و نەبێتە جڵەوکێشی کوشت و کوشتار و ڕژانی خوێنی بەناهەق. سەردار وڵامی ئاحەز و توند و تیژی دایەوە و ڕاسپاردەکەی ناردەوە؛ هەربۆیە هەریک لا دەستیان برد بۆ چەکان و پێکداهاتن. لە یەکەم پەلاماردا ئیمامقولیخان لەگەڵ سوارانی چوست و چالاکی بلباس، پێشەنگانی لەشکری بەرەورووویان هەڵگرتن و تەقورمویان تێخستن و زۆریان لێکوشتن. لەم جەنگەیەدا سەردار چاوی بە نەجەفقولیخانی مەزنەخان کەوت کە لە جەرگەی سپادا سواری کەژاوەیە و هانی قۆشەنی تەورێز و دونبولی دەدا بۆ خۆڕاگری و ئازایەتی. وێڕای پۆلەسوارێک هەڵیکردە سەری و کاتێک نەجەفقولیخان چاونەترسی و هەڵمەتی ئیمامقولیخانی ئاوا هاتە بەرچاوی فەرمانی دا بە جەزایرچی و تفەنگدارانی خزمەت رکێفی کە پلیتەی چەکیان هەڵگیرسێنن و وەختایەک سەردار و هاوڕێیانی نیزیک بوونەوە

بەجارێک دەسرێژیان لێکردن و بەڕاستی فیشەکێک بە خەسار نەچوو. کۆمەڵێک کورد و ئەفشار و لاوی ئازا وەبەر تیری ئەجەل هاتن و لە خاکی نەمان گەوزین. لەم دەمەدا ڕاکردووانی سپای تەوریز و دونبولی تووشی دەستەسوارێک بوون کە بە چوارناڵە دەهاتنە هانایان. بە دیتنی ئەوان ورەیان بەرز بۆوە و گەڕانــەوە و تێکڕا هێرشیان کردە سەر کۆمەڵی چەکدارانی سەردار. جـا ڕاسـت لــەو بگـرە و بەردەیەدا سەفیبەگی ئەفشار کە بەیداخدار بوو، بەیداخەکـەی وەکـوو بــەختی خۆی خەواند و پشتی کردە دوژمــن و عەلیڕەزاخــان و قــەرەنیئاغــای بـلباس ڕەویــن و جەماوەرەکــەی دیکــەش کەوتنــە شــوێنپێــی ڕاکــردووان و خۆڵــی بەدبەختییان وەســەری خۆیــان کــرد. کــەچی دیــسانیش ئیمــامقولــیخــان و ئەحمەدخانی موکری و جەماوەرێکی کەم خۆیان ڕاگرت و لە شەڕ و بــەرەنگاری شل نەبوونەوە. بەڵام هیچ فایدەی نەبوو، چونکە سەرەڕای شـکانی لەشکری، بۆخۆشی لە چەند جێگاوە ئەنگوابوو بە سەختی و قۆشەنی بەرامبەری زیاتر بوو لە مار و مێروو. لەو لاشەوە قرچەقرچی مانگی گەلاوێژ و بڵێسەی گەرما وای تین هێنابوو کە مێشک لە کاژەڵاکان دەکوڵین و سەرداری نـاودار لەبــەر قورســایی بەرگەرزێ و هالاوی گەرما و خوێن لە بەر ڕۆیشتنی، هێزی لێبڕا و لە خــوانی زینەوە هەڵدێرا. عەسکەرخانی ئیمانلووی میرئاخوڕ ســەرداری وەکــوو گیــانی گرتە ئامێزی و بە یارمەتی چەند کەسێک لەو گێژاوی مەرگە دەربازی کرد و بــە کوێرەڕێیاندا بەرەو شار خوشــی. هێنــدێک دەڵــێن هــەر دەگاتــەوە دەروازەی عەسکەرخان و دەرانەی چواربورجی ڕەزاقولیخانی مەلی ڕووحی دەفڕێتە باغی بەهەشت.

لێرەدا پێویــستە کــە بــزانین بــە چەنــد جۆرێــک باســی چارەنووســی ئیمامقولیخان دەکرێ و هەر کەس بە شێوەیەک دەیگێڕێتەوە. هێنــدێک دەڵــێن وەختایەک لە مەیدانی بەربەرەکانیدا دیویەتی کە هێزەکانی تێکوپێک شکاون، لە حەیبەتان فجەی کردووە و مردووە. دەســتەیەک دەڵــێن هێنــدە بــەغیرەت و

شەرەف بووە کە چیکلدانەی تەقیوە و تاقمێک پێیان‌وایە ئەوەنـدەی ئـارەق خواردۆتەوە کە گیانی لە قاپۆڕی دەرچووە. بەلام لە نێو ئەفشاری قاسملوودا وا باوە و دەلێن کە عەلیڕەزاخـان لـە گەرمـەی شـەڕا میـوەی ژاراوی داوەتـێ و کوشتوویەتی. جا بەڕاستی وێدەچێ ئەم گێڕانەوەیە لە هەمووان دروستتر بـێ، چونکە زۆر بیستراوە لـە پیرەپیـاوان. دەلـێن لـە سـەرەتای ئـەم پـەلامارەدا ئەحمەدخانی دونبولی کە دوژمنایەتی ڕەچەلاکی خۆی لەگەل ئەفشاران وەکـوو شتێکی سروشتی دیارە و بەرچاوە، وێڕای ئەمیرئەسلان‌خانی کوردبەچە چەنـد کاغەز و ڕاسپاردەیان ناردووە بۆ عەلیڕەزاخانی ئەمەگ‌نەناسی بـاوەڕپێکراوی سەردار و بە وادە و بەڵێنی بن‌دراوی درۆ هەڵیانفریواندووە و کاکـە و برالـەیان لەگەل کردووە. پێیان‌گوتووە هەر وەختایەک ئیمام‌قولی‌خان ون بوو لە چاوان و ئەمیرئەسلان‌خـان جـڵەوی خێـلی ئەفـشاری گرتـە دەسـتی، هەلـسووڕاندنی کاروباری ئەفشار دەخرێتە ئەستۆی و تەنانەت دەشکرێتە بریکاری حکوومـەت. ئەو نانخۆرە نانـدێن‌درە ئەوانـە تێـدێنێ و لـە گەرمـەی تێکهەلـچوون‌دا کـە شوێنەواری سەرکەوتنی نەیار دەردەکەوێ، خەیارێکی ژاراوی‌کراوی دەداتێیـە. دیارە هەر خوداش دەزانێ وایە یان نا.

بەکورتی ئەم ڕووداوە تال و ناخۆشە دەگەڕێتەوە ڕۆژی پێنج‌شەممۆ ١٨ی مانگی قوربانی سالی ١١٩٧ی کۆچی/ ١٤ی نوامبری ١٧٨٣ی زایینی. دیـارە لـەو گرمە و هەرایەدا کە دەتکوت ڕۆژی ڕابوونەوەیە هێشتا هیچکەس بەم کارەساتەی نەزانیبوو. محەممەدخان‌بەگی قاسملوو، جەعفەربەگی گەنجالی‌خـانی، مـیرزا ئەبولحەسەنی ئیمانلووی وەکیلی ورمێ و عەسـکەرخانی میرئـاخوری بـرای و میرزا ئاغورلووی محەممەدلووی مامی دایکـی منـی نووسـەر، شـەوی هـەینی تەرمەکـەی دەشـۆن و کفنـی دەکـەن و لەبـەر شـۆقی مەشـخەلان مامۆسـتا میروەحیدئاغای کوڕی میرحوسێنی شێخولئیسلامی مەلبەندەکە و بـەڕێز مـەلا محەممەدحوسێنی ئیمام‌جومعە کوڕی خوابەخـشیو شـێخ مووسـارەزای قـازی

نوێژی لە سەر دەکەن و لە گۆڕستانی خان و لە پەنا گلکۆی ڕەزاقولی‌خانی باوکی خودالێخۆشبووی دەینێژن. دەگێڕنەوە کە ئەم هەڵکەوتە ڕۆژی دووشەممۆ ٢٤ی مانگی شابان ڕووی‌داوە و وەباڵ بە ئەستۆی ئەو کەسەی کە وا دەڵێ.

یەکێک لەو پیاوە سەربەدەرەوانەی کە لەم شەڕەدا کوژرا نەسیربەگی ئەفشاری تیرەی بۆربۆر بوو. ئەو سەرکردە سەرناسانەی کە توانیان دەرباز بن و بگەڕێنەوە بریتی بوون لە: خان‌ئەمیربەگی خەلەج، قارەمان‌بەگی عەرەبلوو، شامحەممەدبەگی کۆهەکلوو، محەممەدبەگ و میرزابەگی قاسملوو و چەند کەسێکی تر کە بۆ ئەوەی لە کورتیم بڕیبێتەوە باسی هەموویان ناکەم. بەری‌بەیانی قەرەنی‌ئاغای بلباس، عەلی‌خانی ئەفشاری خەمسەیی، بالی‌خان و محەممەدئەمین‌خانی گەورووس کە وێڕای هێزەکانی خۆیان لە کێوی «عەلیمان» لەسەر هەست و گوێقولاغ ڕاوەستابوون، بە بیستنی ئەم هەواڵە سامناکە هەرکام بەرەو مەوتەنی خۆیان گەڕانەوە. جەعفەرقولی‌خانی کوڕی ئەحمەدخانی دونبولی بە تەگبیری بابی کە لەشکری لە مێرگی قەرەحەسەنلوو ڕاوەستابوو ڕووی کردە قەڵا و خوشکی کە هاوسەری سەرداری خوابەخشیو بوو، لەگەڵ خۆی هەڵیگرت و هەموو نێومالەکەی خستە سەر پشتی وشتران و بردییەوە نێو هۆربوو. ئەم کارە زیاتر لە دەرد و نەهامەتی مەرگی ئیمام‌قولی‌خانی خودالێخۆشبوو ئەفشاری ئێشاندن.

کارەساتێکی دیکەی کە چوار ڕۆژ پاش کۆچی‌دوایی سەردار قەوما، ماربرانی خانی گەورووس بوو. محەممەدئەمین‌خان کە لە ورمێڕا بەرەو بیجار بۆوە، کاتێک گەیشتە نێزیک کولتەپەی میاندواو بە فێت و دنەی قەرەنی‌ئاغای مامەش تاقمێک شەڕانی و سەربزێوی بلباس چوونە سەر ڕێی و پێشیان پێگرت و خانی گەورووس و تێکڕای پیاوەکانیان قەڵتوبڕ کرد و تەنانەت یەک کەسیان بە زیندوویی دەرنەچوو کە خەبەر بەرێتەوە بۆ وڵات و هەرچی بوویان بە زیندەماڵ و مردەماڵ کەوتنە چنگ بلباسان.

خۆلاسەی کەلام پاش ئەم ڕووداوانە، محەممەدقولی‌خان و قاسم‌خان هەردک برای خوابەخشیو ئیمام‌قولی‌خان وێڕای کەیخودا و پیاوماقوولانی ئەفشار چوونە لەشکرگای نەجەف‌قولی‌خان و ئەحمەدخان لە مێرگۆلانی قەرەحەسەنلوو و سەریان دانەواند و دەستیان بەردایەوە. سەردار لە مندالی نێرینە چواری هەتیوی لە دوا بەجێمان و بریتی بوون لە: حوسێن‌قولی‌خان کە دایکی لە تایفەی خەلەجی باراندێز بوو؛ محەممەدعیساخان، خودادادخان و لونف‌عەلی‌خان کە لە داوێنی کچی ڕۆستەم‌خانی قاسملووی حاکمی پێشووی ورمێ بەربەبوونەوە. بە هیوای خودا لە جێی خۆیدا باسی هەموویان دەکرێ. سەرداری خوابەخشیو لە کاتی گواستنەوەی مال و کۆچی بۆ دنیای دیکە هێشتا سی سالی تەواوی لە قۆناخەکانی ژیانی هەلنەبواردبوو. لە تەمەنی شازدە سالی‌دا ڕۆنیشتە سەر تەختی دەسەلات و ماوەی دوازدە یان چاردە سال بە شێوەیەکی سەربەخۆ حکوومەتی کرد و بەڕاستی دەکرێ بلێی فەرمانڕەوای ئازەربایجان بوو. هێندێک دەلێن بیست و شەش سال ژیاوە و هەر خوداش دەزانێ. میرزا ئاغورلوو ناسراو بە «حیرەت» ڕێکەوتی کۆچی‌دوایی ئەو خوابەخشیوەی ئاوا هۆنیوەتەوە:

ئیمام قولی‌خان ناکامی ئەفشار — کاتێ کە ڕۆیی بۆ دنیای پێوار
عەقل پێی‌گوتم ڕێکەوتی مەرگی — بۆ سپای قودسیان ئەو بوو بە سەردار[1]

❖❖❖❖

1 - «گردید سپاه قدسیان را سردار» دەبێتە سالی ١١٩٧.

# ڕووداوەکانی پاش نەمانی ئیمامقولیخان و وەلانانی ئەمیرئەسلانخان و ڕێخۆشکردن بۆ حکوومەتی محەممەدقولیخانی کوڕی ڕەزاقولیخان

پاش ئەوەی عەلیمرادخانی زەند جڵەوی حکوومەتی ورمێی دایە دەست ئەمیرئەسلانخان، عەشیرەتی دونبولی بەپێی دوژمنایەتی دێرینەیان لەگەڵ خێڵی ئەفشار محەممەدقولیخانی برای نێونجی ئیمامقولیخانیان وێڕای خۆیان برد و لە سەلماس دایانە چنگ پاسەوانان و چۆنیەتی ڕووداوەکەیان نووسی و ناردیان بۆ خانی زەند. لەو لاوە ئەمیرئەسلانخانی کوردبەچە لەسەر تەختی دەسەلاتی ورمێ پالی داوە و کاروباری گرینگی خەلکی ولاتەکەی ئەسپاردە دەست عەلیڕەزاخان و بەگوێرەی بەلێنی پێشووی کچێکی زۆر منال و تەمەن کالی لێخواست و زەماوەندی لەگەڵ کرد کە بەڕاستی وەختی مێردی نەبوو. بۆ بەیانەی دوای بووک گوێزرانەوە کە پیاوماقوولان دەچوونە دیداری قسەیەکی ناشیاوی سەبارەت بە کچەکەی عەلیڕەزاخان بە زاریدا هات کە بەڕاستی خەزووری پێی شکایەوە و هەموو ئەفشار غیرەتیان پێیوەکوڵ هات. برایمخانی سەرۆکدیوان کە خۆی بۆ ڕانەگیرا لێیهەلگەڕاوە و گەلێکی قسەی تاڵوتوون لە [illegible] ەنگی ئەمیرئەسلانخان نا و لە ڕیزی دیدارکەران وەدەرکەوت و ئابۆرەی ئەفشاران لە دەرەوەی دیوەخان لە دەورەی ئەو پیاو ئازایە هالان و کردیانە گورمگوڕ و هەراهەرا سەبارەت ئەمیرئەسلانخان. ئاخرییەکەی تەمایان گرت کە پیاو بنێرنە لای قەرەنیئاغای بلباسی لایەنگر و خزمەتکاری ئەفشار کە بێ و یارمەتییان بدا. هەتا ئەو گەیشتێ ئەفشاری ورمێ کۆبوونەوە و لەگەڵ ئەمیرئەسلانخان کەوتنە دژایەتی. کەلەوەکێشی و دووبەرەکایەتی دەستی

پێکردبوو کە قەرەنیئاغا بە خوی و هەزار سوارەی دڕ و دلێرەوە ئاسۆگی دا و لە کێوی عەلیمان لەنگەری گرت و لە برایمخانی سەرۆکدیوانی ڕاسپارد کە هاتووم. برایمخان بە بیستنی ئەم هەواڵە ورەی بەرزتر بۆوە و ئازاتر هەنگاوی نا و لەگەڵ هێزێک دەورەی خانەمیری دا و کردی بە گرمە و هەرا و تفەنگهەلتۆقاندن. جەماوەرەکەی وێکڕا هاواریان دەکرد دەبێ ئەمیرئەسلانخان لە دیوەخانی حکوومەتی وەدەرکەوێ و بڕوا، دەنا دەیتەزێنین. ئەمیرئەسلانخان تۆقی و پەنای خواست. برایمخان بەپێی بەرژەوەندی زەمان داڵدەی دا و ئەو بێچارەیە ناهومێد و ڕەنجەڕۆ بۆی قوتار بوو. قەرەنیئاغا لە کێوی عەلیمانەوە پێیناکێف کە بکەوێتە شوێنی و بە ڕووتوقووتی بینێرێتەوە لای عەلیمرادخان، بەڵام برایمخان لە ئاکام و سەرەنجامی کارەکە تۆقی و دەمارگری خێڵاتیشی تێهێنا و نەیهێشت قەرەنیئاغا بچێ و پەشیمانی کردەوە. ئەمیرئەسلان بە هەزار ترس و دلەڕاوکە توانی لە چنگ ئەفشار و بلباسان دەرباز بێ و ملی ڕێگای ئێراقی گرتەبەر. پاش ڕۆیشتنی ئەو برایمخان، قەرەنیئاغای بلباسی بە تەنتەنە و سەنسەنەیەکی شکۆمەندەوە هێنایە نێو شار. دواتر وێڕای قەرەنیئاغا، میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل، میرزا مستەفای سەعدلووی سەرحیسێب، محەممەدخانبەگی ڕدێنسپی بەرەی قاسملوو، حوسێنقولیبەگی ڕیشچەرمگی ئەرمشلوو، مەحموودخانی سەرۆکی تیرەی ئەفشاری ساینقەلا، عەسکەرخانی ئیمانلوو و تێکڕای سەرۆک و سەرکردەکانی خێڵ دانیشتن و کەوتنە باس و ڕاوێژ. هەموو وایان بە باش زانی کە خودی دیوانبەگی و میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل و محەممەدخانبەگ هەستن و بچنە خۆی بۆ لای ئەحمەدخانی دونبولی و پرس و تەگبیری پێبکەن و [ئەگەر ڕازی بوو] محەممەدقولیخانی برای خوابەخشیو ئیمامقولیخان بەرنە ورمێ و لەسەر کورسی دەسەڵاتی دابنێن.

کاتێک برایمخان و کۆمەڵی هاورێیانی گەیشتنە مەڵبەندی خۆش و هەستبزوێنی خۆی و چوونە دیداری ئەحمەدخانی دونبولی و ویست و ئامانجی خۆیان پێڕاگەیاند، ئەحمەدخان بە تووڕەیی کەوتە سەرکۆنەیان و گوتی کاری ئاوا ناجەیاز و ناڵەبار هەر لە ئەفشاران دەوەشێتەوە و کەسی دیکە ئەوەندەی شوو لێهەڵناکێشێ. بۆ چما لە لێپرسینەوە و هەڵپێچانی عەلیمرادخانی زەند ناترسن؟ برایمخان ئەم قسانەی لە دڵی گران هاتن و دیسان دەماری بزووت و وڵامی داوە کە ئێمە بە یارمەتی خودای گەورە پشتئەستوورین و لە عەلیمرادخان و کەسانی دیکە ناترسین و سەریان بۆ شۆڕ ناکەین. ئەحمەدخان بە قسەکەی خۆی تەریق بۆوە و هێدیتر دوا و کەوتە دڵدانەوەیان و گوتی ئەمڕۆ میوانی منن، سبەینێ کاغەزتان دەدەمێ و پیاوتان ڕەگەڵ دەخەم هەتا محەممەدقولیخان لە سەڵماسەوە بەرن. برایمخان گوتی پێویستمان بە حوکم و چاودێری تۆ نیە بە پشتیوانی خودای مەزن... ئەمەی گوت و لەگەڵ پۆلی هاورێیانی خۆیان هاویشتە سەر خوانی زین و بە سەرڕەو چوونە دیلمەقانی سەڵماس و بە خۆشی و ناخۆشی محەممەدقولیخانیان لە چنگ پاسەوانانی دەرهێنا و بە غار و برتاو بەرەو ورمێ بوونەوە. نیزیک تاریکانێ گەیشتنە گوندی «قەرەلەر» و لایان دا. بۆ سبەینێ ورد و درشتی خەڵکی شار بە لێشاو چوونە پێشوازی و زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە هێنایانە نێو شار و لەسەر تەختی حکوومەتیان دانا.

## محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگ

وەکوو پێشتر ئاماژەی پێکرا لە ئاخری مـانگی جیمـادی یەکـەمی سالـی ۱۱۹۸ی کۆچی/ ۲۲ی ئاوریلی ۱۷۸٤ی زایینی‌دا، محەممەدقولی‌خان بە پشتیوانی و یەکگرتوویی خێلی ئەفشار توانی لەسەر کورسی دەسەلاتی بەگلەربەگایەتی پاڵ بداتەوە. جەماوەر و خێلاتی سەرسنووران هەموویان بە هێنانی دیاری ڕوویـان کردە بارگای دەسەلاتی و هەرکامەیان چـۆنی پێویـستە ئـاوا بەسـەرکرانەوە و چاکەیان لەگەڵ کرا. محەممەدقولی‌خـان هێـشتا لـە هـەڕەتی لاوی‌دا دەژیـا و پێی‌خۆش بوو بە شادی و کامەرانی بیگوزەرێنێ و هەر لە سەرەتاوە بـەگوێرەی سرشتی خۆی شانی شل کرد بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی قەڵـەمڕەوی ژێـر دەسەلاتی و چاوی بە پلە و پایەکانی حکوومەتی‌دا گێڕا. مـیرزا ئەبولحەسـەنی عەبدولمەلیکی ناسراو بە ئیمانلووی لەسەر کاری خۆی هێـشتەوە و لـە پلـەی سەرۆکایەتی بەشی پیتاک و داهات لای‌نەدا. عەسکەرخانی بـاوکبراشـی هـەتا پلەی ئێشیک‌ئاغایەتی پێهەڵبرد. میرزا مستەفای ئەفشاری سـەعیدلووی کـردە سـەرۆکی دیـوانی حیـسابات. نازنـاوی «ئەنیـسولحەزرەت»ی دا بـە ئەفراسیاب‌سولتانی سەرۆکی عێلی زەرزا کە پیاوێکی وریا و تێگەیـشتوو بـوو. گەورەپیاوانی سەردەمی دەسەلاتی بریتـی بـوون لـە: ۱- بەڕێز میروەحیدئاغای کوڕی خوابەخـشیو مـیرزا حوسـێنی شێخولئیـسلامی پێشوو کـە لـە ڕیـزی گەورەسەیدان و مەزنەمـەلاکان‌دا خـۆی دەنوانـد و جێـی بـاوکی گرتبـۆوە. ۲- مامۆستا مەلا محەممەدحوسێنی کوڕی مەلا مووسـاڕەزا کـوڕی قـازی ئاغـاڕەزا ئیمامجومعەیەتی ورمێی بە ئەستۆوە بوو. ۳- ڕێزدار ئاخوند مەلا سەفەر ناودێر بە نیزامەددین کە گەلێ ساڵ لە «خـەتا» و «خوتـەن» خوێنـدبووی و تێیـان‌دا

گەڕابوو. ٤- مێژایانی بەرزەجێ مەلا محەممەد و مەلا عەلی کورانی خودالێخۆشبوو مەلا محەممەدباقری ئەفشار کە گرێوگۆڵ و کاروباری شەرعیان جێبەجێ دەکرد. ٥- ڕەحیمخانی کوڕی نەقیخانی قاسملوو. ٦- مەحموودخانی کوڕی موئمینخانی ئەفشاری سائینقەلا. ٧- ئەللایاربەگی ئەفشاری ئەرەشلوو. ٨- حوسێنقولیبەگی ئەفشاری ئەرەشلوو. ٩- محەممەدتاهیرسولتانی کوڕی شەهریارخانی گۆندوزلوو. ١٠- محەممەدبەگی کۆهەکلوو ١١- حوسێنبەگی قەرەحەسەنلوو. ١٢- نەورۆزعەلیسولتانی ئەرەشلوو. ١٣- حوسێنبەگی قووزیوەند. ١٤- سەفیبەگی بوورغانلوو. ١٥- بابابەگی عەرەبلوو. ١٦- عەبدوڕڕەزابەگی قوتەلوو. ١٧- میرزا خانبەگی خەلەج. ١٧- ئاغاجانبەگی خەلەج، کە ئەو چاردەی کەسەی دوایی هەموویان سەرکردە و سەرهێز و سەرۆکی تیرە و تایفەی خۆیان بوون. ئەمانە وێڕای کەسانێکی دیکە دەستەونەزمری ڕاوەستان و کەوتنە خزمەت کردن و هەڵبژاردنی لاوانی ئەفشار و لە مەیدانی جەرگەقەلای حکوومەتیدا مەشقیان پێدەکردن و بۆ چاونەترسی ڕایاندێنان. میرزا ئاغورلوو ناودێر بە «حیرەت» کە کوڕە گەورەی خوابەخشیو میرانبەگی ئەرەشلوو بوو، لەبەروەی پێشتر زۆری زەحمەت بە فێرکردن و بارهێنانی منداڵەکانی ئیمامقولیخانەوە کێشابوو، پلەی مەزنەمەلایەتی باربوو کرا. لەم بەینەدا و لە سەرەتای مانگی محەڕڕەمی ئەم ساڵەدا، نەجەفقولیخانی دونبولی بەگلەربەگی تەوریز نەخۆش کەوت و تێکهەڵگلا و پاش پازدە ڕۆژان، ~وی هەینی لای بەیانی چوو بەرەوپیری بانگەوازی گەڕانەوە [بۆ خەزێنەی یەزدانی].[1]

پاش کۆچیدوایی نەجەفقولیخان، خەڵکی تەوریز خودادادخانی کوڕیان لە جێی دانا و بردیانە سەر تەختی دەسەڵات و خۆیان لە خزمەت کردنی هەڵکرد.

---

1 - لێرەدا چەند شێعرێکمان هەڵقرتاند. م . ب

خودادادخان دوای چەند ڕۆژێک کەوتە سەر فیز و هەوای جەوانی و دەستی کرد بە زولم و زۆرەملی و خەڵکی تەورێزی تەفرە دا و دەرگاکانی دادەوانی و پارسەنگ ڕاگرتنی قفڵ کردن. هەر بۆیە جەماوەری تەورێز بە دنەی دەمراستی شار لێیهەڵگەڕانەوە و وردەوردە ئاگری دژایەتی گرفەی هات.

سادقخانی کوڕی عەلیخانی شوقاقی کە یەکێک بوو لەو کەسانەی ئەو سەردەمە بانگەشەی حکوومەت و فەرمانڕەوایەتی دەکرد، بە مەبەستی گرتنی تەورێز لە شارۆکەی سەرابەوە لەشکری دەنگ دا و خودادادخان کەوتە نێو گێژەنی ترس و دڵەڕاوکە. بە تەگبیری لایەنگرانی و ئاغاعەلیمحەممەدی تاجرباشی تەورێز دیارییەکی شیاو و بەرچاوی نارد بۆ محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ و داوای یارمەتی لێکرد. بەگلەربەگیش ڕەزامەندی دەربڕی و دووهەزار سواری بە سەرکردایەتی برایمخانی ئەفشار نارده فریا و یاریدەی خودادادخان. برایمخان کەوتەڕێ و لە ناوچەی تەسووج تووشی ئەحمەدخانی دونبولی بوو کە وێڕای قۆشەنی دەچوو بە کۆمەکی خودادادەوە و پێکەوە تەپیان دایە سەر سادقخانی شوقاقی. ناوبراو بە بیستنی ئەم هەواڵە تۆقی و بەبێمرادی لە تەورێزەوە گەڕایەوە سەراب و خەڵکی تەورێز لە هەڵای هێرش خەلەستن. خودادادخان چۆن جوان و چاکە ئاوا بوو بە خانەخوێی ئەحمەدخان و برایمخان و بەوپەڕی گەرموگوڕی میوانداری سپای خۆی و ئەفشاری کرد و بە دەورەیاندا هات.

## کۆچی‌دوایی عەلی‌مرادخانی زەند؛

## گوێزرانەوەی دەسەڵات بۆ جەعفەرخان؛ سەرهەڵدانی خێڵی هەکاری و ڕاسپێردرانی برایم‌خان بۆ داکووژاندنی ئەم ئاژاوەیە و دەرکەوتنی ئاغامحەممەدخانی قاجار

لەم سەروبەندەدا خەبەر هات کە عـەلی‌مرادخـانی زەنـد لـە ئیـسفەهان مردووە و دەستی لە داوێنی دنیای نەمێن بـەرداوە و تـاج و تـەختی ئامانـەتی بەجێ‌هێشتووە بۆ سادق‌خانی دایـک‌بـرای. خوابەخـشیو حـاجی سـولەیمانی سەباحی بیدگولی، سالی مردنی ئاوا بە شێعر هیناوەتەوە:

نووسی قەلەمی سەباحی لە کۆشکی سولتانی

ڕۆیەدەر عەلی‌مراد،[1] جێی گرتەوە جەعفەرخان

بە بلاوبوونەوەی ئەم هەواڵانە دووبارە جیهانی مەنـد و هێـدی شـلەژا و سـەربزێوانی ئەوپەڕەوپـەڕان وەخۆکـەوتن و کردیانـە هـەرا و نانـەوەی دووبەرەکایەتی و پەلاماردانی ئێرونەوێ. بۆ وێنە خێلی هەکاری دەستیان درێـژ کـردە سـەر ناوچـە و مەڵـبەندەکانی ورمـێ و گـەلێک نالـەبار جووڵانـەوە. محەممەدقولـی‌خـانی بەگلەربـەگ بـە ئامـانجی بەرپەرچدانـەوەیان بەپەلـە قاسیدێکی نارده لای برایم‌خان کە هەرچی زووە لە تەورێزەوە بگاتێ و بە ڕێگای سەلماسدا لەگەڵ هێزەکانی بچێتە سەر «ئالباغ»ی نیشتمانی خێلی هـەکاری و

---

1 - «عەلی‌مراد برون شد، نشست جعفرخان»، دەبێتە سالی ۱۱۹۹.

ئەوەندەی بۆی دەکرێ تێیانسرەوێنێ و زەبریان لێبوەشێنێ. کابرای ڕاسپاردە ڕۆیی و لە مەودای ڕێیەدا تووشی برایمخان بوو کە لە تەوریزەوە دەهات و ئەرک و فەرمانی پێڕاگەیاند و ئەویش لەڕێوە گوتی بە چاوان و بە هەڵێکی لەباری دانا. بە شانی سەلماسدا وەکوو برووسکە و با تێپەڕی و لە دەشتی ئالباغ ئاگری شەڕ و کوشتاری داگیرساند و خاکی ئەو مەڵبەندەی کرد پێخوستی سمی یەکسمانی. بەناچار خێڵی هەکاری خۆیان لەبەر پەلاماری ئەفشاران بۆ ڕانەگیرا و قوونەدزەیان دایە و چەشنی مار و مێروو بلاوبوونەوە. برایمخان وێڕای شێرانی شەڕانی و دلێرانی بەناوبانگ و هێندێک دەسکەوت و خەنیمەت سەری ولاخیان وەرسووڕاند و گەڕانەوە و لە گوندی ئاوەگەرم شەکەت و ماندوو دابەزین و بنەیان خست و کەوتنە حەسانەوە. بەلام نەیانزانی کە خێڵی تێشکاوی هەکاری دیسان هێزێکیان کۆکردۆتەوە و دوابەدوایان وەکوو لافاوی بەگوڕم یان بەلای لەناکاو کەوتوونە سەریان. وەختایەک برایمخان بە هاواری قەرەوڵان وەخۆ هاتەوە، شاقەلی پالەوانەتی بە لادا کرد و بەرەگەی لەو نێچیرە بەختوەرگەڕاوانە گرت. هەر کە هێزەکان تێکهەلەنگووتن گەنجانی چوست و چالاک و بوێری ئەفشار بە نووکەنێزەی گیانئەستێن و بە زەبری شیری ئاگرپژێن بەڕاستی ئازایەتییان نواند و ئاخرییەکەی شنەی سەرکەوتن قژی ئالای ئەفشاری لاواندەوە. کوردانی هەکاری پۆلێکیان لێکوژرا و زۆربەیان ئەنگوان و دیسان زەرەرمەند و خەساربار ڕایانکرد. برایمخان بە خۆی و هێزەکانی هەتا سێ فرسەخان هەزارەزبلەی [کوردانی] هەڵبڕی و بە دەستی پڕەوە گەڕایەوە ناوچەی ئەنزەل و لەوێ خەنیمەتەکانی دابەشی و چەند سەرکردەیەکی بە مەبەستی ڕاگەیاندنی هەواڵی سەرکەوتن ناردە خزمەت محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ. ئەویش حوکمی پاراستنی سنووران و چاوەدێری جەماوەری بۆ بەرێکرد. برایمخانیش کۆگرچینقەلای قەرەباغی ئەنزەلی کە بۆ سەختی و بەرزی و لەمێژینەیی ناوبانگی لەوپەڕوپەڕی هەرێمان دەنگی

داوەتەوە، کردی بە بنکەی دەسەڵاتی. بەڵام لەم لایەوە ئەو سەرکردانەی کە چووبوونە خزمەت محەممەدقولیخان چاکەیان لەگەڵ کرا و خەڵاتی چاکیان درایە.

پێشتر باسی کرا کە دوای نەمانی عەلیمرادخان دەسەڵاتی ئامانەتی و لەرزۆک و خۆنەگری ئێراق و فارس، دەستاودەستی کرد بۆ شێخالیخان و جەعفەرخان. لەو ڕۆژگاریدا زەند کەوتنە کێشە و دووبەرەکایەتی و شیری دوژمنایەتییان لێکتر هەژاند و لە ماوەیەکی کەمدا هیچیان بە یەکترەوە نەهێشت و هەموویان کوژران و تەنیا لوتفعەلیخانی کوڕی جەعفەرخان توانی بە سلامەتی بۆی دەرچێ. بەڵام لەو لاوە ڕێزدار ئاغامحەممەدخانی کوڕە گەورەی محەممەدحەسەنخان کە تا ئەم کاتە لە مازندەران بوو بە بیستنی ئەم خەبەرانە وەکەیف هات و هارووژا. لەبەروەی خۆی بە شایانی پادشایەتی دەزانی، هێندە هەڵسوورا و بە چیری و چڕی تێراچوو کە توانی جەعفەرخانی زەند بشکێنێ و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی پاڵ بداتەوە و کتێبەکانی مێژوویی بە دوور و درێژی باسیان کردووە.

## شەڕی محەممەدقولیخان لەگەڵ سادقخانی شوقاقی بە سەرکردایەتی برایمخان

پێشتر باسی کرا کە سادقخانی شوقاقی حاکمی سەرابی گەرمڕوود بە ئامانجی گرتنی تەورێز لەشکری دەنگ دا، بەڵام ئەفشار و دونبولی چوونە یاریدەی خودادادخان و ئەویش هیچی بۆ نەکرا و گەڕایەوە. لەم ساڵەشدا دیسان بیری گرتنی تەورێز داڵغەی لە مێشکی دا و بە لەشکرێکی زۆر و زەوەندەوە هات و کەمەندی گەمارۆی هاویشتە دەوری قەڵای شار. مەزن و ماقووڵانی تەورێز بە دەستووری پێشوو ئاغاعەلیمحەممەدی تاجرباشییان بەڕێکردە لای محەممەدقولیخان و پێنجهەزار تمەنیشیان بە دیاری بۆ نارد و داوایان لێکرد بێتە هانایان. دیاری و داوای تاجرباشی وەرگیران و حوکمێکی نووسی بۆ برایمخانی ئەفشاری سەرۆکی ئەنزەل کە بە سێهەزار سوارە و پیادەی ئەفشارەوە بچێتە کۆمەکی خودادادخان و ئەگەر دیسانیش سادقخان هەڵات دەبێ برایمخان دەستی لە دوو نەکاتەوە و هەتاکوو سەراب جڵەوی ئەسپی نەکێشێتەوە.

بەمجۆرە برایمخان فەرمانی حوکمڕانی بەجێهێنا و هەر کە گەیشتە تەورێز هەمیسان سادقخان خۆی بە مەردی مەیدانی نەزانی و دەرپەڕی. برایمخان هەتا خاکی سەراب کەوتە شوێنی و ئەگەرچی دەستی نەگەیشتە سادقخان، بەڵام ئەوەندەی توانی پەنجەیەکی وەشاند و پاشان گەڕایەوە تەورێز و لەوێ بنەی داگرت و چاوەڕوانی فەرمانی تازە ڕاوەستا. لەو سەروبەندەدا محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ورمێ پیاوی ناردە لای

ئەحمەدخانی موقەددەمی حاکمی مەراغە و داوای لێکرد کە وەکوو دیاری وشکەپوولێکی بەرچاوی بۆ بنێرێ. ئەحمەدخان بە گوێی نەکرد و نێرپراوەکەی بەگەربەگی بە دەس‌بەتاڵی ناردەوە. ئەویش فەرمانێکی نووسی بۆ برایمخان کە بەو هێزەی ئێستا لە ژێرکێفی‌دایە بچێتە مەراغە، خۆشی چەند رۆژێک لە مێرگ و جێ‌لەوەڕی گوێکتەپە لەنگەری گرت هەتا قۆشەن کۆ بکاتەوە. حوکمی ناردن بۆ بوداقخانی موکری حاکمی سابلاغ و هۆزی بلباسی لاجان و نووحەبەگی سەرۆکی خێڵی زەرزای شنۆ و میرزائاغای بشکوفتی[1] و داوای کرد کە هەموویان بە هێزەوە بگەنێ و تاوڵ و خێوەتیان لە دەشتی سندووس هەڵدەن.

1 - نووسەر لە تەواوی دەقەکەدا بە «شکوفتی» هێناوە، بەڵام دروستەکەی «بشکوفتی»یە.

## شەڕی محەممەدقولیخان لەگەڵ ئەحمەدخانی موقەددەم

کاتێک ئەحمەدخان ئەم هەواڵانەی بیستەوە بە لەشکرێکی بێژمارەوە لە مەراغە وەدەرکەوت و ڕووی کردە مەیدانی بەرەنگاری. هێشتا قوناخێک دوور نەکەوتبۆوە کە خەبەریان بۆ برد ئەوە برایمخانی ئەفشار ئێستا بەڕێی دێخورگاندا بەرەو مەراغە بەڕێوەیە. هەر بۆیە ئەحمەدخان سەری یەکسەی وەرسووڕاندەوە و لە نێو قەڵای مەراغەدا مەتەرێزی داکوتا و دەورەی درا. بەپێی ئۆستایەتی و دراوسێیەتی تکای لە سادقخانی شوقاقی کرد کە یاریدەی بدا و ئەویش بە قۆشەنی خۆیەوە بەرەو مەراغە بزووت. بەڵام وەختایەک دیتی سوارە و پیادەی برایمخان ڕێگایان تەنیوە. لە نیزیک ئاوایی خورخورە پەنای بردە قامیشەڵانێک. لەو جەنگەدا قەرەولەکانی خەبەریان دایە کە دەستەیەکی هۆزی بڵباس چوون و دێهاتەکانی مەراغەیان تاڵان کردووە و ماڵێکی بێئەندازەیان هێناوە و لەبنەوپاڵەوە خەریکی حەسانەوەن و ئاگایان لە مەحموودی بێزەواد نیە. سادقخان کە وای زانی هەلەکەی خواستەوە و چەشنی شێر لە قامیشەڵان دەرپەڕی و وێڕای پۆلێک پەلاماری بڵباسانی دا و چونکە زۆربەیان لە خەوی بێخەبەریدا بوون، شیری تیژی دەمنەپارێزی تێنان و ئەوەندەی دستوبرد و ئازایەتی نواند کە تەنیا کەسێکیان توانی دەرباز بێ و ئەوانی دی هەموویان نوقمی دەریای مەرگ بوون و پشوویان لێبڕا.

پاشان سادقخان دەسکەوت و ئەسپ و چەکوچۆڵی بلباسانی وەبەر خۆی دا و لە یارمەتیدانی ئەحمەدخان پەشیمان بۆوە و بەرەو سەراب گەڕایەوە. محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ هێشتا لە سندووس جووڵەی نەکردبوو کە ئەم هەواڵەی پێگەیی و زۆری پێناخۆش بوو کە ئەم نێچیرە توانیویەتی لەو داوە

دەرباز بێ. ئەوسا دووبارە کاغەزێکی نووسی بۆ برایمخان کە ئەنگە بە ئەحمەدخانی موقەددەم هەڵچنێ و تۆڵەی بلباسانی لێبکاتەوە.

ئەحمەدخان وەختایەک دیتی کە لە دوو لاوە سێلاوی بەڵا دەورەیان داوە چەند کەیخودا و نامەی ناردن بۆ محەممەدقولیخان و داوای ئاشتی و پێکهاتنی کرد و خۆشی بێ و ناخۆشی بێ سەری بۆ دانەواند کە خەراجی بداتێیە و بەڵێن و پەیمانی نێوانیان بە سوێندی پتەو داگیرسا. هەر بۆیە برایمخان فەرمانی گەڕانەوەی پێدرا و لە ناوچەی سندووس گەیشتە خزمەت بەگلەربەگ و نێو هۆردووی ئەفشار. دوای چەند ڕۆژان ئەو سەرۆک هۆز و عەشیرەتانەی کە هاتبوون هەرکام بەپێی پلە و پایەی خۆیان خەلاتی چاکیان درایە و پاش بەسەرکرانەوە و خوێندرانەوە، ئیزنیان لە بەگلەربەگ وەرگرت و گەڕانەوە مەوتەنی خۆیان. برایمخانیش بە دابی جاران گەڕایەوە جێگای خۆی و لە گۆگرچینقەڵا کەوتەوە سەر کاروباری سەرکردایەتی و پاراستنی ناوچەی ئەنزەل.

## تێچاندنی ئەحمەدخانی دونبولی بۆ برایمخانی ئەفشار و کوێرکردنی ئەو سەرکردە ئازایە بە دەست محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ

ئەحمەدخانی دونبولی حوکمڕانی خۆی هەر لە کۆنەوە برایمخانی ئەفشاری ناخۆش دەویست و دەیبوغزاند. لەم ماوەیەدا لێدانی خێڵی هەکاری و گەمارۆی شاری مەراغە و گوێبادانی سادقخانی شوقاقی و زەبروەشاندنەکانی برایمخان لە تەوریز ئەوەندەی دیکەیان سندووقی سینەی خانی دونبولی لە کینەی ئاخنی. جا لەبەروەی کە گەشەی کاروباری محەممەدقولیخانی ئەفشار و سەربەخۆیی دەسەلاتی ئەوی دەبردەوە سەر ئازایەتی و هونەر و جەوهەر و لێوەشاوەیی برایمخان و بە چاوی خۆشی دەبدیت، لە دەرفەتێک دەگەڕا کە بە هەر فێڵوفرتێکی بۆی بکرێ ناوبراو لەبەرچاوی بەگلەربەگی ساویلکە بخا. لە رووی ئەم تێبینی و بۆچوونانەوە دەرگای دۆستایەتی و یەکێتی لەگەڵ محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ کردنەوە و کەوتە ناردنی کاغەز و ڕاسپاردە و دیاری و خەلاتان و کچێکی خۆشی دایە. لە قاقەزێکدا کە ئەحمەدخان بۆ زاواکەی خۆی ناردبوو، وای تێهێنابوو کە برایمخان تەواوی ئەم سەرکەوتنانەی لە بەخت و چارەی بەگلەربەگ نووسراون، بە هونەر و شارەزایی و لێوەشاوەیی خۆی دادەنێ. بۆیە وا دیارە کە هەلمی خۆبەزلزانی و بادیهەوایی لە مێشکی پووک و بێلێکدانەوەی هەڵدەستێ و خودبەسەر کاری وا نالەبار دەکا کە خەسارەتی قورسی لێدەکەوێتەوە. ئادەمیزادی ئاوا نابێ هێندەی جڵەو بۆ شل بکرێ و پشتی پێببەسترێ، چونکە بەرژەوەندی دین و دەسەلاتی تێدا نیە. من لە رووی دڵسۆزی و چاکەوە ئەوانەم گوت و ئیدی ئیختیار بە دەست خودی

بەگەربەگە. ئەم شینەدرۆ و هەڵبەست و تۆمەتەی ئەحمەدی دونبولی سەبارەت بە برایمخانی ڕووڕاست و بێپێچوپەنا کە لەبەر چاوی وردبینان دەتگوت مزی زێرکفتە، لە بۆتەی دڵی بەگەربەگی گەنجی کاڵفامدا وەکوو نەخشێکی کە لەسەر بەرد هەڵکەندرێ ئاوای جێگرت و لەو بێچارەی بێخەبەرە کەوتە درۆنگی. بەتایبەت کابرای ڕاسپاردە و نامەبەری ئەحمەدخان لە دەرفەتێکدا کەوتە شەیتانی و شۆفاری و ئەوەندەی دیکەی پێوەنا و خانی ئەفشاری هەڵفریواند و لە ڕێگای ڕاستی ترازاند. دوای چەند ڕۆژێک بەگەربەگ بە بیانووی ڕاوی خاسەکەو ڕووی کردە ناوچەی ئەنزەل و ڕووداوێکیش باوی هەنگاوی خۆشتر کرد. برایمخان کە بیستبوویەوە ئەحمەدخان بۆی تێچاندووە هەر بە دوژمنایەتی کاروانی خۆیەی ڕووت کردبوو لە کەلی قوشچی و چەند کەسێکیشی هەڵداشتبوونە هەرێمی نەمان. بەکورتی کاتێک محەممەدقولیخان گەیشتە ناوچەی ئەنزەل، برایمخان لە گۆگرچینقەڵاوە وێڕای ئاپۆرایەکی بەرچاوی جەماوەر چوو بەرەوپیری و بە خزمەتی گەیشت و بەخێری هێنا و زۆر چاکی میوانداری لێکرد. بەگەربەگ بەڕواڵەت هیچی وەسەر خۆی نەهێنا و چەند ڕۆژێک چووە سەیران و ڕاوەکەو و لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ناوەندی دەسەڵاتی، ناوبراویشی لە ڕکێفی خۆیدا هێنایە ورمێ.

دوای چەند ڕۆژێک مانەوەی برایمخان لە ورمێ، بەیانەیەک کە سەرسەرای حکوومەتی بێگانەی تێدا نەبوو، بەگەربەگ ناوبراوی بانگهێشتە ژوورێکی چۆڵ و مستەفاقولیخانی کوڕە گەورەی خۆی کە هێشتا زۆر منداڵ بوو ناردی بۆ لای برایمخان و لە پێشدا فێری کردبوو کە بە بیانوویەک داوای کێردی بەرپشتێندی لێبکا. وەختایەک مستەفاقولیخان چووە ژوور و سەلامی کرد، برایمخان لەبەر کوڕی سایەچەوری خۆی هەستا و گرتی و لەسەر ڕانی خۆی

دانا. بەگەربەگزادە بەپێی ڕاهێنانی باوکی و چاو لێهەڵتەکاندنی ئاتابەگی[1] خۆی کە دەستەونەزەر ڕاوەستابوو، پەری بە کێردی بەرپشتێندی برایمخاندا کرد و دەریهێنا و ڕۆیی! برایمخانی چارەڕەش کە بە کار و خزمەتەکانی خۆی دەنازی، هەر هیچ خەیاڵێکی خراپی بە دڵیدا ڕانەبرد. لەو کاتەدا ساقیبەگی سەرفەڕاشی فەڕاشخانەی حکوومەتی وێڕای چەند فەڕاشێک لێیوەژوور کەوتن و لە برایمخانیان ڕاخوڕی کە بەگەربەگ ئێمەی ڕاسپاردووە هەردک چاوت بکۆڵین کە دنیای ڕوونیان پێدەبینی. برایمخان هەناسەیەکی ساردی لە دڵی پڕ ژان و دەردەوە هەڵکێشا و گوتی بەڵێ با وابێ و ملم کەچە. بەڵام هەر لەڕێوە گەورەی من لەم کارەی پەشیمان دەبێتەوە و لە ئەژنۆی خۆی دەدا! دەی فەرموون ئەرکی خۆتان بەجێبێنن و لە کۆنیشەوە گوتوویانە ڕاسپاردان چیان لەسەر نیە. خێرایەکی ساقی و یارانی بە[قەڵەمبڕیکی تیژی سەر بە قولاپە] کە پێی دەڵێن گوێزلک هەردوو چاوی ئەو سەرکردە دلێرەیان لە قاپێلکان دەرهێنا و گلێنەکانیان بردە لای بەگەربەگی دڵڕەش و هەرکە دیتنی لەڕێوە پەشیمان بۆوە و حەکیمی دانا کە چارەسەری بکا!! بەڵام تازە بێفایدە بوو. برایمخان سزای ئەم کارەی کە بە دنە و تێچاندنی ئەحمەدی دونبولی کرابوو، دایە دەست تۆڵەئەستێنەوەی ڕاستەقینە[کە یەزدانە] و هێندەی پێنەچوو کە ئەحمەدخانی دونبولیش داری لە ڕووحی درا.

---

[1] - ئەتابەک. ئەو کەسەی پەروەراندنی کوڕی پاشایان و میران و گەورەپیاوانی بە ئەستۆوە بووە. لەلەی ماقووڵ.

# کوژرانی کارەساتباری ئەحمەدخانی دونبولی

ئـەم کورتـەڕووداوە بـە دوور و درێـژی ئـاوای بـاس کـراوە و دەڵـێن تاهیرئاغا، زاهیرئاغـا، مەهـدیئاغـا و ڕەزاقولـی کـە هـەموویان ئـامۆزای ئەحمەدخان بوون و هەتا ئێستا بەناچاری پەرەوازە کەوتبوونەوە و لە هەرێمی ئێراق دەژیان و پێشتر لەگەڵ ئەحمەدخان لێک مکوڕ بـوون، بارگـە و بنـەیان پێچایەوە و گەڕانەوە زێد و نیشتمانی خۆیان کە مەڵبەندی دڵبزوێنی خۆیە بێ. پاش ماوەیەک کە لە دیدار و سەردانان بوونەوە، ڕۆژێکی تاهیرئاغا میوانییەکی لە ماڵی خۆی ڕێکخست و ئەحمەدخان و کوڕەکانیشی بۆ شێوی شەو بانگهێشتن کرد. بەڵام بەر لەوەی ئەوان بێن بەپێی ڕاوێژ و کاکەوبرالـەی نێوانیـان چەنـد کەسێکیان بە چەکوچۆڵەوە لە هۆدەیەکی دیکە مەڵاس دابوو هەتا لە جەنگـەی خۆیدا دەست بە کار بن. کەچی ئەحمەدخانی بەختوەرگـەڕاوە و کـوڕانی بـەم پیلانەیان نەدەزانی. کاتێک کەوڵی نانخواردن ڕاخرا ئەو چەند کەسە وێکڕا بـە ئاماژەی تاهیرئاغای خانـەخوێی دڵـڕەق لێیـان وەژوور کـەوتن و تەقـەیان لێکردن. هەر لەڕێوە کەڵبالیخان ومحەممەدخان ئەنگێوران و کوژران و دەستیان لە گیان و داوێنی ژیان بەردا. ئەحمەدخان خۆی لە پەنجەرەی ژوورەوە فـڕێ دا دەرەوە بەڵکوو هەڵێ و ڕزگار بێ، بەڵام چەند کەس کەوتنە شوێنی و لە کـۆڵان گەیشتنە سەری و کوشتیان و وەکوو مەڕ سەریان گۆشاوگۆش بڕی. «سـا ئێـوە دەرس وەرگرن، ئەی گرۆی خاوەن ئاوەزان!»[1] کوڕێکی دیکەی کە سولەیمانخان بوو دەرپەڕی و گەیشتە حـەمامێکی ئـەو دەوروبەرانـە کـە مـلکی خـۆی بـوو. بەهەڵکەوت ئەو ڕۆژە نۆرەی ژنان بوو، ئەویش خۆی لە نێودا شاردنەوە، بەڵام

---

1 - « فاعتبروا یا اولی الابصار »، قورئـانی پـیرۆز، سـوورەی حەشـر، ئایـەی ۲، ل ٥٤٥، وەرگێڕاوی ماموستا هەژار...

تاقمێک لەو بێشەرمانە خۆیان بە زووریدا کرد و هەر لەوێ بە رووتی جلوبەرگی ژیانیان لەبەر دارنی. حوسێنقولیخانی کورە گەورەی ئەحمەددخان لە پەنایەک خۆی حەشار دا. بەڵام جەعفەرقولیخانی برا چووکەی بە سەری رووت و پای پەتی هەڵات و لە دەرەوەی قەڵا کەتەبارگینێکی لە کابرایەکی چاڵاوپاکەرەوە بە کرێ گرت و لە جەرگەی شەودا بە هەزار کوێرەوەری و بە لەقەلەق خۆی گەیاندە شاری شادیهێنی ورمێ[1] و رووداوەکەی بۆ محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ گێڕاوە. خانی ئەفشار یەکجار زۆری پێناخۆش بوو. هەربۆیە کۆمەڵێک لە فەرماندەرانی ئەفشاری هەڵبژارد و لەگەڵ جەعفەرقولیخانی دونبولی ناردنی بۆ تەزاندنی بکوژانی ئەحمەددخان و [کوڕانی] کە بریتی بوون لە: محەممەدبەگی قەرەحەسەنلوو، حوسێنبەگی قەرەحەسەنلوو، شامحەممەدبەگ و ئاغاجانبەگی کۆهەکلوو، تاهیرسولتانی گۆندوزلوو، محەممەدحەسەنبەگی مەحموولووی کوڕی ئەبولمەعسوومبەگی کورەمامی دایکی منی رەشکەرەوەی ئەم رووپەڕانە و هەروەها مەحموودخانی کوڕی موئمینخانی ئەفشاری ساینقەڵا کە بوو بە سەرکردەیان. لەو لاوە پیاوکوژانیش لە دەورەی تاهیرئاغای ناپاک کۆبوونەوە و لە نیزیک پردی «خاتوون» و داوێنی کێوی «غەزەنفەر» چاوەڕوان بوون. کاتێک هەردک قۆشەن تێکهەڵەنگوتن، سوارانی خێڵی ئەفشار بە دابی خۆیان دەستیان برد بۆ چەکوچۆڵان و هەڵیانکوتایە سەر دونبولییەکان و لە ماوەیەکی کەمی تێکهەڵچووندا، دونبولی خۆیان بۆ رانەگیرا و بەناچار دەرپەڕین و رەوین و ئەفشار کەوتنە سەریان و خۆیان بە خۆیەدا کردەوە. لەو گرمە و هەرایەدا تاهیرئاغا و زاهیرئاغا کە خۆیان پەنادابوو وەدەرکەوتن و بە سزای خۆیان گەیشتن و هەرچی لە پاشیان بەجێمابوو دەستی بە سەردا گیرا. بەڵام

[1] ورمێ بە «دارالنشاط» ناسراوە.

ڕەزاقولیبەگ لە ترسی گیانی، بە کێردی بەرپشتێندی لـە کلاوقووچەیـەکی جەرگەقەلادا خۆی کوشت و وازی لە ژیان هێنـا. هەروابێتـەوە مەهـدیبـەگ و تێکڕای تاوانباران هەرکام بە خراپترین شێوە تۆڵەیان لێئەستێندرایەوە. ئەوسا مەحموودخان بەگوێرەی پەسند و فـەرمانی محەممەدقولـیخـانی بەگەربـەگی ئەفشار، حوسێنقولیخانی کوڕە گەورەی ئەحمەدخانی خوابەخشیوی لە جێـی باوکی دانا و کردی بـە حوکمـڕان و وێـڕای سـەرکردەکان و سـوارانی ئەفـشار گەڕانەوە ورمێ. جەعفەرقولیخان هەتا لێواری ڕووبـاری «زولـە»ی سەڵـماس بەڕێیکردن و لەوێوەڕا گەڕایەوە خۆی.

## دژایەتی قەرەنیئاغای [مامەش] لەگەڵ بوداقخانی موکری حاکمی سابلاغ و بزووتنی محەممەدقولیخان بە مەبەستی چزاندنی

ساڵی ۱۲۰۱ی کۆچی/۱۷۸٦ ـ ۱۷۸۷ی زایینی، بوداقخانی موکری دوای ئەحمەدخان بە ئاماژەی محەممەدقولیخان بوو بە حاکمی سابلاغ. جا لەبەروەی کە هەر لە کۆنەوە ناوچەی لاجان سەر بە خێلی موکری بوو، هۆزی بلباس هەموو ساڵێک برێکی دیاریکراویان وەکوو دیاری بۆ دەناردن. ئەمساڵیش لەسەر پێوشوێنی پێشوو راسپاردەیەک لە لایەن بوداقخانەوە چوو بۆ لای قەرەنیئاغای [مامەش]ی مەزنی [بلباسان] هەتا ئەوەی قسەی لێکراوە وەربیگرێ. قەرەنیئاغا کە لە سایەی خزمایەتی لەگەڵ بەگلەربەگی ئەفشار دەسەڵات و شەوکەتێکی پێکهێنابوو، خۆی لە دانی پاراست و کەوتە دەستیەدستی پێکردن و ساوەساو. وردەوردە نێوانی موکری و بلباسان بە باری گرژیدا تلی دا و دووبەرەکایەتی تیژ تەنییەوە. وای لێهات کە قەرەنیئاغا ئاپۆرایەکی کۆکردەوە و لە ناخافڵ هێندێک ناوچە و لادێی سابلاغی تاڵان و بێخوست کرد. بوداقخان کە خۆی سەر بە بەگلەربەگی ئەفشار و داندراوی ئەو دەزانی، بەبێئیزن و سەربەخۆ نەکەوتە بەرەورووبوون و بەرەنگاری و بە دوور و درێژی چۆنیەتی رووداوەکەی بە خزمەت غولامانی بارگای بەرزی راگەیاند. بەگلەربەگ ئەم کارەی لە دڵی گران هات و لێبڕا کە خاشەی بوون و مانی هۆزی بلباس بەجارێک ببڕێتەوە. ئەو کات کاغەزێکی لە ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغە نووسی کە نێوانیان زۆر خۆش بوو و داوای لێکرد بە قۆشەنەوە بێتە یاریدەی. خۆشی چوارهەزار کەسێکی سوارە و پیادەی

ئەفشاری خستە بەرزکێفی و لە چیمەنی دۆڵامەلەری نیزیک قاشقەگەدووک لەشکرگای دانا. لەوێوە عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی ئیمانلووی ناردە ناوچەی سندووس هەتا بە خەبەرێکی بلباسان بزانێ و ئاگادار بێ کە داخوا موقەددەم و موکری گەیشتوونێ یان نا و گەورە کەیخوداکان تێبگەیەنێ. لەو لاوە وەختایەک قەرەنی‌ئاغا بیستی عەسکەرخان هاتۆتە سندووس، ویستی کە لە ڕێگای ئەورا خۆی بگەیەنێتە ڕکێفی بەگەربەگ و داوای لێبووردنی لێبکا سەبارەت بە ڕووداوەکان. بەڵام گەجەروگوجەر و قەلەوقوتەی بلباس ڕازی نەبوون و کەوتنە لاساری هەتا جەماوەری موکری و موقەددەم گەیشتنە سندووس. عەسکەرخان هەواڵی ناردەوە بۆ خزمەت بەگەربەگ و ئەوانیش لە شوێنی خۆیانەوە بزووتن و بەرەو سندووس کشان. دوای شەوەرێک قۆشەنیان بەرەو لاجان دەنگ دا. قەرەنی‌ئاغاش بلباسێکی بێ‌هەژماری کۆکردنەوە و بە مەبەستی بەرەنگاری هاتە بەرەوە. هێزەکان لە قەراغ چۆمی لاوێن بەرەوڕووی یەکتر بوونەوە و دوو دەریای لەشکر هاژان و کەوتنە چەپۆکان و شەپۆلان و گەرد و تۆزی شەڕگە بەرەو ئاسمان باڵی گرت و لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ئێوارەیەکی درەنگ ئاوری شەڕ هەر نێلەی هات و شیر و تیر و نێزە لە کاردا بوون. ئاخرییەکەی خێڵی ئەفشار و موقەددەم سەرکەوتن و بلباس بەرگەیان نەگرت و ژمارەیەکیان لێکوژرا و هەزارەزیلەیان بە شەقوشڕی و زاماری بەرەو دوند و بەرزایی کێوەکان تەقین و یەکسم و خەنیمەت و دەسکەوتێکی زۆری دیکە کەوتە چنگ غەزاکەرانی ئەفشار.

❖❖❖❖

## دژایەتی حوسێنقولیخانی دونبولی لەگەڵ دانی پیتاک و هێرشی محەممەدقولیخان بۆ سەر خۆی

لەم ساڵە سەرانسەر موبارەکەدا، محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ دوای لێبوونەوە لە کاروباری گرینگی وڵات، کەوتە سەر نۆژەن کردنەوە و دانانی شوێنەواری خێر. سەرەتا کەڵتەی حەساری شاری خستە سەر شانی سەرکردەی سوارە محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلووی ئەرمشلوو، کە لە سەردەمی خوالێخۆشبوو کەلبالیخانی ئیمانلوورا هەتا ئێستا لە چەند جێوە کلاوقووچە و شوورەی داڕووخابوون. لێدانی پردی تازەی سەر رووباری بناوی ڕەوزەی خستە ئەستۆی حاجی ڕەمەزانی چاوەدێر و باوەڕپێکراو. گەڵاڵەی دوو باغی خۆش و دڵگری بەرەوڕووی دەروازەی جەرگەقەڵای دارشت و نەمامی لێناشتن و ناوبێری کردن بە باغی قیبلە و باغی نەزەر. هەر لەم ڕۆژانەدا عەلیڕەزاخانی ئێشیکئاغاسی خوالێخۆشبوو ئیمامقولیخانی سەردار، کە وەک پێشتر باسی کرا لەبەر زۆر کاران کەوتبوویە بەر غەزەبی حاکم و بە دوورەپەرێزی دەژیا، میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی مەڵبەندەکە دڵداری دایەوە و خودی بەگلەربەگیش تەشریفی بردە ماڵەکەی و دوای خواردنی ژەمی نیوەڕۆ، کچەکانی عەلیڕەزاخان کە پێنج کەس بوون هەمووی بە دەسگیران کردن. یەکیان بۆ خۆی، یەک بۆ بوداقخانی موکری، یەکێک بۆ عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی. یەک بۆ حوسێنقولیخانی برازای خۆی و ئەوی دیکەیان بۆ قاسمخانی برا چکۆلەی. هەر لەو کۆڕەدا وەک چۆن باوە نوقڵ و شیرینی خورا و مارە کران.

لەم سەروبەندەدا بەگلەربەگ، عابیدینبەگی ئەفشاری بۆ وەرگرتنی باج و خەراجی دیاریکراو ناردە لای حوسێنقولیخانی دونبولی، بەڵام بە دنەی

جەعفەرقولیخانی برای ئەیدا. عابیدینبەگ هاتەوە و چۆنیەتی ڕووداوەکەی گێڕاوە و گوتی وا دیارە دەیانهەوێ بکەونە ملانەش لەگەڵ بەگلەربەگی ئەفشار. محەممەدقولیخان کە ئەم هەواڵە تاڵەی بیستەوە پێیتێکچوو. نامەی بۆسێودووی نووسین بۆ حاکمان و خانانی ئازەربایجان کە خێرایەکی بە هێز و قۆشەنەوە خۆیان بگەیەننە مێرگ و پاوانی دۆرشەکی سەلماس. هەر بۆیە خودادادخانی کوڕی ئەجەفقولیخان لە تەورێزەوە و ئەحمەدخانی موقەددەم لە مەراغەوە و سادقخانی شوقاقی لە سەرابەوە و کەلبالیخانی کەنگرلوو و محەممەدخانی ئێرەوانی کە هەموویان لایەنگر و بەرفەرمانی بوون، دوابەدوای یەکتر گەیشتنێ. بەگلەربەگیش بە سپای ئەفشارەوە لە ورمێڕا بزووت و لە نیزیک کێوی مەنشوور بە مەعدەنی خوێیە دەوار و تاوڵ و خێوەتی هەڵدران و سەریان گەیشتە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان! بە بیستنی کۆبوونەوەی ئەم لەشکرە، شوورەی دڵی جەماوەری سەلماس و خۆیە بەڕاستی کەوتنە لەرزین و هەژان و هەموویان قسەیان کردە یەک و بە حوسێنقولیخانیان گوت کە ئێمە بەرگەی ئەو لافاوی لەشکرەی ئازەربایجان ناگرین. ئەگەر هەروەک پێشوو سەر وەبەر بەگلەربەگی ئەفشار دێنی ئەوە چاکە، بەڵام چما بێتوو بکەویە شەڕ و دوژمنایەتی بە خۆت و کەسوکارەوە دەتگرین و بە دەستبەستە دەتدەینە چنگ محەممەدقولیخان و دەڵێین هەموو پەند و گۆلمەزێک لە کۆڕی تۆ هەڵدەستێ. خۆت دیتووتە کە تێکڕای سەرۆکانی ئازەربایجان سەریان وەبەرهێناوە و تۆش بەڕاستی زەند و مەچەک و داندراوی ئەوی، ملبەملە نابەجێیە. حوسێنقولیخان زانی کە بە باری خێر و چاکە و ڕووڕاستیدا وا دەڵێن، بۆیە ئافەریمی لێکردن و گوتی قسەکەتان وایە. لەڕێوە برایمخانی ئێشیکئاغاسی خۆی نارده لای بەگلەربەگ و پوختەی ڕاسپاردەکەی ئەوە بوو کە ئێمە میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل بە پیاوێکی باش و نیازپاک و مەند و تەواو دەزانین و تکامان وایە کە بینێرنە قەڵایە هەتا سەبارەت بە شەڕ و پێکهاتن لەگەڵی بکەوینە

گفتوگـۆ. بـــەکورتی مـــیرزا ئەبولحەســـەن چـــوو بـــۆ قـــەڵا و لـــە لایـــەن محەممەدقولی‌خانەوە، حوسێن‌قولی‌خان و خانانی خۆی دڵنیا کردموە و وێڕای خۆی هێنانی بۆ نێو هۆردوو. بەگلەربەگی ئەفشار شـادی نوانـد و ڕەزامەنـدی دەربڕی و حوسێن‌قولی‌خانیش سەبارەت بە ڕابردوو کەوتە عوزرخوازی و گوتی:

دەزانی بۆچی، هیچ داروباری قـوم ناکاتن ئـاو
جونکە پێی شەرمە گۆچکراوی خۆی ببینێ خنکاو

کـۆڕی دیـدار گـەرم دامـات و هـەرجارەی باسـی شـتێک هاتـەگۆڕ و لێ‌خۆشبوونیش جێـی‌خـۆی گـرت. پاشـان حوسـێن‌قولـی‌خـان گـوتی دەبـێ محەممەدقولی‌خان و تێکرای سەرۆک و سەرکردەکانی هـۆردوو لـە «داغ‌بـاغی» میـوانم بـن. ئـەو باغـە خـۆش و دڵـبزوێنەی کـە خوابەخـشیو ئەحمـەدخان چەقاندبووی. محەممەدقولـی‌خـان بـۆ تازەکردنـەوەی نـان و نمـەک سـەری ڕەزامەندی لەقاند و تەشریفی بردە وێندەرێ. بەڕاستی حوسێن‌قولی‌خان نـان و چێشت و خوانێکی وەها قورس و جوان و ڕەنگینی ساز کـرد کـە هیچکـەس لـە هۆردووی محەممەدقولی‌خان وەدوا نەدرا و پـارووی بـۆ بـادرا. لـەو جەنگـەدا بوداق‌خانی موکری حاکمی سـابلاغ کـە ئـەویش چەنـد ڕۆژ پێـشتر بـە دوای‌دا نێردرابوو کە بە قوشـەنەوە بگاتـێ، وێـڕای هـەزار شەنگەسـواری نێـزەداری پەڕبەسەر کە شەوکەتیان ڕەنگی دەدایەوە، گەیشتێ و سەری دانەواند و سـڵاوی کـرد لە محەممەدقولی‌خـان و ڕاوەسـتا. بەگلەربـەگ فـەرمـووی کـرد کـە دانیشێ. خانانی ئازەربایجان لە سلم و شکۆی بـوداق‌خـان ترسـان و کێچیـان کەوتە کەولی و هێندەی نەمابوو کە زراویان بتوقێ. بۆیە بەدزی ڕاوێژیان لێکرد کە بـە هـەر فێڵ و تەڵەکەیەکی دەکرێ لەبەرچاوی محەممەدقولی‌خـان ڕەشـی بکەن و ئەو پـشتیـوانـەی لـێ‌بـستێنن. ئـەنجـا چـوونـە بـن کلیـشـەی

حوسێنقولیخان و لە خشتەیان برد و دەنەیان دا و ئەویش پەنامەکی بە خزمەت محەممەدقولیخانی ڕاگەیاند کە پیاوی ئاوا دەبێ خۆیان لێبپارێزی، چونکە ئەگەر هەلیان بۆ هەلکەوێ دەست لە مەزن و سایەچەوری خۆیان دەوەشێنن و لێیهەلدەگەڕێنەوە. ئەوەندەی لەم قسە پڕوپووچانە بە گوێی هەلخوێند کە محەممەدقولیخانی سافیلکەی ساکار لە بوداقخان تۆقی و لێیسلەمییەوە و سەرەنجام لە ناخی خۆیدا کەوتە بیری چزدانی ئەو بێتاوانە.

# کوێرکرانی بوداقخانی حاکمی سابلاغ بە دەستووری محەممەدقولیخان

بەکورتی پاش ئەوەی کۆڕی میواندارِی حوکمڕانی خۆیە گەیشتە بلاوەلێکردن و هەلومەرجی ئاشتی و ئۆستایەتی پتەو رەنگی دایەوە، خانانی ئازەربایجان ئیزن دران و بەرەو مەوتەنی خۆیان گەڕانەوە. محەممەدقولیخانی بەگلەربەگیش سەری ولاخی بەرەو ناوەندی دەسەلاتی وەرسووڕاند و هاتەوە ورمێ. بوداقخانی موکریش کە بە پیلانی ناحەزان و بەدخوازانی نەدەزانی، لەسەر ئیزنی بەگلەربەگ رووی کردەوە سابلاغ. ئەفراسیابسولتانی زەرزا کە هاودەم و راوێژکاری دەر و ژوور و نەهێنخانەی بەگلەربەگ بوو، لەبەرەوەی کار و خزمەتی میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل لە سەفەری خۆیەدا درەوشایەوە و روون و گەش کەوتە بەرچاوان، ئەوەندەی دیکەی ناخۆش ویست و ئاگری بەرچاوتەنگی و ئیرەیی پێبردن لە ناخی سینەی پڕ کینەیدا پتری تەنییەوە! خانی زەرزا لە هەلێک دەگەڕا کە بە رێچکە و رێبازی شەیتانی و شۆفاریدا، میرزا ئەبولحەسەن تێدابەرێ، چونکە بەراستی ئەفراسیابی بێدەرد و خەم پیاوێک بوو زمانچەور و فێلەباز و یەکجار زۆر فیتنەگێڕ، بەلام پێیوابوو هێشتا کەمەندی فرتوفێلی لە دەورەی شوورەی شەرەف و ئابڕووی وەکیل ناگاتەوە. بۆیە سەرەتا کەوتە قەلاچۆی توخمی بوداقخان کە یەکێک بوو لە لایەنگرانی وەکیل و وردەوردە لە خزمەت بەگلەربەگدا عەیبی لێهەلدا و تۆماتی دژایەتی و غەیانەتی پێوەبەست. جا چونکە پێشتر لە خۆیە بناوانی ئەم پیلانە شێلدرابوو، نیشانەی ئەنگاوت و محەممەدقولیخان ئەوەندەی دیکە سەبارەت بە بوداقخان کەوتە دوودلی و دڕۆنگی. هەربۆیە میرزا سالەی نۆکەری خۆی نارده سابلاغ و

داوای کرد کە بوداقخان بەپەلە بگاتــە ورمــێ. ئەگــەرچی خــانی مــوکری لــەم هەلەوپەلە نابەوەختە خوتخوتەیەکی کەوتە دەروونــی، بــەلام لەبــەرەوەی بــە پیاوێکی ڕاست و دروست دەناسرا و بە خزمــەت و ڕووڕاســتی خــۆی دەنــازی، بێڕاوەستان و خاوەخاو گوتی بە سەر چاوان و لەگەڵ میرزا سالە ڕووی کــردە ورمــێ. هەر کە گەیــشتێ بەگەربــەگ هێنــدێک تــاوان و کەمتەرخــەمی خــستە ئەستۆی و بەپێی فەرمان لە حەسارخەلوەتی بەند کرا و نیوەشەو بردیانە قەلای باراندێز و بەریبەیانی سالیبەگی سەرفەڕاش ڕاسپێردرا کە بچێتــە بارانــدێز و هەردک چاوی ئەو سیاچارەیە بکۆلێ و بە کوێری بیهێنێتەوە شاری ورمێ! پاش ئەوەی سالیبەگ حوکمی حاکمی بــەجێهێنا و وێــڕای چەنــد کەســێکی خەلــەج گێڕایەوە ورمــێ، میرموفیدئاغای شێخولئیسلام تکای کرد و بردی بۆ مالی خۆی و کەوتە دلخۆشیدانەوەی. بۆ سبەینێ وەختایەک خزم و کەسی بوداقخان ئــەم هەوالەیان بیستەوە، بە گریان و بە سەرداداان هاتنە بەردەرگا و دەرانەی بەرزی شێخولئیسلامی بەرزمجێ. لەبەرەوەی نەیانهێــشت چاویــان پێــیبکــەوێ هــەتا تاریکانێ فرمێسکیان هەلــوەراند و شــینان گێــڕا و ئەوەنــدەیان قووڕانــد کــە شێخولئیسلام زگی پێیانسووتا. ئەگەرچی پاسەوان و قەرەولــێکی زۆریــان لــە دەوری مالی ئەو پایەبەرزە دانابوو کە چاویان بە سەر بوداقخانەوە بێ، بەلام شێخولئیسلامی هێژا، لە مەودای شەودا ئەو چارەڕەشە نابینایــەی بــە بــواری چۆمیدا پەڕاندەوە و لەگەڵ کەسوکاری بەڕێی کردەوە بۆ سابلاغ.

هەر لــەم سالــەدا کــە دەبێتــە ١٢٠٣ی کــۆچی/١٧٨٨ــ١٧٨٩ی زایینــی، ئاغامحەممەدخانی قاجار کە لە ئێراق و فارس تەواو دەسەلاتی تەنیبوویــەوە و بە سەربەستی دەژیا، لە تارانی پایتەختەوە ڕووی کردە ئازەربایجــان، بــەلام دەنگ و هەرای بزووتنی لوتفعــەلیخــانی زەنــد لــە بالــی فارســەوە پــەکی سەفەرەکەی خستەوە.

## شەڕ لەگەڵ عێلی هەرکی؛ تێچاندنی ئەفراسیابسوڵتان بۆ میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی ورمێ و عەسکەرخانی برای

هەر لەم ساڵەدا (١٢٠٣ی کۆچی مانگی)، جەماوەرێکی هەرکی و شەمزینان کە دانیشتووی ناوچەی دەشت و تەرگەوەڕن، کەوتنە سەربزێوی و ئاژاوەنانەوە و راماڵیان بردە سەر ناوچەی بناوی رەوزە و خڕ و پتوون تالانیان کرد. ئەم پەلامارە بوو بە هۆی بزووتنی دەماری خێڵخوازانەی محەممەدقولیخانی بەگەربەگ و بە قۆشەنێکەوە کەوتە سەریان و هەڵبڕدابڕی وێخستن و گەڕایەوە. هەروابێتەوە محەممەدقولیخان دوای دەرهێنانی چاوی بوداقخان، خوشکی ئەجیمزادەی خۆی لە ئەفراسیابسوڵتانی زەرزای «ئەنیسولحەزرەت» مارە کرد و رۆژ بە رۆژ دەرگای خۆشەویستی و لاوانەوەی بە رووی ئەو دوژمنی دەسەڵات و ئەمەگنەناسەدا کردەوە و جڵەوی راپەڕاندنی هەموو کارێکی گرینگی دایە دەستی. میرزا ئەبولحەسەن وەختایەک تەماشای کرد خانی دووزمان بۆی گرتووە و زیاتر لە پێشوو دەستی دەڕوا، تۆزێک بە خۆیدا چۆوە و وردەوردە کشاوە، چونکە بەڕاستی داهاتووی لەبەر چاوی بوو. بەڵام ئەفراسیابسوڵتان ئەوەندەی بۆی دەلوا تەنانەت هەناسەیەکیش لە شەیتانی و دووزمانی رانەدەوەستا. سەرەنجام گەڵاڵەیەکی دارشت و گوتی ماوەیەکە سەرۆکایەتی دیوانی پیتاک و کۆی حیساباتی داهات و دەرکەوتی دەر و ژوور بە دەستی لێوەشاوەی وەکیلەوەیە و غولامانی خاوەنشکۆ سەرقاڵی لەشکرکێشی و دوژمنکوژی بوون و کەس نەیتوانیوە بە پاکردەحیساب و بەردبژێری کارەکانیدا بچێتەوە. بۆیە وا چاکە ئێوەی پایەبەرز چەند کەسێکی باوەرپێکراو و سەرراستی خوێندەوار دیاری بفەرموون کە بە پەراوەکانیدا بچنەوە و بکەونە پشکنینی و بزانن چ باسە و کەم و زیاد وەدەرکەوێ و پەراوێز و کۆی حیسابات لێکهەڵاواردرێ. ئەم قسەیەی ئەفراسیابسوڵتان کە لە رووی بوغزاندن و

ئامانجەوە بوو وەکوو نەخشێک کە لەسەر بەردێک هەڵکەندرێ لەڕێوە لە بیرگەی بەگەربەگدا شەقڵ بوو. خێرا چەند خوێندەوارێکی لێزان ڕاسپێردران کە زۆر بە وردی بە حیساباتی میرزا ئەبولحەسەندا بچنەوە و چاوەدێری بن.
عەسکەرخانی باوکبرای وەکیل کە پیاوێکی زۆر زیرەک و هەڵکەوتەی زەمانە بوو، شەوێک لە دووبەدوویی‌دا بە کاکی گوت: من ئەم ڕۆژگارە بە ئاخرشەڕ دەبینم و لە ڕووی هێندێک ئاکاری بەگەربەگ و ڕاوێژی خەڵکرا پێموایە بارەکە گۆڕاوە و ئەستێرەی بەختمان بەرەو ڕاکشان و ئاوابوونە. دەترسێم کە لە هەزار تیری فێڵوفرتی قین لە زگان یەکیان لەپڕێ بنیشێتە سەر نیشانە و چاووزار بنەماڵەمان بنگێون. بۆیە وا باشترە و بە قازانجمانە کە بەجارێک دەست لە خزمەت هەڵگرین و ماڵاوایی بکەین لە مەوتەنمان و ماوەیەک و ئەوەندەی تەمەنمان بڕ دەکا لە گۆشە و کەناران بیگوزەرێنین هەتا بزانین چەرخی گەردوون چ شتێک لە پشتی پەردەوە دەخاتەڕوو...
میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل لە وەڵامی براکەی‌دا گوتی ئەوەی دەیڵێی هەمووی بە چاکەیە، بەڵام بێلادان و ترازان لە ڕێگای ڕاست و بێ خەیانەت کردن، خۆدانە بەر تۆمات و قسە بۆ هەڵبەستران، کاری ئادەمیزادی ئاقڵی دووربین نیە و لە قەدیمەوە گوتوویانە: ئەو، ی پاکە بێباکە. عەسکەرخان گوتی کاکە هەتا زۆڵەچەرمەکە ئاو نەیبردووە دەبێ کاری خۆمان ببینین. وەکیل جوابی داوە براڵە ژنی تۆ باوکبرای عەلیڕەزاخان و خوشکی هاوسەری بەڕێزی محەممەدقولیخانی بەگەربەگە. ئەگەر ئەتۆ سەری خۆت هەڵگری و ...ی بۆ هەندەران و پەرەوازە بی، ماڵ و منداڵت هیچیان بە سەر نایا و بێتوو من بەجارێک خاوخێزانم بەجێبێڵم کارێکی زۆر نارەوایە. بە باری ڕەوت و ڕێبازی ویژدان و جوامێری‌دا کارێکی ناشیاوە کە من هەر لە بیری وەی‌دا بم چۆنی بۆم دەکرێ خۆم بگەیەنمە بەستێنی ڕزگاری و کەسوکارم لە گێژاوی بەڵادا بەجێبێڵم. جا بۆیە خودا چۆنی مەیل لێبێ هەر ئەوەیە و پێی‌ڕازیم. سەرەنجام هەردک برا وا ڕێککەوتن کە ماوەیەک وردەهەنگاوی بەپارێز باوێن و قەتیش وێکڕا نەچنە هەوێلی بەگەربەگ. بەهەڵکەوت ڕاست ئەو شەوە بەگەربەگ ناردی

بە شوێن وەکیلدا و عەسکەرخانیش باوەڕپێکراوێکی خۆی ڕەگەڵ خست هەتا بزانێ چ باسە و خەبەری بۆ بێنێتەوە. پاش دوو کاتەژمێر پیاوەکەی عەسکەرخان گەڕاوە و هەواڵی هێنا کە وەکیل گیراوە! عەسکەرخان خێرایەکی پێی‌نایە ئاوزەنگی و مامزەی لە کەلەکەی ئەسپی ئەنگاوت و بە هەزار ترس و دلەڕاوکە لە جەرگەی شەودا بەرەو سەلماس رایکرد. بەیانی بەگەربەگ و ئەفراسیاب‌سولتان بیستیان کە عەسکەرخان وەکوو تیری بەرکەوان و ماسی نێودەستان دەرپەڕیوە و ڕەنگە هەر ئێستا نا تاوێکی دیکە هەرایەک بنێتەوە. بۆیە لەڕێوە لە کردەی خۆی پەشیمان بۆوە و ناردی بە شوێن میرزا ئەبولحەسەن‌دا و پاش دلدانەوەیەکی زۆر ئیزنی فەرموو بگەڕێتەوە ماڵ. وایان دانا کە خودی وەکیل کاغەزێک بنووسێ بۆ عەسکەرخان و لە لایەن بەگەربەگیشەوە لوتفوللابەگ و هادی‌بەگی ئۆستاجلوو خێرا نامەی دلدانەوەی بۆ بەرن و بیگێڕنەوە. پاش ئەم کارانە بەگەربەگ وەکیلی بە مەبەستی ڕاگواستنی خێڵی بشکوفتی نارده ناوچەی سۆما [و] برادۆست لە ڕاستی‌دا حوکمدار دەیهەویست کە وەکیلیش لە چنگ ئەم خەیاڵاتە دەربازبێ و لەخۆوە ڕووڕاستی ئەم پیاوە تێدانەچێ. وەکیل کە بەراستی کابرایەکی فامیدە و پشت‌بەستوو بە خودا بوو، هیچ ترس و خەیاڵاتێکی بە دلی خۆی‌دا نەهێنا و بەوپەڕی پتەوی و سەرڕاستی چوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەر شانی و پاش جێ‌بەجێ کردنی گەڕایەوە جێگای خۆی. بەلام ئەوانەی چووبوونە گێڕانەوەی عەسکەرخان، نەگەیشتنە سەری و تۆزیان نەشکاند و بێ‌مراد گەڕانەوە. بەگەربەگ زانی کە تازە عەسکەرخان بەم دانانە بە داوەوە نابێ و سەرلەنوێ فەرمانی گرتنەوەی وەکیلی دا. پاشان خانووبەرەی زۆر و لەمێژینەی عەسکەرخانی خاپوور کردن و هەرچی لە دوای بەجێمابوو دەستی بە سەردا گرت. بەوەندەش تووڕەیی ڕۆنەمرکا و چەند ڕیش‌سپی و گەورەپیاوی تیرەی عەبدولمەلیکی بە ڕۆژی ڕوون خنکاندن و پەتی خستنە ئەستۆی و بۆ چاوترساندنی خەلک لە مەیدانی بازارباش فڕێی دان کە بریتی بوون لە: پیران‌بەگ، کەهران‌بەگ، قۆجەبەگ و عەبدولمەلیک. کاتێک ئەم هەواڵە سامناکانە لە خاکی سەلماس بە گوێی عەسکەرخان گەیشتەوە، بۆسۆی لە

جەرگ و هەناوی هەستا. ڕاست ئەو شەوە لە باڵەخانەی حاوانەوەی هەڵەنگووت و کەوت و لاقی ڕاستی لە جێ چوو و ئەمەشی لێبوو بە سەرباری دەردان. شەو هەتا بەیان لە تاوی ژانی قاچی هەر جینگڵی دا و بە ناڵینەوە هاواری خودای کرد. بەریبەیانی پیاوی نارد بە شوێن «ئەحمەدبەگ»ناوێکدا کە پیرەپیاوێک بوو بە تەگبیر و گوتی دەمهەوێ چاوم پێیبکەوێ. کاتێک ئەحمەدبەگ هات و چۆنیەتی بەسەرهاتی عەسکەرخانی بۆ ڕوون بۆوە، داخی بۆ خوارد و زۆری پەرۆش بوو. ئەوسا شکستەبەندێکی شارەزای بۆ هێنا و لاقی بردەوە جێ. عەسکەرخان گوتی ئەوەندەم لە تۆ دەوێ کە بڕۆی و لەگەڵ برایمخانی ئێشیکئاغاسی کە دۆستێکی بەڕاستیمە، بچنە لای حوسێنقولیخانی دونبولی حوکمڕانی خۆیە و لە زمان منەوە عەرزی بکەن و پێیبڵێن:

ئاسمـــان دوور و زەوی ســـەختە ئەگـەر ڕوحمێـک دەکـەی وەختـە

بەکورتی ئەحمەدبەگ وێڕای مورتەزاقولیبەگ و میحرابـبەگ چوونە خۆی و بە هاوکاری برایمخانی دۆستی ڕووڕاست و خێرخوازی دڵسۆزی وەکیل و عەسکەرخان بە وردی بەسەرهاتی دووبرالەیان بە خزمەت حوسێنقولیخان ڕاگەیاند. حوسێنقولیخان کە بۆ بەربەرەکانی و چاولێکەری لە محەممەدقولیخان بەدڵ لە ڕۆژ و بیانوویەکی ئاوا دەگەڕا. سەبارەت بە چارەنووسی وەکیل و عەسکەرخان پەژارەی دەربڕی و گوتی پێمناخۆشە. پاشان گەلێک نامەی نووسی بۆ سەرۆکانی کورد و خێلاتی قەڵەمڕەوی خۆی و داوای لێکردن کە بە قۆشەنەوە بێن و پاشی چەند ڕۆژان جەماوەرێکی زۆر لە خۆی کۆبوونەوە. جەعفەرقولیخانی برای بوێری خۆی بۆ کردنە سەرکردە و ناردنی بۆ ورمێ کە داوای وەکیل بکەن لە محەممەدقولیخان و ئەگەر جوابی نەدانەوە بیکەنە شەڕ.

## تێکهەڵچوونی دونبولییەکان و عەسکەرخان لەگەڵ محەممەدقولیخان بە مەبەستی ڕزگار کردنی میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل

جەعفەرقولیخان وێڕای هێزی بەرفەرمانی پێینایە شارۆچکەی سەلماس. عەسکەرخان بەم هیممەت و هەڵوێستەی حوسێنقولیخان و کۆمەڵی خانانی خۆی گیانێکی تازەی وەبەر هاتەوە و زۆر گەشایەوە و تێکرا بەرەو ورمێ کەوتنەڕێ. لەم لایەوە کاتێک محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاریش هەواڵی هێرشەکەی بیستەوە، قاسمخانی برا چووکەی خۆی لەگەڵ نادیرسوڵتانی کوڕی شاریارخانی سەرۆکی تیرەی گۆندوزلوو و ئەڵلایاربەگی ئەرمشلوو و لوتفوڵلابەگی ئۆستاجلوو و تێکرای سەرکردەکانی ئەفشار و حەشامەتێکی بەرچاو ناردنی بۆ بەرپەرچدانەوەیان. لە نیزیک ئاغزیارەت(ئاقزیارەت) هێزەکانیان تێکهەڵەنگووتن و شەڕیان لە نێوانیدا قەوما. لە ڕاستیدا دەستەیەک لە خێڵی ئەفشار لەبەر دڵی عەسکەرخان ئەوەندەی پێویستە شانیان لە شەڕ شل نەکرد و کەوتنە کلکەلەقە و باڵەپڕژە و بە ئانقەست ڕایانکرد. ئەم کارە تینی ئازایەتی پتری وەبەر هەناوی هێزەکانی جەعفەرقولیخان هێنا و لە ئاغزیارەتەوە هەتا دەوروبەری «قزقەڵا»ی ورمێ هەڵیانبڕین. کۆمەڵێک لە سووارانی ئەفشار بەناچاری گەڕانەوە و کەوتنە خۆڕاگری و بەرەنگاری، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا و هەنگاوی مێرانەیان وەها خلیسکا کە هەتا بەردەرانەی دەروازەی بالوو لغاویان بە دەمی ئەسپیاندا نەدایەوە. جەعفەرقولیخان کە دەم لەسەر پشت بە دوویانەوە بوو، لە نیزیک تۆپراقەڵای ورمێ دابەزی کە چواریەکی فرسەخێک لە شارەوە دوورە.

بەڵام محەممەدقولیخانی بەگەربەگ چونکە بە شۆفاری و دووزمانی کەتنگێرانی شەیتان، بەتایبەت ئەفراسیابسولتان، مەیدانی شەڕ و بەربەرەکانی لە پیاوانی ئازای کارزان بە چۆلی دەبینی و خۆی لەبەر چاوی هەمووان بە کابرایەکی رارا و فیفی و باوەڕپێنەکراو رانابوو، بەناچار لە ترسی پەلاماری دوژمن بازگە و دەروازەکانی قەڵای داخستن و ماتەی هەڵگرت و دمم بە دمم لە چۆکی خۆی دا و هەر پەکووپەکووی بوو.

بەڵام فایدەی چ بوو، خۆ تازە بە ئاخ و داخ و پەژیوانی چاوی برایمخانی دیوانبەگی ئەفشار و بوداقخانی حاکمی سابلاغ نەدەگەڕانەوە جێی خویان و قەرەنیئاغاش بە هێزەوە نەدەهاتە فریای.

بۆ سبەینێ لای بەیانی، پێشقەرەولانی دونبولی بە فەرمانی جەعفەرقولیخان و بە تەگبیری عەسکەرخان بە مەبەستی زەبروەشاندن و ئازایەتی نواندن هەتا دەروازەی تۆپراققەلا ئەسپیان غاردان و کردیانە قریشکە و هەرا و رمبازێن. لەم لایەوە چەند کەس لە پاڵەوانانی ئەفشار کە پارێزەری بورجان بوون تەمایان گرت لێیانوەدەست بێن و بۆیان دەرپەڕن. لەم کاتەدا حاجی برایمناوێکی عێلی دونبولی کە بە یەکێک لە مەردانی زەمانە دادەندرا، لەپڕێ ئەسپەکەی دەستی کرد بە کۆڕژن و چەپۆکان و هەڵیگرت و لغاوی نەداوە دەستی و ئەم پیاوە ناودارەی فڕاند و یەکسەر بردی بۆ نێو هێزی ئەفشار. لەرێوە محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلووی ئامۆزای دایکم کە سەردەستەیەکی سوارانی ئەفشار بوو، خۆی گەیاندێیە و شیرێکی لێدا و لە خوانی زینەوە هەڵیداشت و بەو برینە قووڵەوە پشووی لێبڕا. ئەو کات ئاغاسیبەگی دونبولی پێینایە مەیدانی بەرەنگاری و ئەویش کوژرا و بە دوای حاجیدا رۆیی. «جانگیربەگ»ناوێک چووە هانای و ئەویش دەستی لە جیهانی رووخەک بەردا و ئەسەدبەگێکیش بە چەنگ شێرانی مێشەی مەیدانداری پەلپەل کرا. بەکورتی چوارکەس لە پاڵەوانانی بەناوبانگی دونبولی و چەند کەسێکی قەلەوقوتەی

ئەفشار لەم پێکهەڵپڕژانەدا کوژران و هەتا تاوپەڕین هەردک لا هەڵسووڕان و داسووڕان. کاتێک سەریبڕاوی ئەو چوار کەسە کوژراوەی دونبولی لە قەڵا برانە بەرچاوی محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ، دەسخۆشی لە پیاوکوژان کرد و لاواندنییەوە! لەو لاوە جەعفەرقولیخان و عەسکەرخان بە قەومانی ئەم ڕووداوە تاڵە پەژارە دایگرتبوون...

چونکە عەسکەرخان مەبەستی لەم هەستانی لەشکر و پەلامارە تەنیا ڕزگاری میرزا ئەبولحەسەنی برای بوو و نەیدەویست ئاژاوە بتەنێتەوە و کەسی خوار و ژووری تێدا بکوژرێ، لەگەڵ جەعفەرخان کەوتە ڕاوێژ و گوتی وا باشە چەند نامەیەک لەسەر پێوشوێنی دۆستایەتی بنێرین بۆ سەرۆکانی ئەفشار و دنەیان بدەین بۆ ئاشتی و نێوانخۆشی. بەڵکوو بتوانین بەم فرتوفێڵە میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل لە زیندانی بەگلەربەگ دەرباز بکەین و بگەڕێینەوە. با ئەم شەڕ و خوێنڕشتنەی کەوتۆتە مابەینی دوو تاقمی مسوڵمانان ببڕێتەوە و مافی دراوسێیەتی و خزمایەتی پارێزراو بێ. جەعفەرقولیخان ئەم تەگبیرەی عەسکەرخانی بە دڵەوە نووسا و ڕەزامەندی ئەوی بە ئەرکی سەر شانی خۆی دانا. هەر بۆیە نامەگۆڕینەوە و هاتوچۆی ڕاسپاردان لە هەردک بەرانەوە دەستی پێکرد، بەڵام سەرۆکانی ئەفشار لەبەر هێز و بڕشتی ئەفراسیابسوڵتانی زەرزا کە هەمیشە دەتکوت بە بەگلەربەگەوە دروواوە، دەستیان پێیڕانەدەگەیی کە باسی ئاشتی و ڕێککەوتنی بە خزمەتی ڕابگەیەنن. ئەو فیتنەگێڕە وەختایەک بە سرتوخورتی سوڵح و هاتوچۆی ڕاسپاردانی زانی، داگیرسانی نێوانی عەسکەرخان و سەرۆکانی ئەفشاری بە خزمەت بەگلەربەگ ڕاگەیاند. کارێکی وای کرد کە بەگلەربەگ لە ڕێگای پێکهاتن و ئاشتی تلاسا بێ و تۆماتی دژایەتی و خەیانەتی بە ئەستۆی سەرۆکانی ئەفشار دابڕی و دەستەیەک لە دەستوپێوەند و چەکدارانی زەرزای دانا بۆ قەڵاداری، بێجگە لە محەممەدسەفیبەگی یوورقانلوو، ئەمیرخانبەگ و خانئەمیربەگ و

ئەمیرئەسلانبەگ لە تۆرەمەی خەلەج کە ئامادە بوون بۆ شەڕی دونبولییەکان.
وایان دانا کە نەقیبەگی ئەحمەدوەند برای سەرمەستبەگ وێـڕای سـوارەکانی
خۆی لە گوندی «شێراوا» بکەوێتە پاراستنی دێهاتی بناوی نازلوو و لە رامالـی
چەکدارانی دونبولی بیانپارێزێ. ئەو رۆژە شەڕێکیان لـە نێـوانیدا نەقـەوما و
سەری سێ رۆژە جەعفەرقولیخان پیاوی نارده لای بەگلەربەگ و لێیڕاسپارد کە
دوێنێ لەگەڵ دوێنێ چوو. ئامانجی ئێمە لەم شەڕەی قەوماوە تەنیا ئازادبوونی
میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلە و هیچی دی. وەکیلمان بە خۆشی و سلامەتی بدەنـە
دەستی هەتا بگەڕێینەوە، دەنا لە حەوشە دەرکەون کە بە شمـشێری دووسـەرە
کارەکـە یەکـسەرە بکەینـەوە و بـا بـزانین گـەردوون بـــە ئـــارەزووی کـێ
هەڵدەسووڕێ و کێ سەرکەوتنی لە چارەی نووسراوە. بەگلەربەگ بە تـەگبیری
ئەفراسیابسولتان داوای سێ رۆژ دەرفەتی کرد هەتا لەم بارەوە بیر بکرێتەوە و
پاشان وڵامیان بدرێتەوە. لەبەرەوەی پێشتر چەند کەسێکیان بەپەلە ناردبوو بـە
شوێن عێلی زەرزا و بشکوفتیدا، هەموویان لە ماوەی ئەم سێ رۆژەدا گەیـشتنە
شاری ورمێ. ئەوسا تفەنگدارانی نێو قەڵایان لەسەر بورجان دامەزراندن و تۆپی
قورسیان دابەستن و شامحەممەدبەگی کۆهەکلوویان کردە فەرمانـدەیان. دوایـە
محەممەدسـەفیبـەگی یوورقـانلوو و محەممەدبـەگ و حوسـێنبـەگی
قەرەحەسەنلوویان لەگەڵ سەرۆک و سەرکردەکانی ئەفشار و سـوارانی زەرزا و
تفـەنگچیانی بـشکوفتی ناردنـە دەرەوە بـۆ بـەرەنگاری. لـەو لاوە
جەعفەرقولیخانیش هێزی خۆی کۆکردەوە و لەبەر دەمی تۆپراققەڵا سـەف بـە
سەف بەرەورووی یەکتر راوەستان. قرمەقرمی تەپڵ و شیرەشیری کەڵەشاخان لە
هـەر دوو لاوە بـەرەو ئاسمـان کۆڵـەکەی بەسـت. پێـشەنگانی بەرگـەپۆلا
لەوبەرەوبەران وەدەرکەوتن و شەڕگەیان گەرم داهێنا و لەو کاتەدا عەسکەرخان
لە قۆشەنی دونبولی هەڵبرا و هاتە بەرەورووی تاقمەکانی ئەفشار. سـەرۆکانی
ئەفشار هـەر کـە چاویان پێیکەوت ئەمـەگی مـیرزا جەعفـەری خوابەخـشیوی

باوکی و میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی مەزلوومی زینـدانیکراوی بەگلەربـەگی برایان هاتەوە یادی و یەکجار زۆر شەرمەزار بـوون و بـە خۆیـاندا شـکانەوە. هەروەکوو ئاشـکرایە ئـالا هێـزی دەروون و ورەی خـۆراگری لەشـکرە، بۆیـە محەممەدسەفیبەگی یوورقانلوو کە هێزەکەی بەیداخدار بوو، دەستووری پێـدان سەرەونخوونی بکەن. حێلی [کوردی] حەیدەرانلووی خۆیە کە بەرەوڕووی حێلی [کـوردی] زەرزا ڕاوەسـتابوون، بـە سـەراوبنبـوونی بەیـداخ زۆر ئازایانـە هەڵیانکردە سەریان و هێندەی پێنەچوو کە زەرزا کۆڵیان دا و ڕەوین و شکستێکی قورس بە سەر شانی ئەفشار و عەشـیرەتاندا هـات و بـە هـەڵاتهـەڵات و بـە قوونەشەڕ خۆیان هاویشتەوە نێو حەساری قەڵا. جەعفەرقولـیخـان فـەرمانی گەمارۆی دا و هێزەکانی قەڵایان چەشنی نەقیم گرتە باوەشیان. پارێزەرانی قەڵا وەبەر دەسڕێژی تفەنگ و تۆپانیان دان و دەنگوت هەراهەرا و گرمەگرم و شین و شەپۆڕی ڕۆژی حەشرە. دەڵێن برایمخانی سەرکردەی تەواوی هێزەکانی ئەفشار کە پێشتر بە حوکمی محەممەدقولیخان کوێرکرابوو، لـەم وەختـەدا جوانـاوی دەرشت و لە سەرەمەرگدا بوو. کاتێک گـوێی بـە هـاوار و زەنازەنـای دەرەوە زرینگایەوە لەوانەی لە دەورەی بوون پرسی ئەرێ ئەو هەراهەرا و دەنگەدەنگـە چییە؟ خێزانی گوتی جەعفەرخانی دونبولی بە لەشکرێکی زۆرەوە دەورەی ورمێی داوە و تەقوتۆقی تفەنگ و ڕمبەڕمبی تۆپانە. برایمخـان کـە پیـاوێکی زۆر بـە غیرەت بوو هەناسەیەکی ساردی لە دڵی پڕژان و دەردەوە هەڵکێشا و هـەر لـەو ڕۆژەدا گیانی دایەوە دەس پەروەرندەی جیهان و ڕەحمەتی خودای لێبێ. پێشتر باسی کرا کە نەقیبەگی ئەحمەدوەند بە حوکمی بەگلەربەگ لـە قـەڵای شـێراوا بنەی داکوتابوو هەتا بەری ڕامان و شالاوی جەماوەری دونبولی بگرێ و نەهێڵێ پەلاماری گوندەکانی بناوی نازلوو بدەن و کۆمەڵـێک سـوارەی ئەفـشاری لـە ژێرکێفیدا بوون. هەموو ڕۆژێ تاقمێکی قۆشەنی دونبولی کە گیرۆدەیان دەبوون ڕووتیـان دەکـردن و ئەسـپ و چـەکوچۆڵـیان پـێنەدەهێـشتن. لەبـەرەوەی

جەعفەرخان سەرقالی گەمارۆی قەلا بوو، دەرفەتی نەدینا کە دەستێکی لێبوەشێنێ و لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەلام پەیتاپەیتا دەستەدەستەی قۆشەنی دونبولی لە چنگ هەڵمەت و پەلاماری نەقیبەگ سکالایان دەبردە بەردەم جەعفەرخان و زێرەیان لێهەڵدەستا. دوازدە ڕۆژ بە سەر ماوەی گەمارۆدا تێپەڕی، بەلام هیچ نیشانەیەکی سەرکەوتن بەدی نەکرا. جەعفەرخان بە تەگبیر و پێداگری عەسکەرخان کە لەبەر میرزا ئەبولحەسەنی برای بە دوای ئاشتیدا دەگەڕا و لەوەی دەترسا پەند و بەلایەکی بە سەربێ، دیسانیش کەیخودایەکی باوەڕپێکراوی ناردە لای محەممەدقولیخان و لێی ڕاسپارد یان وەکیلمان بە ساغی و سلامەتی بدەنە دەستی یا خۆتان لە قەلا دەرکەون و وەرنە مەیدانی شەڕ و بەرەنگاری. بەگەربەگ ئەمجارەش سوێندی پتەوی خوارد [کە لەسەر جێبەجێبوونی کارەکە سوورە] و ڕاسپاردەکەی جەعفەرقولیخانی ناردەوە و گوتی مەرجی سەرەکی شکانی گەمارۆی ورمێیە و هەر کە ئالقەی دەوری قەلا کۆکرایەوە وەکیل بە سەربەستی دەنێرمە لای عەسکەرخان. بەم گفت و پەیمانە جەعفەرقولیخان و عەسکەرخان وێڕای لەشکری سەلماس و خۆیە ئابلۆقەیان شکاند و سەری ولاخیان بەرەو خۆی وەرگێڕا و گەڕانەوە. عەسکەرخان لە سەلماس بنەی داکوتا و جەعفەرخان هەتا خۆی ڕانەوەستا. پاش تێپەڕینی ماوەیەک و وەدینەهاتنی بەڵێنەکانی محەممەدقولیخان و ئازاد نەکرانی وەکیل، حوسێنقولیخانی حوکمڕانی خۆی قاقەزێکی لە محەممەدقولیخانی بەگەربەگ نووسی و داوای لێکرد کە وا باشە بەگەربەگ پێ لە وادە و پەیمانی خۆی نەنێ و میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل ئازاد بکا، ئەگینا تووشی شەڕ دەبێتەوە و دەبێ ئامادە بێ. محەممەدقولیخان کە پێیوابوو دەسەلاتی بە سەر تەواوی حاکمانی ئازەربایجاندا دەشکێتەوە و حوکمی دەڕوا و بەڕاستیش وابوو، بەم دەنگنیری و ڕاخورینەی حوسێنقولیخانی دونبولی هەڵبەزییەوە و زۆر بە قەڵسی ڕاسپاردەکەی ڕادا و بێجواب ناردییەوە. پاشان

خۆی هێزێکی بەرچاوی خستە ژێرکێفی و لە ورمێوە بزووت و گەیشتە قەرەباغی ئەنزەل و تاول و خێوەتی هەڵدا. جەعفەرقولیخان لەگەڵ قۆشەنی خۆیە لە مێرگ و پاوانی دۆرشەکی سەلماس بنەی خستبوو. بەڵام بەگلەربەگ لەم سەفەرەدا لەبەر زۆر شتان کە پێشتر باسی کراوە هیچکەسی لە عێل و هۆزی موکری و بلباس وێرا نەبوو. خان کە لە هێزی کەمی خۆی دەڕوانی و قۆشەنی زۆر و زەوەندی خەنیمی دێنایە بەرچاوانی دلی غایلەی دەکرد و دەترسا، بۆیە نامەیەکی نارد بۆ خودادادخانی کوڕی نەجەفقولیخانی دونبولی بەگلەربەگی تەوریز و داوای یارمەتی لێکرد.

## کوژرانی کارە ساتباری میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل بە فەرمانی محەممەدقولی‌خانی پەیمان‌شکێن لەسەر داوای خودادادخان و بە فیتی ئەفراسیاب‌سولتان

خودادادخان وەختایەک کاغەزەکەی محەممەدقولی‌خانی پێگەیشت بە فیت و سنەی ئەفراسیاب‌سولتان بۆ بەگلەربەگی نووسیبەوە کە ئاوری تەواوی ئەم فیتنە و ئاژاوە و خوێنرشتنە بەرچاوە لە گۆڕی میرزا ئەبولحەسەنی وەکیل و عەسکەرخانی برای هەڵدەستێ. ئێستا کە عەسکەرخان لە چنگ تووڕەیی و زەبروزەنگ دەرباز بووە و کاکیتان گرتووە و پێوپل بە زنجیرە، مان و نەکوژرانی عەقڵی تێناچێ! ئەگەر بێتوو بەگلەربەگ وەکیل تێدابەرێ کە بۆتە تۆخمی خراپە و هەرا و شێوان، من هەتا ماوم سەر لە پێناوم و کەولی یەکرەنگی دەخەمە سەر شانم و ئالقەی خۆشەویستی بە گوێمەوە هەڵداوەسم، دەنا نا...

بەکورتی کاتێک وڵامی خودادادخان گەیشتەوە لای محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگ، هەر لەڕێوە حەمەساڵەبەگی بێبەزە و بەدکاری تایفەی خەلەجی باراندێزی ڕاتەسپارد کە بچێ و لە قەڵای باراندێز وەکیلی بەندکراو بکوژێ کە هیچ هیوایەکی بە ژیانی خۆی نەبوو. حەمەساڵەبەگ ڕۆژێک بەر لە جێژنی نەورۆز گەیشتە باراندێز و خۆی لە کوشتنی ئەو مەزلوومە خۆش کرد. چەند کەسێکی بەڕەحم و لە خوداترسی خەلەج هەر چەندی لەبەری پاڕانەوە و وەبەریان هەڵخوێند کە ئەو نابەکارە لە ڕۆژێکی ئاوا پیرۆزی جێژن‌دا بەرەبابێک ڕەشپۆش نەکا و وەکیلی بێچارە تێدا نەبا، سوودی نەدا. چونکە لە تەتەڵەی بەرزی یەزدانی‌دا قەڵەمی چارەنووسی لێدرابوو کە تۆماری تەمەنی وەکیل لەو

ڕۆژمدا دربەدر بکرێ. بۆیە ئەو زاڵمەی ناساڵح واتە محەممەدساڵح - کە نــاوی پێچەوانە بوو، وەک چۆن بە قولەزەنگی دەڵێن کــافوور - لای ئێــوارە وەکیلــی بردە ساری بەگلوو کە ئاخرین مەزرای باراندێزە و شانی لە کوشتنی شل کـرد. وەکیل گوتی ئیستێکم لێبگرە و دوای دوو ڕەکات نوێژ، بە حەمەساڵەبەگی گوت فەرموو ئەوەی پێتئەسپێردراوە سەرم وەبەرهێناوە و حوکمیش هەر بــە دەســت خودایە....

ئەو چەپەڵکارە پەتی هاویشتە ئەستۆی و هێندەی لێتوند کرد کە مــەلی رووحی لە شەقەی باڵی دا و قەفەزی قاپۆری لەشی بەجێهێــشت. لــە تاریکــایی شەودا تەرمی ئەو خوابەخشیوەی هێنایەوە شار و لەبەر دەرگــای ماڵــی خــۆی فرێی دا و باڵاپۆشێکی کۆچکەداری بــە ســەر هەڵکێــشا. بــەری‌بــەیانی کاتێــک کەس‌وکاری پێیان‌زانی کردیانە شــین و هــاوار و قورپێــوان و بابــەڕۆ. جێژنــی نەورۆزی تیرەی عەبدولمەلیکی بوو بە ماتەم و حیرەتی شاعیر لە ورمێ ساڵــی کۆچی‌دوایی وەکیلی ئاوا هۆنیوەتەوە:

بۆ ڕێکەوتی نەمانی حیرەت نووسی      گەیشتە ڕێزەی شەهیدان بولحەســەن[1]

1 - «ملحق بە زمردی شهدا شد ئەبولحەسەن». دەبێتە ١٢٠٤.

## شەڕی دووبارەی جەعفەرقولیخانی دونبولی و عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی ئەفشار لەگەڵ محەممەدقولیخان

ساڵی ١٢٠٥ی کۆچی/١٧٩٠ی زایینی، کاتێک حەمەساڵەبەگی خەلەج هەواڵی کوژرانی وەکیلی لە جێژنی نەورۆزی میریدا برد بۆ محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ لە قەرەباغی ئەنزەل و قەومانی ئەم ڕووداوە سامناکە بڵاو بۆوە، تێکرای تیرە و تۆرەمەکانی ئەفشار ناهومێد و خەمبار بوون و تازە هیچکەسێکیان باوەڕی بە محەممەدقولیخان نەما. هەموو بە یەکدەنگ کاغەزیان نووسی و پیاویان نارده لای جەعفەرقولیخانی دونبولی و عەسکەرخان و ڕایانئەسپارد کە تۆماری ژیانی وەکیل بە دەست ئەم ناجوامێرەی باوەڕپێنەکراوە تێکەوەپێچراوە و کار لە کار ترازاوە. دەبێ هەستن و بێن و سنووری لێنەکەن و ئێمەش لە هەلێکی گونجاودا لێیهەڵدەگەڕێینەوە و دەنگمان لەگەڵ دەنگتانە. بەڵام لەو لاوە وەختایەک خودادبەگی بەگلەربەگی تەوریز سیخوڕ خەبەریان بۆ برد و محەممەدقولیخانیش نامەی بۆ نارد و کوژرانی میرزا ئەبولحەسەنی بۆ ڕوون بۆوە، زۆری پێگەشاوە و قۆشەنی بەرەو ورمێ گاڵ دا. لە نیزیک کاروانسەرای «خاندلم» تەماشای کرد لێشاوی سپای ...ەرقولیخان هەستاوە و بە جارێک ڕێگای لێتەندراوە. پیاوی ناردە قەرەباغ بۆ لای جەعفەرقولیخان و پێیڕاگەیاند کە چیمەنی دۆرشەکی سەلماس لەبەر لەشکری دونبولی هەر جەمەی دێ و تێبەڕینی ئێمە بەبێ شەڕ و لێکدان دەس نادا و گرێ و کۆسپی هاتۆتەبەر و ڕەنگە لەم ڕەوگەیەدا تووشی تێشکانێکی وا ببین کە بۆمان قەرەبوو نەکرێتەوە. ئەگەر هێزێکی پشتیوان و بەلەدمان بۆ بنێرن بە خۆشی دەگەینە لاتان. محەممەدقولیخان وەباڵی بۆ کێشا و لەڕێوە

چەند سەرکردە و سەرۆکی ئەفشاری بە هەزار سوارەوە ناردنە پێشوازی خودادادخان کە بریتی بوون لە: خانئەمیربەگی خەلەج، محەممەدبەگ و حوسێنبەگی قەرەحەسەنلوو، میرزاخانبەگی خەلەج، هیممەتبەگی خەلەج، محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو، بابابەگی عەرەبلوو و سامبەگی قۆرقلوو. پاشان خۆشی وێرای ژمارەیەک قۆشەنچی بە دوایاندا رۆیی و لە دەوروبەری ئاغزیارەت گەیشتە لایان. لەم کاتەدا بەیداخداران و پێشەنگانی سپای جەعفەرقولیخان کە کەوتبوونە سەر رەشایی کۆمەڵی ئەفشاران، وەدیار کەوتن. محەممەدقولیخان ئەگەرچی هێزی بەرەنگاربوونەوەشی لە ژێرکێفیدا نەبوو، بەڵام بەناچار خۆی ساز کرد بۆ بەربەرەکانێ. لە هەردک بەرانەوە تەپڵ و کەلەشاخ قرمە و تووڕەیان هات. سەرەتا پێشەنگان لەو باڵەوباڵانەوە هەنگاویان نا و خۆیان نواند. ئاغاجانبەگی کۆهەکلووی پێشقەرەوڵ دەستی کرد بە شەڕ و خوداوڕاستان ئەسپەکەی سەرسمی دا و تێکهەڵگلا و کوردانی حەیدەرانلووی خۆیە لە ڕاست و چەپەوە تێیوەرووکان و شەقوشڕیان کرد و هەناسەیان لێبڕی و دوایە وەکوو مەڕ سەریان بڕی و کردیانە قوربانی. خۆلاسەی کەلام پێشەنگانی بەرگەزرێ و پڵینگانی لووتکەی بەرەنگاری بە گژ یەکدا چوون و بە زەبری شیر و نێزان خوێنێکی زۆریان ڕشت و کردیانە تەپوتۆز و گەردەلوول. بەڵام سەرۆک و سەرکردەکانی ئەفشار بەپێی بەڵێن و پەیمانێکی کە بوویان لەگەڵ عەسکەرخان، لە گەرمەی تێکهەڵچوونا هەر دەستەیەی بەیداخی خۆی سەرمونخوون کرد و ڕێی ڕاکردنی گرتەبەر. محەممەدقولیخان کە بارودۆخەکەی ئاوا هاتە بەرچاوی، بە لێواری دەریای شاهی (گۆلی ورمێ)دا سەری ولاخی وەرگێڕا و بەرەو قەرەباغی ئەنزەل تێیتەقاند و ڕەوی. دوای شەوێک مانەوە، بۆ بەیانیڕا کە ١١ی مانگی مەزنی ڕەجەب بوو، بە هەزار کوێرەوەری و نەهامەتی لە قەرەباغەوە تەپڵی کۆچی کوتا و شانبەشانی خودادادخانی بەگلەربەگی تەورێز ڕووی کردەوە ورمێ. هەر

گەیشتنەوە ڕۆستەمبەگی قاسملووی کردە میوانداری خودادادخان. چونکە داینابوو لەبەروەی خودادادخان ئامۆزای جەعفەرقولیخانی دونبولییە سەری بە گۆمدا بکا. ئەفراسیابسولتانی زەرزا هەستی بەم کارە کرد و لەبەروەی لاگیری خودادادخان بوو بە کەلبالیسولتانی ئەفشاردا لێیڕاسپارد کە ئەوەندەی بۆی دەکرێ بە بیانوویەک پێ نەنێتە قەلای ورمێ. بۆیە خودادادخان لە دەوروبەری قەلا کەم و زۆر تاریفاتی «باغی نەزمر»ی بە گوێی بەگلەربەگ هەلێنا و تکای لێکرد کە لەوێی مزل بۆ دیاری بکرێ. پاش قبوولکرانی داواکەی غولام و خزمەتکاریان دانا کە بڕۆن و هەرچی پێویستە بۆ میوانداری خانی دونبولی دابینی بکەن. بەکورتی پێنج شەو و ڕۆژ ڕۆستەمبەگ میوانداری خودادادخانی کرد و لە باغی نەزمردا بە خۆشی و کامەرانی ڕایانبوارد و پشوویان دا. ئەفراسیابسولتان هەمیشە وریا و لەسەر هەست بوو کە نەکا بەلایەکی تووش بکرێ. دوای ئەم ماوەیە پیاوی نارده لای محەممەدقولیخان و ئیزنی چوونەوەی لێخواست، بەلام چونکە عەسکەرخان و جەماوەری دونبولی ڕێگای سەلماسیان تەنیبوو، نەیدەتوانی بەو ڕەوگەیەدا تێپەڕێ، بۆیە بەگلەربەگ تاقمێک لە سوارانی ئەفشاری وێڕای خوداقولیخانی کوری خۆی و ڕەحیمخانی کوری نەقیخانی قاسملووی ڕەگەل خست و بە ڕێگای سندووس و میاندواودا بەڕێیکردەوە تەورێز.

## برانەوەی چارەنووسی خودادبەگی بەگەربەگی [کورد] بە دەست سادقخانی شوقاقی و پتەوکردنی دۆستایەتی لەگەڵ محەممەدقولیخان

عەسکەرخان دوای ڕموینی محەممەدقولیخانی بەگەربەگ بەرمو ورمێ، لەبەرووەی کە زانیبووی کوژرانی وەکیلی برای بە فیتی خودادادخانە، لە دەشتی سەڵماس بنەی داکوتابوو هەتا ئەو دەگەڕێتەوە. کاتێک بیستی کە بە ڕێی مەراغەدا ڕووی کردۆتەوە تەورێز، کاغەزێکی نووسی بۆ سادقخانی شوقاقی و دۆستایەتی نێوانیانی وەبیر خستەوە و تکای لێکرد ئێستا کە خودادادخان بە ڕێگای مەراغە و دێخوڕگاندا دەڕواتەوە تەورێز، لە هەر جێیەکی دەتوانی سەرمرێ لەو خوێنڕێژە بگرە و کولی دڵم ئاوپڕژێن بکە و تۆڵەی لێبستێنەوە. بەڕاستی ئەگەر وا بکەی هەمیشە خۆم بە ئەمەگداری تۆ دەزانم و قەت لە بیرم ناچێتەوە. وەختایەک نامەکەی گەیشتە دەست سادقخان کە ماکە و هەوێنی شەڕ و گەڕ و گێچەڵبازی بوو، لە ڕۆژ و دەرفەتێکی ئاوا دەگەڕا. قۆشەنی پەرداخ کرد و لەو دەوروبەرانە چاومڕوان بوو هەتا خودادادخان بگاتێ و لەناکاو خانی دونبولی لەگەڵ خوداقولیخان و ڕەحیمخان و کۆمەڵێک لە ئەفشاران ئاسۆگی دا. سادقخان هەر کە چاوی بە پیاوەکانی محەممەدقولیخان کەوت، لەبەر زۆر شتان خۆی تێهەڵنەقوتاندن و سەری ڕکێفی بەرمو سەراب و ئەو ناوچانە وەرسووڕاند. هەر بۆیە خودادادخان بێهیچ گرفت و خەسارێک گەیشتەوە تەورێز و بە شێوەیەکی شیاو دەرگای لاواندنەوە و میوانداری بە ڕووی خوداقولیخانی کوڕی بەگەربەگ و هاوڕێیانیدا کردەوە.

لەم سەروبەندەدا نێوانی خودادادخان تێکچووبوو لەگەڵ برایمخان و جانگیرخان و محەممەدخان و عەلیخان و هەر چوار برای لێیهەڵگەڕابوونەوە. بۆیە بە کابرایەکی باوەڕپێکراودا لە سادقخانی شوقاقییان ڕاسپارد ئەگەر بێتوو بەرەو ئێرە بێی، ئێمە بێ شەڕ و هەرا کلیلەکانی قەڵا دەدەینە دەس تۆ. خانی شوقاقی کە لەمێژ ساڵ بوو تاسەی سەرۆکایەتی و حکوومەتی تەورێزی لە مێشکیدا بوو، ڕۆژێکی ئاوای لە خودا دەویست. خێرایەکی قۆشەنی دەنگ دا و بەرەو تەورێز بزووت. خودادادخانیش وێڕای کۆمەڵێک چوو بۆ بەرپەرچدانەوەی. لە دەشت و مێرگوڵانی «سەعیداوا» هێزەکانیان تێکهەڵەنگووتن و شەڕێک قەوما و لەو جەنگەیەدا براکانی خودادادخان لێیهەڵبڕان و چوونە پاڵ لەشکری سادقخان. بۆیە قۆشەنی خودادادخان ترسی قورسی ڕێنیشت و سپاکە دەستیان لێکبەردا و بەناچار ڕەوین. شوقاقی کەوتنە سەریان و خوداوڕاستان لە گەرمەی ڕاکردندا خودادادخانی بەختەوەرگەڕاو بەتەنیا کەوتە گیر و گازی خەلیلبەگی شوقاقی. ئەویش سێودووی لێنەکرد و ڕمبێکی گیانئەستێنی لێدا و لە خوانی زینەوە هەڵیداشت و لە خاکی گەوزاند. کابرای شوقاقی هەر بەوەندە لێینەبۆوە و بە زەبری خەنجەری تیژ سەری بری و مەیلی سەرۆکایەتی تەورێزی لە مێشکی هەڵفڕاند و کاژەڵاکی بە نووکەنێزەوە کرد و فڕێیدایە بەرپێی سادقخان. بەکورتی سادقخان پێینایە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات و زۆر بە گەرموگوڕی سەرۆکانی ئەفشاری [illegible]ـدەوە. هەر ئەو شەوە خوداقولیخان و ڕەحیمخانی قاسملوو، محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلووی سەرکردەیان بە مەبەستی ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە بەرێ کردەوە خزمەت بەگلەربەگ. محەممەدحەسەنبەگ کاتێ تێپەڕین بە سەلماسدا پەنامەکی هەواڵی کوژرانی خودادادخان و زاڵبوونی سادقیخانی شوقاقی و گیرانی تەورێزی بە یەکێکی باوەڕپێکراودا نارد بۆ عەسکەرخان و خۆی چاوی پێینەکەوت و بەرەو ورمێ ڕێگای کوتا. وەختایەک گەیشتێ نامەی

خوداقولیخانی بردە خزمەت محەممەدقولیخانی بەگەربەگ و هەرچی خۆشی دیبووی و بیستبووی بە زمان گێڕایەوە. خانی ئەفشار کەیفی زۆری گول کرد و بەپێی داب و نەریتی ولات نامەیەکی پیرۆزبایی نووسی بۆ سادقخان. لە ولامی خوداقولیخان و ڕەحیمخانیشدا نووسی و لە گوێی سرەواندن کە دەبێ دووبارە بناغەی دۆستایەتی و یەکێتی لەگەل سادقخان پتەو بکەن و بگەڕێنەوە.

پاش نامەگۆڕینەوە و هاتوچۆی ڕاسپاردان، سەرلەنوێ نێوانی بەگەربەگی ئەفشار و سادقخانی شوقاقی گەرموگوڕ بۆوە و ئەوسا خوداقولیخان وێڕای سەرۆکان و پیاوماقوولانی ئەفشار لە تەورێزەوە گەڕایەوە. بەلام پاش ئەم سەرکەوتنە لەبەروەی کە سادقخان لە بوون و مانی براکانی خودادادخان دەترسا و بە کۆسپی سەر ڕێی خۆی دەزانین و باوەڕی پێنەدەکردن، یەکبەیەک پێیاندا هات. واتە برایمخانی کوێر کرد؛ جانگیرخانی لە ژێر هەرەسی دیواردا کوشت؛ سەری محەممەدقولیخانی لە قەلای قەلافەتی کردەوە و تاماوی مەرگیشی بە عەلیخان چێشت. دیارە هەر خودا دەزانێ ڕووی ڕاستی ڕووداوەکان چۆنە.

# چوونی ئاغامحەممەدخانی قاجار بۆ ناوچە و مەڵبەندەکانی ئازەربایجان و ئەو ئاڵوگۆڕە بنەڕەتییانەی کە لە ڕەوتی مێژوودا بەدیهاتن

پێشتر لە نێو ڕووداوەکانی ساڵانی ڕابردوودا، کورتە ئاماژەیەکی پێکرا کە هێژا ئاغامحەممەدشای قاجار کوڕی محەممەدحەسەنخانی شەهیدی پایەبەرز، پاش ئەوەی هەرێمەکانی عێراق و فارسی بە تەواوی کەوتە بەردەستی و گرێوگۆڵی تێدانەما، تەمای وابوو کە بەرەو ناوچە و مەڵبەندەکانی ئازەربایجان ببزوێ. بەڵام هەر جارەی کۆسپ و تەگەرەیەک لە پشت پەردەی غەیبەوە خۆی دەنواند و [دەبوو بە لەمپەر و بەرگیرەوەی.] ئەم ساڵ کە دەبێتە ١٢٠٦ی کۆچی/١٧٩١-١٧٩٢ی زایینی، پاش ئەوەی کە هەواڵی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات و شێواوی ئازەربایجان و ڕووداوی محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی لەگەڵ سادقخانی شوقاقی و شەڕی پەیتا پەیتا و نەپسانەوەی دونبولی و ئەفشارانی لێڕوون بۆوە و نامەی عەسکەرخانی عەبدولمەلیکیش گەیشتە خزمەت ئەم پادشا تاجدارە و گوتبووی غولامانی بەرهەیوانی پاک و پیرۆزی دەیانهەوێ بچنە خزمەتی، ئەوەندەی دیکەی پاڵ پێوەنا بۆ بزووتن. هەر بۆیە ڕمانی بێئەملا و ئەولای دەرچوو بۆ هێزەکانی ئێراق و فارس و لە ماوەیەکی کورتدا کۆمەڵەی شۆڕەسواران و بەیداخدارانی بەڕێکێڤی شکۆمەندی خۆشفەڕی پادشایانەی چەشنی فەرەیدوونشای لە تارانی پایتەختەوە بەرەو ئازەربایجان کەوتەڕێ. لەم کاتەدا بە خزمەتیان ڕاگەیاند کە لوتفعەلیخانی کوڕی جەعفەرخانی زەند دیسان هێزێکی کۆکردۆتەوە و دەیهەوێ ئیسفەهان بگرێ. هەر بۆیە خاوەنشکۆ، بەڕێز فەتحعەلیخانی برازای خۆی کە ناسرابوو بە باباخانی

سەردار، بە قۆشەنێکەوە ناردی بۆ لێدان و شکاندنی لوتفعەلیخان و مستەفاخانی قاجاریش بە پێنجهەزار سوارەوە لە ڕکێفی خانزادەدا بزووت. هەروەها سولەیمانخانی قاجار بە لەشکرێکی دەهەزار کەسەوە بەپێی فەرمانی [خاوەنشکۆ] ڕووی کردە ماسوولە بۆ دەمکوتی جەماوەری تالش و بەڕاستی ئەم خزمەتە گەورەی بە چاکی ڕاپەڕاند و دەسخۆشانەی میرانەی لێکرا. حاکمانی گەرووس و خەلخال سەریان وەبەرهێنا و بەختیان گرتی، بەڵام سادقخانی شوقاقی چارەرەشی داوێنی گرتەوە و لە دەوروبەری قەڵای سەراب(سەراو) لەگەڵ ڕکێفدارانی نەبەزی پێکهەڵپڕژا و شکستێکی قورسی بە ئەستۆیدا بڕا و پەنای بردە بەر برایمخەلیلخانی کوڕی پەناخانی جەوانشێری حوکمڕانی شووشی. هێزە باڵادەستەکان قەڵای سەرابیان خاپوور کرد و بۆ گرتنی ئەردەوێل مامزەیان لە کەلەکەی ئەسپان کوتا. لەم کاتە کەسی یەکەمی دەولەت میرزا محەممەدشەفیعی مەزنەوەزیر بە حوکمی پادشا تەتەرێکی خۆشئاژوێ نارد بە شوێن عەسکەرخانی عەبدولمەلیکیدا لە سەڵماس، چونکە پێشتر کاغەزێکی سەبارەت بە چەوسێندرانەوەی گەیبوویە خزمەت مەزنەوەزیر. عەسکەرخان ئەم بە دواداچوونەی بە سەرکەوتن و بە هاتی بەختی دانا و چەشنی هەور و با باڵی گرت و فڕی و خێرایەکی تێراچوو بەرەو ڕووباری لەشکری بەرڕکێفی خاوەنشکۆ کە ئەستێرەی سەرکەوتن شوێنی لە دوو دەگێڕا. لە نیزیک پردی سەر چۆمی جەغەتووی میاندواو گەیشتە ڕکێفی موبارەکی و ئەوەندەی دەکرێ بارودۆخی ناوچەی بە خزمەتی ڕاگەیاند و کەوتەبەر شەپۆلی بەسەرکرانەوەی میرانە. دواتر کاروان و کەژاوەی پیرۆزی لە هاوینەهەواری «یام» خستی. بە بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە شادیهێنە، خانانی ئازەربایجان بۆ وێنە حوسێنقولیخانی کوڕی ئیمامقولیخانی سەرداری ئەفشار لە خاکی ورمێوە و ئەحمەدخانی موقەددەم لە مەراغەوە و محەممەدخان لە ئێرەوانەوە و حوسێنقولیخانی دونبولی لە خۆیەوە وێڕای حاکمی نەخجەوان هەموویان بە

حەشامەتێکی فرەوە ڕوویان کردە بەرەرکێفی بەختیاری بەرەو سەرکەوتن و پێهەڵاچوونی و گەیشتنە خزمەتی. کۆمەڵی خان و بەگەران وەختایەک دیتیان عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی کارەکەی لە بارەگای میریدا گرتوویەتی و لە پێش هەمووانەوەیە، تێکرا بە خزمەتیان ڕاگەیاند وەکوو دیارە عەسکەرخان توانیویەتی لە ڕکێفی خاوەنشکۆدا لە هاوشانەکانی تێپەڕێنێ و ئێمەش تکامان وایە کە بە سیلەنیگای میرانە کۆست و کۆسپەکانی لێکۆڵینەوەی زیاتریان دەربارەی بکرێ و مالی پێشێلکراوی بۆ بگەڕێتەوە. هەر بۆیە غولامانی بارەگای پیرۆزی، محەممەدخانی سەرداری تیرەی عیززەددینلووی قاجاریان ڕاسپارد کە وێرای حوسێنقولیخانی کوڕی ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی پێشووی ئەفشاری ورمێ بزوێ و بڕوا و محەممەدقولیخان بگرێ و بیهێنێتە بەرڕکێفی بەرەو سەرکەوتنی پاشا. بەڵام چەند ڕۆژێک زووتر سادقخانی شوقاقی کە خۆی بە بۆستی ڕووڕاستی محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ دادەنا، وریای کردبۆوە. ئەویش بە بیستنی ئەم هەواڵە تووشی ترس و دڵەڕاوکە ببۆوە و بە تەگبیری ناقڵمەندانی خێرخوا قاسمخانی برای خۆی وێرای ڕەحیمخانی قاسملوو و عەلیڕەزاخان و کەلبالیبەگی خەلەج ناردنە خزمەت غولامانی میری بەرزمجێ و گەلێکی دیاری بەنرخ و شایانی پێدانادرن. پاشان لەبەر خەیاڵات و دڵەخورتە، بارگە و بنەی خۆی و کەسوکاری ڕاگواستە قەڵای باراندێز و دواتر چوو لە قەڵای شنۆ بنەی داکوتا.

لەم ڕۆژانەدا حوسێنقولیخانی برازای وێرای محەممەدخانی قاجار گەیشتنە ورمێ و تەماشایان کرد محەممەدقولیخان سەر و سۆراغی ونە. بۆیە وێکەوتن و هەر ماڵ و سامانێکی لە پاشی بەجێمابوو دەستیان بە سەردا گرت و چۆنیەتی باروبۆخەکەیان بە بارەگای پیرۆزی ڕاگەیاندەوە هەتا بزانن فەرمانی فەرمانڕەوا چ دەبێ. بەڵام لەو لاوە کاتێک قاسمخانی برای محەممەدقولیخان و سەرۆکانی ئەفشار مزلێکیان مابوو بۆ «یام»، عەسکەرخان لە لایەن خۆیەوە

پیاوی نارده لای قاسمخان و یارانی و لێیڕاسپاردن که محەممەدقولیخان ئێستا تاوانبارە سەبارەت بە پاشا و بە خەیانەتکاری بارگا داندراوە، بێگومان ئەو دیارییانەی ناردوونی وەبەرچاو ناگیرێن و بە دڵەوە نانووسێن. باشتر وایە ئەوەی هێناوتانە بە ناوی قاسمخانەوە بخرێتە بەرچاوی خاوەنشکۆ و تکا و داوای حوکمی حکوومەتی ورمێ و بەگەربەگایەتی ئەفشاری بۆ بکەین. سەرۆکانی ئەفشار یەکدەنگ قسەکەی عەسکەرخانیان سەلماند و لێیان ڕاسپاردەوە کە ئەتۆ چ شتێک بە قازانج و بەرژەوەند دەزانی ئێمەش هەر ئەوەمان پێباشە... عەسکەرخان پێیگەشاوە و چەند کەسێکی خۆی ناردنە پێشوازی و ڕێوڕاست هاتن و لە چادری عەسکەرخان دابەزین. پاشان بە ڕێنموونی عەسکەرخان پێشکەشییەکانیان بردە خزمەتی میر و بەپێی تکا و داوای ناوبراو و بە تەگبیر و پێشنیاری سەرۆکانی ئەفشار فەرمانی شانازی حکوومەتی ورمێ بە ناوی قاسمخانەوە لێدرا. هەروەها حوکمی وەکیلایەتی دیوانی پیتاک و دارایی ورمێ کە پێشتر هی میرزا ئەبولحەسەنی خوابەخشیو بوو، باربووی میرزا محەممەدنەبی کوڕە گەورەی کرا و خودی عەسکەرخانیش بوو بە سەرکردەی دووهەزار کەس سوارەی ئەفشار کە لە ڕکێف پادشادابێ و ئەم کۆمەڵە بە شادی و کامەوایی و بە خەڵاتی میرانەوە ڕوویان کردەوە ورمێ.

## قاسمخانی کوڕی ڕەزاقولی‌خان و ڕووداوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی و پێوەبوونی محەممەدقولی‌خان

کاتێک قاسمخان بەپێی فەرمان لەسەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ پاڵی داوە و کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی مەڵبەندەکە، عەسکەرخانیش پێداهات و هەزار سوارەی ئامادەی ئەفشاری لە سان دا و ڕێکیخستن و بە تەگبیری قاسمخان لە ماوەیەکی کەمدا هەزار سوارەی ئەفشاری دیکەشی هێنانە ڕیزی قۆشەنەوە. پاش ئەم کار و هەنگاوانە محەممەدخانی قاجار پیاوی ناردە لای محەممەدقولی‌خان لە شنۆ و داوای لێکرد بێتە بەردەرگانەی میر و سەری وەبەربێنێ. محەممەدقولی‌خان بە قایمی و پتەوی جێگاکەی و زەوەندی یارانی خوڕی و لووتی بە نێردراوەکەی محەممەدخان‌دا نەهێنا و بە هێزێکی زۆری عێلی زەرزا و کوردانەوە ڕۆیی بۆ باراندێز. لەم لایەشەوە محەممەدخان وێڕای سوارانی ئەفشار چوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی و لەشکریان لە مەزرای ساری بەگلوو بەرەوڕووی یەکتر وێستان. هێشتا هیچ لایەک شەڕی هەڵنەگیرساندبوو کە قارەمانخانی ئەفشار لەبەر دەماری عێلانی هاتە پێش ڕیزەکانی سپای محەممەدقولی‌خان و کەوتە ئامۆژگاری کردنی و ئاکامی دژایەتی لەگەڵ دەوڵەتی بۆ ڕوون کردەوە. محەممەدقولی‌خان چونکە زانی پەند و ئامۆژگارییەکانی بێ‌گرێ‌وگۆڵن گوێی بۆ شل کرد و ڕەزامەندی دەربڕی و لەوێوە ئەفراسیاب‌سوڵتانی وێڕای سوارانی کورد و زەرزا ناردەوە شنۆ و خۆی لەگەڵ قارەمانخان دایە پاڵ لەشکری ئەفشار، بەڵام لە کاتی چوونە نێو شاردا، محەممەدخان بەرێ‌پێگرت و لە باغی نەزەر بنەی پێداکوتا و قەرەوڵی بە دەورەیەوە دانا. بەری‌بەیانی محەممەدخانی سەردار وێڕای عەسکەرخان و

دووهەزار سوارەی ئەفشار و حوسێنقولیخانی برازای محەممەدقولیخان و رەحیمخان و مەحموودخانی قاسملوو. هەستان رۆیشتن و محەممەدقولیخانیان لە ورمێرا برد بەرەو کۆمەڵی کاروانی پیرۆز. لە شارەدێی سەڵماس میحرابخان و نەسرولڵاخانی قاجار کە ئاغامحەممەدخان راینەسپاردبوون گەیشتنە سەریان و بۆ ماوەی کاتەژمێرێک لەگەڵ محەممەدخانی قاجار لە پەنایەک کۆبوونەوە و پاشان لەرێوە هەردک چاوی محەممەدخانیان لە قاپێلکان دەرهێنان و بۆ چاوترسێنکردنی خەڵک بە بەرچاوانیاندا گێران. [هەتا لە بیرمە با ئەوەندەش بگێرمەوە کە] محەممەدخانی سەرداری عیززەددینلوو لەگەڵ محەممەدزەمانخانی برای کە حاکم بوو لە بەستام و محەممەدوەلیخان و محەممەدتەقیخانی شلمبەیاتی و تاقمێکی دیکە دژی خاوەنشکۆ خەریکی کەینەوبەینە بوون، بەڵام لەپڕێ لێفەیان لەسەر پیلانی هەڵدرایەوە و بە حوکمی فەرمانڕەوا محەممەدخان و محەممەدزەمانخانی برای و محەممەدوەلیخان سزادران و هەرسێکیان چاویان کۆلدرا.

ئێستا با بادەینەوە سەر هەودای قسەی خۆمان. کاتێک محەممەدقولیخانی ئەفشار لە ناوچەی قەرەجەداغ گەیشتە بارەگا و هۆردووگای بەرزی، خاوەنشکۆ زۆری بە سەر رۆیی و بالبەستە لەوێ راگیر کرا. حوسێنقولیخانی دونبولی کە بە حوسێنخان دەناسرا، کرایە حوکمداری تەورێز و ئەردەوێل و پاشان لەشکری بەشان و شەوکەتی رووی کردە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات و لەوێ رکێفی بەتال فەرموو.

لەم سەروبەندەدا برایمخەلیلخانی جەوانشێر کە سادقخانی شوقاقی حاکمی سەراب پەنانشینی بوو، لای پاشا بۆی داپاڕی و لێبووردنی میرانە باڵی بە سەر کێشا. ئەگەرچی گڕی ئاگری ئاژاوەی لوتفعەلیخانی زەند لەبەر تەوژمی پەلاماری هێزەکانی قاجار بە سەرکردایەتی باباخان خۆی بۆ رانەدەگیرا و رۆدەمرکا، بەڵام هەر جارەی لە بالێک سەری هەڵدەدایەوە. خانی زەند کە لە

ئیسفەهانەوە ڕەوببوو، لە شیراز پشێوی دەنایەوە و کاتێک خاوەن‌شکۆ تەشریفی لە تەوریز بوو پەیتاپەیتا هەواڵی شاڵاوی سەربزێوانەی دەگەیشتە گوێی موبارەکی. هەر بۆیە جارێ دەستێکی بە سەر و بەری کارە گرینگەکانی ئازەربایجان‌دا هێنا و ئاڵای سەرکەوتن‌نیشانی بەرەو عێراق هەڵدرا و شەکایەوە. لە نیزیک چیمەنی ئۆجان کاغەزێکی قاسم‌خانی ئەفشاری حاکمی ورمێ گەیشتە دەست گەورەبەرپرسانی دەوڵەت و نووسیبووی کە عێلی زەرزای شنۆ بە هان و هەڵخەڵەتانی ئەفراسیاب‌سوڵتان دووبارە کەتن و ئاژاوەیان ناوەتەوە و تەنانەت پرکێشییان کردۆتە سەر ناوچە و مەڵبەندەکانی ورمێ و ئەوەندەی بۆیان دەلوێ دەست لە تاڵان و کوشتار ناگێڕنەوە. [تکایە بفەرموون] کە فەرمان چیە؟ ئاغامحەممەدخان دەستووری دا کە عەسکەرخان بە خۆی و سوارانی بگەڕێتەوە ورمێ و شان‌بەشانی قاسم‌خان و ئەو هێزەی کە هەیانە بکەونە لێدان و بەرپەرچدانەوەی زەرزایان. ناوبراو بەپێی فەرمان لە ماوەیەکی کەمدا خۆی گەیاندەوە ورمێ و وێڕای قاسم‌خان قۆشەنیان بەرەو شنۆ گاڵ دا. فەرمانێکیشیان نووسی بۆ بوداق‌خان کە ئەویش بە خۆی و سپای موکری سابلاغەوە بکشێ و لە ناوچەی سندووس بگاتە قۆشەنی ورمێ. ئەتا قاسم‌خان و عەسکەرخان گەیشتنێ، موکریش ئامادە بوون و تێکڕا بەرەو شنۆ ئەسپیان لینگ دا.

بەڵام عێلی زەرزا پێشتر لەشکرێکی بێ‌ژماری سوارە و پیادەی هۆز و خێڵاتی بلباس و ڕەوەند و هەرکییان کۆکردبوونەوە و ئامادەی شەڕ و بەرەنگاری ... هێندەی پێنەچوو کە لەپڕ قاسم‌خانی حوکمڕانی ورمێ و عەسکەرخان بە لەشکرێکی وەکوو خێز و خۆڵ لێیان‌وەدیار کەوتن و خۆیان نواند و سەرۆکانی ئەفشار نەیاندەزانی کە موکری و زەرزا لە ژێرەوە ڕێککەوتوون کە قۆشەنی موکری لە یەکەم پەلاماردا پشتیان لێ‌بکەنەوە و هەڵێن. بەری‌بەیانی کە هێزەکانی ورمێ بەرەوڕووی قۆشەنی سەربزێوان بوونەوە، بە حوکم و ئاماژەی قاسم‌خانی حوکمداری ئەفشار هەر تاقم و لقەی لە جێی خۆیان سەفیان بەست و

بە ڕێکوپێکی نووتەپلە و کەلەشاخی شەڕیان لێدا و هەلیانکوتایە سەر خەنیمان. سوارانی زەرزاش پشتیان دابوو بە قەلاوە و ئامادە بوون بۆ بەرەنگاری. کاتێک هێزەکانی ئەفشار پەساپەسا تێکبەزین و دەستەدەستە پالیان وێکدا و لێبڕان بۆ بەربەرەکانی، «مەحموودخان»ێکی موکری کە خزمایەتی هەبوو لەگەل ئەفشارەکانی ورمێ، بە بیانووی ڕمبازی و تەقلەلێدان لە ڕێزەکانی ئەفشاران نیزیک بۆوە و بە ئاماژە کەسێکی بانگکردە پێش و بە گوێی هەلخوێند کە دەبێ وریا بن و ئاگاداری کاران، چونکە تۆرەمەی موکری بێفێلوفرت تێنەکەوتوون و نەکا تووشی خەسارێک ببنەوە. قاسمخان کە پیاوێکی بێئەزموون بوو لای لە قسەکانی مەحموودخان نەکردەوە. لەو حەلەدا هۆزی بلباس بەپێی ڕێککەوتنی پێشوو بەجارێک هرووژمیان کردە سەر لەشکری موکری و ئەوانیش بەئانقەست دەستیان لێکبەردا و ڕەوین. ئەم دیمەنە وای کرد کە جەماوەری ئەفشار و دونبولی تۆقین و سەریان لێشێوا، چونکە ئەوان زیاتر بە کۆمەلی موکری دەخوڕین و پێیان دلگەرم بوون. لەو لاوە تفەنگدارانی کورد وەکوو برێشکەی سەر سێل فیشەکیان تەقاند و کردیانە حەولەوەلای ڕۆژی قیامەت و لە قەلای شنۆشەوە قۆشەنی پیادە دەستەوخەنجەر هەلیکوتانە سەر. قاسمخان و عەسکەرخان وەختایەک باروبۆخەکەیان ئاوا هاتە بەرچاوی، بەناچار بوونە ڕێبواری ڕێی ڕاکردن. توخم و تۆرەمەی کوردان لەبەر بوغزاندن و دوژمنایەتی دەستیان لە کوشت و کوشتاری ئەفشار و هێزەکانی هاوکاریان نەپاراست. دەلێن لەو هەرایەدا نیزیکەی هەزار چەکداری سپای دونبولی و ئەفشار کوژراون و هەزارەزیلەیان بە خاکەساری و خەسارباری بە کەلی «خانتاوس»دا چوونەوە ورمێ. بەڕاستی عەسکەرخان توانی بە فرتوفێل لەو گێژاوەیان دەرباز بکا، ئەگینا هیچکەس بە زیندوویی دەرنەدەچوو.

## لادرانی قاسمخان و حکوومەتی دووبارەی محەممەدقولیخان

سالی ۱۲۰۷ی کۆچی/۱۷۹۲-۱۷۹۳ی زایینی، وەختایەک کە ئالای شەکاوەی سەرکەوتننیشانی سپای ئێران بە فەرمانی بەڕێز ئاغامحەممەدشای قاجار بۆ لێدانی لوتفعەلیخانی زەند بەرەو زەرەقانی شیراز هەڵدران، هەواڵگرانی دەسەڵات هەواڵی شکانی قاسمخانی حوکمداری ورمێیان بە دەست زەرزا و بلباسان وەکوو چۆن پێشتر باسی کرا، بە خزمەت گەورەپیاوانی بارگا ڕاگەیاند. ئاغامحەممەدشا زۆری پێتێکچوو و بە زمانی مبارەکیدا هات کە قاسمخانی گەنجی گەوج لە ڕاستیدا شیاوی حکوومەت و سەرۆکایەتی نیە، بەتایبەت حکوومەتی کەوشەن و مەڵبەندێکی گەورە و بەرفرەوانی وەکوو ورمێ. خودی حاکم دەبێ کەسێک بێ شارەزای دەسەڵات و بتوانێ یاغی و سەربزێوانی قەراغ و قولاغان بگەوزێنێ و نەهێڵێ سەربکەنەوە. لەم کاتەدا محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ کە لە ڕکێفیدا دەستبەسەر بوو، بە بیستنی ئەم هەواڵانە وە قلیوبلی کەوت و بە کەیخودایەتی و تکای باوەڕپێکراوانی بارگا، بڕی چوارهەزار تمەنی تەوریزی وەکوو دیاری خستە سەر شانی و سەرلەنوێ حوکمی حکوومەتی ورمێی بۆ نووسرایەوە. پاشان گوتی من تازە هەتاکوو ماوم هەر لە خزمەت ڕکێفی پیرۆزی ئێوەدا دەبم، بۆیە تکام وایە کە حوکمی بریکاری بۆ مستەفاقولیخانی کوڕە گەورەم بکرێتە باربوو. ئەم داوایەی لێ قبووڵ کرا و مستەفاقولیخان بە خەڵاتی میرانەوە بەرەو ورمێ بزووت. پاش گەیشتنەوەی حاکمی نوێ، قاسمخانی مامی بە لێخراوی و شەرمەزاری ڕۆیی بۆ سەر پەلەملکێکی بە میراتگەڕاوی باوکی لە دیزەج (دزە) و بە سەرکزی و دوورەپەرێزی هەڵکورما. مستەفاقولیخانی بریکاری محەممەدقولیخانی باوکی کەوتە سەر ڕاپەڕاندنی کاروباری وڵاتەکە.

بەڵام لەو لاوە وەکوو پێشتر باسی کرا کاروانی شکۆداری ڕێزدار ئاغامحەممەدشا بە مەبەستی خاشەکێشانی لوتفعەلیخانی زەند لە مێرگ و

چیمەنی «گەنمان»ەوە وەڕێکەوت. عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی ئەفشار و ڕەحیمخانی قاسملوو بە خۆیان و سوارانی بەرفەرمانەوە لە ژێر سێبەری ئالای شەکاوەیدا دەچمین. بەکورتی پاش ئەوەی لەشکری بەشەوکەتی گەیشتە مێرگ و جێلەوەری «ئیرەج» بە خزمەتیان ڕاگەیاند کە لوتفعەلیخان بە ئامانجی هەلمەت و پەلامار لە زەرەقانەوە کەوتۆتەڕێ و لە دوور و نیزیکی ڕکێفی شکۆمەندەوە بۆسەی داناوە. میری فەرمانڕەوا فەرموویان ئەگەر هاتوو نیشانەی زەبر و شالاو دەرکەوت، نابێ هیچکەس بێئیزن لە شوێنی خۆی چورتە بکا و دەست ببزێوێ. دەگێڕنەوە لوتفعەلیخان کە بە خۆی و کۆمەلەچەکدارێکی زەند و خێلاتی فارسەوە دەیهەویست لەناکاو هەلکاتە سەر ئاپۆرای ڕکێفدارانی پیرۆزی و بۆسەی دانابۆوە، حاجی برایمناوێکی شیرازی لە تۆرەمەی حاجی قەوامی بەناوبانگ دەچێتە لای و بە سەری دەڕوا و سەرکۆنەی دەکا و بە خێرخوازی دەکەوێتە ئامۆژگاری کردنی و دەلێ ئەتۆ بە خۆت و بەم پۆلەچەکدارەوە کوا دەرەقەتی پادشای ئێران دێی و بەراستی ئەوەی دەیکەی نابەخێرە. لوتفعەلیخان کە لاوێکی بادیهەوا بوو، گوێی نەدایە پەندی حاجی و بە تەگبیر و دنەی میرزا ئەحمەدی وەزیری خۆی، وێڕای پێنسەد سواری دڕ و ئازای زەند و لوڕان بە مەبەستی هەلکوتانە سەر هۆردووگای ئاغامحەممەدشای قاجار گوڕی بەست. سەرەتا لە بۆلی ئیرەج تووشی برایمخانی دامغانی هات و شەڕ قەوماو برایمخان پاش دەسکردنەوەیەکی پیاوانە کوژرا. لوتفعەلیخانی زەند، عەبدوللاخان و محەممەدخانی زەند کە مامی بوون، ناردنی بۆ گەڕانگەری هۆردووبەزی میری و خۆشی وێڕای چەکدارانی لە بەرامبەر هۆردووگادا قوت بۆوە و بێسێودوو ڕامالی برد و شەڕی هەلگیرساند. ترس و دلەڕاوکەیەکی وای تێخستن دەتگوت قیامەت ڕابووە. لوتفعەلیخانی ئازا لەو جەرگەی شەوەدا چەشنی گڕی ئاگر هەر جارەی شالاوی بۆ لایەک دەبرد و تیژ دەبەزی. لەو کاتەدا عەبدوللاخانی زەند ویستی پەلاماری خێوەت و

بارەگای میری بدا، بەڵام ئاغاخانی قوڵلەرئاغاسی[1] و میرزا محەممەدخانی لاریجانی پێشیان پێگرت. لەو جەنگەدا میرزا فەتحوڵڵای ئەردەڵان گەیشتە سەر لوتفعەلیخان و مزگێنی سەرکەوتنی دایە. لوتفعەلیخان بە متمانەی ئەم مژدەوە لە هۆردووبەز دەرکەوت و لە گۆشەیەک لەنگەری گرت. بەکورتی لەو شەودا هێرش و زەبری لوتفعەلیخانی زەند سێیەکی لەشکری پرشوبڵاو کرد و زۆربەیان کوژران یان برینـدار و دەسبەسەر کران. محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلووی ئامۆزای بەڕێزی دایکی منی نووسەر کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی سوارەی ئەفشار ئاوای گێڕایەوە: لەو بگرە و بەردەدا یەکێک لە فەرماندەرانی لوتفعەلیخانی زەند لە ئەسپەوە هەڵدێرا و من کە مەتەرێزم گرتبوو، خێرایەکی گەیشتمە سەری و دەردەستم کرد. ئەو هەر چاوم بە سەرییەوە بوو، بەڵام بەریبەیانی لە ڕێگای خودادا ئازادم کرد. ئەو کابرایە وەختایەک دەگاتەوە لای لوتفعەلیخانی زەند تەماشا دەکا ئەوە دە سواری گیراوی ئەفشاران کەوتوونە بەر سێبەری شیری جەللاد و خەریکن سەریان بپەڕێنن. بەڵام هەر کە بەسەرهاتی خۆی بۆ خانی زەند دەگێڕێتەوە، لوتفعەلیخان ئافەریم دەنێرێ بۆ جوامێری محەممەدحەسەنبەگ و سوارانی ئەفشار ئاکووژێ و لێیان خۆش دەبێ.

خولاسەی کەلام وەختایەک خۆر لە سەرانی دا لوتفعەلیخانی وای دەزانی کە لەو شەوگورزەدا لەشکری ئاغامحەممەدشا بەتەواوی تێداچووە و دەستی لێکبەرداوە و کوشتار و تاڵان هیچ لایەکی وەدوا نەداوە و خودی پادشاش یان کوژراوە یا ڕایکردووە. بەڵام وەختایەک کازیوەی بەیانی گوێی بە شیرەی کەلەشاخ و گرمەی تۆپی ساندیتن و دەنگی دلنیای بانگدەران زرینگایەوە، زانی کە سەرکەوتنی دوێشەوی خەون و خەیاڵ بووە و زەحمەتەکەی بە فیڕۆ چووە. بۆیە پشتی دەستی خۆی گەست و بە پەرێشانی و بە پەشیمانی لە کردەی خۆی سەری وڵاخی بەرەو کرمان وەرسووڕاند و ڕەوی و نووسەت کەس لە هاوڕێیانی

---

[1] - سەرۆکی غولامانی بارەگای شا.

گیران. عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی و ڕەحیمخانی قاسملوو کە وێڕای سوارانی ئەفشار لەو شەوە تاریکەدا هەتا بەیانی کەوتبوونە شەڕ و بەربەرەکانی، لەسەر داوای خۆیان و بەپێی فەرمانی فەرمانڕەوا کەوتنە شوێن لوتفعەلیخان و باباخانی سەرداریش لەگەڵیان چوو. وا بڕیار درا ئەگەر لە مەودای ڕێگادا تووشیان بە تووشی نەبۆوە هەتا شیراز ڕانەوەستن. ئەوسا ڕکێفی موبارەکی بەرەو شیراز بزووت و لەو لاوە حاجی برایمخانی شیرازی و سەرداران و پیاوماقوولانی فارس بەرەوپیری کشان. ئەنجا پاش ئەوەی کە حاجی برایمخانی دانا بە بریکاری حکوومەتی فارس و خاوخێزانی لوتفعەلیخانی کۆچ دا بۆ ئەستەراباد، تەواوی سەرکردەکانی سپای بەسەر کردنەوە و ئیزنی دان کە بگەڕێنەوە مەوتەنی خۆیان. بۆ وێنە محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ کە هەتا ئەو کاتە لە خزمەت ڕکێفیدابوو، ئیزنی گەڕانەوەی درا. عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی و ڕەحیمخانی قاسملوو، لە ڕێگای میرزا محەممەدشەفیعی مەزنەوەزیرەوە بە خزمەتی موبارەکیان ڕاگەیاند کە محەممەدقولیخان لەگەڵ ئەم غولامانە دوژمنایەتی کۆنی پێماوە و ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر بچێتەوە جێگای خۆی خزم و کەسوکاری ئێمە لە چنگ زوڵم و زۆری ناحەسێنەوە و ناحەجمێن. بۆیە تکامان وایە کە سەرپەرستیی ناوچەی ئەنزەلی قەرباغ بدەن بە ئێمەی نۆکەر و بە سیلەنیگای میرانە بەسەرمان بکەنەوە هەتا بە ماڵ و کۆچەوە لە ورمێ بگوێزینەوە و لە ئازار و ئێشاندنی محەممەدقولیخان دەرباز بین و دیارە هەمیشە هەر دۆعای بەخێرتان بۆ دەکەین و خۆمان بە مسکێنی بارگاتان دەزانین. لەسەر تکا و داوایان ڕەحیمخان حوکمی سەرپەرستی و بەرپرسایەتی ناوچەی ئەنزەلی قەرمباغ و سوارانی ئەفشاری وەرگرت و لە بارگای میریڕا ڕووی کردەوە ورمێ و ماڵ و کۆچی خۆی و عەسکەرخانی وێڕای هەموو خزم و کەسەکانیانی بردە ناوچەی ئەنزەل و لە قوشچی بنەی دانا. پاش ماوەیەک عەسکەرخان لە شیراز بیستی کە محەممەدقولیخان دووبارە کەوتۆتەوە دەسدرێژی بۆ سەر خەڵک و بۆ نموونە

عەلیڕەزاخانی گرتووە و بایی چوارهەزار تمەنێکی ماڵ و دارایی لێئەستاندووە و پاشان ئازادیشی نەکردووە. عەسکەرخان ڕووداوەکانی بە خزمەت پێچکی دەسەڵات ڕاگەیاند و نامەیەکی توند و تیژی بۆ ئازادکرانی عەلیڕەزاخان وەرگرت و گزیرێکی حکوومەتی هێنای و خۆشی ئیزنی خواست و بەرەو ورمێ کەوتەڕێ. کاتێک گەیشتە ناوچەی ئەنزەل ئەحمەدبەگی برازای وێڕای کابرای گزیر و حەفدە سواری ئەفشار ناردنی بۆ ورمێ کە عەلیڕەزاخان لە زیندان ڕزگار بکەن. کاتێک گەیشتنە ورمێ بێئەوەی پرس بکەن بە بەگلەربەگ بە ڕۆژی ڕوون دەرگای بەندیخانەیان شکاند و عەلیڕەزاخانیان بە ساغ و سلامەتی بردە ئەنزەل. پاشان پیاوماقووڵان و باوەڕپێکراوان و لایەنگرانی عەسکەرخان وردەوردە بارگە و بنەی خۆیان ڕاگواستە قوشچی.

بەکورتی عەسکەرخان بە مەبەستی بنەگربوونی خۆی و کەسوکاری قەڵایەکی لە بەرەوەی گوندی قوشچی بەرەو ڕووگە ساز کرد کە ئێستا خاپوور بووە. هێندێک لە مێژوونووسان دەڵێن کە ئەم ڕووداوانە ساڵی ١٢٠٦ی کۆچی/١٧٩١ـ١٧٩٢ی زایینی قەومان. هەر لەم ساڵەدا ئەمیر سولەیمانخانی قاجار ناسراو بە ئیعتزادوددەولە، بە ئامانجی ڕێکخستنی کاروباری گرینگی ئازەربایجان و سەرۆکایەتی هەرێمەکە بەرەو تەورێز بزووت. پاش ئەوەی لە ناوەندی دەسەڵات دامەزرا و حوکمی ڕۆیی، لە ماوەیەکی کەمدا دەستەیەک لە خانان و حاکمانی ئازەربایجان سەریان وەبەرهێنا کە بریتی بوون لە: سادقخانی شوقاقی حاکمی سەراب و گەرمڕوود، ئەحمەدخانی موقەددەمی ٣٠٠ ربەگی مەراغە، حوسێنقولیخانی دونبولی بەگلەربەگی خۆی، کەلبالیخانی نەخجەوانی، نەسیرخانی شاسەیوان، محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ و عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی. هەروەها برایمخەلیلخانی جەوانشێری حاکمی شووشێ و گەنجەش عەبدوسسەمەدی ئامۆزای بە کۆلێک دیاری و پێشکەشی شایانەوە نارده تەورێز و گوتی سەرم لە ڕێدایە و خۆم بە دەولەتخوا دەزانم.

❖❖❖❖

# داکووژانی چرای چارەنووسی لوتفعەلیخانی زەند و زاڵبوونی ئاغامحەممەدخانی قاجار بە سەر تێکڕای کاروباری گشتی و سیاسیی وڵاتا

وەکوو پێشتر باسی کرا، لوتفعەلیخانی زەند پاش ئەوەی هەڵیکردە سەر لەشکرگای خاوەنشکۆ و گەلێکی ئازایەتی و مەردایەتی نواند - کە بە ڕاستی ئەویش چەشنێکە لە شێتی و شێتیش بە چەند ڕەنگان خۆی ڕادەنێ - بەڵام هیچی بۆ نەکرا و بە تێکشکاوی و خەساربارێ ملی ڕێی کرمانی گرتەبەر. لەو سەروبەندەدا خەڵکی کرمان لە مورتەزاقولیخانی قاجاری حوکمڕان و برای فەرمانڕەوا هەڵبەزیبوونەوە و شاربەدەریان کردبوو. کاتێک لوتفعەلیخان دیتی جەماوەری کرمان دڵیان بۆی دەکورکێنێ، بێ شەڕ و هەڵلا دەستی بە سەر شارەکەدا گرت. جانگیرخانی سیستانی کە پیاوێک بوو دلێر و خۆی بە ڕۆستەمی داستان دادەنا، پاڵی وێدا. بە بیستنی ئەم هەواڵانە بەڕێز ئاغامحەممەدخان کە دەیهەویست بۆ زیارەت و ڕاپەڕاندنی چەند کاروبارێک بەرەو خوراسان ببزوێ، بە مەبەستی بڕینەوەی فیتنە و ئاژاوەی لوتفعەلیخان یەکی سەفەرەکەی خستەوە و لە تارانەوە ڕووی کردە کرمان. سەرەتا هێزا باباخانی سەردار واتە فەتحعەلیشای وێڕای پێنجهەزار چەکداری ناودار گاڵدان بەرەو کرمان. عەسکەرخان و ڕەحیمخانی قاسملوو لەگەڵ سوارانی ئەفشاریش بەپێی حوکمی میر هاتبوون و لە ڕکێفی باباخاندا ڕۆیشتن. کاتێک کاروانی پیرۆزی ڕکێفدارانی گەیشتە نزیک کرمان، لوتفعەلیخان بە ئامانجی بەرەنگاری لە شار دەرکەوت و شەڕێکی قورسی کرد، بەڵام دیسانیش بەختی قرچۆکی نەیهێنا و تێکوپێک شکا و پەنای بردە بەر شوورەی قەڵای کرمان و دەرگای لەسەر خۆی گالە دا. هێزە باڵادەستەکان بە فەرمانی فەرمانڕەوا قەڵای کرمانیان دەورە دا و

هەتا شەش مانگ مەچەکەیان لێ ئەنگاوت و ئەگەرچی هێندێک فەند و فێڵی قەلاگیری نەیتوانی ولامدەرەوە بێ. بەلام گەمارۆدراوان تەنگیان پێهەلچندرا و قاتیوقڕی چنگی داکوتا و پەلوپۆی هاویشت و وای لێهات کە قەلاداران نیزیکەی دەهەزار کەسی هەژار و کاسپکار و پیر و دەستەوستانیان وەدەرنان و لە بەرەنگاری شل نەبوون. پاش تێپەڕینی ئەو شەش مانگە بە قودرەتی خودا شنەی سەرکەوتن بەرەوڕووی لەشکری نەبەزی میری هەلیکردێ. واتە ئەحمەدخانی سەوادکووهی لەگەل قۆشەنی ژێرکێفی بە فەرمانی ئاغامحەممەدخانی پادشای ئێران بە کلاوقووچەی حەساری کرمان هەلاچوون و پێنسەد کەسیش لە سوارانی ئەفشار یاریدەیان دان و لەگەلیان وەسەرکەوتن و هەموو بورجەکانیان گرتن. دەلێن یەکەم کەسێکی ئەفشار کە توانی بگاتە سەر لێواری شوورەی قەلا محەممەدحەسەنبەگی سەردەستەی مەحموودلووی ئەفشار بوو. میر ئەم ئازایەتییەی بە دلەوە نووسا و سەد تمەنی تەوریزی خەلات کرد. سەرکردەی ئەفشار گوتی نامهەوێ، چونکە ئەگەر لە پێناو خزمەتی مەزن و سایەچەوری خۆمدا گیانم فیداکەم، وەرگرتنی دەسخۆشانە لە نێو جەماوەردا بۆم دەبێتە سەرشۆڕی و پێی بۆسۆ و بەدناو دەبم و چما ئازایەتی و خزمەتێکی شایانیشم لە چنگ بێ هێندە وەبەرچاو نایا و تاریف ناکرێ. ئەم قسانەی ئەوەندەی دیکە لە لای میری خاوەنشکۆ ڕەنگیان دایەوە و بە سیلەچاوی میرانە بەسەرکرایەوە و سەری گەیشتە ئەستێرەکانی دووبرالە! بەکورتی کاتێک حەساری کرمان گیرا، لوتفعەلیخان تەماشای کرد گلۆلەی کەوتۆتە لێژی و چارەڕەشی لە چاوی نووسراوە، بۆیە پێینایە ئاوزەنگی ئەسپی خۆشبەزی و لە خەندەکی بەرینی «جەهاندە» بازی دا و چەشنی برووسکە بەرەو «بەم» فڕی. لە نێو خەلک وا باوە و دەلێن کە سێ فرسەخ یان چل فرسەخی بە شەو و ڕۆژێک بڕیوە و دیارە هەر خودا دەزانێ. دوای ڕاکردنی ئەو هێزی بالادەست دەروازەکانیان کردەوە و چونکە خەلکی کرمان پێشتر لە حاکمی خۆیان هەلگەڕابوونەوە و بە لای

لوتفعەلیخاندا شکابوونەوە، خاوەنشکۆ فەرمانی کوشتاری جەماوەر و تالانی شاری دەرکرد و دواتر بە تکا و پاڕانەوەی گەورەمامۆستایان و خاکەڕایی مەزنەپیاوان و سەرۆکان تاوانەکانیان بەخشرا.[1]

بەگشتی کاتێک لوتفعەلیخان بە ڕاکردوویی پێی نایە «بەم» و محەممەدعەلیخانی حوکمڕان، جانگیرخانی سیستانی برای خۆی وەبەرچاوی نەهات، پێیوابوو کە جانگیرخان گیراوە و ویستی کە لوتفعەلیخان بگرێ و بینێرێتە لای فەرمانڕەوای ئێران و بیکاتە دیاری دەستی خۆی، بەڵکوو بتوانێ ئاوا براکەی ڕزگار بکا. لوتفعەلیخان هەستی بەم مەبەستە کرد و ویستی لەو شوێنە دەرباز بێ، کەچی سیستانی بە حوکمی محەممەدعەلیخان ئەسپی خۆشئاژۆیان پەی کرد و خانی زەندیان بە چەند جێگا ئەنگاوت و لە پێیان پەڕاند و گرتیان.

بەسەرهاتی خانی زەند بە شێوەیەکی دیکەش دەگێڕنەوە و گۆیا وەختایەک لوتفعەلیخان گەیوەتە دەوروبەری سیستان، لە باغێک لای داوە و ڕکێفی بەتاڵ کردووە و لەبەروەی شەو و ڕۆژێک ئەو ڕێگا دوورەی بڕیوە و شەکەت بووە، ئەسپی خۆشبەزی بۆ لەوەڕ بەرەڵلا کردووە و خەوێکی قورسی بە سەردا هاتووە و لەسەر گازەرای پشت ڕاکشاوە و خەوی لێکەوتووە. لەو کاتەدا سیستانی کە بە سەر و سۆراغی دەزانن بۆی دەچن کە بیگرن، ئەسپەکەی کە خەریکی لەوەڕ دەبێ گوێی دە چەرمەوە دەبا و هەستی پێدەکا و هەڵدەستێتە سەر پاشوان و دەحیلێنێ و قەپ بە کلاوی خاوەنەکەیدا دەکا کە وەکوو بەختی خۆی

---

[1] - ئاغامحەممەدخان سەبارەت بە خەڵکی شاری کرمان بە شێوەیەکی یەکجار دڕندانە جووڵایەوە. تەواوی نێرینەی باڵغی قەلاچۆ کرین و هێزدکانی نیزیکەی ۲۰هەزار کەس ژن و منداڵیان بە کوێلە برد. وەک گێڕاویانەتەوە ۲۰ هەزار جووت چاو بە کۆگا هەڵدرایەوە و پاش ژماردن درایە دەست هێزدکانی سەرکەوتوو. «کەریمخانی زەند»، مێژووی ئێران لە نێوان سالانی ۱۷٤۷ـ۱۷۷۹، جان. ر. پێری. وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، ل ٦۱۳، سالی ۲۰۰٥، بنکەی ژین، سلێمانی، چاپخانەی شڤان.

خەوتبوو. لەناکاو لوتفعەلیخان ڕادەپەڕێ و دەیهەوێ خۆی باوێتە سەر خوانی زین، بەڵام سیستانی هەر چوار پەلی ئەو ئاژەڵە بێزمانە دەپەڕێنن و خانی زەند دەگرن. هەر چۆنێک بێ، وەختایەک گیرانی لوتفعەلیخان بە خزمەت ئاغامحەممەدشا ڕادەگەیەنن، لەڕێوە محەممەدوەلیخانی قاجار لەگەڵ عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی بەڕێ دەکا کە بڕۆن و بیهێنن. هەروەها بە عەسکەرخان دەفەرموێ کە دوو کوتە ئەڵماسی مەنشوور بە «تاج‌ماه» و «دەریای نوور» کە لە کاتی کۆچیدوایی محەممەدحەسەنخاندا کەوتبوونە چنگ زەندان لە لوتفعەلیخانی وەربگرێتەوە و لای خۆی ڕایانبگرێ. پاشان کاتێک لوتفعەلیخانیان بە کۆت و زنجیرەوە هێنایە هەوێڵ ئاغامحەممەدشا، خێرایەکی هەردوو چاوی جیهابینیان دەرهێنا کە لە تاج و تەختی فەرمانڕەوایەتی ئێرانی بڕیبوون. دواتر بە ناخۆشترین شێوەی ئەشکەنجەدان لە تاران ناردیانە ماڵی هەتاهەتایی و تەرمەکەیان لە پەنا ئیمامزادە زەید بە خاک ئەسپارد.[1] مێژوونووسانی ئەو سەردەمی چۆنیەتی کوشتنەکەیان بە چەند جۆرێک گێڕاوەتەوە و دیار هەر خوداش دەزانێ چۆن بووە.[2]

بەڵێ ئاوا بەم شێوەیە ئاغامحەممەدخان تەواوی خوازیارانی فەرمانڕەوایەتی وڵاتی یەک بە دوای یەکدا شکاند و پاشایەتی بێبەرگر و لەمپەری ئێرانی بە دەستەوە گرت و پاش بڕینەوەی هەرای خوراسان گەڕایەوە زستانەهەواری موغان و لەبەر وەرزی سەرما جارێ لەوێ بنەی داکوتا.

---

1 ئاخرین فەرمانڕەوای زەند کە هێشتا پێینەنابوویە تەمەنی ٢٥ ساڵی گیرا و کوێرکرا... مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٠٩ی کۆچی/نوامبری ١٧٩٤ی زایینی لە تاران کوژرا «کەریمخانی زەند، ل ٦١٣».

2 لەبەروەی نووسەر لە ڕەوتی گێڕانەوەی مێژووی سەبارەت بە ئەفشاران لای داوە و چۆتە سەر زەندان و لەشکرکێشانی ئاغامحەممەدخان بۆ سەر خوراسان و داکووژانی سەرهەڵدانی نادرمیرزای کوڕی شاروخشا، چەند لاپەڕەیەکمان هەڵپەڕتاوت. م. پ

## زوڵم و زۆرەملی محەممەدقوڵیخانی بەگەربەگ لە ورمێ و هاوار بردنی خەڵک بۆ لای شا

پاشا لە ماوەی مانەوەی کاروانی لەشکری شکۆمەندی باڵادەستیدا لە موغان بۆی دەرکەوت و لێیسوور بۆوە کە دەسدرێژی ڕووسیا بۆ سەر هەرێمی ئازەربایجان بە تەگبیر و دنەی برایمخەلیلخانی جەوانشێر و فێڵوفرتی ئارکێلیخان (ئارکێلخانی) والی تفلیس ڕووی داوە. بۆیە سەرەتا خاوەنشکۆ فەرمووی نامەیەک بنووسن بۆ ئارکێلیخان کە کاکڵ و نێوەرۆکی ئاوا بوو: وەکوو دیارە لە سەردەمی شاسمایلەوە گورجستان لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئێراندا بووە و بەپێی ڕێککەوتنەکانی کۆنیش تفلیس و ئێرەوان کەوتوونە نێو جەغزی ئێرانەوە، بۆیە هەر وەختایەک کاغەزی ئێمەتان زیارەت کرد دەبێ بەوپەڕی دڵنیایی و هیواداری بێنە خزمەتمان و دوای خۆشکرانی ڕێوشوێنی خزمەتکاری بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان.

بە نێردرانی ئەم کاغەزە، ئاڵای سەرکەوتننیشانی میری بەرەو قەڵای شووشی بە مەبەستی تەمێکردنی برایمخەلیلخان هەڵدران.[1]

وەکوو پێشتر باسی کرا جەماوەر چەند جارێک لە چنگ محەممەدقوڵیخانی بەگەربەگ و ئاکاری نالەباری هاواریان بردبوویە بەر

---

[1] لێرەشدا نووسەری مێژووی ئەفشار چەند لاپەڕەیەکی تایبەت داوە بە شاڵاو بۆ سەر قەڵای شووشی و پەناهئاباد و چۆنیەتی پێملبوونی برایمخەلیلخانی بە درێژی گێڕاوەتەوە. ئەوەی کە پێویستە بۆ ئەپسانەوەی پەیوەندی لەگەڵ مێژووی ئەفشار ئەمەیە کە ئاغامحەممەدخان دوای سەرکوتی برایمخەلیلخان گەڕاوەتەوە و لێرە بوو کە هەواڵی مەرگی ئەلیکساندری ئیمپراتۆری ڕووسیای بیست و زانی کە هێزەکانی ڕووسیا ناوچەکانی شیروان و دەربەندی پێشتر داگیرکراویان چۆڵ کردووە و گەڕاونەوە. بۆیە لەشکری میری بەرەو تفلیس دەنگ درا و کەوتەڕێ. . ئێمەش ئەو چەند پەڕەمان هەڵقرتاند. م.پ

بارگای میری. بەڵام وەختایەک کە بیستی خاوەن‌شکۆ ئاغامحەممەدشا بەرەو گورجستان بزووتووە، پتری تەنگ بە خەڵکی ورمێ هەڵچنی و بە ڕێبازی ملهوڕی‌دا شۆڕ بۆوە و بە قەدرایە سەرەموویەک لە هەڵپێچان و لێپرسینەوەی فەرمانڕەوا نەدەترسا. بۆیە سەرەنجام چەوساوەکان تێکڕا چوون و دەستەوداوێنی ڕێزدار مەلا محەممەدحوسێنی ئیمامجومعە بوون و لە مەحکەمەی وی بنەیان داگرت کە پەنا و پەسیوی خوار و ژووری کۆمەڵ بوو. جا چونکە بەڕێزیان دەیزانی لالانەوە و پاڕانەوە لای بەگلەربەگ دادی کەس نادا، بەگوێرەی ئەرکی ئایینی بۆ بڕینەوەی ماکەی زوڵم و زۆرەملی وێڕای پۆلێک کەیخودای مەلبەند و بازرگانی سەربەدەرەوە، لە ورمێوە بزووت و ڕووی کردە کاروانی کەژاوەی مەزنی و دوای بڕینی چەند ڕۆژمڕێیەک، لە دەورووبەری گەنجە لەگەڵ یارانی گەیشتە هۆردووبەزی کە دەنگوت ئاسمانی شکۆمەندە. لە دەرفەتێک‌دا تەواوی زوڵمەکانی محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگی سەبارەت بە خەڵکی ورمێ عەرز کرد. ئاغامحەممەدشا کە ئاوازەی پیاوچاکی بەڕێزیانی بیستبوو، زۆری حورمەت بۆ دانا و بەخێری هێنا و بەپێی سکالای ئەوان نامەیەکی پڕ هەڕەشە نووسرا کە دەبێ هەرچی زووە محەممەدقولی‌خان بگاتە خزمەت فەرمانڕەوا و بزانین چ باسە و چی کردووە. کاتێک ڕکێفی پیرۆزی گەیشتە دەورووبەری تفلیس لە شوێنێک کە پێی‌دەڵێن سووقانلوو هێزەکانی ڕێکوپێک کرد و سوارانی ئەفشاری ورمێ بە سەرکردایەتی عەسکەرخان کرانە پێشەنگ. لەو لاشەوە والی گورجستان کە بە قایمی و پتەوی شوورە و بورجی قەڵا و جەماوەری زۆر و زەوەندی سوارە و پیادەی دەنازی و پشتی پێیانەوە گەرم بوو، لە چوار فرسەخی دامەزرابوو بۆ شەڕ و بەرەنگاری. کاتێک هێزەکان خۆیان ساز کرد بۆ تێکهەڵچوون، خوداوڕاستان لەو ڕۆژە ڕوونەدا مژەکوێرەیەک وڵاتی داگرت کە دەتگوت یەکەم شەوی چلەی گەورەیە. لەشکرچی بەو ڕۆژەڕەشە تێمان و ساردبوونەوە و سەریان لێ‌شێوا. خەلک دەڵێن لەو کاتەدا ئاغامحەممەدشا بۆ

تەماشای دیمەنی شەڕ لەسەر گردێک ڕاوەستابوو. کاتێک ئاوای چاوپێکەوت لە ئەسپەکەی دابەزی و نێوچاوانی نیازی لە خزمەت پادشای ڕاستەقینەی بەندەلاوێنەوەدا نایە سەر خاکی زەلیلی و کەوتە هاوار و پاڕانەوە و ئاوای گوت: ئەی خوداوەندی مەزنی دلاوا، ئەگەرچی منی بەندە شایانی تاج و تەخت و فەرمانڕەوایەتی نیم و بۆ سەرزنجیرەی خانەدانێک نابم، بەلام بە گەورەیەتی و بەخشندەیی تۆ هیوادارم. ئومێدم وایە بەم جەماوەرە مسوڵمانەوە کە من لەسەر خانە و لانەی خۆیان هەڵمکەندوون و هێناومن، بە ڕووزەردی و تێشکاوی خۆم نەبینمەوە... دەڵێن تیری پاڕانەوەی ئەو پادشایە گرتی و لەپڕێ هەوا خۆشی کردەوە و تەم ڕەوی. ئەو کات دلێرانی ئەفشار دیتیان کە تفەنگچی گورجی لە مەودای تیراوێژ تێپەڕبوون، بۆیە بەجارێک دەسرێژیان لێکردن. وای لێهات کە شەرگە لەبەر دووکەڵی فیشەکان تاریکتر داگیر لە بەختی گورجییانی دەبەنگ. بەلام لەناکاو لە نێو باغاتی تفلیسەوە تفەنگچی بێدین و ڕقەوەنی بۆسەداگرتووی گورجی وەکوو بارێزەی باران فیشەکیان بەرەو سوارانی ئێران هەڵتۆقاند. کاتێک سوارانی ئەفشار و بوێرانی ناودار بە دەسرێژی ئەو شەڕەنگێزانە خۆیان نوقمی گێژاوی نەمان هاتە بەرچاو، بە شیری ئاورینگدار و نێزەی برووسکەئاکار چەشنی گڕی ئاگر خۆیان بە جەرگەی لەشکری گورجییان دادا. فڕینی تیران و برشت و بڕینی شیران جۆباری خوێنیان لێکەوتەوە و ئەوەندە کەلاکی پیاوان بە سەر یەکدا کەوتن کە سەحرا شانی لە شانی کێوان دا. سەرەنجام بەسەرکرانەوەی یەزدانی خۆی نواند و شنەی سەرکەوتن پرچی ئالای فەرمانڕەوای ئێرانی شەکاندەوە و گورجی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و تۆقین و بەناچار بوونە ڕێبواری ڕێگای ڕاکردن...

ئارکیلیخان ڕووی لە تێکهەلچوون وەرگێڕا و بەرەو تفلیس بەزی و لەوێش خۆی پێ نەگیرایەوە و هەلات بۆ کاریتێل (کارتێل) و کاخت (کاختی).

ئەوسا بەپێی حوکمی فەرمانڕەوا هێزە باڵادەستەکان تفلیسیان گرت و پازدەهەزار کەسیان بە یەخسیر برد.

ئـەنجا پـاش گیرانـی تفلـیس، مـیری خـاوەنشـکۆ ڕێـزدار مـەلا محەممەدحوسێنی ئیمامجومعەی ورمێ و کـەیخودایان و بازرگانـان و کەسـانی ئەفشاری کە لەم ماوەیەدا لە ڕکێفیدا بوون و هەمیشە دوای نوێژان لەبەر خودای تاق و تەنیا دەپاڕانەوە بۆ سەرکەوتنی لەشکری ئێـران، وەبـیری گـوڵاوپژێنی خۆی هێنانەوە و بانگیهێشتن. پاشان بەو زمانەی کە پەیامی یەزدانی لێدەباری فەرمووی ئەم سەرکەوتنەی ئێمە هەمووی لە خێر و بەرەکەتی نزا و پاڕانـەوەی ئێوە بوو. ئێستا وەختی هاتووە کە بە سکاڵای ئێـوەدا بچمـەوە و دادی هـەموو لایەک بدەم و نەهێڵم کەس مافی بفەوتێ. ئەوسا ڕووی کردە محەممەدقولیخان و خۆی لێسوور و شین هەڵگێڕا و سەرکۆنەی کرد و تێیڕاخوڕی و گوتی ئەوەندەت خەڵک چەوساندۆتەوە کە دەمهەوێ بەو گوێزلکەی[1] بە دەستمەوە هـەرد چـاوت دەربێنم. دیسان مامۆستا و هاوڕێیـانی کەوتنـە پاڕانـەوە و گوتیـان قوربـان لێیخۆش بە بەو مەرجەی لەسەر دەسەڵات نەمێنێ و پیاوانی ئایینی و مـەزن و ماقووڵانی مەڵبەندەکە هەر کەسـێکیان هەڵـبژارد، دەوڵـەتی پایـەدار حـوکمی حوکمڕانی بۆ بنێرێ. مامۆستا و یارانی تێکڕا گوتیان کە عەسکەرخان دەمڕاستی ئێمەی بەڵاگەردان و کەیخودامانـە. محەممەدقولـیخـان وەختایـەک زانـی کـە حکوومەت و سەربەستی وی تەواو بە ڕا و بۆچوون و ڕەزامەندی عەسکەرخانەوە بـستراوەتەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ کەوتە دڵدانەوەی و مەزنەپیاوانی بارگاشـی کـردە ڕاسپاردە و نێوبژیوان و دیسان چۆوە سەر دەسەڵات. ئەوسا محەممەدقولیخان و ئیمامجومعەی بەڕێز و تێکڕای هاوڕێیانی دیاری و خەڵاتی شـانازی میرانـەیان باربوو کرا و ئیزن دران و دڵیان لێکتر پاک کردەوە و گەڕانـەوە ورمـێ. کاتێـک

---

[1] - قەڵەمبڕێکی نووک هەڵگەڕاوەی تیژ کە چاوی مرۆڤیان پێدەکۆڵی.

گەیشتنەوە ناوچەی ئەنزەل، بەگەربەگ لەگەڵ تەواوی هاورکێفانی لەو قەلایەی قوشچیدا کە عەسکەرخان سازی کردبوو، بوو بە میوانی عەسکەرخان و ڕەحیمخانی قاسملوو. پاشان بەختیار و خاوەندەسەلات ڕۆیشتن و پێیان نایە ورمێ و خەلکیش بە شێوەیەکی شایان چوونە پێشوازیان و بەخێریان هێنانەوە.

پاش ئەوەی بەگەربەگ وەکوو جاران چۆوە سەر تەختی حوکمات، بەپێچەوانەی رابردوو دەرگای خۆشەویستی و دادەوانی بە ڕووی تێکرای جەماوەردا کردەوە و بەتایبەت ئەوەندە گەرموگوڕ و نەرم و نیان لەگەڵ عەسکەرخان جوولایەوە کە بەجارێک قەرەبووی ڕووداوەکانی پێشووی کرایەوە. لەبری خانووبەرەکانی عەسکەرخان کە بە حوکمی ئەو خاپوور کرابوون، دوو دەستی دیکەی دەر و ژوور لە لای دەروازەی عەسکەرخانەوە بۆ ساز کرد و وەستاکاری شارەزای لێوەخۆخستن و نەیهێشت هێندەی پێبچێ. ئەو خانووبەرانە ئێستاش هەر ماون و بە چنگ کورەکانییەوەن. دواتر خوشکی خۆشی دایە کە فەرەجوللاخانی لە داوێن کەوتەوە.

لەو لاشەوە وەختایەک ئەفراسیابسولتانی زەرزا لە شنۆ بیستی کە بەگەربەگ بە سەربەستی گەڕاوەتەوە، لەگەڵ هاوسەری کە خوشکی محەممەدقولیخان بوو ڕووی کردە ورمێ. ئەگەرچی لە یەکەم دیداردا زۆر بەخێرهاتن کرا و ڕێزی لێگیرا، بەلام چونکە تەواوی ئاکاری نالەبار و هەلوێستی دزێوی بەگەربەگ دەگەڕانەوە سەر فێڵ و تەڵەکە و بەدفەڕی ئەو دڵچەپەلە و ڕژانی چەند خوێنی بەناهەق و تێداچوونی گەلێک بنەماڵەی لەمێژین بە پیلانی ئەو بوون، تۆڵەیان لێئەستاندەوە و دەرمانداویان کرد.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر ڕەوتی ڕووداوەکانی هەمووانی و وەبیری بێنینەوە کە پێشتر برایمخەلیلخان سەری وەبەر خاوەنشکۆ هێنا و خۆی بە گیانباز و غولام دانا و گوتی هەموو سالێکیش باج و خەراج دەدەم. هەر بۆیە کاروانی کەژاوەی ڕکێفدارانی ئاغامحەممەدخان لە شووشێرا گەڕاوە تارانی

پایتەخت. بەڵام هێندەی پێنەچوو کە برایم‌خەلیل‌خان پێی لە گفت و بەڵێنەکانی خۆی نا و کەوتەوە کەڵەوەکێشی. جا بۆ ئەوەی کە سەربزێوی و ملبەملەی خانی شووشی وەکوو پەتا بڵاو نەبێتەوە و کەس نەیگرێتەوە و بەجارێکی تۆخمی ئاژاوەی ببڕێتەوە، مێرزا ئاغامحەممەدشای قاجار بە ترینگەوپرینگەی شایانەوە ئاڵای لەشکری بەرەو قەرەباغ هەڵدان. کۆمەڵێک فەرمانی میرانەی ناردن بۆ حاکمانی ناوچە و مەڵبەندەکانی ئازەربایجان کە بە قۆشەنی خۆیانەوە بگەنە بەرڕکێفی. بۆ وێنە کاغەزێک نووسرا بۆ محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگ کە خێرایەکی سوارانی سکۆرتی [کە دووهەزار کەس بوون] بخرێنە بەرڕکێفی مەحموودخانی کوڕی موئمین‌خانی ئەفشاری ساین‌قەڵا و بیانێنێرن. هەروەها پێویستە کە عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی قۆشەنی دونبولی خۆیە لە سان بدا و بێ‌زیاد و کەم بیانهێنێ. ئەگەرچی ئەم کارەی بە لاوە زۆر قورس بوو، بەڵام لەبەر زیرەکی و تێگەیشتوویی وەسەر خۆی نەهێنا و بەپرتاو بەرەو خۆی فری و چونکە زۆر لە کۆنەوە دۆستایەتی هەبوو لەگەڵ سەرۆکانی دونبولی و جەماوەری خۆیە نەیدەتوانی بۆ کۆکردنەوەی سپا توندیان لێ‌بکێشێ. ئەوانیش بەم نەرم‌کێشانەی عەسکەرخان خلوور ببوون و ساوەساویان دەکرد. چۆنیەتی هەڵوێستی [خانانی دونبولی] بە خزمەتی ڕاگەیاندرا و فەرمانی توند و تیژ و هەڕەشەی پەیتاپەیتا دەنێردران بۆ عەسکەرخان و گزیری ئالە دەگەیشتنە لای. هەر بۆیە ئەو بێچارەیە کەوتە گێژاوی ترس و تۆقین و لە خۆیەوە رووی کردە سەڵماس هەتا لەوێوە وێرای سپای دونبولی بڕۆنە خزمەت ڕکێفی. بەڵام هێزی دونبولی خاوەخاویان دەکرد و کۆنەدەبوونەوە و مەیلیان لێ‌نەبوو بڕۆنە بەرڕکێفی موبارەکی میر. عەسکەرخان ڕۆژ بە ڕۆژ پتری سەر ئاڵۆزکا و دەستی لە ژیانی خۆی شۆرد و لە زەبروزەنگی پادشا تۆقی. ڕاست لەو ڕۆژانەدا دەروێشێکی پیاوچاک چووبووە ماڵی عەسکەرخان کە لە ڕێگای خودادا شتێکی بداتێ. وەختایەک دیتی زۆر پەرێشان و پەرۆشە، پرسی بۆچی وای؟ عەسکەرخان گوتی لە لایەن پاشایەکی توند و تیژەوە بۆ کارێکی ئاوا

ڕاسپێراوم و لە چنگیشم نەهاتووە، ئێستا ئەوەندە لە توورەیی پادشا تۆقیوم کە هەراسانم لێ‌هەڵگیراوە و مەرگی خۆم لەبەر چاوە و نازانم چ بکەم. دەرویش کە پیاوێکی سارد و گەرم‌چەشتووی ڕەوت و ڕێبازی بواری خوداناسی و عارفێکی بەرچاو ڕوون بوو، گوتی ترسی پێ‌ناوێ و هەر ئێستا لێی‌سواربە و یەکسەر برۆ بۆ قەرەباغ، چونکە سەفەرێکی یەکجار موبارەکە و خێری پێوەیە و ئەو کەسەی کە لێی‌تۆقیوی چاوت پێی‌ناکەوێ!! یانی فەرمانڕەوا بە زیندوویی نابینی! عەسکەرخان بە متمانەی گوتەی ئەو پیرە دڵناوێنەیە بەجارێک خوتخوتەی لە دەروونی خۆی هەڵفڕاند و ترسی نەما و بە هیوای خودا یەکراست ڕۆیی بۆ قەرەباغ. وەختایەکی گەیشتێ قەڵای شووشی گیرابوو و برایم‌خەلیل‌خان ڕەویبوو بەرەو داغستان و خودی ئاغامحەممەدشا لە نێو شار بنەی داکوتابوو و لەشکری باڵادەست بە دەورەی قەڵادا دەهاتن و دەچوون. عەسکەرخان ڕۆژی ۱۹ی مانگی قوربان گەیشتێ و لە سام و خۆفی میر بەناچار لای‌دایە خێوەتی مەحموودخانی ئەفشاری ساین‌قەڵا. سادق‌خانی شوقاقی چونکە لەگەڵ عەسکەرخان ئاواڵێکی گەرم‌وگوڕ و گیانی‌گیانی بوو، هەر کە بیستی هاتووە لەڕێوە چوو بۆ خێوەتی مەحموودخان و ویستی خێرایەکی بیباتە خزمەت پادشا. عەسکەرخان گوتی ئەمشەو لێی‌گەڕێ و هەڵیگرە بۆ سبەینێ! بەڵام نەیدەزانی کە لەو شەوەدا ئەستێرەی ژیانی ئاغامحەممەدخان بەپێی چارەنووس ئاوا دەبێ.[1]

---

[1] - نووسەری مێژووی ئەفشار لێرەدا چۆنیەتی کوژرانی ئاغامحەممەدخانی بە دەست چەند کەس لە خزمەتکارانی تایبەتی خۆی کە حوکمی کوشتنی دابوون، بە دوور و درێژی دەگێڕێتەوە، کە ئێمە دەرمانهاویشت. هەر چۆنێک بێ لەو شەوەدا چرای تەمەنی ئاغامحەممەدخان کوژایەوە و ئەم پادشا بەدەسەڵاتە کە گەورەترین خزمەتی دابین‌کردنی دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی و دابڕنەکرانی خاکی وڵات بوو، بە دڵڕەقی و دەس‌قووچاوی دیار و بەرچاوی ڕووی کردە دنیای هەرمان. م. پ

ئاغامحەممەدخان ٥٦ ساڵ ژیاوە و ساڵی ۱۱۹۳ تا ۱۲۱۱ی کۆچی حکوومەتی کردووە و تەرمەکەی ڕاگوێزا دە بو نەجەف و لەوێ نێژراوە. وەرگێر

وا دەگێرنەوە کە ئەو سێ خزمەتکارەی ئاغامحەممەدخانیان کوشتبوو، تاج و کەمەرە و قۆڵبەند و سندووقچەی گەواهێراتیان هەڵگرتوون و بردوویانن لای سادقخانی شوقاقی و ئەسپاردەی دەستی ئەویان کردووە... .

بەکورتی وەختایەک بەریبەیانی ئەم هەواڵە سامناکە لە نێو هۆردوودا بڵاوبۆوە و وەراستگەرا، جەماوەری لەشکری دەستیان لێکبەردا و چەشنی کەرەکەمەری بێشوان بەرەو بیابان رەوینەوە و روویان کردەوە مەوتەنی خۆیان. لەو کاتەدا رەحیمخانی قاسملوو کە پێشتر محەممەدقولیخانی بەگەربەگ گرتبووی و توانیبووی بە فێڵەبازی لە زیندان رابکا، گەیبوویە بارگای بەرزی و بەپێی فەرمانی شا کرابوویە بەرپرسی کۆکردنەوە و هێنانی خێڵی جەوانشێر و راگواستنیان لە گەنجە و شێروانەوە بۆ شوێنێکی تر. هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی خەبەرەکە، گرتیان و دەست و پێی ئەو بێچارەیان بەست و حەوایان دایە نێو رووباری «کور» و هەرگیز سەر و سۆراغی وەدی نەهات!

عەلیقولیخانی سەرداری برای شا بەرەو پایتەخت کەوتەرێ و خێڵی جەوانشێر کەوتنە شوێنی و ئەوەندەی هێزیان بڕی کرد دەستیان لە قۆشەنی وەشاند و دایانرووتاند. بەڵام عەسکەرخان کە وەک باسی کرا لە ترسی هەڵپێچانی شا زراوی چووبوو و هۆردووگای ؤخۆی بە زیندان دەزانی، پاش ئەم رووداوە وێرای پیاوەکانی بە رێگای نەخجەواندا رووی کردەوە ورمێ و لە مەودای رێیەدا کورتەنامەیەکی نووسی و بە محەممەدعەلیبەگی جڵەوداری خۆیدا ناردی بۆ محەممەدقولیخان و سەبارەت بە باروبۆخەکە ئاگاداری ـەوە. عەسکەرخان سەرەتای مانگی محەررەم گەیشتەوە و چۆنیەتی رووداوەکە روون بۆوە و دوا بە دوای ئەویش مەحموودخانی قاسملوو لە رۆژی عاشووورادا لەگەڵ سوارانی ئەفشار هاتنەوە ورمێ.

## فەرمانڕەوایەتی فەتحعەلیشای قاجار و
## ئەو ڕووداوانەی کە لە ورمێ و ئازەربایجان قەومان

بەگوێرەی تەواوی سەرچاوەکانی مێژوویی کە سەبارەت بە حکوومەتی قاجاران نووسراون، خاوەنشکۆی باوکی پاشایان[1] فەتحعەلیشای کوڕی حوسێنقولیخان ناسراو بە جیهانسۆزشای قاجار، ڕۆژی جێژنی ڕەمەزانی ساڵی ١٢١١ی کۆچی/ ٣٠ مارسی ١٧٩٧ی زایینی، لەسەر تەختی دەسەڵاتی جیهانداری پاڵی داوەتەوە و تاجی فەرمانڕەوایەتی ناوەتە سەری. پاشان سادقخانی شوقاقی و جەعفەرقولیخانی دونبولی ئەم دوو پیاوە دووڕازە بەڕواڵەت سەریان وەبەر دەسەڵاتی هێناوە. سادقخان حکوومەتی سەراب و گەرمروود و جەعفەرقولیخان سەرۆکایەتی تەوریز و خۆی درابوویە. بەڵام سەرەتا کەوتنە شوێن تاسە و ئاواتی نەوسانی و دەبەریەکڕاچوون و دایانە باری دژایەتی و وا لێکترازان کە تووشی شەڕ هاتن. سادقخان لە حاند جەعفەرقولیخان بەرگەی نەگرت و بەزی و ڕایکردە موغان و شیروان، بەڵام سەرەنجام ئاشتبوونەوە و یەکتریان گرت و محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێشیان هەڵخەڵەتاند و بە دەسباری یەکتر ویستیان کە هەرێمی ئازەربایجان لە قاجاران دابڕن و بیکەنە پاککردە و پاوانی خۆیان.

وەکوو دیارە جەعفەرقولیخانی دونبولی و سادقخانی شوقاقی پێکەوە لە ژێر سایەی بارەگای بەرزیدا بەشداری گەمارۆ و گرتنی قەڵای شووشی ببوون. پاش ڕووداوی ئاغامحەممەدخان و دەست لێکبەردانی هۆردوو،

---

1 - ئاغامحەممەدخانی قاجار کە خواجە بوو کەسی لە پشتی نەکەوتبۆوە و پادشایانی قاجار توخمەی فەتحعەلیشان. بۆیە بە «ابوالملوک» واتە باوکی پاشایان ناسراوە.

جەعفەرقولیخان تەرمی پادشای لە شووشیڕا ڕاگواستە خۆی. دەوڵـەتیش لـە چاکەی ئەم کار و خزمەتە، کردی بە سەرۆک و پێشکاری حکوومەت لە خـۆی و تەوریزی ناوەندی دەسەڵات و کەوڵی شانازی خستە سەر شانی. بەڵام هەر ئـەو دەم تاقمێک لە خانانی قاجار بـە خزمـەت فەرمانـڕەوایان ڕاگەیانـد کـە دوای کارەساتی پادشا، گەلێک کەلوپەل و چەکوچۆلی قاجاران کەوتۆتە بەردەستی جەعفەرقولیخان و تەنانەت ماڵ و سامانی هۆردووی پرشوبڵاوی تەواو گەسک لێداوە و بردوویەتی... .

خاوەنشکۆی باوکی پادشایان لە دوای لێدوانـەکانی سـەرۆکانی خـێڵ، عەلیمحەممەدخانی قاجاری ڕاسپارد و ناردی بـۆ تـەوریز کـە بارگـە و بنـەی تالانکراوی هۆردوو لە جەعفەرقولیخان وەربگرێتەوە و حوکمێکی پتەویشی بۆ بەڕێکرا. عەلیمحەممەدخان وەختابەک گەیشتە تەوریز بەپێی فەرمان زۆر بـە توند و تیژی داوای ماڵی تالانی کردەوە. بەڵام جەعفەرقولیخان گەلێکی پاکانـە بۆ خۆی کرد و بەڵگە و بۆنەی هێنایەوە و گوتی ڕانەبردووە و ئەگەریش ڕابردبێ خێڵی جەوانشێر کردوویەتی. قسەکانی جێیان نەگرت و کابرای ڕاسپاردەش بـە گوێیدا نەچوون. سەرەنجام عەلیمحەممەدخانی جواب کـرد و لـە تـەوریزەوە ڕۆیی بۆ خۆی و لەگەڵ حوسێنقولیخانی کـاکی تـەگبیر و ڕاوێژیـان لێکـرد و لەسەر دژایەتی دەوڵەت ڕێککەوتن. بەڵام مەرجیان دانا کـە دەبـێ سـادقخـانی شوقاقی و محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی ورمێش لەگەڵ خۆیان بکەنـە یـەک دەنگ و بکەونە ناردنی نامە و ڕاسپاردان و دەسەڵاتی قاجاران لە مەڵبەندەکانی ئازەربایجان کورت بکەنەوە. بۆیە سەرەتا سولەیمانبەگ کە ئێـشیکئاغاسـی حوسێنقولیخانی دونبولی و یەکێک بوو لە مەزنانی خانەدان، وەکوو کەیخودا ناردیانە لای محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ. کاغەزێکیان لێنووسی و ویست و داخوازی خۆیان تێدا ئاشکرا کرد و گوتیان ئەگەر ئێوەی بەرزەشان بە دوومان‌دا

بنێرن ئێمە هەمیشە حازرین لەبری پێ بە سەر بێین، دەنا خۆتان تەشریف بێنن بۆ ئەم لایە و ئێمە چاوەڕوانین بۆ پێشوازیتان.

بەکورتی پاش ئەوەی سولەیمانبەگ گەیشتە ورمێ و نێوەرۆکی راسپێرانەکەی روون بۆوە، محەممەدقولیخانی بەگلەربەگیش تەواوی سەرۆکانی ئەفشار و پیاوماقووڵانی شاری ورمێی کۆکردنەوە و کاکڵ و مەبەستی دیداری پیاوەکەی حوسێنقولیخان و جەعفەرقولیخانی پێراگەیاندن و تەگبیر و راوێژی پێکردن. هەموویان تێکڕا گوتیان وا باش و بەجێیە کە خودی بەگلەربەگ بچێتە مەڵبەندی دڵبزوێنی خۆی و پاش دیدار لەگەڵ خانانی دونبولی چۆنیەتی راستی و ناراستی و قسەی دڵ و زمانی حاکمانی تەورێز و خۆی بە ئەرازووی عەقڵ و تێگەیشتن هەڵسەنگێنێ و پاشان سەرپشکە و لە کۆنیشەوە گوتوویانە: ئەو کەسە ئاقڵە کە سەرەنجامی کاران بخوێنێتەوە. بەگلەربەگ بە تەگبیری لایەنگرانی، مەحموودخانی ئەفشاری سابنقەڵا کە پیاوێکی کارزانی باوەڕپێکراو بوو، راپەسپارد کە بڕوا و تەواوی تیرە و عێل و هۆزانی ساینقەڵا، موکری سابلاغ، زەرزای شنۆ و بلباسی لاجان کۆبکاتەوە. کەیخودایەکی نارد بە شوێن سادقخانی شوقاقیدا و خۆی لەگەڵ عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی و خانئەمیربەگی خەلەج و چەند کەسێک لە سەرکردەکانی ئەفشاری ورمێ بەرەو خۆی کەوتەڕێ. بەڵام لەو لاوە سادقخانی شوقاقی زۆر بەپڕتاو هاتبوو بە ڕێگادا و لە دەشتی «ئەروەنەق» و «ئەنزاب» چاوەڕوانی دوایین هەواڵ بوو. حوسێنقولیخانی دونبولی و جەعفەرخانی برای کە زانیان محەممەدقولیخانی بەگلەربەگ بەرەو خۆی کەوتۆتەڕێ و سادقخانی شوقاقیش ڕەزامەندی دەربڕیوە، زۆر شادمان بوون و هەتا کەلی «گۆ»ی خۆی چوونە پێشواز و محەممەدقولیخانیان لەگەڵ هاوڕێیانی بردە قەڵا و باڵەخانەی سەیری «داغباغی» کە کەوتۆتە سەرەتای شەقامی شاری خۆی و وەختی خۆی خوداڵێخۆشبوو ئەحمەدخانی باوکی حوسێنقولیخان سازی کردبوو. لەوێ

بەڕاستی ئەوەندەی کرا جەعفەرقولی‌خان بە دەورەیاندا هات و چاکی میوانداری کردن و هیچی تێدانەهێشتەوە و لەم جەنگەیەشدا سادق‌خانی شوقاقی گەیشتێیە. پاش تێپەڕبوونی جێژن و خۆشی و شادی کۆڕی دانانی ڕێوشوێن و گەلالەداڕشتن پێکهات و حوسێن‌قولی‌خانی حاکمی خۆی و جەعفەرقولی‌خانی برای و سادق‌خانی شوقاقی بەکدڵ و بەکزمان بڕیاریان دا کە محەممەدقولی‌خان پێشەنگ بێ و حوکمی بڕوا و سەریان وەبەر فەرمانی بکە و نەکەی هێنا. ئەمجا چەند کاغەزێکیان ناردن بۆ محەممەدخانی حاکمی ئێرەوان، عەبباس‌قولی‌خانی حاکمی نەخجەوان، عەتاخانی شوقاقی و ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغە هەتا هەموویان بێن و لە تەورێز کۆ ببنەوە و ببنە هاوسوێند و هاوپەیمان بۆ دژایەتی کردنی فەتحعەلی‌شا کە بڕوایان بە سەقامگیربوونی دەسەلاتی نەبوو. لەسەر ئەم تەمایە محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگ و جەعفەرقولی‌خان و سادق‌خان لێی‌سواری ئەسپە کوێتی خۆیان بوون و چوونە تەورێز و وردەوردە خانەکانی دیکەش گەیشتن. لەم ماوەیەدا نامەیەکی نەهێنی لە لایەن شەیتان و شۆفاری ئەفشاری ورمێوە گەیشتە دەست محەممەدقولی‌خان سەبارەت بە حوسێن‌قولی‌خانی برازای کە بریکاری بوو لە ورمێ و تێیدا نووسرابوو کە دەستەیەک کەبخۆدا چوونە بنی و هەلیانخەلەتاندووە و هەر بێنا تەبلی حکوومەتی لێدا و ڕەنگە شەڕ و گەڕێکی وا بنێنەوە کە تازە بە هاسانی بەری پێ نەگیرێ و چارەسەر نەکرێ. حەممەدقولی‌خان بە خوێندنەوەی ئەم کاغەزە تۆقینەرە و بە بیستنی ئەم خەبەرە زۆر هارووژا و خوتخوتەی کەوتە دەروونی. سەرەتا بەپەرتاو خان‌ئەمیربەگی خەلەجی باوەڕپێکراوی خۆی بە مەبەستی لێکۆڵینەوە ناردەوە ورمێ. پاش ڕۆیشتنی خانی خەلەج، بەگلەربەگ ئەوەندەی دیکەی حەجمین لێ‌هەلگیرا و کەوتە نیگەرانی و خۆی بۆ ڕانەگیرا و ویستی کە خۆشی بەرەو ورمێ بخوشێ. بەلام جەعفەرقولی‌خان زۆری پێ لێ‌داگرت و نەیهێشت

بگەڕێتەوە، نەکا بە چوونــەوەی بەگەربــەگ ئامانجەکــە پووچــەڵ دەرچــێ و شیرازەی دانەکووژاوی کاریان لێکهەڵوەشێتەوە. کەچی محەممەدقولیخان دڵــی هەر لەسەر پێ بوو، بۆیە سەرەنجام عەسکەرخانی لە جێگای خۆی دانا و هەموو دەسەڵاتێکی دایە و بەهەشتاو بەرەو ورمێ باڵی گرت. ئەحمەدخانی موقەددەمیش بە بیانوویەک ڕووی کردەوە مەراغە و خانەکانی دیکەش هەرکام بــە بەهانــەی کۆکردنــەوەی قۆشــەن ڕۆینــەوە مەوتــەنی خۆیــان. لــەم لایــەوە کاتێــک حوسێنقولیخان گەیشتەوە ورمێ سوور بوو لەسەر گرتنی حوسێنقولیخــان و محەممەدعیساخان و لوتفعەلیخانی براکانی، چونکــە ئــەوانی بــە هانــدەری بریکاری حوکمدار دەزانی. وەختایەک کەسان و نیزکانی حوسێنقولــیخــان بــە تەما و بڕیاری بەگلەربەگیان زانی، لەڕێوە تێیانگەیاند و ئەویش بــە براکــانی ڕاگەیاند و لە مەودای شەودا ڕووی کردە گوندی سەعیدلوو یان قەلای بارانــدێز. محەممەدعیساخان و لوتفعەلیخان - کە دواتر بوو بە فەرماندەی لقی حەوتی ئەفشار - دوا بە دوای کاکیان بزووتن و ڕێگایان هەتلە کــرد و چوونــە ئــاوایی «بەند» کە لە زارکی ناوچەی مەرگەوەڕ هەلکەوتووە و ئاوی ڕووباری «شاراجۆ» لەوێڕا دێتە خوار. کەللەی بەیانی کاتێک بەگلەربەگ بە ڕاکردنی براکانی زانی، چەند سوارێکی تیژبــەزی بــە شــوێنیدا نــاردن کــە بیــانگرن و بیانگێڕنــەوە. خوداوراستان محەممەدعیساخان و لوتفعەلیخان لە دێی «بەند» گیرۆدە بوون، بەڵام حوسێنقولیخان کە لە دایکەوە لە تایفەی خەلەج بوو، ماڵــی خاڵــوانی باڵیان بە سەر کێشا و بوونە چاوساغی و توانی دەربازبێ بۆ ناوچــەی شــنۆ و لەوێ عێلی زەرزا ماوەی سێمانگان بوونە خانەخۆیی و زۆریان ڕێــز لێگــرت و ئەرکی نۆکەرچاکی خۆیان بەجێهێنــا. پاشــان لــەوێوە ڕووی کــردە ســابلاغی موکری و چوو بۆ لای بوداقخانی کوێر کە لە بابەلبابەوە لایەنگری ئەم بەرەبابە بەرزەجێیەی قاسملوو بوو. خانی موکری هــاتنی کــوڕی خانــەدانی بەســایە و

سێبەری خۆی بە هەل زانی و ئەوەندەی توانی پێداویستییەکانی مەودای ڕێگای سەفەری بۆ تێکنا.

حوسێنقولیخان لە سابلاخەوە بەرەو تارانی پایتەخت بزووت و بە ڕێگای میاندواودا ڕووی کردە مەراغە و ئەحمەدخانی موقەددەمیش چۆن چاکە ئاوای دەستی ڕێزلێنا و خانی وەجاغزادەی دنە دا کە لە سەفەری خۆی بۆ لای پادشای بەرزمجێ پەشیمان نەبێتەوە. لەوێشەوە حوسێنقولیخان تەدارەکی شیاوی بۆ گیرا و بەرەو تاران هەنگاوی نا کە پاشان بێتەوە... .

پێویست بە وەبیرهێنایەوە کە دوای چوونەوەی عەلیمحەممەدخانی قاجار لە تەورێزەوە بۆ تاران و بلاوبوونەوەی پەیتاپەیتای هەواڵی سەرهەڵدان و بەکانگیری حاکمانی ئازەربایجان بە پشتگەرمی محەممەدقولیخان و بە فیتی جەعفەرخانی دونبولی و تەنینەوەی خەبەرەکان لە پایتەخت، میری مەزن فەتحعەلیشا بە ئامانجی برینەوەی خاشەی سەربزێوان و خەنیمان و پاراستنی دەولەتی هەتاهەتایی، لەشکری چاک و تەیاری بەرەو ئەو مەڵبەندە دەنگ دا. لەم جەنگەدا حوسێنقولیخانی کوڕی ئیمامقولیخانی ئەفشاری قاسملوو برازای محەممەدقولیخانی بەگەربەگ کە بەپرتاو بەرەو پایتەخت دەجمی، لە ڕێی گەورەپیاوانی دەسەڵاتەوە توانی بگاتە لاشیپانەڕاموسانی دەرانەی بەرزی میری. خاقانی مەزن کە نووسین و قسەکانی گوێدایە، گوتی بەختمان چاکی هێناوە و فەرمانی بەگەربەگایەتی ئەفشاری ورمێ و ئەسپێکی هەرەباش بە ڕەخت و زینی زێڕ و شمشێرێکی گەوهەربەندی باربوو کرد و لە هاوشانەکانی تێپەڕاند و سەربلندی کرد. لەگەڵ ئەو حوکمێکی میرانەش نێردرا بۆ ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگەربەگی مەراغە. محەممەدعەلیخانی عەرەب بەستامی کە سەرکردەی غولامانی بارگای بەرزی بوو، بە مەبەستی هێزوەبەرنانی بەگەربەگی تازە و کوژاندنەوەی ئاگری ئاژاوەی محەممەدقولیخان، لەگەڵ حوسێنقولیخان گەورە بەرەو ورمێ

کەوتەڕێ. کاروانی کەژاوەی پادشایەتیش بە شوێنیاندا ئالای داوەریـن بـەرەو ئازەربایجانی هەڵدا. دوای ئەوەی حوسێنقولیخانی گەیشتە مەراغـە هەواڵـی شـان و شـەوکەتی لەشکری خاوەنشکۆ بلاوبۆوە کـە هـاتوون و گەیـشتوونە مێـرگ و چیمـەنی سولـتانییە و خەڵـکی ئازەربایجـان هـەموو پێیـانزانـی. جەعفەرقولیخانی دونبولی [کورد] وەختایەک لووزەوی سوارانی میری بە گوێی ئاشنا کرا کەوتە دڵەڕاوکە و پەرێشانی و چەند تەتەرێکی خێرای ناردن بـۆ لای خانانی ئـازەربایجان. بـەتایبەت نامـەی نووسـین بـۆ محەممەدقولـیخـانی ئەفشار و ئەحمـەدخانی موقـەددەم و کاتێـک هیچکـام وڵامێکـی ڕوون و ورد و باریکیان نەدایەوە و هەرکام کەوتنە هێنانەوەی بڕوبیانووی ناخۆش، بەناچار لەگەڵ سادقخانی شوقاقی [کورد] و عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی و لەشـکرێکی زۆر و زەوەند لە تەورێزەوە بەرەو مەراغە هەیدێی لێکرد و بە خەیاڵی پـووچ و خاو و بۆچوونی گەندەڵی خۆی وای تێگرتبـوو بەڵـکوو بتوانـێ ئەحمـەدخانی موقەددەم و مەحموودخانی قاسملوو بە قۆشەنی مەراغە و ساینقەڵاوە بهەژێنێ و بیانباتە بەرەگە لێگرتنی لەشکری پادشا. لە دەوروبـەری مەراغـە بیـستی کـە ئەحمەدخانی موقەددەمیش بایداوەتەوە و لەسەر پـەیمانی پێـشووی نـەماوە. ئەوەندە تووڕە بوو کە هەڵپێچان و لێدانی ئەحمەدخانی بە هاسان زانی و لەگەڵ یـارانی دەورەی مەراغـەی دا و مـاوەی گـەمارۆ دوازدە ڕۆژ پێهـەڵاچوو هـەتا پەیتاپەیتا خەبەر هات کە کاروانی ڕکێفدارانی میری لە «نیـکپـەی» خێـوەت و ڕەشماڵیان هەڵداوە. جەعفەرخان بە خەیاڵیدا هات کە سادقخـانی شـوقاقی و عەسکەرخان بە غەدرێک بنەزێنێ و دەستیان لێبوەشێنێ و لە دەرفەتێکا ئەو دوو ئاواڵە گیانیگیانییەی بکوژێ. ئەوانیش لە ئاکار و ڕوخساریڕا هەسـتیان بـە پیلانی جەعفەرخان کرد و پێکەوە بۆ شەوی داهـاتوو، خۆیـان لـێدزییـەوە و چەشنی برووسکە و با بەرەو هۆردووی باڵادەستی پادشای تاجدار تێیانتەقاند و ڕەوین. بەریبەیانی نە جەعفەرخان بە ڕاکردنی ئەوانی زانی، لەبـەرەوەی هـیچ

هیوایەکی نەبوو بە گرتنی مەراغە و لەشکری میری لەبنەوپالەوەی هالاوی دەهات و ئەویش دەترسا، بەناچار دەوری قەلایەی بەردا و کەوتە تالان و داڕووتاندنی هێندێک لە گوندەکانی دەوروبەری مەراغە و ناوچەی دێخوڕگان و گەڕانگەڕی. پاشان هات و لە نیزیک مەرەند بنەی داکوتا هەتا بزانێ دنیا چی بە سەر دێ و لەودیو پەردەی پێوارەوە چ شتێک خۆی دەنوێنێ. بەلام سادق‌خان و عەسکەرخان وەختایەک لە جێ‌هۆردووی «نیک‌پەی» گەیشتنە خزمەت ڕکێفی پادشا، سادق‌خانی مەزنەمیر سولەیمان‌خانی قاجاری کردە تکاکار سەبارەت بە ئاکار و هەلوێستی نالەباری پێشووی و لەبەر زۆر شتان قەلەمی بەخشینی میرانەی بە سەر تاوانەکانی‌دا کێشا. عەسکەرخان سەری بردە بەرڕکێفی هەلکشاوی و بە وەبەرچاوگرتنی خزمەتەکانی پێشووی چاوپۆشی پادشایانە گرتییەوە و دلنوایی کرا. کاتێک سەبارەت بە حال‌وبال و چارەنووسی جەعفەرخانی دونبولی پرسیاری فەرموو، عەرزی کرد لەو کاتەوە کە بیستوویەتی لەشکری شکۆداری پادشا بەڕێوەیە، چەواشە و پەرێشان چەشنی ماسی دوورەئاو کەوتۆتە هەلبەزدابەز و دلەخورتێ. هەر بۆیە پادشا فەرمانی دا بە سولەیمان‌خانی قاجار کە بە هێزێکەوە بڕواتە لێدان و گرتنی جەعفەرقولی‌خانی شێت. خانی قاجار بە شانی سەراب و گەرمڕوودا وەکوو سێلاو سەرەوخواری دایە و عەلی‌محەممەدخانیش بە هەزار سوارێکی نڕ و ئازاوە کەوتە شوێنی. سەرەتا سولەیمان‌خانی دێوگر لە نیزیک مەرەند گەیشتە سەر جەعفەرقولی‌خان و لە هەردک لاوە ئاگری شەڕ هەلگیرسا. جەعفەرقولی‌خانی سەرکەش وەکوو گڕی ئاگر و ئاورینگی سووتێنەر کە بەربێتە قامیشەلان خۆی بە نێرینەی قۆشەنی سولەیمان‌خان دادا. بە هۆمەن و شالاوێک خرمانی ژیانی پۆلێکی سووتاندن و ئەسپاردەی دەستی بای نەمانی کردن و لە خاک و خۆلی مەرگی گەوزاندن. سوارانی سولەیمان‌خانی قاجار خۆیان بۆ ڕانەگیرا و دەستیان لێک‌بەردا و ڕەوین. جەعفەرقولی‌خان سەرەنجامی کارانی وەبەرچاوی نەهێنا و

کەوتە شوێنیان. لەو کاتەدا عەلیمحەممەدخان بە خۆی و هەزار سواری تازەپشوویەوە هەڵقوڵی و کۆمەڵی ڕاکردووانی جەعفەرقوڵیخان گیانێکیان هاتەوە بەر و ورەیان زۆر بەرز بۆوە. شانبەشانی پیاوەکانی عەلیمحەممەدخان ڕامالێکی بەتەوژمیان بردە سەر جەعفەرقولیخان و قۆشەنی تاقوواز و لێکبڵاوی و کەللەسەر چەشنی گەڵا و بەریداران وەرین. سەرەنجام جەعفەرقولیخان کە لەبەر گوڕمی شالاوەکانی خۆی تووشی شەکەتی ببۆوە و زنجیری کۆمەڵەی چەکدارانی پسپس ببوو، شکستێکی قورسی بە سەر شانیدا سەپا و بە حەول و حەلەلا بەرەو خۆی فڕی. سولەیمانخان دەستی لە دووی نەکردەوە و گەیشتە سەری و لە گوندی «موغانجوق»ی سەڵماسیش شەڕێکی بەتەوژمیان لە مابەینیدا قەوما. دوای تێکهەڵچوون و لێدانێکی زۆر جەعفەرقولیخان زانی هێزی بەرەنگاری لە بەردا نەماوە و چی دیکەی دەست بۆ ناکرێتەوە، بۆیە بە ڕاکەڕاکە پەنای بردە بەر کوردەکانی یەزیدی (ئێزەدی) لەوبەری چۆمی ئاراس و دواتر بادەدەینەوە سەری.

بەڵام لەم بالەوە کاتێک عەسکەرخان دەیهەویست لە خزمەت ڕکێفی بترازێ بە عەرزی ڕاگەیاند ئەگەر ڕای پیرۆزی میری لەسەر بێ، پێمخۆشە کە چەند حوکمێکی سپی مۆرکراو بدەنە دەست منی غولامی دەولەتخواز هەتا بزووتنی کاروانی کەژاوەی بەشان و شەوکەتی ئێوە بە گوێی سەرکەشانی ئازەربایجان ئاشنا بکەم و بە لاواندنەوەی باش و هێزای پاشایانە هیوایان وەبەربێنم و بۆ پێشوازی بیانهێنم. ئەم تەگبیرە چاکە وەبەردڵ کەوت. سەبارەت بە محەممەدقولیخان بەرەوڕوو جەختی کردەوە و فەرمووی ئەگەر بێتوو بتوانێ دەربازبێ و بچێتە هەندەران و سەری لە وڵاتانی غەوارە وەدەربنێ، تێکڕای تیرەی ئەفشاری ورمێ تەمێ دەکرێن و [وەک جاوی جووی هەڵدەپێچرێن.] لە لایەکی دیکەوە حوسێنقولیخان پاش گەڕانەوەی لە زیارەتی لاشیبانەی میری چووە مەراغە و لەوێڕا داگەڕا بۆ سابلاغ و بوداقخانی موکری و سمایلبەگی

خەلەجی ناردنە لای سەرۆکانی هۆزی بلباس و لێیڕاسپاردن کە هەموویان بە قۆشەنەوە لە قەراخ چۆمی گادەری سندووس چاوەڕوانی چوونی بن. هەربۆیە مامەندئاغا و برایمسولتان بە خۆیان و هەزار سوارێکی عێلی مامەش و بالەک و پیران و مەنگوڕ لە سندووس دایانە پاڵ حوسێنقولیخان. پاشان ئەم هێزە لە ڕکێف ئەو ئەمیرە ئاقڵ و بە تەگبیرەدا ڕوویان کردە ورمێ. محەممەدقولیخان وەختایەک ئەم هەواڵەی پێگەیشت هالۆزکا و بەناچار شەشهەزار سوارەی کە بە دابی سپای عوسمانی ڕێکیخستبوون دەنگی دان بۆ پێشەوە. خانی ئەفشار تاقمێک چەکدار کولەبالەی زووری خوڕی و قاپووتی بۆگەنیوی کردبوونە بەری و لەسەر نەریتی تفەنگچییانی ڕەشتی ناوی نابوون قەرەچووخا (قاپووتڕەش) و دەستەیەک کلاوی زەنبوورەکچییانی[1] کردبوونە سەری و پێیدەگوتن قزلباش (کلاوسوور- سەرسوور). ئەم لەشکرە هەتا مێرگ و پاوانی دۆلامەلەری نیزیک قاشقەگەدووک هات و هێزەکانی حوسێنقولیخانیش لەوێ گەیشتنە بەرەورووبان. چەند کەیخودا و بەڕیوان کەوتنە نێوان مام و برازا و خەریکی هاتوچۆ بوون کە عەسکەرخان گەیشتە قوشچی و بە چۆنیەتی باروبۆخەکەی زانی. جا بۆیە زۆر بەپارێزەوە هەنگاوی نا و لە ترسی ئەوەی نەکا محەممەدقولیخان شکستێکی بە سەر شانیدابێ و لە بەردا نەمێنێ و تازە کار لە کار بترازێ و پاشان هەزار هاوار بە پوولێک بێ، خێرا نامەیەکی لە زمان پاتشاوە بە دەسخەتی نووسندەی خۆی لە یەکێک لەو کاغەزە سپی مۆرکراوانەدا بۆ محەممەدقولیخان نووسی. بۆی ڕوون کردبۆوە چونکە حوسێنقولیخان بە ڕووراستی هەنگاوی ناوە و چۆتە بەرپێچکەی تەختی بەرزی میری بە سیلەچاوی بەخشندەی پاتشایانە بەسەرکراوەتەوە و جارێ ئیزنمان داوە کە بگەڕێتەوە، بەلام حوکمی ڕاست و بڕگرێ هەر ئەوەیە کە داومانە بە عەسکەرخان. ئەم

---

[1] - زەنبوورەک چەشنێک تۆپی بچووک بووە کە لەسەر پشتی وشتر و یەکسم دایانبەستووە.

فەرمانەی زۆر بەپڕتاو بە سۆهراببەگی پیاوی خۆیدا نارد بۆ محەممەدقولیخان. ئەویش پاش ئەوەی فەرمانی لوولکراوی زیارەت کرد باوەڕی پێهێنا و نەیزانی ساختە و درۆیە و ورەی پێیبەرز بۆوە و کەوتە بەربەرەکانی لەگەڵ حوسێنقولیخان. کاتێک هێشتا تەندووری شەڕ نێل نەدرابوو، مەحموودخانی سەرکردەی سوارانی ئەفشاری ورمێ کە لە تەوریزەوە بە ڕێگای مەراغەدا دەچوو بۆ ورمێ گەیشتە مێرگ و چیمەنی دۆڵامەلەر. وەختایەک بە چۆنیەتی باروهەواکەی زانی دایە پاڵ لەشکری حوسێنقولیخان. حوسێنبەگی ڕیشسپی قەرەحەسەنلوو کە جلەوداری قۆشەنی محەممەدقولیخان بوو چاوی لە مەحموودخان کرد و ئەویش چوو بۆ نێو سپای حوسێنقولیخان. محەممەدقولیخان بە دیتنی ئەم دیمەن و هەڵوێستانە دەروونی سست بوو، بەڵام بە پشتگەرمی ئەو کاغەزەی کە عەسکەرخان ناردبووی شەڕی نەکرد و لەوێوە گەڕایەوە مێرگۆلانی گوێگتەپە. عەسکەرخان لەو کاتەدا پێینابوویە ورمێ و لەوێوە چووە گوێگتەپە و بە فرتوفێڵ هێنایەوە شار. بەڵام حوسێنقولیخان پاش گەڕانەوەی محەممەدقولیخانی مامی، شەش ڕۆژ لە دۆڵامەلەر مایەوە و پاشان ڕۆژی یەکشەممۆ ٢١ی مانگی قوربان بەرەو ورمێ بزووت. ئەو ڕۆژەی کە گەیشتەجێ پیاوماقوولان و مەزنانی شار وێڕای تەواوی ئەفشاران بە شادی و خۆشی و چەپڵەڕێزان چوونە پێشوازی و هێنایانە نێو سەراپەردەی دەسەڵات. لەبەروەی محەممەدقولیخان ماڵی لە چواربورج و جەرگەقەڵای حکوومەتیدا بوو، حوسێنقولیخان بۆ پاراستنی ڕێزی مامی بەرزەجێی! لە قەڵا و باڵەخانەی ڕەحیمخانی قاسملوو کە لە بازاڕباشی بوو دابەزی.

❖❖❖❖

## چوونی فەتحعەلیشای قاجار بۆ ورمێ و گیران و بەڕێکرانی محەممەدقولیخان بۆ مازندەران

سالی ١٢١٢ی کۆچی/١٧٩٧ـ١٧٩٨ی زایینی، پاش ئەوەی کە حوسێنقولیخانی کوڕی ئیمامقولیخانی ئەفشار پێی نایە ورمێ و بەگوێرەی حوکمی میری بەرزەشان فەتحعەلیشای قاجار لەسەر کورسی دەسەلات و بەگلەربەگایەتی پالیدایەوە، محەممەدقولیخانی مامی دەم لە پووش کرا. لەو کاتەدا مامەندئاغا و برایمسولتانی مەزنی بلباسان کە لە رکێف حوسێنقولیخانی بەگلەربەگدا هاتبوون، دوای ڕاپەڕینی کاران لەسەر ئیزنی حاکم بەرەو لاجان دەگەڕانەوە، بەلام لەبەر سرشتی نالەباری بلباسان کە شەڕ و گەڕی پێوەیە. حەشامەتیان راماڵیان بردە سەر چەند گوندێکی نیزیک قەلای ورمێ و بەتایبەت دەستیان لە «کچەباشی» و «ئوچتەپە»ی مەحموودلووی ملکی میرانبەگ نەپاراست و تالانیان کردن و پێنج کەسیش کە هاتبوون دەستیان وەبەربێنن کوشتبوویانن.

کاتێک هەوالەکە بە خزمەت حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ راگەیەندرا، تەماشای کرد هەلەکە بۆ لێدانیان گونجاو نیە، چونکە بەم زووانە کەژاوەی ـبارەکی پادشا دەگەیشتێیە و خودی بەگلەربەگیش لە لایەکی دیکەوە سەرقالی ڕێکخستنی سەروبەری بەپیرەوەچوون و میوانداری کردن بوو. حاکم تەمێ کردن و چزدانی بلباسانی هەلگرت بۆ دەرفەتێکی دیکە و لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ.

دوای چەند ڕۆژێک برایمخانی حاکمی ناوچەی دەشت و تەرگەوەڕ کاروانێکی سێ سەرەی بارگینانی وەدووی خۆی دا بۆ ورمێ و هات کە بە لانی

لاگیریدا محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی لێخراو بە بارگە و بنە و ماڵ و کۆچەوە بەرێتە کوردستان. محەممەدعەلیخانی عەرەب بەستامی کە بۆ گرتن و پاراستنی راسپێردرابوو، بە تەگبیری عەسکەرخان، برایمخانی دەشتی ناردەوە دەشت و تەرگەوەڕ و محەممەدقولیخان لە ماڵ و دیوەخانی عەسکەرخان دەسبەسەر کرا، هەتا بزانن دوای هاتنی پادشا، فەرمانی میرانەی دەرهەق بە وی چ دەبێ. پاش چۆل کرانی کۆشکەلی چواربورج و جەرگەقەلای حکوومەتی، حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ لە کاتێکی موبارەکدا لە ماڵی ڕەحیمخانەوە گواستییەوە و تەشریفی بردە وێندەرێ.

لەم جەنگەدا محەممەدحوسێنخانی قاجار گەیشتە ورمێ و مزگێنی تەشریفهێنانی کاروانی بەشەوکەتی ڕاگەیاند و دوابەدوای ئەو حوسێنخانی سەرداری قەزوێنی بە مەبەستی دیارکردنی جێیحاوانەوەی خاوەنشکۆ و مەزنەپیاوانی دەسەلات کە لە ڕکێفیدا بوون وەڕێوورکەوت. محەممەدقولیخان هەدادانی لێهەلگیرا و بە تەگبیر و ڕای عەسکەرخان لە ورمێوە بزووت هەتاکوو بەر لەوەی کەژاوەی پیرۆزی بگاتێ لە سەلماس خۆی بگەیەنێتە لای سولەیمانخانی ئیعتزادودەولە و بیکاتە تکاکار. بەلام لە دەوروبەری عەسکەراوانەیە، محەممەدعەلیخان گەیشتە سەری و گێڕایەوە شار. بۆ سبەینێ کە بە قەولێک ٢٦ی مانگی قوربان و بە گوێرەی گێرانەوەیەکی دیکە ٦ی مانگی محەڕرەمی ئەم ساڵە بووە، کاروانی ڕکێفی پیرۆزی بەشەوکەت و تەنتەنەوە گەیشتە شاری ورمێ و پادشا پێی لە ئاوزەنگی موبارەکی بەتاڵ کرد. لەبەر وەمی پێوقەدەمی بەخێروبێری شانی شانازی بەگلەربەگ و ئەفشاران لە ئەستێرانی تێپەڕاند. لەبەر دە ڕۆژەی یەکەمی مانگی محەڕرەم مەزنانی بارگا چوون و بەشداری تازیەداری بوون لەگەل خەلک و لەسەر داوای حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ مووچە و مانگانە بۆ پیاوانی ئایینی و سەیدان دیاری کرا. پاش ئەم کارانە میرزا ڕەزاقولی نەوایی سەرقەلەمدار و محەممەدعەلیخانی عەرەب

بەستامی کەوتنە بژاردن و تۆمارکردنی تەواوی سامان و دارایی محەممەدقولیخان و دەستیشان کردنی چەند سەر خێزانێکی سەرۆکانی ئەفشار کە بە ماڵ و کۆچەوە وەکوو بارمتە رایانگوێزن بۆ هەرێمی ئێراق. ئەمانە ماڵ و دارایی محەممەدقولیخانیان بە زەبری کوتەک و ئەشکەنجەدان لە میرزا ساڵەی پێشکاری ئەستاند.

فەتح‌عەلیشا دوای تەواوبوونی ڕێورەسمی لەخۆدان و ئازیەتباری [ئیمامی حوسێن]، کۆڕی دیداری گشتیی و چوونە سلاوی پێکهێنا و ئەمیرانی بارگا و مەزن و ماقووڵانی ئەفشار تێکرا بە خزمەتی گەیشتن و سەرتاپاخواری حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی بە خەڵاتی میرانە ڕازاندەوە و چەند گەوهەرێکی سەبارەت بە شێوەی سەرۆکایەتی و لاواندنەوەی جەماوەری لە لێوی باری و پێی لەسەر داگرت. خوشکی دوانێپاکی بەگلەربەگ واتە کچی خوابەخشیو ئیمامقولیخانی سەرداری خستە نێو لیزگەی پەردەنشینانی فەرمانڕەوایەتی کە دواتر شازادە قاسممیرزا و مەلیکمەنسوورمیرزای لە داوێنی کەوتنەوە.

بەکورتی چلوسێ سەر خێزانی محەممەدقولیخان و کوڕانی وێڕای پیاوماقووڵانی تیرەی قاسملوو بەپێی فەرمانی میر ڕاگوێزرانە قەزوێن. خودی خانیش بە دەسبەسەری لە ڕکێفی پیرۆزا بزووت و پاشان باسی سەرەنجامی دەکرێ لە مازندەران.

دوایە ڕکێفی موبارەکی لە ١٧ی مانگا بە شەوکەتی شاهانەی چەشنی ڕ.یدوونەوە ڕووی کردە سەیرانگای دڵبزوێنی خۆی و لەوێ حوسێنقولیخانی دونبولی ناسراو بە حوسێنخان بە شێوەیەکی شایان کەوتە میوانداری و گەلێک دیاری شیاوی بردە خزمەت پادشا و بە سیلەنیگای میرانە بەسەرکرایەوە. خانانی داغستان بۆ وێنە جەوادخانی قاجار، زیاد ئۆغلی حاکمی گەنجە، شێخالیخان سەرکردە و دەسەڵاتداری قەبیە و گورگینخانی کوڕی ئارکێلیخانی والی گورجستان بە ناردنی کاغەزی غولامانە و دیاری و پێشکەشی میرانە خۆیان

بە گیانفیدا و دەوڵەتخوا دانا. لەو سەروبەندەدا کە ئاڵای سەرکەوتن لە خۆیەوە بەرەو داغستان دەشەکانەوە، هەواڵی سەرهەڵدانی شازادە حوسێنقولی‌خان ناسراو بە جیهانسۆزی دووەم، برای بچووکتری خاقانی بەرزەجێ بە گوێی ڕکێفدارانی ئاشنا کرا کە لە شیراز جفەی دژایەتی دەرکردووە و باڵی گرتووە. بەناچار سولەیمان‌خانی قاجاری بە ئامانجی ڕێکخستنی کاروباری سنوورەکانی ئازەربایجان لەوێ بەجێهێشت و خۆشی سەری ڕکێفی بەرەو عێراق وەرسووڕاند. عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی بە مەبەستی وەرگرتنی بڕی هەشت‌هەزار تمەن دیاری ئەفشاری ورمێ ئیزنی خواست و تیژ بەرەو ورمێ فڕی.

## گەشەی کاروباری حکوومەت بە دەستی حوسێنقولیخان؛
## شەڕ لـەگـەڵ هۆز و عەشیرەتەکانی سەرسنووران؛
## چـوونــی عەسکەرخان بۆ تاران و کووژانەوەی چرای
## چارەنووسی محەممەدقولیخان

پاش گەڕانەوەی میری خاوەنشکۆ، کاتێک کە تەختی دەسەڵاتی ورمێ بە هەناسەی پیرۆزی حوسێنقولیخان گیانێکی تـازەی وەبەرهاتـەوە، بەوپـەڕی دادەوانی و ڕاگرتنی پارسەنگی نێوان جەماوەر بـە کاروبارەکـانی مەڵـبەندەکە ڕاگەیشت. خێڵی ئەفشاری دانیشتووی ورمێ کـە چەنـدین ساڵـی دوور و درێـژ ببوونە پێخوستی زوڵم و زۆرەملی ڕووداوەکانی ڕۆژگار و پرکێشی هەمەچەشنی تاقمێک لە حوکمڕانان، کەوتنە ژێر سێبەری سۆز و چاکەی و بە سەر فەرعانی و تەسەلیدا کەوتن و بە هێمنی و ئاسوودەیی پشوویان دا و بۆی خەوتن. ئەوسـا بەپێی فەرمانی خاوەنشکۆ جڵەوی کاروباری قورس و گرینگـی ئـابینی خرایـە ئەستۆی بەڕێزانی بەرزەجێ ئاغا میروەحیـدی شێخولئیـسلام و ئاخونـد مـەلا محەممەدحوسێنی ئیمامجومعە و مـیرزا محەممەدنـەبی عەبدولمـەلیکی کـوڕی خوابەخشیو میرزا ئەبولحەسەنی برازای عەسکەرخانی دەمڕاستی پێتاک. پلـەی ژمێریاری درایە دەست سەرۆکی تایفەی ئەفشاری سەیدلوو (سەعیدلوو) مـیرزا مستەفا. وەزارەتی کاروباری ملکوماشـی تایبـەتی حوکمـڕانیش درایـە مـیرزا محەممەدحەسەنی ئەفشاری سەعیدلوو. میرزا ساڵح و میرزا ڕەفیعی ئۆستاجلوو کە دوو برا بوون بە خەزێنەدار و چاوەدێری خەرجوبەرجی بەشی دارایی داندران. خانبابەگی قاسملوو لە بەرەبابی خودالێخوشـبوو کەلبالـیخـانی حـاکمی پێشووی ورمێ بە پلەی نێشیکئاغایەتی سەری بەرز کرایەوە. خـانئەمیربـەگی

خەلەج کاروباری دام‌ودەزگای حوکماتی پێ‌ئەسپێردرا و باسی تەواوی غولامان و خزمەتکاران دەبڕمەوە. چونکە تۆقیوم لە درێژدادڕی!

لە مەودای ئەم کارانەدا بوو بە دەنگۆ کە مستەفابەگی هەکاری دانیشتووی چێهریق لەگەڵ عێل وعاشیرەتەکانی سنووربەزی نێوان دەوڵەتی ئێران و عوسمانی کردووە و لە ناوچەکانی ورمێ وێڕای جەماوەرێکی زۆر خۆی ساز داوە بۆ هەڵمەت و ڕاماڵ. حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگ، عەسکەرخانی لەگەڵ قۆشەنی هەمیشە ئامادەی ئەفشار و پێنسەد سوارەوە ناردە سەر مستەفابەگی هەکاری. لە نیزیک خان‌گەدووک هێزەکانیان بەرەورووی یەکتر بوونەوە و شەڕێکی قورس و سامناکیان لە مابەینی‌دا قەوما. سەرەنجام بە یارمەتی خوداوەند تۆرەمەی هەکاری بە شەقوشڕی بەزین و تەقورەویان تێکەوت و تاقمێکیان هەلیان بۆ ڕەخسا کە بە سلامەتی دەرباز بن و دەستەیەکیان بە برینی قوولەوە مردن. دەڵێن لەم شەڕەدا ئەفشار تووشی هیچ خەسارێک نەبوون و [کەس لووتی لە خوێن نەهات] و تەنیا حوسێن‌بەگی ڕیش‌سپی تیرەی قەرەحەسەنلوو بە گوللەی گەرمەوە چوو بەرەو کونجەخانووی هەتاهەتایی.

ئەنجا عەسکەرخان بە ساغ و سلامەتی و دەستی پڕەوە گەڕایەوە خزمەت بەگلەربەگ و بە خەلاتی ڕەنگین و دەسخۆشانەی ئافەرین بەسەرکرایەوە. پاشان هەشت‌هەزار تمەن دیارییەی وەرگرت و ڕووی کردە تارانی پایتەخت. کاتێک گەیشتە بن‌پێچکەی بلیندی تەختی فەرمانڕەوایەتی کە خاقانی بەرزەشان بە تکا و پارانەوەی بەڕێزی کەلەژن «مەهدی‌عولیا»ی دایکی خۆی لە تاوانەکانی حوسێن‌قولی‌خانی برا چووکەی خۆش ببوو. جا هەروەکوو لە مێژووی قاجاران‌دا بە دوور و درێژی باسی کراوە، نێوان‌ناخۆشی مابەینیان هیچ گرێیەکی لەبەر نەماوە و ڕەویوە.

پاش ئەوەی عەسکەرخان دراوی بە دیاری نێردراوی بردە بەرچاوی خاوەن‌شکۆ و سەرڕاستی و خزمەتەکانی حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگی ئەفشار

ڕوون بۆوە و وەبەرچاو گیرا، سەرلەنوێ بە مەبەستی دڵگەرمی و هیواداری دەستێکی دیکەی خەڵاتی شیاو کردە باربووی و بە عەسکەرخاندا بۆی بەڕێ کرا.

بەگوێرەی حوکمی میری پایەبەرز، محەممەدقولی‌خان لە مازندەران زیندانی کرابوو. ئەوەی لەسەر زار و زمانان ماوە و زیاتری باس دەکرێ دەڵێ کە لە ژوورێکدا بەند کراوە و دەرگا و پەنجەرە و کەلێن و کولێنی بە قسڵ و گێچ دادراوە و کونی لێبڕاوە... . هەر لەم ساڵەدا حوسێنقولی‌خانی بەگەربەگ باغی «کەماڵئاباد»ی لە نزەی سیاوەش و باغی «خوڕڕەمئاباد»ی لە مڵکی گوندی باراندێز لێداوە و خانووبەرەی خۆش و دڵنشین و قایمی بە ئەستێری پڕ لە ئاوی وەک چاوی قرژاڵەوە لێساز کردوون. هەروەها چەند نەزرگەی پیرۆز و ئاسەواری خێر و چاکەی وەک پرد و مزگەوت و تەکیەی نۆژەن کردوونەوە.

## ڕاسپێردرانی برایمخەلیلخانی قاجار بۆ سەرکوتی سەرهەڵدانی جەعفەرقولیخانی دونبولی و بە دەنگەوەچوونی حاکمانی ورمێ و مەراغە

هەر لەم ساڵەدا جەعفەرقولیخانی دونبولی کە پێشتر بەزیبوو لە ئاست سولەیمانخانی ئیعتزادولدەولە و پەنای بردبوویە بەر کوردەکانی بایەزید،[1] وردەوردە جەماوەرێکی کوردی عەشیرەتی زیلان و حەیدەرانلوو و عێلاتی ئێرموان و خۆی لە خۆی هالاندبوون و شالاوی هێنایە سەر قەڵای خۆیە و هەرای هەڵگیرساند و حوسێنقولیخانی کاکی گەمارۆ دا کە حاکم بوو لەوێ! کاتێک چۆنیەتی بارودۆخەکە لە بارگای پیرۆزی بە خزمەتی ڕاگەیەندرا، میری بەرزەشان دەستووری فەرموو برایمخانی قاجاری دەوانلوو کە سەرکردەیەکی بوخت و کارامە بوو وێڕای ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغە و حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ شان بدەنە برینەوەی ئەم ئاژاوە شوم و بێفەرە.

بەپێی فەرمانی فەرمانڕەوا، حوسێنقولیخان لە ورمێوە و ئەحمەدخان لە مەراغەوە هەرکام بە لەشکری بێژمارەوە گەیشتنە مێرگ و چیمەنی دۆرشەکی سەلماس و تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا و لەسەر برایمخانی سەردار ڕاوەستان و چاوەڕوان مانەوە. ڕۆژی پاش گەیشتنی سەردار هەموو لایەک لە ڕکێفیدا بەرەو خۆی بزووتن. جەعفەرقولیخان دەستی لە گەمارۆی قەڵا هەڵگرت و هات و بەرەگەی لە میوانی هەڵقولیو گرت. کاتێک لە هەردک بەرانەوە گڕی ئاگری شەڕ

---

1 - پێشتر نووسیویەتی کوردەکانی یەزیدی.

**خـۆش کـرا، جەعفەرقولـیخـانی دونبـولی کـــە لـــە نێـو کــوردانـدا بـــە «باتمانقلێچ»[1] ناسراوە شەڕی پاڵەوانانە و ڕۆستەمانەی دەکرد، بەڵام فایـدەی بە چی وەختێ بەخت یاری نەبوو. پاش تێکهەڵچوون و زەبروەشاندن و لێدانێکی زۆر، خۆی بۆ ڕانەگیرا و بە تێکشکاوی بەرەو ماکۆ ڕەوی. قۆشەنی بەرفەرمانی کە چەشنی حاڵی پەرێشانی لێقەومابوو، تـاقمێکی کـوژرا و دەسـتەیەکی بـە سەرشۆڕی گیرا و بەخسیر کرا.**

**بەگشتی جەعفەرقولیخان هەتا هاتنی «ئێشپۆختۆر»ی[2] سەرداری ڕووسیا بۆ ئێران، لەو مەڵبەندە چەواشە و بـێپـەنا و پەسـیو دەژیـــا. پـاش ئـەوەی حوسێنقولیخانی کاکی لە خۆیە ماڵاوایی کرد لە ژیـان و دەسـەڵات، نـاوبراو دەستەوداوێنی گەورەپیاوانی حکوومـەتی خـاوەنشـکۆ بـۆوە و تـوانی ببێتـە حوکمڕانی خۆیە و دەوروبەری و لە جێگای خۆیدا باسی دەکرێ.**

**بەکورتی دوای بڕانەوەی هەرای جەعفەرخان، برایمخانی سەرداری قاجار لـــە لایـــەن دەوڵـــەتەوە جـڵـەوی حکوومـــەتی تـــەورێزی ناوەنـــدی دەســـەڵاتی [ئازەربایجانی] درایە و لەوێ لەنگەری خست و حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ و ئەحمەدخانی موقەددەمیش هەرکام گەڕانەوە بنکەی حکوومەتی خۆیان.**

---

1- شمشێر قورس. ئەو کەسەی کە شیرەکەی سێکیلۆیە. شیرباتمان.

2-لە دەقەکەدا نووسراوە ئیشپوخدور. لە ڕاستیدا «ئیسپێختور»ە کە وشەیەکی ڕووسییە بە مانای پشکێنەر. ئەم سەردارەی ڕووسی خەڵکی گورجستان و ناوی «تیستسیانوف» بووە و سەردەمی دەسەڵاتی فەتحعەلیشا لـە جەنگەی شەڕەکانی ئێران و ڕووسیادا هاتۆتە ئێران. (وشەدانی دێهخودا، ب ٢، ل ٢٥٩٧)

## چەند ڕووداوێکی گرینگی مێژوویی کە لەگەڵ ڕەوتی دیرۆکی ورمێ و چارەنووسی مەزنەپیاوانی مێژوویی ئەم مەڵبەندە یەکتر دەگرنەوە

یەکێک لە ڕووداوە بەرچاوەکانی ئەم ساڵ هەڵبژێرانی ڕێزدار شازادە «عەبباس‌میرزا»یە وەک جێنیشی‌میر و بریکاری فەرمانڕەوایەتی لە ئازەربایجان کە بەڕێز میرزا عیسا ناسراو بە میرزا بوزورگی فەراهانی بوو بە وەزیری تایبەت و پێشکاری. هەر لەم ساڵەدا دەنگ و هەرای هەستان و سەربزێوی نادرمیرزای کوڕی شاروخ‌شا لە هەرێمی خوراسان بە خزمەت غولامانی بارەگای پادشایەتی ڕاگەیەندرا و بیری بەرزی میرانە خۆی لە خاشەکێشان و بڕینەوەی خۆش کرد. ئاشکرایە کە نادرمیرزای کوڕی شاروخ‌میرزا نەوەی نادرشا لە کاتی شالاوی ئاغامحەممەدخان بۆ سەر خوراسان هەڵاتبوو بۆ هیرات و هەتا ئێستا لە نێو ئەفغانانی هیرات و کابولدا دەژیا، بەڵام لەم ساڵەدا وێڕای کۆمەڵێک داوەریبوو بۆ مەشەدی پیرۆز و ئاژاوە و هەرای نابۆوە. هەر بۆیە فەرمانڕەوا بە ئەرکی سەر شانی خۆی زانی کە دەستی لێبوەشێنێ و قەلاچۆی بکا و حوکمی کۆبوونەوەی هێزە باڵادەستەکانی وڵاتی دەرکرد. بۆ وێنە عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی سوارانی بەرکێفی ورمێی ساز کرد و بەرەو تارانی پایتەخت بزووت. پاش گردبوونەوەی قۆشەنچییانی ئێران، لە سەرەتای ئەم ساڵەدا هەڵۆی ئاڵای میری بە تەمای دەرهێنانەوەی خوراسان لە چنگ سەربزێوان باڵی ئەنگاوت و کۆچاوکۆچ فڕی هەتا گەیشتە ڕووکاری شاری پیرۆزی مەشەد و بە فەرمانی فەرمانڕەوا لەرێوە قەلایان دەورە دا. بەڵام لەبەر گڵکۆ و گومبەزی پاکی

حەزرەتی ئیمامی هەشتەم – سەلامی لەسەر بێ – زۆر توندیان نەدەکێشا و خاو بوون سەبارەت بە جێبەجێ کردنی ئاماژەی پادشا. هەر بۆیە ڕۆژانــی گــەمارۆ درێژەیان کێشا. دەورەدراوان تەنگیان پێهەڵچندرا و بەلای قاتیوقــڕی بــەرۆکی گرتن. سەرەنجام نادرمیرزا دەستی بەردانەوە و چەنــدین کــەیخودا و تکاکــاری ناردن و پێشنیاری کرد کە کچێکی بنەماڵەی نادری لە کوڕێکی فــەتحعــەلیشــا مارە بکرێ. خاوەنشکۆ جارێ دەستی لە گەمارۆ هەڵگرت و بەختیار و کامــڕەوا گەڕایــەوە تــارانی پایتــەخت. لــەم ڕۆژانــەدا بــەپێی ڕەزامەنــدی و ئاگــاداری حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ، سوارانی حازر بە دەستی ئەفشاری ورمێ تێکــڕا دژی هەڵسوکەوتی نالەباری عەسکەرخان سکالایان بردە بــەر خــاکی پــیرۆزی میری. عەسکەرخان ئەگەرچی میرزا ڕەزاقولی مونشیولمەمالیکی کــردە تکاکــار بەلام هیچی بۆ نەکرا و لە ســەرکردایەتی لادرا و پادشــا مــەحموودخانی کــوڕی موئمینخانی ئەفشاری سائینقەلای لە جێــی دانــا. عەســکەرخان لەبــەر چەنــد هۆیەک لە تاران ڕاگیر کرا و مەحموودخان وێرای سوارانی ئەفــشار گەڕایــەوە ورمێ. هەر لەم ساڵەدا کە ١٢١٤ی کۆچی/١٧٩٩ـ١٨٠٠ی زایینــی بــوو، خــاتوونی بــەڕەزەجێ «مەهــدیعولیــا»ی دایکــی فــەتحعــەلیشــا کــۆچیدوایــی کــرد. حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ بۆ سەرەخۆشــی ڕووی کــردە بارەگــای مــیری و محەممەدعیساخانی برای لە جێی خۆی دانا.

## سەرهەڵدانی عەشیرەتەکان دوای ون بوونی حوسێنقولیخان لە بەرچاوان؛ لابران و داندرانەوەی و شەڕ لەگەڵ عێلاتی سەربزێو

کاتێک حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ لە تارانی پایتەخت بوو، مەحموودخانی ئەفشاری سایینقەڵا وێڕای سوارانی سکۆرتی ئەفشاری بەپێی فەرمانی میر بانگکرایە تاران هەتا لەگەڵ هێزە ئەبەزەکان بەرەو خوراسان ببزوێ. ئەوەی ڕاستی بێ لە ماوەی بە دەستەوەنەبوونی بەگلەربەگدا لەبەر بێموبالاتی و لێنەوەشاوەیی محەممەدعیساخانی جێگری کاکی، کاروباری وڵات تەواو بە سەر کەموکووڕی و پەرێشانیدا کەوت و بوو بە تێکەولێکەیەک وەرە سەیرێ. چونکە نێرە و تۆرەمەکانی بلباسی لاجان وەختایەک دیتیان بەگلەربەگ لە بەرچاوان ونە، بریکاری چەندڕۆژەی حکوومەتیان بە هیچ دانەنا و شوویان لێهەڵکێشا و دەسدرێژییان کردە سەر ناوچە و مەڵبەندەکانی ورمێ و هەتا دەورەی قەڵای شار ملیان پێوەنا. دەستیان لە ئاغجەقەڵای میرقاسمی قازی وەشاند کە دێیەکی ئەرمەنینشینە و دایانڕووتاند و خەڵکیان لە خوێن گەوزاند و بەوەش ڕازی نەبوون و چەند گوندێکی جێرانەمووچەشیان زەرەربار کردن. محەممەدعیساخان وێڕای ئەوەندە چەکدارەی بۆی ساز بوو، بە مەبەستی لێدان و بەرپەرچدانەوەی هۆزی بلباس لە شار دەرکەوت، بەڵام هیچی بۆ نەکرا و گەڕایەوە شار. لەم کاتەدا حوسێنقولیخان کە لە بارگای پیرۆزی میری ئیزنی گەڕانەوەی خواستبوو کۆچاوکۆچ هاتەوە و گەیشتەوە ناوەندی دەسەڵاتی و گوێبیستی ڕووداوەکان بوو. خێڵی ئەفشار بە گەڕانەوەی گەشانەوە و زۆر جوان و شیاو چوونە پێشوازی و کردیانە تەقەی شادی. خوداوڕاستان لە گەرمەی

تفەنگ هەڵتۆقاندندا، فیشەکێک بە بەر گەرووی بەگەربەگدا ویزەی کرد و بە روحمی خودا نەیپەنگاوت. خۆلاسەی کەلام پاش ئەوەی لە خانەمیری ورمێ دابەزی، چونکە هەرەتی لاوەتی جیهان و جەنگەی وەرزی بەهار و کاتی گەشت و سەیران بوو لە باغ و دەشت و کۆسار، بەتایبەت بەهاری ورمێ کە هێندەی دەنگداوەتەوە پێی‌ناوێ بدەم پەسندی، بەگەربەگ مەیلی چوونەدەر و خەم بە بادانی بزووت. فەراشان و خزمەتکارانی کارجوان و لێوەشاوەی حکوومەت شانیان لێ شل کرد و تاول و خێوەتیان لەسەر کێوی حەیدەرلوو، لای سەرووی خانبلاغی هەڵدا و [ئەستوندەکیان وەبەردان و گوڵمیخیان داکوتان و ڕستەیان لێکێشان] و پۆپەیان هەتا پەرپەرۆچکەی خۆر و مانگ پێهەلابردن. ئەوسا بەگەربەگ وێرای گەورەپیاوان و مەزنەمامۆستایان و ئەمیران چوونە ئەو چیایە و کۆمەڵی گەورەگەورانی ئەفشار و خەڵکی شاریش کە ماوەیەک بوو بە پرشنگی دیداری نەگەشابوونەوە و بە شەپلاخەی رۆژگار شەکەت و تاسابوون، خۆیان دە دەسک نا و بەرەو باسک و بەندەنی کێوی حەیدەرلوو بزووتن و چادر و چیبیان لێ‌رانەنگاوت و کردیانە جێژن و چراخان و ماوەی هەژدە شەو و رۆژان لەو گەشت و سەیرانە نەگەرانەوە. لەم بەینەدا بەگەربەگ هێزێکی ناردنە سەر بلباسان بەلام هیچیان بۆ نەکرا و هاتنەوە. پاش گەڕانەوەی بەگەربەگ بۆ شار، ئەگەرچی تاقمێک فیتنەگێڕ تێیانچاندبوو کە بە پیلانی محەممەدعیساخانی برای لە کاتی هاتنەوەیدا فیشەکیان پێوەناوە، کەچی حوسێنقولی‌خان هەر نەیدەویست وە رووی خۆی بێنێ و برایەتی تێدێنا و تێهەڵپێچانی بە زیادی دەزانی. بەلام دیسانیش لەسەر ئیزنی گەورەپیاوانی دەوڵەت و لەبەر رەوینەوەی تۆمانەکە، محەممەدعیساخانی لەگەڵ لوتفعەلی‌خانی برا بچووکی بە ژن و منداڵ و ماڵ و کۆچەوە ناردن بۆ قەزوێن و ماوەیەک لەوێ دەس بە سەر مانەوە و پاشان گەرانەوە ورمێ. دیارە لە جێی خۆیدا بە وردی باسی دەکرێ و لە نێو براکانی بەگەربەگدا خودادادخان لە

هەموویان دەوڵەمەندتر و تێرووپرتر بوو. بەکورتی تـەواوی کەسـانی سـەر بـە محەممەدقوڵیخان و حکوومەتەکەی کەوتنە بەر لێپرسینەوە و چێـوەچزەدران و بـە زەبروزەنـگ لـەگەڵـیان جـووڵاوە، بـۆ وێنـە خـانئەمیربـەگی خەلـەج تێیهەڵپێچرا و هەرچی هەیبوو بەگەربەگ دەستی بە سـەردا گـرت. هـەروەها حەسەنئاغا، کەریمبەگ، میرزا مستەفا، میرزا ساڵح، کازمبەگ و خەلیلبەگی سەردەرکەوانی محەممەدقوڵیخان هەموویان زۆر چاکیان گوێبادرا.

دەڵێن بەڕێز ئاغا میروەحیدی شێخولئیسلامی ورمێ کە پەنا و پەسـیوی خەڵک بوو، کەوتە نێـوان و زەحمـەتی وەبـەرخۆی نـا و چـوو بـۆ خزمـەت بەگەربەگ و داپاری بۆو کەسانە، بەڵام تکای نەگیرا. هەر بۆیە دڵی ئێشا و بـە مەبەستی سکاڵا بەرەو تارانی پایتـەخت بـزووت. بەگەربـەگ چەنـد پیـاوێکی سەربەدەرەوەی ئەفشار و باوەڕپێکراوی خۆی ناردن و شێخولئیسلامی ڕێزداریان لە نێزیک نەسووجەوە گێڕایـەوە و سـەفەرەکەیان پـێهەڵوەشاندەوە. بـەڵام خەلیلبەگی قاپووچیباشی (سەردەرکەوان) بـە کـوێرەڕێدا چەشـنی شەماڵـی کوێستان باڵی گرت و سکاڵانامەی مەزنانی گەیاندە لای گەورەپیاوانی بارەگـای خاوەنشکۆ و ڕاست لەو کاتەدا عەسکەرخان لە هەوێڵدا بوو. فەرمانڕەوای هێژا کاغەزەکەی خەلیلبەگی خوێندەوە و لە عەسکەرخانی پرسی داخوا چۆنە، وایە یان وا نیە؟ ئەویش چونکە بەگەربەگ پێشتر بە لای مـەحموودخانی ئەفـشاری ساینقەڵایدا شکاندبۆوە و سوارانی ئەفـشاری بـەرکێفی لـێئەسـتاندبۆوە و ئەسـپاردەی دەسـتی مـەحموودخانی کردبـوون، وەباڵـی بـۆ داد و هـاواری خەلیلبەگ و کەسانی سەر بە محەممەدقوڵیخـان کێـشا و گـوتی بەگەربـەگ دەستی لە زوڵم ناپارێزێ. بۆیە لەڕێوە فەرمانی پیرۆز سـەبارەت بـە لادرانـی حوسێنقوڵیخان نووسرا و حوکمی حکوومەتی ورمێ بۆ مستەفابەگخانی کوڕە گەورەی محەممەدقوڵیخان لێدرا. میرزا ڕەزاقوڵی نەوایی سەرقەڵەم کە ئاواڵ و لایەنگری دڵسۆز و ڕووڕاستی حوسێنقوڵیخان بوو، ئەم هەواڵەی بە تەتەرێکی

خۆشاڕۆدا بۆ نارد بەلکوو هەرچی زوو وەخۆکەوێ و چاری بکا. بەگلەربەگ هەر کە کابرا گەیشتێ و هەواڵەکەی لێڕوون بۆوە، بێڕاوەستان بەرەو پایتەخت ئەسپی تاو دا. لەو لاوە مستەفاقولی‌خان کە فەرمانی حکوومەتی ورمێی بە چنگەوە بوو تیژ دەفڕی، بەڵام کاتێک لە قەزوینێ ناوەندی دەسەڵات چاوی بە بەگلەربەگ کەوت، پەڕ و باڵی هەڵوەری و بەوپەڕی ناهومێدی لەوێ داما و ڕاوەستا هەتا بزانێ خوداوەندی بێهاوتا چ دەکا و چی وەڕێ دێ.

پاش ئەوەی بەگلەربەگ گەیشتە پایتەخت و چاوی بە میرزا ڕەزاقولی نەوایی کەوت، لەسەر تەگبیری ناوبراو یەکڕاست ڕووی کردە ماڵی عەسکەرخان. جا لەبەروەی عەسکەرخان یەکێک بوو لە جوامێرانی ڕۆژگار، بەم چوون و بەسەرکردنەوەیە کۆنەڕقی لە دەروونیدا نەما و هەمووی بە دەم بادا و بە گیان و دڵ و سەرڕاستی لەگەڵی تێکەوت. ئەوسا بە هەوڵ و هەڵسووڕانی میرزا ڕەزاقولی نەوایی و تکا و پاڕانەوەی عەسکەرخان، بەگلەربەگ دووبارە لە جێگای خۆی دامەزرایەوە و مستەفاقولی‌خان هێشتا نەگەیبوویە ورمێ کە حوکمەکەی هەڵوەشایەوە و گەڕایەوە. لەم ماوەیەدا کە حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگ لە پایتەخت مابوویەوە و لە بارەگای پیرۆز دەسەڵاتی وەچنگ هێنابوویەوە، ڕۆژێکی لە نێو قسان‌دا باسێکی سەبارەت بە بلباسان هێنا گۆڕ و بە چڕ و پڕی پرکێشی و شەڕفرۆشتنی ئەوانی بە خزمەت ڕاگەیاند. لەسەر داوای بەگلەربەگ هەر لەو کورەدا حوکمێک بۆ خۆی و یەکیش بۆ ئەحمەدخانی موقەددەم نووسرا پێکەوە لەشکری ئەفشار و موقەددەم بەرن و توخم و تۆوی کەتن و ئاژاوەی ئەو هۆزە سەربزێوە ببڕنەوە. لەبەروەی بنەبانی ساڵ و دەمەو نەورۆزی میری بوو، حوسێن‌قولی‌خان بە مەبەستی پیرۆزبایی و وەرگرتنی ڕێوشوێن و ڕێنموونی تازە لە پایتەخت مایەوە و ئیزنی چوونەوەی نەدرا.

❖❖❖❖

## شەڕی حوسێنقولیخان و ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغە لەگەڵ حێلاتی سەربزێو

ساڵی ١٢١٦ی کۆچی/١٨٠١ـ١٨٠٢ی زایینی، پاش تێپەڕینی جێژنی نەورۆز، حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ ئیزنی لــە تــۆزی بــەر پێــی فەرمانڕەوایــەتی خواست و بەرەو بنکەی دەسەڵاتی گــەڕاوە. لــە تــەوریزی ناوەنــدی دەســەڵاتی ئازەربایجــان ڕووی کــردە بارگــای عــەبباسمــیرزای جێنــشینیمــیر و پــاش ڕامووسانی بنڕێــسمەی، فــەرمانی پــیرۆزی بــە واژۆی شــازادەی بــەرزەجێوە گەیاندە ئەحمەدخانی موقەددەم. هەردک حوکمدار وایــان بــڕیار دا کــە هــەرکام هێز و قۆشەنی خۆیان کۆ بکەنەوە و ڕۆژی دیارکراو لە لێواری چــۆمی گــادەری سندووس یەکتر بگرنەوە و پێکەوە بچنە سەر هۆزی بلباس. هەر بۆیــە کاتێــک بەگلەربەگ گەیشتەوە بنکەی دەسەڵاتی خــۆی کەوتــە ســاز و پــەرداخ کردنــی لەشکری ئەفــشار و کۆمەڵــێکی زۆریــشی لــە عەشــیرەتی بــشکوفتی و زەرزا و شەمزینان کۆکردنەوە. هەر بۆ شێلانی بناوانی کاران عەلیسولــتانی کەلــهوڕی بەپەلە ناردە مەراغە هەتا ئەحمەدخانیش لەسەر گفت و پەیمانی هەڵسووڕێ و لە ڕۆژی خۆیدا بگاتەجێ. بەگلەربەگ بە لەشکرەوە لە ورمێــوە بــزووت و لــە ناوچەی سندووس ئەحمەدخانیش بە قۆشەنی تەیار و تۆپخانەوە گەیشتێیە.

بەڵام عێل و عاشیرەتی بلباسان کە لە نێو حێلاتی ســەر ســنووراندا بــە سوارچاکی و نێزەداری بەناوبانگن و بەڕاستی واشە، بە بیــستنی ئــەم هەواڵــە ترسیان ومبەرنەنیشت و نەپەشێوان و یەکانگیر بوون و شانیان لە شانی یەکتر توند کرد و لە دەشتی لاجان چاوەڕوان مانەوە. هێندەی پێنەچوو کە بــەجارێک بەگلەربەگی موقەددەم و ئەفشار وێڕای ســپای نڕ و دەســکەرەوە ئاســۆگیان دا.

حوسێنقولیخانی بەگەربەگ، سمایلئاغای سەرۆکعێلی بشکوفتی باوکی میرزائاغا و عەلیئاغای لەگەڵ تایفەی خۆی کردە پێشەنگی لەشکری لە شکاننەهاتوو. باڵی ڕاستی ئەسپاردە دەست غەزاکەرانی ئەفشار و باڵی چەپی بە سوارە و پیادەی موقەددەمی مەراغە تەنی و تۆپخانەی سماتەشکێنی شەویلاکە هەژدیهای دایە چنگ ئەحمەدخان. خودی خۆشی وەکوو سەددی ئەسکەندەر لە جەرگەی لەشکر لەنگەری داکوتا و خۆی لە سەرکوتی بلباسان خۆش کرد. سەرەتا سمایلئاغای بشکوفتی بە خۆی و هێزەکانی پێینایە مەیدانەوە و سڵەی نەکرد و بە هێرشی ڕۆستەمانە عێلی باڵەکی پێشەنگی بلباسانیان ڕادان، بەڵام لەڕێوە مامەش گەیشتنە فریایان و دوای تەقە و لێدانێکی زۆر تایفەی بشکوفتی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و پاشەکشەیان پێکرا.

بەناچار غەزاکەرانی ئەفشار کە لە دەستەڕاستەوە چەقیبوون، دەستیان لە ژیانی خۆیان هەڵگرت و تێکرا هرووژمیان کردە نێو مەیدانی شەڕ و لێکدان. لە دەستەچەپەوە ئەحمەدخانی موقەددەم ڕکێفی بەتاڵ کرد و چووە نێو ڕیزی تفەنگدارانی مەراغە و فەرمانی تەقەی تۆپ و تفەنگانی دا و شریخوهۆڕ و ئاوربارانێک دەستی پێکرد دەتگوت ڕۆژی قیامەت ڕابووە. لەبەر کوژرانی پیاوانی بەخۆوەی بەقەڵافەت تەرمەکی تەرمان فوت بوونەوە و سەرەنجام قۆشەنچییانی موقەددەم و ئەفشار توانیان هەنگاو بە دوژمنان شل بکەن و بیانبەزێنن. کاتێک سەرۆکانی بلباس یانی مامەنداغای پیران و هەمزاغای مەنگوڕ[1] و سوارائاغای مامەش و برایمسولتانی باڵەک تەقورەوی هێزی پیادەی خۆیان بە چاو ئەنگاوت، بەجارێک لە پەسیوی بۆسەی تۆڵەوە دەرپەڕین و بە نێزەی تیژی سینەدڕەوە مامزەیان لە ئەسپان کوتا و هەڵیانکوتایە شەڕگە و چەند کەسێکیان بە زەبری زامی قووڵەوە گەوزاند و تاقمێکیان لە خاکی نەمان وەردان. لەو کاتەدا

---

1 - دەبی لیمانتێکنەچی کە مەبەستی لە هەمزاغای سپاسالاری شێخ عوبەیدیللای شەمزینان نیە کە هەڵخەڵەتێندرا و ئەمیرنیزامی گەرووسی بە نامەردی شەهیدی کرد، ئەمەیان پێشتر ژیاوە.

مەحموودخانی ئەفشاری قاسملووی ساینقەلا مەتالی لە باسکی بوێری قایم کرد و بە شیری ڕووتەوە ئەوپەڕی ئازایەتی نواند. لە لای سپای موقەددەمیشەوە «قاسمبەگ»ناوێک کە پیاوێکی چاونەترسی بەناوبانگ بوو بە چاوچاوێنی مەحموودخانی ئەفشار شالاوی برد و سەرلەنوێ شەڕێکی قورس دەستی پێکردەوە. ئاخرییەکەی شنەی سەرکەوتن هەڵیکردێ و وردەوردە ئالای خەزاکەرانی ئەفشار و موقەددەمی شەکاندنەوە. مەحموودخانی گەنجی ئەفشاری ناودار سوارانی بلباسی بەجارێک ڕەواندنەوە و زۆربەیان وەبەر لەپەشیری جەوهەردار کەوتن. دەستەیەکیش کە لەو هەرایە دەرباز بوون ڕایانکردە کێوەکان و لەسەر زار و زمانان وا باوە و دەگێڕنەوە کە لە داوێنی چیای قەندیل بە حوکمی بەگلەربەگی خێڵی بەرزەجێی ئەفشار و ئەحمەدخانی موقەددەم لە دوو شوێنان منارەیان لە کەللەسەری کوژراوی بلباسان لێدان و بانگبێژان پێیان هەلاچوون و بانگیان لەسەر دان. دەسکەوت و خەنیمەتێکی ئەوەندە کەوتە بەر چنگی سپای موقەددەم و ئەفشار کە لە ژمارتن نەدەهات و پێنجشەش بارگینی چوارپەل قایمیان لە کاژەلاکی بلباسان بار کرد و بە ڕەشیدسوڵتانی قاسملووی ئەفشاردا ناردیانە ژێر خاکی پای خاوەنشکۆ و میری بەختیار چاوی پێیانکەوت. ئەم سەرکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی هەینی یەکەمی مانگی پووشپەڕی ئەم ساڵە.

پاش ئەم زاڵبوونە، ئەحمەدخانی موقەددەم چۆوە مەراغە و حوسێنقولیخانی بەگلەربەگیش لە لاجانەوە تەشریفی بردە شنۆ. قاسمسوڵتانی زەرزای حاکمی شنۆ شاقەلی خزمەتکاری و میوانداری بە لادا کرد و چۆن چاکە ئاوایان بە دەورەیدا هەڵسوورا. وەختایەک بەگلەربەگ پێینایە ئاوزەنگی، قاسمسوڵتان هەتا سەرووی هەورازی شنۆیە بەڕێی کرد و لە ڕکێفیدا بزووت و حوسێنقولیخان گەلێکی ڕێوشوێنی گرینگ وەبەردەنا و پێیدەفەرموو. لە ملەی کێو کۆرستانێکی گەورە وەبەرچاو هات کە وەک

کۆرستانی عەشیرەتان نەدەچوو. حوکمڕان سەبارەت بە وێ پرسیاری کرد و قاسمخان لە زمانی دەربەڕی کە ئێرە قەبرستانی کوژراوانی ئەفشار و کاژەلاکیانە کە لە ڕۆژگاری لێخرانی محەممەدقولیخانی بەگەربەگ و شەڕی قاسمخانی برایدا لەگەڵ زەرزایان کوژراون. میری بەغیرەت ئەم قسەی زۆر لە دلی گران هات و بە دزێو و ڕەقوتەقی زانی و لەڕێوە فەرمووی کوت و زنجیر بخەنە ئەستۆی ئەو زمانچەپرەکە نەزانە و بە چۆلەبێچی رایدەن بۆ ورمێ. ڕۆژایەکی کە بەگەربەگ گەیشتەوە ناوەندی دەسەلاتی جێژن و خۆشی و شادمانی سەرتاپاخواری کۆمەلی گرتبۆوە و گەیبوویە ئەوپەڕی خۆی و سێ شەو و ڕۆژ لە گەڕەک و کۆلان و بازاڕدا کردیانە چراخان و ئاوربازی. پاشان لەسەر فەرمانی بەگەربەگ قاسمسولتانی زەرزا فەلاقە کرا و زۆر بە توندی چێوەچزە درا و سێهەزار تمەنی تاوانانە لێئەستێندرا و دوایە ئازاد کرا. بەلام ڕەشیدسولتانی ئەفشار کە کەللەسەری شەڕفرۆشانی بلباسی پێبوو، کاتێک گەیشتە پایتەخت کە نادرمیرزا و کوڕانی شاروخشای نەوەی نادرشای ئەفشار بە کۆت و زنجیرەوە لەوێ ڕاگیر کرابوون. بەپێی فەرمان میری نادرمیرزا و تەواوی تۆرمەی نادری قەلتوبڕ کران و بێجگە لە قەهارقولیمیرزا کەسیان بە زیندیسەر نەمان. بەکورتی و بەگوێرەی گێڕانەوەی دەستەیەک لە مێژوونووسان کوژرانی نادرمیرزا و کوڕانی شاروخشا سەر بە سالی ١٢٧١ی کۆچی/١٨٠٢ـ١٨٠٣ی ..یە و ڕاست واشە. دیارە فەرمانڕەوایەتی لەرزۆکی برازاکان و حەولادەکانی نادرشا دوای کوژرانی وی ماوەی شازدە ساڵ لە خوراسان درێژەی کێشاوە.

دەلێن میری بەرزەشان فەتحعەلیشا دوای کوژرانی نادرمیرزا گوتی شوکرانەی خودای تاق و تەنیا دەبژێرم کە وای هێنا تۆلە بە ناو بکرێتەوە، واتە نادر، فەتحعەلیخانی باپیرەگەورەی ئەوی کوشتبوو و فەتحعەلیشاش کە بە ناوی باپیرەگەورەیەوە کرابوو، نادرمیرزای کوشتەوە. هەر لەم سالەدا

محەممەدقولیخانی مامی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ کە بە فەرمانی فەتحعەلیشا لە ساری ناوچەی مازندەران گیرابوو کراسی خوازراوەی ژیانی لە بەر داڕندرا. هێندێک دەڵێن دەرمانداویان کردووە و تاقمێک لایانوایە کە بە شیر سزایان داوە. بەڵام ئەوەی زۆرتر لەسەر زار و زمانان باوە دەڵێ لە ژوورێکی تەنگ و تاریکیان پەستاوتووە و دەرگا و پەنجەرە و دەلاقەیان هەمووی بە بەرد و قسڵ گرتووە و لەوێدا برسێتی هێرشی بۆ هێناوە و لە حەیبەتان گێچی دیواری خواردووە و پیاڵەی مەرگی لە دەستی ئەجەل وەرگرتووە و چاوی لەسەر جیهانی ڕووخەک هەڵگرتووە. کەچی چەند مێژوونووسێک ئەم ڕووداوە بە سەربوردەی سادقخانی شوقاقی دەزانن. لەسەر یەک محەممەدقولیخانی خوداڵێخۆشبوو پیاوێکی بێبەزە و بێباک و باوەڕپێنەکراو بوو. لە سەردەمی حکوومەتیدا هێز و دەسەڵاتی لە باوک و باپیرانی خۆی تێپەڕاند و لە مەودای بۆشایی دەسەڵاتا ماوەیەک توانی زۆربەی ناوچە و مەڵبەندەکانی هەرێمی ئازەربایجان بخاتە ژێر چۆکی و حوکمی بە سەر هەموو لایەکدا دەڕۆیی و تینی بۆ تێکرای حاکمان دێنا. دوازدە کوڕ و چوار کچی لە پشتی کەوتۆتەوە و کوڕەکانی بریتین لە: ١- مستەفاقولیخان. ٢- سەعادەتقولیخان کە حەمامی سەعادەتقولیخانی لە دوا بەجێماوە. ٣- خوداقولیخان کە ماوەیەک لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی خوابەخشیو نەجەفقولیخان و دواتریشدا سەرۆکدیوان بوو. ٤- محەممەدمووساخان. ٥- عەلیپاشاخان. ٦- مورتەزاپاشاخان. ٧-حەسەنپاشاخان. ٨- حوسێنپاشاخان. ٩- شوکروڵلاخان. ١٠- خەلیلخان. ١١- ئەحمەدپاشا. ١٢- فەتحعەلیخان. کچەکانی بریتین لە: ١- حاجی خانمی بەڕێزی هاوسەری خوابەخشیو حوسێنقولیمیرزای فەرمانفەرمای شیراز کوڕی فەتحعەلیشا کە خاوەنی چەند کوڕ و کچان بوو. ٢- حاجی خانمی خێزانی خوداڵێخۆشبوو لوتفعەلیخانی کوڕی

ئیمامقولیخانی سەردار کە ماوەیەک فەرماندەی دوو لقی حەوت و هەشت بـوو. لوتفعەلیخانی خوابەخشیو کە وەک لـە جێگـای خـۆیدا باسـی دەکـرێ بـە جووتەی ئەسپی میرئاخورەکەی لە سولەیمانی پشووی لێبڕاوە. عەسکەرخانی سەرتیپ، یۆسفخـانی شـوجاعوددەولەی ئـەمیرتومان، ئیمـامقولـیخـانی ئیقبالوددەولە ناسراو بە بیووکخان و ڕابیعەی دوومم لە داوێنـی ئـەم ژنـەی بەربوونەوە. ٣- هاوسەری خودادادخانی کوڕی ئیمامقولیخانی سەردار، دایکـی ئاوڕەحمانپاشاخانی وەزیر، وەلیقولیخان، عەبباسقولیخان، زەکیخـان و چەند کچێکی تر. ٤- [نادیارە].

## گەڕانەوەی عەسکەرخان بۆ ورمێ و کرانی بە سەرهێزی شەڕکەرانی ئەفشار بە مەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ سپای ڕووس

پێــشتر ئاماژەیــەکی پێکــرا کــە لەســەر ســکاڵای ســوارانی ئەفــشار، عەسکەرخان هەوساری سەرکردایەتی بە چنگەوە نەما و مەحموودخانی ئەفشاری ساینقەڵا لە جێی داندرا. عەسکەرخان لەبەروەی پیــاوێکی زانــا و شــازا بــوو، ماوەیەک بە لێخراوی لە بارەگای پیرۆز ڕاگیرا کرا. بەڵام لــە مــاوەی لاتران و مانەوەی لە تاران چونکە کەسێکی ورد و خورد و لێوەشاوە بوو گەلێک خزمەتی گەورە و بەرچاوی رادەپەراندن. ئەگەرچی لە بابەت کێشەی ڕووســاردی پادشــا سەبارەت بە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ و دانــدرانی مــستەفاقولیخــان لــە جێگای، دەورێکی دیاری گێڕا، بەڵام وەکوو پێشتر باسی کرا بەگلەربەگی ناوبراو لەسەر ڕاسپاردەی میرزا ڕەزاقولیخان خــۆی گەیانــدە تــاران و چــووە مالــی عەسکەرخان و بەڕاستی ئەویش قۆلی لێهەڵمالی بۆ ئەوەی لــە شــوێنی خــۆی دامەزرێنێتەوە.

حوسێنقولیخان چونکە لەم ماوەیەدا بیستبوویەوە کە عەسکەرخان زۆر بە چاکە لە بارەگــای مــیری باســی دەکــا و بۆتــە هــۆی پتــەوبوونی ئالــقەی دۆســتایەتی و خۆشەویــستی، لــە قــووڵایی دڵــەوە نامەیــەکی ڕەزامەندانــەی دەربارەی عەسکەرخان و گێڕانەوەی بۆ ورمــێ نووســی و بــە چەنــد کەســێکی باوەڕپێکراوی دەمپاراوی ڕێوشوێنزاندا ناردی بۆ بارگای فەرمانڕەوای ئێــران. ئەم ڕووداوانە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی ١٢١٨ی کۆچی/١٨٠٣ـ١٨٠٤ی زایینی. قــسەی خۆمان بێ لە ڕووی ئەو چەند دیاردانەوە کە باسیان کــرا وا وێــدەچێ لابــران و ڕاگیرکرانی عەسکەرخان لە تاران لەسەر داوای حوسێنقولیخان بووبــێ. هــەر

چۆنێـک بـۆ کاتێـک کاغـەزی بەگەربـەگ گەیـشتە خزمـەت خـاوەنشـکۆ، عەسکەرخان وێڕای ئەوانەی نامەکەیان هێنابوو، خەڵات کرا و بـە سـەربەرزی نیـزن درا بگەڕێتـەوە ورمـێ. هـەروەها فەرەجوڵـڵاخانی کـوڕە گـەورەی عەسکەرخانیش نازناوی «خان»ی باربوو کرا و بڕیار درا ژن و منداڵی ناوبراو کە لە قەزوین بارمتە بوون ئازاد بکرێن و بگەڕێنـەوە مەوتـەنی خۆیـان. کاتێـک عەسکەرخان وێڕای یارانی گەیشتە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات، پـاش ئـەوەی چووە لاشیپانەڕاموسانی جێنشینیمیر، چونکە لەو جەنگەدا قسەی هرووژمـی لەشکری دەوڵەتی ڕووسیا بۆ سەر ئێران لە گۆڕێدا بوو، عەسکەرخان ڕاسپێردرا کە خێرایەکی هێزی سوارەی ئەفشار بـە سـاز و بـەرداخی ڕێـکبخـا. کاتێـک عەسکەرخان گەیشتە گوندی سەعدلوو، بەگەربەگ لەبـەر مەزنایـەتی خـانی ئەفشار خەڵکی شاری لە دوور و نیزیکەوە هەتا دەوروبـەری ئـاوایی «گـرداوا» ناردنە پێشوازی و پاش ئەوەی گەیشتە ورمێ چۆنچـاکە ئـاوا بەخێرهاتنـەوە کرا و ڕێزی لێگیرا.

هەر لەم ساڵەدا سپای ڕووسیا بە سەرکردایەتی «تسیتسیانۆف»[1] ناسراو بە «ئیشپۆختۆر» پەلاماری قـەفقازیان دابـوو. دوای گرتنـی تفلـیس شـالاویان بردبوویە سەر گەنجـە و ئـەو بازێرەشـیان خـستبوویە ژێـر چـۆکی خۆیـان. جەوادخانی گەنجەیی وێڕای کوڕێکی لەم شەڕدا کوژرا و محەممەدخانی قاجاری حوکمڕانی ئێرەوان بە خاپاندنی جەعفەرقولیخانی دونبولی و کەلبالـیخـانی نەخجەوانی لەگـەڵ سـەرداری ڕووس سـازا. هـەر بۆیـە شـازادەی بـەرزەجێ عەبباسمیرزا بە مەبەستی داکووژاندنی ئەم هەرا مەترسیدارە بە خۆی و هێزێکی بێژمارەوە بەرەو ئەو هەرێمە کەوتەڕێ و ئـەم هەواڵانەشـی نـاردەوە خزمـەت بارەگای فەرمانڕەوای ئێران.

---

1 - نووسەر بە سیسیانۆف هێناویەتی. بەلام تسیتسیانۆف دروستە.

# بزووتنی فەتحعەلیشا بەرەو قۆرخبلاغی ئێرەوان و بانگکرانی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ بە مەبەستی بەشداربوون لە هرووژمەکەدا

ساڵی ١٢١٩ی کۆچی/١٨٠٤ـ١٨٠٥ی زایینی، کاتێک گیرانی گەنجە و کوژرانی جەوادخان و کورەکەی و بژایەتی خانانی نەخجەوان و ئێرەوان و زاڵبوونی تسیتسیانۆف لە تارانی پایتەخت بە گوێی فەتحعەلیشا گەیشتەوە، سەرەتا لەشکری بەشان و شەوکەتی میری هات و گەیشتە بێرگ و چیمەنی ئۆجان. لەم کاتەدا شازادەی جێنشینیمیر بەرەو قۆرخبلاغ دەکشا، هەر بۆیە بەپێی فەرمان نامەی هاتن و حازربوون بۆ هێزەکانی ئازەربایجان نووسران. حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ لە پێشدا عەسکەرخانی بە هەزار سواری ئەفشارەوە نارده لێواری چۆمی ئاراس و خۆشی لە سەرەتای مانگی خرمانانەدا وێڕای مەحموودخانی قاسملوو و تاقمێک پیاوماقووڵی ئەفشار رووی کرده تەورێزی ناوەندی دەسەڵات. لە جەنگەی ئەم هەرایەدا بڵاوبۆوە کە محەممەدخانی قاجاری حوکمڕانی ئێرەوان وەکوو کارێکی بێنرخ و سووکەڵە تسیتسیانۆفی سەرداری رووسیای دنە داوە بۆ گرتنی ئێرەوان و ئەم هەڵوێستەی بە قازانج و بەرژەوەندی خۆی و مانەوەی دەسەڵاتی داناوە! هەر بۆیە لەشکر و ئابۆرای رکێفدارانی عەبباسمیرزای جێنشینیمیر بەپرتاو بەرەو ئێرەوان ئەسپیان تاو دا. رۆژی پێنجشەممە ٢٨ی مانگی سەفەر قۆشەن لە قەراغ رووباری «زەنگی» چەشنی دەریای بەربەرین شەپۆلی داوە و کەفی چاند و مەتەرێزی قایم و سەنەری دابەست و چاوەڕوانی تێکهەڵچوون مایەوە. خەڵکی

ئێرەوان بە مەبەستی بەرەنگاری هەنگاویان نا، بەڵام چونکە خێڵاتی دەوروبەری ئێرەوان لەبەر بێمشووری و تەگبیری خاوی محەممەدخان بە ماڵ و کۆچەوە چووبوونە کەوشەنی دیاربەکر و ئەرزەڕۆم و لەوێ بنەیان داکوتابوو، عەبباس‌میرزا مەهدی‌قولی‌خانی قاجاری ڕاسپارد کە بچێ و کۆیان بکاتەوە و بیانگێڕێتەوە سەر جێوڕێی خۆیان. مەهدی‌قولی‌خان دوای ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەر شانی لە کاتی گەڕانەوەی‌دا لە ناوچەی پەنبەک تووشی تسیت‌سیانۆف بوو کە بە خۆی و بیست‌هەزار سالدات (سەرباز) و کۆمەڵێک قازاخ (قەززاق) و سێ تۆپی گاشەشکێن زۆر بە تامەزرۆیی و بەپەلە بەرەو ئێرەوان دەخوشی. شەڕیان بە مابەینی‌دا قەوما و چونکە مەهدی‌قولی‌خان نیزیکەی شەش‌هەزار چەکدارێکی لە ژێرکێفی‌دا بوو، نەیتوانی لە حاند لێشاوی سپای سەرداری رووس خۆی بگرێ و بە قوونەشەڕ و ڕاکەڕاکە گەیشتەوە لەشکرگای جێنشینی‌میر. تسیت‌سیانۆف دوابەدوای ئەو ڕۆژی چوارشەممە ۱۸ی مانگی ڕەبیعی یەکەم لە نیزیک «ئۆچ‌کلیسا»ی سێ فرسەخی ئێرەوان هۆردووبەزی کرد. بۆ بەیانی عەبباس‌میرزا، ئەحمەدخانی موقەددەمی وێڕای دەستەیەک لە سەنگەران‌دا بەجێهێشت و خۆی بە لەشکرەوە تەشریفی ڕۆیی بۆ شەڕی تسیت‌سیانۆف. باڵی ڕاست و چەپی بە سەرکردەکانی سپا و گیانفیدایانی دەوڵەتخوا تەنی و لەو لاشەوە تسیت‌سیانۆف چەکدارەکانی بە شێوەی سێ قەڵا ڕێکخستن و دایمەزراندن کە نێوانی هەرکامەیان دووسەت هەنگاو بوو. پاشان سێ تۆپەکەی لە گەڕانگەری ئەو سێ قەڵایە دابەستن و خۆشی لەبەر ئەوپەڕی ئازایەتی و چالاکی لە نێوان هەرسێک کۆمەڵەکەدا کەلەکاوکەلەک و تلاوتلی دەکرد و بێوچان بە ئاماژەی دەست ڕێوشوێنی سپای ڕووسیای بۆ شەڕ و پەلامار نیشان دەدان. سەرەتا لە لای سپای ڕووسەوە گرمەوهۆڕ و شریخەشریخی تۆپی قورسی ئاگرین بەرەو ئاسمان باڵی ئەنگاوت و لەبەر دووکەڵی ڕەش و تەپوتۆز دەتکوت هەورێکی پڕ بەری خۆری گرتووە و زەوی لەبەر گڕی ئاگر لە کوێن دۆزەخی حەوتەمین خۆی

دەنواند. لە بەری قۆشەنی ئێرانــەوە، ســوارانی تیــژاژۆ و ئــاگرپژێنی وەکــوو پــەرویزخانی چـــەرداوەروو[1]، عەبدوســـسەمەدخانی بـــرای عەســکەرخان و محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلووی ئەفشار مامزەیان لە ئەسپانی تیژبــەزیان ئەنگاوت و هاواریان کرد یا حەیدەری کەڕڕار و بە شیری مووکاری جەوهــەردار زۆر کەسیان لە خوێنی خۆیان گەوزاندن و هەڵیانکردە سەر ئەو قەڵاتی ئاگرە و پاڵەوانانە زەبریان وەشاند. وای لێهات کە لەبەر گوڕمی شــاڵاوی قارەمانــانی شێرگەوزێن تان و پۆی قەڵایەکی سپای رووسان چەشنی ئەندامی ڕزیوی داتەپیو دەستیان لێکبەردا و هەڵوەرین و هیچیان بە بەرموە نەما. خەزاکەرانی ئێران کە یەکەم شــەڕی ســەربازییان بــوو لەگــەڵ ســپای ڕووس و هێــشتا لــە ڕێــسا و ڕێوشوێنی ئەم شێوە بەرەنگارییە ئاگادار نەبوون، بە لێکهەڵوەشان و شــکانی قەڵایەکی ساڵداتی ڕووس قنیاتیان نەکرد و ئەوەندە هەڵکڕابوون کە خۆیــان لــە گرتنی خەنیمەت و دەسکەوت و وەچنگهێنانی ماڵی تاڵانی خۆش کــرد. ئەوســا سەرانی سپای ڕووس و دیلەکانیان بردە خزمەت شازادە و هەر کەس شانی چۆنی هەڵدەگرت ئافەریمی لێکرا و دەسخۆشانەی درایە. تسیتسیانۆف بــەم ڕووداوە پەژارە دایگرت و داما و بەوپەڕی ڕق و قینەوە کەوتە بیری گەمارۆدانی ئێرەوان. کاتێک محەممەدخان بە بڕیار و تەمای تسیتسیانۆفی زانی، لــە کاکەوبرالــەی نێوانیان پەشیمان بــۆوە و حــەجمینی لــێ‌هەڵــگیرا. بــە کەیخودایــەتی مــیرزا محەممەدشەفیعی مەزنەوەزیری دەوڵەت و میرزا سادقی مەروەزی مێژوونــووس دڵنیا کرایەوە کە حکوومەتی ئێــران هەڵــیناپێچێ و ســزای نــادا، هــەر بۆیــە حوسێنقولیخانی کوڕی بە دیاری و پێشکەشی شایانەوە ناردە خزمەت بارەگای بەرزی شازادە کە لە سوڵتانییە بــوو. خــانی قاجــار تکــای کــرد کــە قەڵــەمی بەخشینی بە سەر هەڵوێستی نالەباریدا بکشێ و ئەسالحەی لەگەڵ بکرێ. بــەم

---

[1] - لە دەقەکەدا ئە· ·ر وە چارداولوو.

پێیە کاروانی موبارەکی جێنشینی‌میر لەو شوێنەوە کۆچی لێنــا و لــە چیمــەنی قۆرخ‌بلاغ خستی.

بەڵام کاتێک تسیتسیانۆف زانی محەممەدخان پێی لە بەڵێنی خۆی ناوە و سەری وەبەر پاشای ئێران هێناوە، تاوێک لــە بــیران راچــوو و لــە ناخــافڵ بەری‌بەیانی رۆژی پێنج‌شەممە ٦ی مــانگی رەبیعــی دووەم وێــرای هێزەکــانی و تۆپخانە و قۆرخانەوە بەرەو هۆردووبەزی عەبباس‌مــیرزا شــالاوی بــرد و بــەم تەگبیرە خۆی گەیاندە مزگەوتی گەورە و کەمەندی گــەمارۆی لــە دەورەی شــار شەتەک دا. لەم سەروبەندەدا لەشکری بەشان و شەوکەتی سەرکەوتەی خاقــانی لە سوڵتانییەوە هەستا و لە تەوریزی ناوەندی دەسەڵات بڵاو بۆوە و بیستی کە سەرداری دەوڵەتی رووس سەرقاڵی ئابلۆقەی ئێرەوانە. ئەو کات بەپێی فەرمانی میر، سمایل‌خان کە بە پاڵەوانی دامغان دەناسرا و لە شانامەی مەلیکوششوعەرا فەتح‌عەلی‌خانی کاشانی‌دا لە چەند شوێنیان باسی دەکــرێ، وەکــوو پێــشەنگ رۆیی و رکێفی شکۆمەندی فەرمانڕەواش دوابەدوای بزووت و لە رووباری ئاراس پەڕییەوە. رۆژی ١٩ی مانگی رەبیعی دووەم، یەک فرسەخی باژێری ئێرەوان بوو بە خێوەتگا و سەراپەردەی شکۆمەندی میری. لەو دەمــەدا کــە تــسیتسیانۆفی رووس مەتەرێزێکی زۆری دابەستبوون و خۆی لە مزگەوتی گەورەی شــاردا بــە مەبەستی گەمارۆ بنکەی دانــابوو، تــولحی بــەیانی لــە لەشــکرگای دەوڵــەتی ئێرانەوە تۆپیان تەقاندن کە دەنگوت هەژدیهان ئاوریان لە دەم دەردەپەڕێ و پەل و پۆلی قۆشەن پەلاماری سەنگەرانیان دا و کردیانە گرمە و هەرا و دوای کوژرانی تاقمێکی کەم لەرێوە پاشەکشەیان کرد. سەرداری رووس تۆپخانەی خــۆی بــردە سەر گردێکی قیت و بەرەو هێزە باڵادەستەکانی ئێران ئاگری دان و قۆشەنی ئێران گەڕانەوە خێوەتگــای بــەرزی مــیری. ســەرکردەی رووس دیــسان لــق و پــەلی چەکدارانی ناردنەوە مەتەرێزان و جەعفەرقولی‌خانی دونبولی لەگەڵ میرزاــێک

[ژێنرالێک] و دەهەزار پیـادە و بیست تۆپەوە گالی دان بۆ بـەربـەرچدانەوەی قۆشەنی فەرمانڕەوا.

حەسەنخانی قاجاری قەزوینی قوڵلەرئاغاسی کە ناسراوە بە سـەفدەری غازی، خاوەنشکۆی لە تەمای خەنیمان ئاگادار کردەوە، بۆیـە بـڕیار درا کـە لەشکرچی لە هۆرنووبەز وەدەرکەون و لە داوێنی چیایەک خۆیان مەلاس بدەن و چما ساڵداتی ڕووس و جەعفەرخانی دونبولی شالاویان هێنا لە بەرپاڵی چیاوە هەلکەنە سەریان. خوداوڕاستان سپای ڕووس شەو ڕێگایان لێگۆڕا و کوێرانـە هەنگاویان نا. بەیانی کە گەیشتنە لەشکرگا و تەماشایان کـرد چۆڵـە، بـەرەو ئاتەگی شاخ و قۆشەنی میری کە دەتکـوت ئەسـتێرەی شـکۆمەندی گرشـەدارن تێهەڵبوون. پاش ئەوەی هێندێک وەسەرکەوتن بلێسەی هەتاو تینی بۆ هێنان و تووناییەتی شانی گرتن و بەناچار داگەڕانەوە. لەڕێوە هێزەکانی ئێرانی کەوتنە سەریان و چالاکانە لێیان وەخۆکەوتن و تاقمێکیان لێکوشـتن. هـەروەها ئـەو کەسانەی کە لەسەر فەرمانی سـەرداری ڕووس بـە مەبەستـی کـۆکـردنـەوە خورد و خۆراک و ئازووخە بێروبەوێدا بلاو ببوونەوە، لەبەروەی ئێرانی لەسەر داوای محەممەدخان ڕێی هاتوچۆیان گرتبوون، هەرکامەیان وەبەر گازی سپای ئێران دەکەوتن دەکوژران. تسیتسیانۆف بـەناچار دەورەی ئێرەوانـی بـەردا و بەرەو تفلیس بزووت. لەم کاتەدا حوسێنخانی قاجار کەوتە شوێن سەرکێشکچی تسیتسیانۆف و زۆربەی هاوڕێیانی بەرەو دنیای نەمان هەڵداشـت. پـاش ئـەم ڕووداوانە محەممەدخان دووبارە بەپێی حوکمی پاشا بۆوە حوکمڕانی ئێرەوان.

## غەزرینی پادشا لە مەحموودخانی کوڕی موئمینخان

لە مەودای ئەم شەڕ و هەرایەدا مەحموودخانی ئەفشاری قاسملوو کەوتـە بەر غەزەبی پادشا و بە چۆڵـەپێچکـراوی ناردیانـە ورمـێ. دەڵـێن تـووڕەیی خاوەنشکۆ دەگەڕێتەوە سەر ڕووداوێکی سەردەمی گەمارۆی ئێرەوان و جەنگـەی تێکهەڵچوونی نێوان سپای ڕووس و ئێران. هـەروەکوو بـاوە هـەموو شـەوێک دەستەیەک دەبوونە پاسەوان و پارێزەری هۆردووگا و وا داندرابوو کە دەبێ وریا بن و نەهێڵن لە کانگایەکی خوێی ئەو دەوروبەرانەوە، خوێ بەرن بۆ لەشـکری ڕووس، ئەگینا دەکەونە بەر لێپرسینەوە و سـزادان. وا هەڵـکەوت ڕاسـت لـەو شەوەدا کە نۆرەی سەرۆکایەتی قەرەوڵەکان کەوتـە ئەسـتۆی مـەحموودخان، کابرایەکی ئەفشار گۆیا بە فیتی عەسکەرخان یان چەند کەسێکی دیکە کە خـودا چاکتر دەزانێ، توورەکەیەک خـوێ لـە کانگاکـەوە دەخاتـە سـەر پاشـتەرکی ئەسپەکەی و بە ڕەوگەی سپای ڕووسی هەڵدەپڕژێنێ و بـەریبـەیانی لـە نێـو هۆردوودا دەبێ بە قاو کە ئەمشەو پاسـەوانەکان کەمتەرخـەمییان نوانـدووە و سپای ڕووس توانیویانە خوێ بەرنە هۆردووگای خۆیان. کاتێک ڕوون بۆوە کـە شەوی ڕابردوو سەرکردایەتی قەرەوڵەکانی ئەفشار لە ئەسـتۆی مـەحموودخان بەوە و بە خزمەت فەرمانڕەوایان ڕاگەیاند، لەڕێوە مەحموودخانی بـێتـاوانی بانگهێشت و زۆری بە سەر ڕۆیی و لێیتـووڕە بـوو. پاشـان دەسـتووری دا بـە فەرجوڵلاخانی کەنگاوەری سەرۆکی ئاسایش[1] پشتێندی بخاتە گەردنی و ئەویش سێوبووی لێنەکرد و مەحموودخانی بەوپەڕی سووکایەتی لە خزمەتی ڕاکـێش کرد و بردییە دەرەوە. وا بڕیار درا کە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ بە کـۆت و

---

1 - ئەسەقچیباشی.

زنجیرەوە بینێرێتە ورمێ، بۆیە ئەللاوێردیخانسولتانی ئەفشاری لەگەڵ چەند سوارەی خەلەج ڕەگەڵ خست و بەڕێی کرد و ڕایئەسپارد کە هەتا گەڕانەوەی خۆی لە خەڵوەتخانەی میری ڕاگیر بکرێ.

کاتێک ئەم هەواڵە سامناکە گەیشتەوە گوێی کەسوکار و کوڕانی مەحموودخان، ئەحمەدبەگ و شێخالیئاغا کە هەردووکیان کوڕی گەورەی بوون، دڵیان ئۆقرەی نەگرت و لە تاوان بەرەو لێواری چۆمی ئاراس ئەسپیان تاو دا. لە دەورووبەری «چۆرس»ی خۆیە بە خزمەت باوکی پایەبەرزی خۆیان گەیشتن و گزیرەکانی میری ئەوانیشیان گێڕایەوە ورمێ و هەردکیان وێڕای باوکیان زیندانی کردن.

بەکورتی کاتێک هۆردووی موبارەکی لە ئێرانەوە گەڕایەوە تارانی پایتەخت، حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ و عەسکەرخانیش لە خزمەت ڕکێفی خۆشفەڕی مەرەخەست بوون و گەڕانەوە ورمێ. دەبێ لە بیرمان نەچێ کە مێژوونووسان ژمارەی کوژرانی ڕووسیان بە نیزیکەی چوارهەزار کەس و هی ئێرانیان بە دووهەزار کەسێک تۆمار کردووە.

## نێردرانی عەسکەرخان بۆ شەڕ لەگەڵ تسیتسیانۆف و یارمەتیدانی حەسەنقولیخانی حاکمی بادکووبە

ساڵی ١٢٢٠ی کۆچی/١٨٠٥ـــ١٨٠٦ی زایینـی، دوای گەڕانـەوەی کـاروانی بەشەوکەتی خاقان بۆ تارانی پایتـەخت، وەکـوو دیرۆکـانی دەوڵـەتی قاجـار دەگێرنەوە، تسیتسـیانۆف گەنجـە و تفلـیس دەخاتـە ژێـر چـۆکی. پاشـان بەگوێرەی نێوان و پەیمانێکی کە بوویەتی لەگەڵ براهیمخەلیلخانی جەوانـشێر بێترس دەچێتە قەڵای شووشی و کـە دەگاتـێ لـەوێوە حوکمـدار دەروازەی بـە ڕوویدا دەکاتەوە. سەرداری ڕووس سەرکردەیەک وەکوو بریکاری خـۆی لـەوێ دادەنێ و بەرەو گەنجە دەبزوێ کە دەست و پەنجەیەک بنوێنێ. لـەو ڕۆژگـارەدا شێخالیخانی بەگلەربەگی قوببە و دەربەند و حوسـێنقولـیخـانی حوکمـڕانی بادکووبە لەبەروەی نەکا سەرداری ڕووس بۆ گرتنی بادکووبەش پـەل بـاوێ و شەڕ بقەومێ، داوای کۆمەگیان کرد لـە گـەورەپیاوانی حکوومـەت و کاغـەزیان ناردن. لە لایەن دەوڵەتی مەزنەوە چەند فەرمانێک نووسرا بۆ حاکمان و بۆ وێنە یەکیش گەیشتە دەسـتی حوسـێنقولـیخـانی بەگلەربـەگی ورمـێ کـە تێـیدا نووسرابوو عەسکەرخان بە سەرکردایەتی سوارانی بەڕێکێلی ئەفشارەوە بنێرێتە یاریـدەی حـاکمی بادکووبـە. هـەر بۆیـە عەسـکەرخان شـانبەشـانی عەبدوسسەمەدئاغای برای کارزانی خۆی و سوارانی ئەفشار ڕۆیـی بـۆ شـوێنی دیاریکراو. لەم کاتەدا یەکێک لە سەردارانی ڕووسـیا بـە نـاوی «شـێفت» کـە تسیتسیانۆف ناردبوویە گێلان و لەوێ بە چنگ شازادەی جێگرەوەی فەرمانڕەوا تێکوپێک شکابوو، بە شپرزەیی ڕووی کردبۆوە بادکووبە و بە دەریای خەزەردا پەڕیبۆوە و بەرەوڕووی ئەم شارە لەنگەری خستبوو. چەند شەڕێکی قـورس لـە نێوان شێفت و حوسێنقولـیخـانی بادکووبـەیی و عەسـکەرخانی سـەرکردەی سوارانی ئەفشاردا قەوما. ڕاست لەم کاتـەدا شێخالـیخـانی حـاکمی قوببـە و

دەربەند و کوڕی سورخای‌خانی لەگزی بە لۆشەنی خۆیانەوە گەیشتنە فریایان و شێفتی سەرکردەی رووسیان هەڵبڕی و رایکرد و چووە پشتەوەی ساری سەر بە تالش. تسیتسیانۆف بە تەمای ئەوەی بەشکوو بتوانێ دڵی مستەفاخانی شێروانی بداتەوە، لە گەنجەوە هاتە وێندەرێ. لەم لایەوە پیرقولی‌خانی شامبەیاتی نێردرایە هاواری مستەفاخان، بەڵام لە قەراخ چۆمی کور بۆی دەرکەوت کە تسیتسیانۆف، مستەفاخانی بە گەندەڵفێڵان هەڵخەڵەتاندووە و چۆتە هانای شێفتی رووس بۆ پشتەوەی ساری، هەر بۆیە سەرکردەی ناوبراویش ورەیەکی وەبەر هاتۆتەوە و شانی لە بەربەرەکانی شل کردووە و ئامادەی پەنجەشکێنەیە. بەکورتی مستەفاخان خەڵک و خێلات و مەڕ و ماڵاتی شێروانی ناردنە چیا سەختەکان و خۆشی لە قەڵای «گێلەسەن گوێرمسەن»[1] بنەی داکوتا. جێگرەوەی‌میر حوسێن‌قولی‌خانی قاجاری ناردە هانای مستەفاخان و پاراستنی بادکووبە و ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغەش بە تۆپخانە و چەند لق و پەلێکەوە بە دوای‌دا بەڕێ‌کرا و خودی عەبباس‌میرزای جێنشینی‌میریش لە تەورێزەوە تەشریفی بردە دارولئیرشادی ئەردەوێل. تسیتسیانۆف وەختایەک تەماشای کرد کە لە هەموو لاوە سپای پاشای ئێران دەورەی داوە و لە شەشدەری واقورماندا چەواشەیە، بەناچار لەگەڵ حوسێن‌قولی‌خانی بادکووبەیی دەرگای هاتوچۆ و دۆستایەتی کردەوە و لەگەڵی پێکهات. حوسێن‌قولی‌خان لەبەروەی دەیزانی هەلەکەی ناسکە بەرواڵەت نێوانی لەگەڵ خۆش کرد و بەڵێنی سەروەبەرهێنان و رادەست کردنی کلیلەکانی قەڵای بادکووبەی پێدا. بەپێی نووسینەکانی محەممەدحەسەن‌بەگی ئەفشاری مەحموودلوو کە ئەو دەم یەکێک لە سەردەستەکانی سوارەی ئەفشار و کارگێڕ و باوەڕپێکراوی عەسکەرخان بووە، حوسێن‌قولی‌خانی بادکووبەیی بە تەگبیر و

---

[1] دەستەواژەیەکی تورکییە و یانی بێی و ببینی. م . پ

ڕای عەسکەرخان لە تسیتسیانۆفی ڕاسپاردووە کە بە مەبەستی دیدار و چاوپێکەوتن بێتە دەوروبەری قەڵا. هەردوو پەنامەکی سەرقاڵی وتوویژ بوون کە لەپڕ برایمخانی برازا یان ئامۆزای حوسێنقولیخان لە بۆسە دەرپەڕیوە و دەرفەتی لە دەست نەداوە و لە پشتەوەڕا تسیتسیانۆفی ومبەر گوللە داوە و ئاودیوی دنیای دیکەی کردووە و سەر و دەستێکی پەڕاندووە! قەومانی ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ جەنگەی بانگی نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٦ی ڕەمەزانی پیرۆز. وەرگێڕ و جلەوداری سەرداری ڕووس کە ئەم دیمەنەیان وەبەرچاوی هات بەرەو هۆردووی خۆیان هەڵاتن بەڵام برایمخان لە دواوەڕا دەمانچەی لێئاوردان و جلەودارەکەی ئەنگاوت، کەچی کابرای وەرگێڕ خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپی تسیتسیانۆف و هەتا نێو هۆردوو لینگی دا و هەواڵەکەی بلاو کردەوە. ئەوسا قۆشەنی ئێران پێکەوە شاڵاویان بردە سەر هۆردووبەزی ڕووسیا و دەستیان لە تاڵان و کوشتار نەپاراست. هەزارەزیلەی لەشکری بێسەرکردە لێیسواری لۆتکان بوون و چوونە ڕەوگەی پشتەوەی ساری. وەکوو دیارە و لە دیرۆکانی دەوڵەتی قاجاردا نووسراوە، حاجی میرزا محەممەدی نەیشابووری کە زانایەکی ناوبەدەرەوەی بواری حەدیس بووە، چل ڕۆژ بەر لە قەومانی ئەم ڕووداوە گوتبووی تسیتسیانۆف دەکوژرێ. بەکورتی عەسکەرخان سەری تسیتسیانۆفی لەگەڵ نامەیەک سەبارەت بە دەورگێڕانی خۆی و چۆنیەتی دەسوەشاندنی برایمخانی بادکووبەیی لەم ڕووداوەدا بە محەممەدحەسەنبەگی ئەفشاری حوودلوودا ناردە خزمەت جێنشینیمیر. شازادە عەبباسمیرزا لە ئەردەوێڵ نامەکەی پێگەیی و لە سەر و دەستی براوی تسیتسیانۆفی ڕوانی و لەوێوە بەرێ کرانە تارانی پایتەخت.

## نێردرانی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی ورمێ بۆ یارمەتیدانی سمایلخانی قاجار بە مەبەستی ڕێکوپێک کردنی کاروباری گەنجە و تفلیس

وەکوو پێشتر باسی کرا و دیارە، لەبەر چالاکی و هەڵسووڕانی تسیتسیانۆفی سەردار، گەنجە و تفلیس پارەکە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ڕووسیا. پاش کوژرانی وی و پرشوبڵاوبوونی سپای ڕووس، جەنابی شازادەی جێگرەوەیمیر کەوتە سەر خەیاڵی گرتنەوەی ئەو دوو هەرێمە و داینا کە سەردارێکی شێلگیر و بە شان و شەوکەتی ئازەربایجان وێڕای لەشکرێکی زۆر و زەوەند بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرک و خزمەتە مەزنە دیاری بکا. لە نێو میرانی ئازەربایجاندا بازی ئەنجامدانی ئەم کارە لەسەر شانی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار هەڵنیشت و بڕیار درا کە شانبەشانی ئەمیری کارزان سمایلخانی قاجار بە ڕێگای ئێرەواندا بڕواتە گەنجە و گورجستان و پێکەوە کاروباری ناوچە و مەڵبەندەکان ڕێکبخەنەوە و ببنە سەرچاوەی خزمەتی بەرچاو. لەو لاوە شێلفتی سەرکردەی ڕووسیا کە دوای کوژرانی تسیتسیانۆف لە لایەن دەوڵەتی خۆیەوە سەرقاڵی تێکدانی بارودۆخی دەوڵەتی بەرزی ئێران بوو، لەگەڵ جەماوەرێکی زەوەندی ساڵدات و قازاخ لە شاری تفلیس سەرەڕای داکوتانی بنە، خەریکی فێڵوفرت و گەلاڵە و پیلانداڕشتن بوو. شازادەی بەرزەشان تەواوی هێز و لق و دەستە و پەلی لەشکری ئازەربایجان کە چەشنی دەریا شەپۆلیان دەدا و دەهاژان بە چەکوچۆڵ و تۆپخانە و بووتەپلە و ئاڵا و هەرچی پێداویستی قۆشەنە هەمووی خستنە ژێر حوکمی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار و ناردی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی

سەر شانی. وا بریار درا کە هەموویان سەرەتا لە مەڵبەندی دڵبزوێنی خۆی کۆببنەوە و لەوێوە بەرەو تفلیس ببزوون و ئازایەتی و چالاکی بنوێنن و سەرکەوتن وەچنگ بێنن. تاوڵ و خێوەتی جێنشینیمیریش لە «هەباساوا»[1] هەڵدران و چاومڕانی هەواڵان مانەوە.

حوسێنقولیخان وێڕای سمایلخانی قاجار و هێزە ئەبەزەکانیان هەتا دوو مزڵیی تفلیس چوونە پێش. بەگوێرەی نووسینی نووسەری گولشەنوتتەواریخ، بەگلەربەگی ئەفشار کە لەم سەفەرەدا سەرکردەی سپا بوو لە هەموو کارێکدا بەبێ تەگبیر و ڕای عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی ئەفشار قامکی لە ناو ڕۆنەدەکرد. هەر بەڕاستی لەم سەفەرە سەرموخێرەدا ئەوەندە خزمەتەی کە عەسکەرخان و عەبدوسسەمەدخانی برای ئەنجامیان دان ئەگەر بێتوو بنووسرێنەوە تازە یەک لە هەزاری نابن و هێندە دەسکەوت و خەنیمەت و کەلوپەلەی کە وەدەست قۆشەنچییانی ئێران کەوتن لە ژماردن نایەن. دواتر بەگلەربەگی ئەفشار شەشهەزار سەر خێزانێکی شێروانی کە بە ڕووڕاستی بیوونە رعێتی دەوڵەتی گەورەی ئێران، لەو مەڵبەندانەوە ناردنی بۆ ناوچەی موغانی ئەردەوێڵ. لە گەرمەی ئەم ڕۆژانەدا ،ناووزاری ڕۆژگاری بێوەفای زاڵم بەگلەربەگی گرت و پەڕۆی شینی لەسەر شانی ئەو ئەمیرە باوەڕپێکراوە قایم کرد. ئاشکرایە کە تەواوی سەرۆک و سەرکردەکانی ئازەربایجان ئێرەییان بە حوسێنقولیخان دەبرد و لەبەر سەرکەوتن و هەنگاوی مەزنانەی ناخۆشیان ـیست و دەیانبوغزاند و پێیەوە وەڕەز بوون و هەر لە هەلێک دەگەڕان کە ئەو بەختیارە تووشی نەهامەتی و سەرمەقولات بکەنەوە. بۆیە کردیانە دەنگۆ و هاتهات کە ئەوە بیستهەزار لەشکرچی دەوڵەتی ڕووسیا بە سەرکردایەتی «شێفت» و بە مەبەستی لێدان و تێکهارینی سپای ئێران ڕامال دێنن. بە

---

1 - عەبباسئاباد.

بلاوبوونەوەی ئەم درۆیە هۆربووی ئێران تووشی دڵەڕاوکە و ئۆقرەبڕان بـۆوە. حوسێنقولیخانی سپاسالار کە وای زانی فەرمانی جارکێشانی دا کە ئەم قسانە هەمووی دەمگۆن و خۆڕی و تۆڕی و خەنیمانی دینی پاک هەڵیانبەستوون. بەڵام جارکێشانەکە جێی نەگرت و کارەکە وا گـەورە بـۆوە کـە قۆشـەنچی دەسـتیان لێکبەردا و ڕەوین و هەتا ئێرەوان سـەری جڵـەویان هەڵنەنگـاوت. بێجگـە لـە عەسکەرخان و عەبدوسسەمەدخانی بـرای و سـەرکردەکانی سـوارانی ئەفـشار هیچکەس لە هۆربووگادا نەما. جەنگەی نـوێژیشـێوان لـە کـەلێن و قـوژبنی لێرەوارەکانی گەنجە و تفلیسەوە فیـشەکیان پێوەنـان و ئـەو ئاپۆرایـەی کـە هەڵنەهاتبوون جوابیاندانەوە. بەڕاستی سوارانی ئەفشار هێزەکانی تفلیـسیان شکاندن و زۆر پیاوانە تۆپ و تۆپخانەیان بە ڕێگـای گەنجـەدا گەیانـدە سـەر سنووری ئێرەوان. کاتێک هەواڵی لێکبلاوبوونی هۆربووی سەردار و تێـشکانی قۆشەنچییانی ئێرانی و شپرزەیی حوسێنقولیخان و دەرچوونی بۆ ئێرەوان لـە هەیاساوا بە خزمەت عەبباسمیرزای جێنشینیمیر ڕاگەیەندرا، ڕقـی هەسـتا و زۆری پێتێکچوو. بەناچار حوسێنقولیخانی بەگەربەگی ئەفشاری لێخـست و ئەحمەدخانی موقەددەمی حوکمداری مەراغەی لە جێی دانا.

# شەڕ لەگەڵ گۆداویچی سەرداری رووس

ساڵی ١٢٢١ی کۆچی مانگی/١٨٠٦ـ١٨٠٧ی زایینی، پاش ئەوەی کە سێبەری نەگبەتی شێفتی سەرداری رووس لە سەر ئێرانییـان ڕەوی، دەوڵـەتی رووسـیا سەرکردەیەکی دیکەی بە ناوی گۆداویچ وێڕای هێزێکی بێژمار ناردە سەر شاری تفلیس و دەستی بە سەرداگرت. جەعفەرقولیخانی دونبولی کە ماوەیەک بوو لە دەوڵەتی مەزن و بەشان و شەوکەتی ئێران هەڵتەزیبۆوە و ئاوارە و سـەرگەردان دەسووڕایەوە، دایە پاڵ سەرداری رووس. مستەفاخانی شێروانی لـە لایەکـەوە دەرگای دۆسـتایەتی لـــەگەڵ رووسـیا کـــردبۆوە و لــــە لایــەکـــی دیکــــەوە برایمخەلیلخانی جەوانشێر پەشیمان ببۆوە لـە خێرەسـەری و سـازان لەگـەڵ رووسان و لە سەرەنجامی کاران تۆقیبـوو، هـەر بۆیـە لـە دەوڵـەتی بـەرزی ڕانەسپاردبوو کە یارمەتی بدا بۆ لێدانی سەرداری رووس کە قەڵای شووشی بـە دەستەوە بوو. وڵامی داواکەی درایەوە و حوسێنقولـیخـانی حوکمـڕانی خـۆی وێڕای سمایلخانی دامغانی و ئەمانوڵـلاخانی ئەفـشاری کـەنگاوەری حـاکمی خەمسە نێردرانە یاریدەدانی. کاتێک برایمخەلیلخان بە دنەی جەعفەرقولیخانی ئەوەی خۆی بە دەستی سەرداری رووس کوژرا، هاڵۆزکانێکی بەرچاو کاروباری قەرەباغی گرتەوە. فەرمانڕەوای مەزن لەڕێوە حوسێنخان و حەسەنخانی قاجار کە دوو برای ئەجیمزادە بوون لــە خوراسـانەوە بانگیهێـشتن و بـە مەبەسـتی ڕێکخستنی کاروباری ئەو هەرێمە و حوکمدارێتی ئێرەوان دیـاری کـردن. دواتـر سەرەتا برایمخانی قاجار و پیرقولیخانی شامبەیاتی وێڕای کۆمەڵـێک هێـز و چەکـداری باڵادەسـت بـۆ شـەڕ و بەربـەرەکانی لەگـەڵ رووسـان نێـردران. ئەحمەدخانی موقەددەم و عەسـکەرخان و عەبدوسـسەمەدخانیش بـە قۆشـەنی

خۆیانەوە چوون و لە قەراخ چۆمی ئاراس هۆردووبەز کرا. لەو لاوە گۆداویچی سەرداری رووسی لە جەنگەی کرێوە و باکوت و سارد و سەرما و سەهۆلبەندانی زستاندا جەعفەرقولیخانی دونبولی کردە سپاسالاری خۆی و بەرەو ئێرەوانی گال دا. محەممەدخانی حاکمی پێشووی ئێرەوان خۆی تێکنا بۆ بەرەنگاری و کەوتە قەلاداری. عەسکەرخان و عەبدوسسەمەدخانی برای لە لایەن جێنشینیمیرەوە چوونە هانای محەممەدخان و پاراستنی قەلای ئێرەوان و هێزەکانی بەرکێفی خۆشیان برد. ئەوەی راستی بێ ئەم محەممەدخانە لە دلی خۆیدا هەردک دەولەتی ناخۆش دەویستن و دەیبوغزاندن، بەلام بەرواڵەت و بەپێی هەلومەرجی رۆژگار خۆی بە فیداکار و سەر بە دەولەتی مەزنی ئێران نیشان دەدا، هەروەک لە باسی سەبارەت بە تسیتسیانۆفدا ئاماژەیەکی پێکرا.

بەکورتی جەعفەرقولیخانی دونبولی کە بەرەو ئێرەوان ئەسپی تاو دابوو و بە هەوای سەرکردایەتی دەفڕی، لە مەودای رێیەدا بیستی کە قۆشەنی ئێران بێئەوەی بە هرووژمی ئەو بزانن لە لێواری رووباری ئاراس بنەیان داگرتووە. خانی دونبولی لەبەر خزمایەتی لەگەل محەممەدخانی حاکمی ئێرەوان شەری ئەو مەلبەندە و عەسکەرخانی خستە ئەستۆی گۆداویچ و سەری رکێفی بەرەو سپای ئێران وەرگێرا. خانانی قاجار و سەرکردەکانی لەشکر وەختایەک بە هاتنی لەنەکاوی جەعفەرقولیخانیان زانی ئامادە بوون بۆ لێکدان و بەرەنگاری. کاتێک هێزەکانیان تێکهەلەنگووتن، لە بالی ئێرانەوە پەرویزخانی چەرداوەروو کە پیاوێکی ئازای بەجەرگ بوو وەکوو شێر، بوو بە پێشەنگی شەرگە و بەراستی ئەوەندەی دەستوبرد و چالاکی نواند کە شەوانەی تەماشای شان و باهۆ و دەست و مەچەک و برستیان دەکرد، بە سەرسوڕماوی شەنگوستی خۆیان دەگەست و دەیانگوت هەی ماشەللا. بەلام لەو لاوە جەعفەرخانی دونبولی کە بۆ نەترسی و پالەوانەتی بەناوبانگ بوو، وێرای بۆلەسوارێکی شەڕدیدە هەلیدەکردە سەر سپای قاجار و هەر جارەی برێکی پێدەدا و مەردایەتی

دەخستەڕوو. پیرقولیخانی قاجار و مەهدیقولیخان و سمایلخان کە بە ڕیز سەرکردەی باڵی ڕاست و چەپ و جەرگەی سپا بوون، خۆیان لەبەر گوڕمی پەلامار و ئاورپڕژاندنی تۆپی چیارمێن بۆ ڕانەگیرا و هەوسارییان بە دەستەوە نەما و بە ڕاکەڕاکە هەڵاتن بۆ لێواری ڕووباری ئاراس و دەنگۆی هاتهاتی سپای ڕووسان ئەوەندەی دیکەی ورە پێبەردان.

ئێستا با گوێبستی تۆزقاڵێک قسە بین سەبارەت بە عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی.

لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا کە جەعفەرقولیخان شەڕی ئێرەوانی خستە ئەستۆی سەرداری ڕووسیا و ئەویش ئەمیرئەسلانخانی برای جەعفەرقولیخانی دونبولی کردە سەرکردەی کۆمەڵێک لە سوارانی قازاخی مەردگەوزێن و سەفدەر و گالی دا بۆ شەڕی ئێرەوان و بەرەنگاربوونەوەی سوارانی ئەفشار و سپای ئێران. ناوبراو هەر کە گەیشتە بەرەوڕوویان هەڵیکردە سەریان و شەڕێکی قورسیان لە مابەینیدا قەوما. پێشەنگی سوارانی ئەفشار کە محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو بوو لە گەرمەی تێکهەڵچووندا سوارێکی قازاخی بە زەبری نێزە لەسەر خوانی زین هەڵداشت و لە خۆڵی گەوزاند. خودامرادی نۆکەری عەبدوسسەمەدخان هەر بەو دەستوورە دوو قازاخی تەخت کردن و خودی عەبدوسسەمەدخانیش کە بەڕاستی شێری مێشەی پەنجەوەشێنی و پیاوێکی کارامە بوو، هێرشی بەگوڕمی بردە سەر ڕیزەکانی سپای ئەمیرئەسلانخان.

ـورتی ئاگری شەڕ و لێکدان بە چەشنێک هەڵاییسا کە پیاوانی دەسکەرەوە بە زەبری شیری مووکار و بە فیشەکی تفەنگی ئاوربار، خاکی ژیانی زۆر کەسیان بە دەم بای نەماندا دەدا. لەم جەنگەیەدا کە هێندەی نەمابوو شنەی سەرکەوتن پرچی ئاڵای خەزاکەرانی ئەفشار بشەکێنێتەوە، لەناکاو هەواڵی شکان و ڕەوینی ئەمیرانی قاجار لە حاند جەعفەرقولیخان لە نێو ڕیزەکانی سپای ئەفشاردا بڵاو بۆوە و ترس و سامێکی سەیر دایگرتن. ئەم خەبەرە ئەوەندەی تری ورەی

ئەمیرئەسلان‌خان بەرز کردەوە و سەرلەنوێ شەڕ هەڵگیرسایەوە و سوارانی ئەفشاری بەرکێفی عەسکەرخان بەزین. لەم هەلمەتەدا محەممەدباقربەگی کوڕی شاوێردی‌بەگی قەرەئاغاجی گیرا و خودامرادبەگ و کەربەلایی حەسەن‌مراد و سوارە بە گوللەی گەرمەوە چوون و چەند کەسێکی دیکە کە ناویان نادیارە بە دیل گیران و کەوتنە بەردەستی قازاخان.

دەڵێن دوای ئەوەی تاقمێک لە بەخسیرانی سوارانی ئەفشاریان بردوونە لەشکرگای ڕووسیا، جەعفەرقولی‌خان کەوتۆتە بەین و بێ‌ئەوەی دەستیان بکەنێ قوتار بوون و چوونە مەڵبەندی ئێرەوان.

بەکورتی گۆداویچی سەرداری ڕووس دوای بیستنی ئەم سەرکەوتنە بەرچاوانە و شکانی ئێرانییەکان بە دڵی ئاسوودەوە خۆی لە گەمارۆی ئێرەوان خۆش کرد و محەممەدخانیش کەوتە قەڵاداری. وەختایەک ماوەی گەمارۆ بڕێکی درێژە کێشا، شوێنەواری قاتی‌وقڕی و بڕانی پاشەکەوت لە نێو هۆردووی ڕووسیادا خۆی نواند. بەناچار گۆداویچ داوای کرد کە لە تفلیسەوە ئازووخە بنێرن بۆ لەشکرەکەی. حاکمی تفلیس خورد و خۆراک و جبەخانە و کەل‌وپەلێکی زۆری هاویشتە سەر بانی عارەبانان و وێڕای سێ‌هەزار سالْدات و سێسەد سواری تفلیسی و گورجی و حەڤدە تۆپ بە ڕێگای «پەنبەک»دا بەڕێی کردن بۆ ئێرموان.

## باسی ڕاسپێردرانی عەسکەرخان بۆ ڕێگرتن لە چوونی ئەو سپایەی کە ئازووخە و جبەخانەی ڕووسی دەبرد بۆ گۆداویچ

کاتێک هەواڵی سەرکەوتنی ڕووسیا و شکانی ئێرانییەکان و گەیاندن و ڕاگواستنی ئازووخە لە تفلیسەوە بۆ ئێرەوان بە خزمەت جێنشینیمیر ڕاگەیەندرا، خێرایەکی محەممەدخانی کرمانی بە خۆی و سوارانی بەرفەرمانی نارده لای عەسکەرخان کە پێکەوە ڕەوگەی چوونی سپای ڕووسیا بگرن و نەهێلن بار و بارخانە و کۆمەگ بگاتە دەستی گۆداویچ. بەپێی فەرمان محەممەدخان لە نیزیک مێرگ و چیمەنی ئۆردووباد گەیشتە عەسکەرخان و شانبەشان ڕۆیشتن و لەپڕ لە دەوروبەری دەفەری پەنبەک دابەزین و بنەیان داکوتا. عەسکەرخان لە دەستەی قۆشەنی ئەفشار محەممەدسولتانی سەرکردە و محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو کە پیاوێکی چوست و چالاک و وریا بوو ناردنی کە بڕۆن و تێبفکرن و خوردبنەوە و بزانن چەکدارانی ڕووس ژمارەیان چەندە و گەیشتوونە کوێ و هەواڵی ڕاست و دروست بێننەوە. ئەم دوو کەسە هەر ئەو شەوە ڕۆیشتن و لە نیزیک سپای ڕووسیا خۆیان وە کەنارێنی دا و تەماشایان کرد کۆچیان لیناوە و بەرەو ئێرەوان کەوتوونەڕێ. لەبەروەی مانگەشەو بوو هەموو شتێک بە وردی دەبیندرا. محەممەدحەسەنبەگ حەڤدە تۆپ و سێ هێزی تەیار و پەرداخی ـ ردن کە لە نێو تۆپخانەدا وردەوردە و بێهەستوخوست و گوێقولاغ دەڕۆیشتن. سوارانی قازاخ و تفلیسی لەو بەرەوبەریان ئەسپیان دەئاژۆت و نێزەی تیژیان بە چنگەوە دەترووسکا و زۆر ڕێکوپێک و بەپارێز ڕێیان دەبڕی. محەممەدسولتانی باسکراویش بە مەودای تیرهاوێژێک لەگەڵیان ڕۆیی و لای بەیانی ئەسپی تاو دا و چۆوە کن عەسکەرخان و ئەوەی دیتبووی گێڕایەوە. عەسکەرخان ئافەریمی لێکرد و لە داوێنی دەربەند ڕیزی سوارانی

دامەزراند و بەرەگەی لێبرینەوە. محەممەدخانی کرمانی لــە دەستی راسـت دانــا و عەبدوسسەمەدخانی برای راسپارد بۆ باڵی چەپ. لەپڕێ گـەرد و تـۆزی لەشکری رووسیا رووبەری دەشتی داگرت و تـاری هەڵـگیرا. ئەوسـا سـوارانی ئەفشار و کرمانی بە فەرمان و ئاماژەی عەسکەرخان ویکرا بە کۆمەڵ شـالاویان بردە سەر سپای رووسیا. لەشکری رووس بە دیتنـی ئـەم دیمەنـە لـە زورنـا و کەڵەشاخیان توورراند و رووی حەڤدە تۆپی ئاورباریان بەرەو سوارانی ئەفشار و کرمانی وەرسووڕاند. لەو کاتەدا محەممـەدخانی کرمـانی ویـستی ئازایـەتی و قارەمانەتی بنوێنێ و بێ چاوترووکان ئەسپی بـەرەو تۆپخانەی رووسان لینگ دا و تەمای وابوو نەکشێتەوە و دەستی بە سەردا بگـرێ. پاسـەوانانی تۆپخانـە بەجارێک تۆپەکانیان ئاور دا و دووکەڵی تۆپەڵەی گوللــە تۆپــان لــە مەیـدانی شەڕگەدا چەتری ئەنگاوت و سەری عەقڵی سوڕماند و بەرچاوی تاریـک داهێنـا. محەممەدخانی کرمانی لەبەر پریشکە و دووکەڵی تۆپان سەری لێشێوا و رێگای هەڵە کرد و بە هەڵەداوان گەڕایەوە. وەختایـەک تـەپوتـۆز رەوی دیـسان بـە دەستووری پێشوو ئەسپی هەتا نیزیک تۆپەکان تاو دا. بەڵام هیچی بۆ نـەکرا و بایداوە. ئەو کات عەسکەرخانی کارزان ئـاوزەنگی بـەتاڵ کـرد و لــە جەرگـەی سوارانی ئەفشاردا راوەستا و رووی کردە سەرلق و سەرپەلەکانی و گوتی بـێ و نەبێ لێـرە هەڵـنایەم و ئەگـەر ئـەم پاشـەکەوت و بارخانـە و شـتومـەک و تەقەمەنییانە لە چەنگمان دەرچن و بگەنە دەستی گۆداویچی سەرکردەی رووس، لێمسوور و ئاشکرایە کە سەری عەسکەرخان بە فەرمانی پادشای «جەم»تاج لـە قەلای قەلافەت دەکرێتەوە و بێجگە لەمەش خێڵی ئەفشار هەتا دنیا بە دنیایە لە نێوان هۆز و عێلاندا سەرشۆڕ و بەدناو دەبێ و جێی خـۆی ناگرێتـەوە. کاتێـک عەبدوسسەمەدخانی پاڵەوان کاکی بە پێیان لە نێـو سـوارانی ئەفـشاردا چـاو پێکـەوت، لــە باڵــی چەپــەوە وێــرای چەنــد سـوارەیەکی ئەفـشاری وەکـوو محەممەدحەسەنبەگی مـەحموودلوو و بـەدەلبـەگی لەشـەنلوو و شـابازبەگی

گۆندوزلوو هەڵمەتیان بردە سەر تۆپخانەی رووسیا. سەرتۆپچی رووس بە دابی پێشوو تۆپەکانی ئاگر دان و وەختایەک گرمەی تۆپان بەرز بوونەوە و دووکەڵ لە وڵاتی گەڕا، عەبدوسسەمەدخان و یارانی خۆیان کەنار دا و کە دیسان دووکەڵ و تۆز نیشتەوە دلێرانە هەڵیانکردە سەر تۆپخانە و سەرتۆپچی ناشی بە شالاوی سواران دەست و پێی لێتێکچوو. خانی ئەفشار هەڵیکردە سەری و نێزەیەکی لێدا و ئەو تێژبەزە ئاورپژێنەی لە خاکی نەمان گەوزاند. لە پشتەوەیڕا محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو بە شیری رووتەوە گورمی بەست و ئەو دوو قارەمانە پێکەوە حەوت چەکداری رووسیان بەرەو هەرێمی نەبوون ڕادان. سوارانی ناوداری ئەفشار دوابەدوایان هەڵقولین و تەنووری شەر نێڵ درا. لەم گرمە و هەرایەدا شابازبەگ بە فیشەکێک ئەنگوا و کوژرا. بەکورتی دوای هەوڵ و هەڵسووڕانێکی زۆر سوارانی ئەفشار سەرکەوتن و دەستیان کرد بە تالانوبڕۆ. ژمارەی کوژراوانی رووسیا و تفلیسی ئەم تێکهەڵچوونە بە سێهەزار کەس دانراوە. ئەوەی چاک بوو کە عەسکەرخان بەر لە پێکهەڵپرژان شێست سوارەی ئەفشاری لەسەر ڕێگای دەربەند سەلاس دابوو کە ڕێگای تێپەڕینی خەنیمیان تەنیبوو. هەر کەسێکی سپای رووسیا کە ڕایدەکرد و بە سەریاندا دەکەوت دەکوژرا. کاتێک ڕاستی و دروستی ئەم سەرکەوتنە بەرچاوە بە گوێی بالادەستانی بارەگای پادشایەتی ئاشنا کرا، تێکڕای ئەم سەرۆک و سەرکردانەی لەوێ خۆیان نواندبوو بە دیاری و خەلاتی میرانە بەسەرکرانەوە و گەشانەوە. گۆداویچی سەرداری رووسیا کە پاشەکەوت و تەقەمەنی و هانادەر نەگەیشتنە لای، بەناچار دەستی لە گەمارۆی ئێرەوان هەڵگرت و بە شەرمەزاری و خەسارباری گەڕایەوە رووسیا. عەسکەرخان دانرا بۆ پاراستنی قەلاتی ئێرەوان. ئەم بەسەرهاتەی کە نووسرایەوە لە زەمان محەممەدسولتانی ئەفشاری ئەرەشلووی ورمێوە گێڕدرایەوە.

❖❖❖❖

# گیرانی محەممەدخان و ڕەنجانی عەسکەرخان و دووبەرەکایەتی نێوانیان لەگەڵ بەگەربەگ

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا عەسکەرخان دوای ڕۆیشتنی گۆداویچی سەرداری رووسیا، داندرا بۆ پاراستنی ئێرموان و سنوورەکانی. جا چونکە مەلی دڵی بێوەفای محەممەدخان لە دەروونی خۆیدا هەوای کەمەندی دەوڵەتی مەزنی ئێرانی هەڵبواردبوو و بەڕواڵەت لە پەساری حکوومەتی رووسیادا ماتەی هەڵگرتبوو، عەسکەرخان بە تەگبیری باش و بەجێ دەرگای هاتوچۆ و دۆستایەتی بۆ خستە سەر پشت و لە بابەت بەسترانەوەی بە دەوڵەتی گەورەی ئێرانەوە دڵنیای کردەوە. وای لێهات کە لەسەر ئیزنی محەممەدخان وێرای چەند کەسێکی باوەڕپێکراو چوونە قەڵا و بە نەهێنی دیداریان لەگەڵ کرد. دوای ئەوەی کە ناوبراو بە پەند و ئامۆژگاری هاندەرانە و بێ خلتەوخاڵی عەسکەرخان بە لانی دەوڵەتا هیوادار کرا، پێکەوە لەگەڵ عەسکەرخان چوونە ژێر پێچکی کەژاوەی عەبباسمیرزای جێگرەوەیمیر و گەلێکیان دیاری برد و لە هەباساوا بە خزمەتی گەیشتن. کەچی حوسێنخانی سەرداری قەزوینی و حەسەنخانی برای ناسراو بە ساریئەسلان و سەفەری غازی کە پێشتر حاکم و پارێزەری ئێرەوان بوو، لەم کاتەدا بەپێی فەرمان چوونە نێو قەڵای ئێرموان و محەممەدخانیان بە ماڵ و کۆچ و خاوخێزانەوە بە دەسبەسەری راپێچەک دا بۆ تاران. هەر بۆیە عەسکەرخان بە دیتنی ئەم حاڵ و ڕۆژە بە خۆیدا شکایەوە و هیوای نەما و لە بارەگای پیرۆز کشاوە و نەیدەزانی کە لە کۆنەوە گوتوویانە: ڕەخنە گرتن لە گەوران هەڵەیە!

بەکورتی دوای ئەم ڕووداوانە کاروانی کەژاوەی شازادەی جێگرمووەیمیر بە تەنتەنە و شەوکەتەوە لە «هەباساوا»وە ڕووی کردە چیمەنی «یام»ی تەورێز. ئەمیرخانی سەردار بۆ پاراستنی قەراخ چۆمی ئاراس ئەسپی دەنگ دا و عەسکەرخان لە مێرگوڵانی «یام»ەوە ئیزنی گەڕانەوەی درا بۆ ورمێ. هەر لەم سەروبەندەدا حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ، مەحموودخانی قاسملووی ئازاد کرد کە ماوەی چاردە مانگ گیراوێکی بەڕێز بوو! ئەوسا ڕاپەڕاندنی کاروباری گرینگی وڵاتی دایە دەستی لێوەشاوەی.

هەر لەم ساڵەدا ڕۆستەمبەگی گورجی لە لایەن شازادە عەبباسمیرزاوە بۆ کۆکردنەوەی تیپێک سەرباز لە خێڵی ئەفشار هاتە ورمێ و سپای سوارە کە لە ژێرڕکێفی عەسکەرخاندا بوون، درانە دەست ئیمامقولیخانی دووەم ناسراو بە بیووکخانی کوڕە گەورەی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ و بەپێی فەرمان چوون بۆ پاراستنی نەخجەوان. بەڵام عەسکەرخان کە هاتەوە مەڵبەندی ورمێ هەموو دەسەڵاتێکی لێئەستێندرابۆوە و خانەنشین کرابوو! لەبەر فیتنەگێڕانی کەسانی غەرەزاوی نێوانی عەسکەرخان و بەگلەربەگ وا سارد بۆوە و کار گەیشتە جێیەک کە هیچکەسێکی مەڵبەندەکە هاتوچۆی نەدەکرد، بێجگە لە بابابەگی عەرەبلوو، محەممەدعەلیبەگی بەکەشلوو ومحەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو. سەرەنجام عەسکەرخان سکاڵانامەیەکی نووسی بۆ میرزا ئەبولقاسمی قایممەقام و بە عەلیمحەممەدئاغای عەبدولمەلیکی خزمی خۆیدا ناردی. لە لایەن بەگلەربەگیشەوە میرزا ساڵحی ئۆستاجلوو و میرزا هەمزەی گۆندوزلوو چوونە چیمەنی «یام»ی تەورێز و نامەی ئەو پایەبەرزەیان دایە خزمەت جێنشینیمیر کە باسی خەتاکانی عەسکەرخانی تێدا کرابوو. وا داندرا کە میرزا ئەبولقاسمی قایممەقام لە نامەی هەردکیان بکۆڵێتەوە و پاشان بە خزمەت شازادەی ڕابگەیەنێتەوە. پاش توێژینەوە و پێداچوونە فەرمانی موبارەک دەرچوو کە هەردووکیان بچنە خزمەت فەرمانڕەوا. دوای گەیشتن و زیارەتی فەرمانی

شازادە، عەسکەرخان وێڕای ئەو سێ کەسە باوەڕپێکراوەی خۆی کە پێشتر باسیان کرا و حوسێنقولیخانی بەگلەربەگیش لەگەڵ مەزن و ماقوولانی خێڵی ئەفشار بەشان و شەوکەتی شایانەوە لە ورمێوە بزووتن و لە مێرگ و چیمەنی «یام» گەیشتنە بەر سەراپەردەی بەرزی. کاتێک بەگلەربەگ و عەسکەرخان بە جووت لە خزمەتیدا حازر کران و لە رووی راستی گرفتەکان کۆڵدرایەوە، جێگرموەیمیر و وەزیر بۆیان روون بۆوە کە هەرچی هەیە و لە گۆڕێدایە درۆ و هەڵبەستی بێبناغەی دووزمان و دووڕووی کەتنکەری مەڵبەندی ورمێن! هەر بۆیە گوێی بۆ قسەی هیچیان رانەداشت و قایمەقامی بەڕێز راسپێردرا کە ڕێکیان بخاتەوە و ئاشتیان بکاتەوە و بیاننێرێتەوە ماڵی خۆیان و هەر ئاواش کۆتایی پێهات.

# نێردرانی عەسکەرخان وەکوو باڵوێز بۆ فەرانسە

لەم سەروبەندەدا فەرمانێک لە تارانی پایتەختەوە نێردرا بۆ جێنشینیمیر کە عەسکەرخان وەکوو باڵوێز بەرێبکا بۆ فەرانسە. عەسکەرخان هەلەکەی بە لەبار زانیٚ و سەرکردایەتی سوارانی ئەفشار کە درابوویە دەست ئیمامقولیخانی دووەم، داوای کرد بۆ عەبدوسسەمەدخانی برای و نازناوی «خان»یشی بۆ نەزەرعەلیبەگی برازای کوڕی میرزا محەممەدشەفیعی برای خستە سەر. هەردک داوای لێقبووڵ کران و پێیان‌بەخشرا. دیارە تەواوی ئەم کارانەش بە هاوکاری میرزا ئەبولقاسمی هێژا کە بەدڵ عەسکەرخانی خۆشدەویست بە ئاکام گەیشتن و هەروەها لەمێژینەبوونی خزمەتەکانی عەسکەرخانیش وەبەرچاوی مەزنەپیاوانی حکوومەت گیرابوون. پاش ئەم کارانە عەسکەرخان، محەممەدحەسەنبەگی مەحموودلوو کە یەکێک لە سەردەستەکانی سوارانی سکۆرتێ و خزمیشی بوو، لەگەڵ خۆی هەڵیگرت و زۆر بەپرتاو رووی کردە سەر سنووری چۆمی ئاراس و نەخجەوان، چونکە عەبدوسسەمەدخان نێردرابوویە نێو ریزی هێزەکانی پارێزەری نەخجەوان. بەکورتی وەختایەک خەلات و فەرمان گەیشتە هۆردوو ئیمامقولیخانی دووەم ناسراو بە بیووکخان تەپڵ و ئالای ئەسپاردە دەستی عەبدوسسەمەدخان و خۆی گەڕایەوە ورمێ و لێرەوە بادەدەینەوە سەر رووداوەکانی ئەم مەڵبەندە.

بەڵێ وەختایەکی کە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ بەپێی داواکران دەچوو بۆ «یام»، نەجەفقولیخانی کوڕی کرابووە بریکار و لەسەر کورسی دەسەڵاتی دانابوو. مەحموودخانی قاسملووی هەڵبژاردبوو بۆ کەیخودا و ریش‌سپی وڵات و میرزا عەبدوڵلای کوڕی میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی خوابەخشیوی وەکوو دەمڕاستی حیسابات دیاری کردبوو. ئەم دوو کەسە پێکەوە لە ژێر فەرمانی بریکاری حکوومەتا کاروباری گرینگی دەسەڵات و مەڵبەندەکەیان رادەبەراند. وا

هەڵکەوت کە تاقمێکی قەڵەوقوتە و گورگەمێش و چەپەڵکاری ورمێ هەڵەکەیان بە لەبار زانی و مەیدانیان بە چۆڵوهۆڵی هاتە بەرچاوی و دەستیان کرد بە دزی و راووڕووت و ئاژاوەنانەوە و شەوانە خۆیان بە دووکان و ماڵی دەوڵەمەندانی بازاڕدا دەکرد. هێندەیان شوو لێهەڵکێشا کە شەوێکی کەمەندیان هاویشتە چواربورجی ڕەزاقولیخانی و لێیوەسەرکەوتن و لەو جەنگەیەدا نیگابانەکانی سەرای حوکمڕان و بورجیان پێیانزانی و گرتیانن و بەیانی هەموویان بردنە هەوێڵ نەجەفقولیخانی دووەمی بریکاری حکوومەت. بە فەرمانی بەڕێزیان و مەحموودخانی ڕیشسپی، قاسمی میرغەزەب هەر چواری خنکاندن. لات و شەلاتێک کە ناوی «تووتی» بوو لە دەروازەی بالوو، «ڕەحیم»ناوێک لە دەروازەی هەزاران، «سەردار»ناوێک لە دەروازەی یوورتشا و یەکیش بە ناوی «ئەڵڵاوێردی» لە دەروازەی هیندوو کە عەسکەرخانی ئێستایە هەڵاوەسران.

دوو ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ گەڕایەوە ناوەندی دەسەڵاتی. عەسکەرخان کە وەکوو بالوێز دەچوو بۆ پاریس لە تەورێز ئیزنی خواست و سەرەتای مانگی موبارەکی ڕەجەب گەیشتە ورمێ هەتا لە دووەمی مانگی شاباندا وەرێکەوێ کە لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ.

عەسکەرخان بە دەستی پڕی شاهانەی شاپانەوە دەڕۆیی و ئەو دیارییە بەرچاوانەی کە دەیبردن بریتی بوون لە شمشێرێکی گەوهەربەند کە دەیانگوت شیری میر تەیمووری گوورەکانە و کوتێک لەعلی گەورەی ورشەدار کە تای لە خەزێنەی هیچ پادشایەکدا نەدیترابوو. دەڵێن هەتا ئەو دەم بالوێزێکی ئاوا بەشەوکەت و بە بارگەی پڕ زێڕ و زەمبەرەوە لە لایەن دەوڵەتی بەرزی ئێرانەوە نەچووبوو بۆ وڵاتانی دۆست.

❖❖❖❖

## سەرهەڵدانی خێڵاتی سەرسنوور و سکاڵای خەڵک لای جێنشینیمیر

لە درێژەی ساڵی ١١٢٢ی کۆچی/١٨٠٧ـ١٨٠٨ی زایینیدا، سمایلئاغای سەرۆکی خێڵی بشکوفتی بە هەوای قایمی و پەنەوی قەڵاکەی خۆی کە لەسەر چیایەکی باڵی ڕۆژاوای گوندی نازلوو و سێنجی هەڵکەوتووە و بە دەستی سمایلئاغا سازکراوە و لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ، کەوتە هەڵتۆزەڵتۆز و سەرهەڵدان. سەرخێڵی بشکوفتی لەگەڵ کۆمەڵی کوردان ڕامالی بردە سەر لادێکانی ناوچە و خۆی لە تالانوبڕۆ نەپاراست. قاسمسولتانی مەزنی عێلی زەرزاش لە شنۆوە جەماوەرێکی زۆری کۆکردەوە و پەلاماری ناوچەی «دۆڵ»ی دا و هەرایەکی سەیر مەڵبەندی ورمێی گرتەوە. لەو لاشەوە قەڵەمدارانی دیوانی باڵا لە کۆکردنەوەی باج و پیتاک و سەرانەدا زۆریان پێ لێهەڵێنا و خەڵکیان کرووساندەوە. کەیخودا و پیاوماقووڵانی ورمێ هاواریان بردە بەر حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ. جا چونکە بیستنی ئەم داد و سکاڵایە و پێڕاگەیشتن و نەهێشتنی زوڵم و دەستدرێژی دەکەوتە بەر چۆنیەتی حوکم و پارسەنگڕاگرتنی بەرپرسانی گەورەی حکوومەت، بەگلەربەگ مەحموودخانی ـملووی کارگێڕی ورمێی بۆ ڕاگەیاندنی هاواری خەڵک ناردە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات. جێنشینی پایەبەرزی میر خێرایەکی میرزا محەممەدعەلی ئاشتیانی ناسراو بە ئەشکەبۆس کە سەرۆکی دیوانی دارایی بوو ناردی بۆ کەم کردنەوەی سەرانە و پیتاک و سەنگوسووکی پێکردنی و بەرپەرچدانەوەی داپڵۆسینی کۆمەڵ. هەروەها برایمخانی بادکووبەیی کە تسیتسیانۆفی کوشتبوو بەرێی کرد بۆ وەرگرتنەوەی ماڵ و سامانی تالانکراو و چاوەدێری خێڵ و خەڵکی

ورمێی پێ ئەسپارد. بەڵام چونکە هاتنی ئەم دوو کەسە نەک نەیتوانی بارودۆخەکە هێور بکاتەوە و دادی جەماوەر بدا، بەڵکوو هەڵومەرجەکەی پتر شێواند، کاربەدەستانی مەڵبەند و ڕیشسپی خەڵک و خێڵات لەسەر ئیزنی بەگلەربەگ پێکەوە چوونە تەورێز. شاندەکە سکالایان بردە بەر دەرگانەی شازادەی جێگرەوەی میر و دوای داد و هاوارێکی زۆر و وەباڵ بۆ کێشانی بریکاری بەڕێزی حکوومەت و بە باش زانینی گەورەپیاوانی دیوانی شکۆمەندی چەشنگەردوونی[عەبباس میرزا]، پیتاکی شاری ورمێ و ناوچەکانی بە ویشکەپووڵ و ویشکەماڵ بە بڕی بیستوحەوتهەزار تمەنی تەورێزی و حەوتهەزار خاڵوار دەغڵودان بڕایەوە. سەرلەنوێ شازادە حوکمی نووسی بۆ حوسێنقولیخان کە لەشکر بەرێتە سەر سمایلئاغای سەرخێڵی بشکوفتی و قاسمسولتانی زەرزای حاکمی شنۆ و ماڵی تاڵانکراوی لادێکانی ورمێ بستێنێتەوە. هاواربەرانی سکالاکار بە شادی و کامەرانی گەڕانەوە مەوتەنی خۆیان.

برایمخانی بادکووبەیی و میرزا محەممەدعەلی ئاشتیانی (ئەشکەبۆس) پاش لێبوونەوە لە کارەکانیان بەپێی فەرمانی شازادە گەڕانەوە تەورێز. هەر لەم ساڵەدا لقێک سەرباز کە بریتی بوو لە هەزار کەس بە هەوڵ و هەڵسووڕانی بەگلەربەگ پێکهات و خرایە بەرڕکێفی ڕۆستەمخانی گورجی و بە لقی[١] حەوت ناودێر کرا.

---

[١] لە زمانی کوردی دا «لق» یان «لک» هەر یەکن. لەبری «فەوج» دامناون.

## گەڕانەوەی عەسکەرخان لە پاریسەوە و تکای ئازاد کردنی ژمارەیەک لە کوڕان و کچانی بەگلەربەگانی پێشوو

جێژنی نەورۆزی سالی ۱۲۲۳ی کۆچی/ ۱۸۰۸ ـ ۱۸۰۹ی زایینی، لە خزمەت شازادەی جێگرموەی‌میردا بە شەوکەت و ڕێوشوێنێکی پاشایانە بەڕێوە چـوو. هەرکام لە سەرداران و حاکمانی ناوچە و مەڵـبەندەکانی ئازەربایجـان کـە لـە هەوێڵدا بـوون، [عەبباس‌میرزا] بـــە خـــەلاتی تـــازە و لـوتفی بـێ‌ئـــەندازە بەسەری‌کردنەوە. بۆ وێنە خـەلاتێکی شـیاوی بـاربووی حوسـێن‌قولـی‌خـانی بەگلەربەگ فەرموو کە پێشتر نەجـەف‌قولـی‌خـانی کـوڕی، حـاکمی ناوچـەی هەستبزوێنی ساین‌قەلای دانابوو لە جێی خۆی و هاتبوو بـۆ ژێردەرانـە مـاچ کردنی و پاش دیاری کردنی ڕێوشوێنی کاروباری مەڵبەندی بن‌دەسەلاتی، ئیزنی دا و ناردییەوە. لەو سەروبەندەدا عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی کە وەکوو باڵوێز نێردرابووبە پاریس، گەڕایەوە و بـە خزمـەت شـازادەی بـەرزمجێ گەیـشت و تـەواوی ئـەو دیـاری و شتومەکە جوانانـەی کـە لـە پاریـسەوە هێنـابوونی نیشانی دا و لەوێوە ئیزنی وەرگرت و بەرەو تـارانی پایتـەخت ئـاژوا. کاتێـک گەیشتە قەزوێنی ناوەندی دەسەلات چاوی بە کۆمەڵـێک لـە کـوڕان و کچـانی بەخشیو ئیمام‌قولی‌خانی سەردار و محەممەدقولی‌خانی بەگلەربەگی پێشووی ئەفشار کەوت کە وەکوو بارمتە ڕاگیر کرابوون و کاغـەزێکی لێـوەرگرتن هـەتا وەختایەک شانازی چوونە دیداری ترووسکەداری خاقـانی پایەبـەرزی پێبـرا، بیخاتە بەرچاوی موبارەکی و بۆ ڕزگاربوونیان داپاڕێ. بەکورتی پـاش ئـەوەی گەیشتە خزمەت پاشای گـەورە بـە چەشـنێک بەسـەری‌کـردەوە کـە تـەواوی حوکمڕانانی هەرێمەکانیش ئاواتی بۆ دەخوازن و لە هاوشانەکانیشی تێپەڕاند و

چاوی ئیرەیی و تاسەباری هەموویانی بە مۆلەق وەستاند. عەسکەرخان لە نێوبەندی قسەکانیدا کەم و زۆر نامەی فرزندانی ئیمامقولیخان و محەممەدقولیخانی خستە بەر دیدەی موبارەکی و تکای بۆ کردن کە چی دیکە لە قەزوێن رانەگیرێن. هەر لەرێوە داواکەی لێقبوول کرا و بەگوێرەی فەرمانی پادشا حوکمی ئازادی حەولادەکانی ئیمامقولیخان نووسرا کە بڕۆنەوە مەوتەنی خۆیان. عەسکەرخانیش چۆوە ورمێ و سالی داهاتوو لەگەل سوارانی بەرێکیفی خۆی رووی کردە لێواری چۆمی ئاراس و کەوتە پاراستنی سنوور.

یەکێک لەو کەسانەی کە وێڕای عەسکەرخان بەرەو ورمێ بزووت لوتفعەلیخانی کوری چوارەمی ئیمامقولیخانی تۆرەمەی رەزاقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار بوو. وەختایەک گەیشتنە تەورێزی و شانازی دیداری جێگرەوەی‌میریان پێبرا و شازادە شوێنەواری وریایی و لێوەشاوەیی بە نێوچاوانییەوە دیت، دەستووری فەرموو کە پێنسەد سواری ئەفشار لە هێزی سوارە بخرێتە بەرێکیفی لوتفعەلیخان و پێنسەدی دیکەش بدرێنە دەست عەبدوسسەمەدخان. هەروەها رەحمەتوللاخانی گێزازی بە مەبەستی وەرگرتنی چەند کەسێکی تۆپچی رووی کردە ورمێ و ئەم پۆلە هەموویان وێڕای عەسکەرخان بزووتن و هەرکام ئەرکی سەرشانی خۆیان راپەڕاند. لەو سالەدا قۆشەنی ورمێ بە تۆپچی و سوارە و سەربازەوە ٢٢٢٠ کەس بوون.

## پەلاماری تۆرمۆسۆفی سەرداری رووس و سەرکەوتنی شەرکەرانی ئەفشاری ورمێ

هەر لە درێژەی ئـەم سالـەدا هەوالـی هـرووژم و هێرشـی تۆرمۆسـۆفی سپاسالاری رووسیا کە بە مەبەستی تێهەلێنانەوە و ئەسترینەوەی سـووکایەتی راکردنی گۆداویچ نێردرابوو، لە ولاتی ئێـراندا بـلاو بـۆوە و گوتیـان کـە بـە نۆهەزار سالداتەوە بەرەو موغان داکشاوە. هەر بۆیە شـازادەی جێنـشینیـمیر دوازدەهەزار سوارە و پیادەی سـپای نـوێی ئازەربایجـانی هەلـبژارد و نایـنـە بەردەستی کابرایەکی ئینگلیسی کـە راهێنـەر و مامۆسـتای هێـزە نەبـەزەکانی ئێرانی بوو. بۆ وێنە لقی حەوتی ئەفشاری ورمێ بە سەرکردایەتی محەممەدخانی قاجار و لقێکی موقەددەمی مەراغەش لە بەرایی لەشکری چەشنی دەریای هاژاودا لووزەویان بەست. کاتێک گەیشتنە موغان و سولتانئاوا تۆرمۆسـۆفی رووسـی «جێنیمیار» کە فەرماندەیەکی پالەوان و ئازا بوو کردی بە پێـشەنگی مەیـدان و بەرگێرەوەی سپای ئێـران و خۆشـی لـە دوو فرسـەخ واوەتـر بنـەی داکوتـا. وەختایەک هێزەکان بەرەورووی یەکتر راوەستان و دامەزران و دەستیان برد بـۆ چەکوچۆلان، لەو جەنگەدا [ئەفسەری] راهێنەری ئینگلیسی کە چاکی لە فـێل و فەندی شەر دەزانی، تۆپـەکانی بـەرەورووی جبەخانـەی رووسـان دابەسـت و فەرمانی دا کە بەجارێک بیانتەقێنن. تەقینەوەی گوللـەتۆپان ئـاگری بەردایـە جبەخانەی رووسیا و سەرپاکی سووتاند. لـــە بـــالی چەپیـشەوە دوو لقـەی ئەفشار و موقەددەم هەنگاوی ئازایانـەیان هاویـشت و خۆیـان لـە گیانبـازی نەپاراست و ئاخرییەکەی لەشکری رووسان بە سەرشۆڕی و تێشکاوی رایانکرد. بە گوتەی مێژوونووسان لەم تێکهەلچوونەدا شـەشهـەزار چەکـداری رووسـیا

کوژراون و پێنسەد کەسیان بە دیل گیراون، دیارە خودا دەزانێ وایە یان نا. جینی‌میار برینێکی قووڵی هێنا و بە ڕاکەڕاکە بۆی دەرچوو. تۆرمۆسۆفی سپاسالار بە دیتنی ئەم ڕووداوانە ڕووی کردە شاری تفلیس و دوای چەند ڕۆژان دوو سەرکردەی چاوناسی ڕووس بە ناوی «لیستکین» و «کریشکین» سەریان وەبەرڕکێفی [عەبباس‌میرزای] جێنشینی‌میر هێنا. ئەم سەرکەوتنە دیار و بەرچاوە بە ناوی موقەددەم و ئەفشاران داکووژا.

هەر لەم ساڵەدا لوتفعەلی‌خانی کوڕی ئیمامقولی‌خان بەپێی فەرمان لقێکی تازەی بێجگە لە لقی حەوت پێکهێنا کە بە لقی هەشت ناودێر کرا.

# شەڕی لەنکەران و ئەسلاندووز

ساڵی ١٢٢٤ی کۆچی/ ١٨٠٩ ــ ١٨١٠ی زایینی، سەردارێکی رووس بە نـاوی «رۆیشیجۆف» دوای بەزین و تێکشکانی تۆرمۆسـۆف کەوتـە تـەگبیروڕایان و پەیتاپەیتا پیاوی دەناردنە خزمەت جێنشینیمیر و دەپاڕاوە کە با نێوانناخۆشی ببڕێتەوە و تەساڵحە بکرێ. خودی جێگرەوەیمیر لە شـوێنێک کـە پێـیدەڵـێن ئەسلاندووز تەشریفی لەنگەری گرت و چاوەڕوانی هەواڵی شەڕ و ئاشتی مایەوە. کاتێک درۆی بنڕاوی «رۆیشیجۆف» روون بۆوە و شازادەی بەرزەجێ بیستی کە لە لایەن دەوڵەتی رووسیاوە دوو مینراڵ (سـەرهەنگ) وێـڕای نۆهـەزار ساڵـدات راسپێراون بۆ گرتنی لەنکەران و ئەرکەوان و بە سـواری کەشـتی و لۆتکـان بـە دەریادا هاتوون، فەرمانی دا بە ئەمیرخانی قاجار کە ئاڵای سەرکەوتن هەڵبدا و بە دوازدەهەزار کەس و چەند دەزگـا تۆپــەوە بـڕوا بـۆ پاراسـتنی لەنکـەران. محەممەدخانی قاجار بە لکی حەوتی ئەفشارەوە رەگەڵیان کەوت و چونکە لکـی هەشتی ئەفشار کە لوتفعەلیخانی قاسملوو سەرکردەیان بـوو هێـشتا چـاک رانەهاتبوون و لە شێوازی شەڕیان نەدەزانی، کرێشکین راسپێردرا کـە هـەموو رۆژێک هەتا سەری شەو مەشقیان پێبکا و حوکمی بارەگای میری بەڕێوەچوو.

کاتێک ئەمیرخانی سـەردار گەیـشتە دەوروبـەری لەنکـەران، سـەرەتا مستەفاخانی هاشمی ئازایانە هەڵیکوتایە مەیدان و کەوتە بەرەنگاری و چونکـە هیچی بۆ نەکرا وەلاکەوت. ئەوسـا سـەربازانی فیـداکار لـە دەوروبـەری قـەڵا سەنگەری قایمیان دابەستن و کەوتنە پاسەوانی.

ئێستا پێویستە کورتە و پوختەیەک سەبارەت بە رووداوی جگەرسووتێنی ئەسلاندووز بخرێتەروو هـەتا بـزانن کـە کرێـشکینی داخ لـە دڵ چ گۆڵـمەز و هەرایەکی بەراوەژووی نایەوە. ئەگەرچی ئەو بێچاو و روویە بەرواڵەت سـەری

وەبەر پەساری دەوڵەتی مەزن هێنابوو، بەڵام لە ناخی خۆیدا دڵی هەر بۆ حکوومەتی رووسیا دەیکورکاند. بێپسانەوە و پەنامەکی قاقەزی لە سپاسالاری رووسیا دەنووسی کە هێرش بکاتە سەر لەشکری خاوەنشکۆ و دنەی دەدا کە رانەوەستێ. لوتفوڵلابەگی خەلەج سەرلقی لقی هەشتی ئەفشار بە زیرەکی هەستی بەم مەبەستە کردبوو، بۆیە لە گەرمەی مەشق و راهێناندا بە بیانوویەک شمشێری لە رووی کرێشکینی فێڵەباز هەڵکێشا و کار گەیشتە جێی باریک و شازادەی جێگرەوەیمیر چونکە بە دەهۆی ئەو رێویەی نەدەزانی، دوای کوتان و تێهەڵدانی سەرلقەی ئەفشار رایدا بۆ نێو قەرموڵان.

ئەو ناپاکە فێڵەزانە لە رۆژی عارەفەی مانگی قوربانٍدا حوکمی لە سەربازەکان کرد کە لەبری بەرد، تفەنگان پڕ بکەن لە چێو. بەکورتی لە شەوی جێژنی قورباندا کە ئێرانی خەریکی حەسانەوە بوون و بە ئاسوودەیی پالیان دابۆوە، «کۆتلرۆسکی» سەرداری رووس بە لەشکر و تۆپخانەی تۆکمەوە لەبڕ هەڵیکوتایە سەر قۆشەنی شازادەی جێنشینیمیر و کردی بە رۆژی حەشر و حەلەلا لە دەشتی ئەسلاندووز. ئێرانی بە سەرلێشێواوی راپەڕین بۆ بەربەرەکانی و لە جەرگەی شەوی تارا سەفیان بەستن. جەنابی جێگرەوەیمیر چونکە دەیزانی کە تۆپچییەکانی ئازەربایجان بەتایبەت ئەوانی ئەفشار تازەکارن و ئەو جۆرەی پێویستە تۆپیان بۆ ئاهاویژێ و دوژمنیان پێناشکێ و تەنانەت چاکیشیان دەست بۆ ناکرێتەوە هەتا ئەو بەڵا لەناکاوە بڕەوێنن، خودی خۆی داوێنی موبارەکی بە لادا کرد و سێرەی تۆپانی راست کردن و ئاوری دان. تۆپچییانی رووسیا تۆپخانەی خۆیان لەسەر گردێکی قیت دابەست و گوللەی ئاگرینیان وەکوو تەرزەی قورس یان تاوەبارانی مانگی خاکەلێوە بە سەر جەماوەری نێو هۆردوودا رشت. گرمە و هەرایەکیان ساز کرد کە دەتگوت دەشتی ئەسلاندووز سەر کڵی جەهەندەمە و هەر گۆشەیەکی ئاتەشخانەی دۆزەخی بەنێلەیە. خولاسەی کەلام لەو رۆژی جێژنەدا دەست و پێی مسوڵمانان لەجیاتی

خەنە بە خوێن دەرەنگا. لەو بگرە و بەردەیەدا لوتفولڵابەگی سەرلک لە نێو قەرەوڵان دەربەڕی و چەشنی شێری دەرهەڵبوو خۆی گەیاندە کرێشکین و بە زەبری شەرێک ئاودیوی دنیای نەمانی کرد. کوشت و کوشتار و تاڵان لە رادە دەرچوو و ساڵدات و قازاخ ڕژانە مەتەرێزی ئێرانییەکان و گۆمیلکەی خوێن مۆنجیان دا و هەرچی هەبوو دەستی بە سەردا گیرا و برا. بەناچار جێنشینیمیر و چەکدارانی خزمەت ڕکێفی خۆیان گەیاندە سەر باسک و بەندەنی ئەسلاندووز و کەوتنە دان بە خۆداگرتن و کۆکردنەوەی لەشکری پرژوبلاو. بەراستی لەو کشێمەکێشە سامناک و پڕمەترسییەدا کە دەنگوت ڕۆژی رابوونەوەیە ئێرانی کەوتنە ئەوپەڕی گیانبازی و خۆڕاگری، بەتایبەت لوتفعەلیخانی ئەفشاری سەرکردەی لقی هەشت و محەممەدخانی قاجار فەرماندەی لقی حەوت و جەعفەرقولیخانی موقەددەم سەرداری لقی مەراغە. بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەمانەش ڕووسیا سەرکەوت و ئێرانی شکان و بەزین. زۆر کەسی باوەڕپێکراو گێڕاویانەتەوە کە پێنسەد کەس لە پلەداران و سەربازانی لقەکانی ئەفشار لە ڕێگای شەڕی پیرۆزی دینی پاکی ئیسلام و دەوڵەتی هەتاهەتاییدا بە گوللەی ئاگرین لە خاکی نەمان گەوزان و نەغدینەی ژیانیان دایە بەر دەم بای نەمان. پاش ئەم ڕووداوە لەشکری ڕووسیا هۆردووبەزی ئێرانییەکانیان تاڵان کرد و بەرەو حەساری لەنکەران و ئەرکەوان بزووتن. بە هیوای خودا لە جێگای خۆیدا هەمووی دەخەینەڕوو.

هەر لەم ساڵەدا میرزا محەممەدنەبی کوڕی خوابەخشیو میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی پێشوو چۆوە بەر دلۆڤانی خودێ.

## شەڕی دڵڕاکێنی لەنکەران

دوای ڕووداوی ماڵــــوێرانکەری ئەســــلاندووز، ســــاڵی ١٢٢٧ی کـۆچی/١٨١٢ـ١٨١٣ی زایینی[1]، لوتفعەلیخانی قاسملوو سەرکردەی لکی هەشتی ئەفشار بەپێی فەرمان ڕاسپێردرابوو کە لە ورمــێ بــە دەوری هێزەکــەیدا بــێ و قەرەبووی کەمبوونەکەی بکاتەوە و لەگـەڵ لەشـکری ئێـران بـەرەو سـنووری لەنکەران ببزوێ، چونکە ڕووداوی تاڵ و ناخۆشی لەنکەرانیش بیوو بە سەربار لەسەر کارەساتی ئەسلاندووز. یانی کۆتلرۆسکی سەرداری ڕووس پاش ئـەوەی بڕینی سپاکەی سـاڕێژ بـۆوە، لــە جەنگـەی سـەرما و سەخـڵەتی زسـتاندا، گەرماوگەرم ڕێگای ئەرکەوانی گرتەبەر و شەوی ٤ی مـانگی محـەڕرەم گەیـشتە دەوروبەری ئەرکەوان. بەناچار پارێزەرانی وێندەرێ کە پیرقولیخانی قاجـار و عەسکەرخان و باباعەلیبەگی پێشقەرەولی دەربار سەرکردایەتییان دەکردن، بە هاتنی سپای ڕووسان تۆقین و حەجمینیان لێهەڵگیرا و کەوتنە بیری ڕزگاری و تەگبیران و تەنانەت هێندێکان سەری خۆیان هەڵگرت و ڕایانکرد. لـەم بەینـەدا تەنیا میرزا ئەحمەدی کاشانی بـرازای فـەتحعـەلیخـانی مەلیکوشـشوعەرا و ســەرکردەی لقــی بــەنگیمــسوڵمان[2] و عەبدوســسەمەدخان و عەســکەرخانی فەرماندەی سوارانی ئەفشار مانەوە. ئەم چەند کەسە دلێرانە چوونـە مەیـدان و پــشتیان نــەدا و باســک و مەچــەکی پاڵــەوانانەیان هەڵــکرد و دوای شــەڕ و تێکهەڵچوونێکی زۆر خوداوڕاستان مـیرزا ئەحمــەدی کاشـانی و جەعفـەرخانی مازندەرانی بە دەست سپای ڕووسیا شەهید بوون و چوونە پلەی بەختـەوەری و کۆمەڵێکی بەرچاویش بە شوێنیاندا جەڵلەیان بەست و وای لێهات کە بە خوێنی

---

1 - وەختایەک نووسەر دەڵێ شەڕی لەنکەران و ئەسلاندووز دوابەدوای یەکتر قەومان و سەرەتای شەڕی ئەسلاندووز دەباتە جێژنی قوربانی ساڵی ١٢٢٤ی کۆچی، وا دیارە دوای مانگی قوربان کە سەرەتای ساڵی کۆچییە و بە محەڕرەم دەست پێدەکا شەڕی لەنکەران قەوماوە. کەوایە ساڵی ١٢٢٥ی کوچی دروستە نەک ١٢٢٧. بەلام ڕەنگە هەر ساڵی ١٢٢٤ی کۆچی وا نەبێ و لە بنەڕەتدا شەڕەکە ساڵی ١٢٢٦ی کۆچی قەوما بێ.

2 - دەبێ نویمسوڵمان بێ.

کـوژراوان گیاوگۆڵـی مووچـە و مـەزرای ئەرکـەوان هەڵـگەڕانە سـەر ڕەنگـی ئەرخەوان.

بەکورتی سەرداری ناوبراو دوای سەرکەوتنی بە هێزێکی قورس و گـران و بار و بارخانەیەکی بێهەژمارەوە لەوێوە ڕووی کردە لەنکەران و پـاش ئـەوەی گەیشتێ لە شەوی ٩ی مانگی محەڕرەمدا کە دەبێتە تاسـووعا، سـپای ڕووسـیا کردی بە هاوار و هەرای ڕۆژی حەشر. بەڕاستی زمانی قەڵەم لە نووسینەوەی ئەم بەسەرهاتە و قەڵەمی زمان لـە گێڕانەوەی ئـەم حەولەوەلایە پێی لێـدەنێ کـە کول و کۆڵ و لەنگ‌ولۆرە. لەم تێکەولێکەیـەدا محەممـەدخانی قاجـار کـوژرا و بەشـی هـەرەزۆری لقـی حـەوت بوونـە گۆشـتی دەم تـۆپ و تفـەنگ. بـەپێی سەرچاوەکانی مێژوویـی بەتایبـەت «ناسـخوتتەواریخ» و «ڕەوزەتوسـسەفای ناسری» لە شەڕی ئەسلاندووز و لەنکەراندا پتر لە ٥٠٠٠ چەکداری ئێرانی و ٢٥٠٠ لەشکرچی ڕووسـیا کـوژراون. کۆتلرۆسـکی سـەرداریش لـەو تێکهەڵـچوون و لێکدانەدا سێ برینی قووڵی هێنا و هەر بەو زامانەوە وێڕای پاشماوەی لەشکری شەلوکوتی ڕووی کرد جامیشی وان. دەڵێن ئەگـەرچی بـە زەحمـەت و هـەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر برینەکانی سارێژ کرانـەوە، بـەلام هـەتا ژیـا هـەر شـەل و گێڕوگەواڵ بوو.

ئەوەی ڕاستی بێ یـەکێک لـە ڕاکردووانـی لقـی ئەفـشار لـە لەنکـەران ئاغورلووی وەکیل‌باشی بوو کە سەرەڕای ئەوەی سەیر ئـەنگاوبوو، لەبـەرەوەی جێنشینی‌میر لە ئەممەری قەرەجەداغ بوو، بەرەو ئەو باڵە بزووت و لە مـەودای ڕێدادا تووشی لوتف‌عەلی‌خانی سەرکردەی لقی هەشتی ئەفشار بوو کە ئـەویش هەر واوە دەچوو. خانی سەردار لەگەڵ خـۆی بـردی و ئـاغورلوو لـە خزمـەت جێگرەوەی‌میردا هەرچی بە چاوی خۆی دیتبووی لە نووکەوە گێڕایەوە.

هەر لەم ساڵەدا جەعفەرقولی‌خانی دونبولی کە لە ناوچەی شاری شەککی بنەی داکوتابوو، بارگەی ژیانی لەم جیهانە ڕووخەکەوە تێکنا و بـەرەو دنیـای هەرمان هەنگاوی نا و بە مردنی خۆی مرد.

## نێردرانی عەسکەرخان بۆ دەمکوتی خێڵی شیروان و کووژاندنەوەی ئاگری ئاژاوەی لاجان و دووبەرەکایەتی لەگەڵ ئەحمەدخانی موقەددەم

لەم ساڵەدا کە هێشتا کاری پێکهاتنی دەوڵەتانی ئێران و رووس هەروا بە دواکەوتوویی مابۆوە، سەرەتای ملبەملەی خێڵی شیروان سەری هەڵدا. شازادەی پایەبەرزی دەوڵەتی مەزن [عەبباس‌میرزای] جێگرەوەی‌میر تەنیا عەسکەرخان و عەبدوسسەمەدخانی راسپاردن کە هەڵکەنە سەریان و دایانڕووتێنن. ئەوانیش بەگوێرەی فەرمان وێرای سوارانی خۆیان چوونە سەریان و ئەو تاقمە یاغی و سەربزێوەیان زۆر چاک تەزاند، بەڵام چونکە وەرزی زستان بوو لەبەر تۆف و بەند و سەرما و بەستەڵەک زۆربەی سوارانی ئەفشار چوونە نێو بازنەی نەمان و ئەوەی مابوون بە هەزار کوێرەوەری خۆیان گەیاندە تەورێز. لەبەر بەختی‌بەد و شێواوی رۆژگار، ئەم خزمەتەی عەسکەرخان و عەبدوسسەمەدخان روون وەبەر چاو نەهات و جێی‌خۆی نەگرت و بەڵکوو بە کەمتەرخەمی و کۆتایی لە قەڵەم درا. شازادەی جێگرەوەی‌میر وا دەرهەڵبیوو کە فەرمانی دا لەبەر چاوی خۆی پەتێک باوێنە ئەستۆی عەبدوسسەمەدخان و بیخنکێنن!! عەسکەرخان بە پشتیوانی بەرێز میرزا ئەبولقاسمی قایم‌مەقام و کار و خزمەتەکانی پێشووی و ریش‌سپییایەتی خۆی تێکەوت و توانی براکەی لەو سزادانە قوتار بکا. لەم سەروبەندەدا رێککەوتنی نێوان ئێران و رووسیا کە بە پەیمان‌نامەی گولستان ناوبانگی دەرکردووە، کۆتایی پێهات[1]. دەقی پەیمان‌نامەکە کە بە تەگبیر و

---

[1] - پەیمان‌نامەی گولستان ساڵی ١٢٢٨ی کۆچی/١٨١٣ی زایینی نووسراوە.

راوێژی حاجی میرزا ئەبولحەسەنخانی بالوێزی باوەڕپێکراوی دەوڵەتی گەورەی ئێران نووسراوە بە دوور و درێژی لە دیرۆکاندا خراوەتەڕوو... .

هەر لەم ساڵەدا جێگرەوەی پایەبەرزی میر بیستی و لێیڕوون بۆوە کە هۆزی بلباسی نیشتەجێی لاجانی سەر بە سابلاغ وێدەچێ شالاو بەرنە سەر دانیشتووانی ساینقەڵا و سندووس و دایانپلۆسن و دایانڕووتێنن و مووچە و مەزرایان پێخوست بکەن. هەر بۆیە جێنشینی بەرێزی میر، ئەحمەدخانی موقەددەم و عەسکەرخانی ئەفشار کە لە تەورێز لە خزمەتیدا بوون هەڵیبژاردن هەتا بڕۆن و لێیانبدەن و بیانتاسێنن. ئەم دوو کەسە پسوولەی پازدەهەزار تمەنی تەورێزییان دا بە دیوانی بەرزی فەرمانڕەوایەتی کە دوای کۆتایی هاتنی ئەرکی سەر شانیان لە ماڵی تالانکراوی بلباسان بیدەن. وا قەرار کرا کە ئەحمەدخان لە مەراغەوە و عەسکەرخان لە ورمێوە هێزی خۆیان کۆبکەنەوە و لە سندووس یەکتر بگرنەوە و پێکەوە پەلاماری بلباسان بدەن. بەڵام ئەحمەدخان پێی لەم قەراروبڕییە نا و بەر لە عەسکەرخان ڕۆیی بۆ زگ بلباسان و دەستی لە تالان و کوشتار نەپاراست و بە دەسکەوت و خەنیمەتێکی بێژمارەوە گەڕایەوە مەراغە. لەو لاوە کاتێک عەسکەرخان بەرەو لاجان بزووت لە مەودای ڕێیەدا بیستی کە ئەحمەدخان دەستی خۆی ڕەپێش داوە و ئەوەی دەبوو بکرێ کراوە، جڵەوی شل نەکردەوە و یەکسەر ڕووی کردە میاندواو و ئەوەندەی ڕق هەستابوو کە هەر ئاوری دێنا. وەختایەک لە میاندواو گەیشتە سەر ئەحمەدخان و کردی بە

تاڵە و قسەی تاڵ و ناخۆش و سارد و سووکی بە زمانیدا هات و لەو لاشەوە بیستییەوە، زۆری دڵ لە ئەحمەدخان ئێشا و گەڕایەوە ورمێ. لەبەرەوەی ئەحمەدخان لە لایەن عەسکەرخانەوە قسەی ڕەقوتەقی لە پارسەنگی نرابوو، سکاڵای بردە بەر دەسەڵاتخانەی تەورێز و بە هەڵە دژی عەسکەرخانی دوا. بە هاندان و داوای خانی موقەددەم، میرزا ڕەحیمخانی قاجار یەکێک لە پیاوماقووڵانی بارگای میری ڕاسپێردرا کە بڕوا و نیوەی ئەو بڕە دراوەی

عەسکەرخان خستبوویە سەر شانی و ٧٥٠٠تمەنی تەورێزی بوو لێـیوەرگـرێ و بیباتەوە. دوای ئەوەی ڕەحیمخان گەیشتەجێ، عەسکەرخان ٣٥٠٠ تمەنی حـازر کرد و وێی دا و بۆ ٤٠٠٠ تمەنەکەش کە دەمایەوە چوار مانگی دەرفەت وەرگرت و پسوولەی دا و لە ئەلقەوە نەهاتە بێ و کابرای ڕاسپاردەشی بە باشترین شـێوە بـەڕێکردەوە تـەورێز. بـەڵام کاتێـک ئەحمـەدخانی موقـەددەم هەڵوێـست و هەنگاوەکەی بیستەوە سەری لە پوختەیی و لێوەشاوەیی عەسکەرخان سوڕما و ئەویش لەڕێوە ٧٥٠٠ تمەنی ئەشرەفی پێشکەشی خەزێنەی دەسەڵات کرد.

هەر لەم ساڵەدا میری خاوەنشکۆ بە مەبەستی گەڕان و سەیران لە تارانی پایتەختەوە بزووت و چیمەنی ئۆجانی دەوروبەری تـەورێزی کـردە خێوەتگـای سەراپەردەی بەشەوکەتی. لـەوێوە دەسـتووری فـەرموو کـە تـاقمی تـۆپچی و سوارانی تـازەی هێـزی ئەفـشار بچنـە خزمـەتی. هـەر بۆیـە عەسـکەرخان و عەبدوسسەمەدخان و ئەزمەرعەلیخانی برازایان لەگەڵ سوارانی تازەی بەڕڕکێفی خۆیان چوونە مێرگۆڵانی ئۆجان. دیـارە ڕەحمەتولـلاخـانی قاجـار سـەرتیپی تۆپخانـە و ئەسەدولـلابەگی ئەفـشاری عـەرەبلوو سەردەسـتەی تۆپخانـە و خەزانئاغاسوڵتانیش وێڕایان چوون. ئەوسا سوارانی مەشقپێکراوی ڕاهاتووی لە کڵدرەچوو کەوتنە خۆ ڕانان و مەشق و ڕیزبەستن. خاقانی بەرزەجێ لەگـەڵ پۆلێک لە گەورەپیاوانی دەوڵەت و میرزا محەممەدشەفیعی مەزنەوەزیر چوونـە سەر تەپۆلکەیەک و تاسەی تەماشای بزووت و یەکجار زۆری وەبەردڵی کەوت و کەیفی موبارەکی پێیبزووت. لەو جەنگەیەدا مەزنەوەزیر کە هەمیشە لە دوورەوە قازانج و بەرژەوەندی عەسکەرخانی دەپاراست و بڕوای پێـی بـوو، هەلەکـەی قۆزتەوە و بە خزمەتی ڕاگەیاند کە ئەمانە هەمووی دەچنەوە سەر لێوەشاوەیی و کارچاکی عەسکەرخانی ئەفشار کە لە کۆنـەوە غـولام و دەوڵـەتخوایە. پاشـان باسی چۆنیەتی ڕێوشوێن کێشانی کـوژرانی تـسیتسـیانۆف و چـــوونی بـۆ فەرانسە و تێکڕای خزمەتەکانی بە زمانێکی تەڕ و پاراو بۆ گێڕایـەوە و نـەقڵ و

نەزیلەی ٧٥٠٠ تمەنەی کە شازادەی جێگرموەی‌میر بە فیتی ئەحمەدخان وەکوو تاوانانە پێوەی‌بەستبوو، وێڕای ئاکاری باش و لەباری خرایەڕوو. خاوەن‌شکۆ هەر لەڕێوە شازادی بانگهێشت و زۆری لێ‌تووڕە بوو و بە سەری ڕۆیی و فەرمووی دەبێ پسوولەی ٤٠٠٠ تمەنەی بدەیەوە و چاکت ئاگا لە عەسکەرخان بێ و جبەیەکی دارمۆشی بۆ کردە خەڵاتی شانازی.

هەر لەم ساڵە بەگوێرەی تەگبیری میرزا محەممەدعەلی ئاشتیانی (ئەشکەبۆس) وەرگرتنی باج و پیتاکی ورمێ لە ویشکەماڵ و نەغدینە خرایە ئەستۆی مەحموودخانی کوڕی موئمین‌خانی ئەفشاری ساین‌قەڵا. سەعیدەین‌بەگ یەکێک لە دیوانی دیوانەی مازندەران لەبەر پەرێشانیی کاروباری حوکمڕداریێتی حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگ لە لایەن دیوانی میرموە وەکوو دارۆغە و خاوەن‌دەسەڵات نێردرایە ورمێ. لقی حەوتی ئەفشار کە پێشتر لە ژێر دەستی محەممەدخانی قاجاردا بوو، بە شێوەیەکی کاتی درایە چنگ «ئاغاقاسم»ناوێکی باوەڕپێکراوی جێنشینی‌میر. هەروەها سوارانی تازەی سپا بۆ ڕاهێنان خرانە ژێر‌رکێفی نەزەرعەلی عەبدولمەلیکی.

# چوونی جێنشینی‌میر بۆ خۆی و ورمێ

سالــی ١٢٢٩ی کــۆچی/١٨١٣ ــ ١٨١٤ی زایینی، پــاش تێپــەڕینی جێژنــی نەورۆزی سوڵتانی بــە خۆشــی و کامــڕەوایی و کامــرانی، جیهــانی پــیر بــە پێوقەدەمی خاکەلێوە تەمەنی لە نوێ نووسرایەوە. لــەو هەڕەتــەدا شــازادەی بەڕێزی جێگرەوەی‌میر کە لەمێژ بوو هەر سەرقاڵی شەڕ و هەرا و دانەسەکنین و گیرۆدەی شەکەتی بوو، مەیلی فەرموو کە تەشــریف بــەرێ بــۆ ســەیران و ڕاو. سەرەتا پرشنگی شەوکەتی هاویشتە سەر مەڵــبەندی دڵــبزوێنی خــۆی و ڕۆژی شەممە ٧ی مانگی شابان بزووت و تاوڵ و خێوەتی لە چیمەنی دۆرشەک هەڵــدا. ئەوەندەی پێویست بوو خەڵکی خۆی و سەڵماسی خوێندەوە و بەسەری‌کردنەوە. کاتێک کاروانی کەژاوەی لەوێوە ڕۆیی و سێبەری هاویشتە سەر داوێنی قزقەڵای ورمێ، عەسکەرخان کە لە ڕکێفی خۆشفەڕیدا بوو، ئیزنــی وەرگــرت و بەپەلــە مزگێنی چوونی کەژاوەی پیرۆزی برد بۆ حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگ. ئەویش کەوتە ئامادە کردنی شتومەکی جێژن و شادمانی و میوانداری و لەگەڵ خانان و پیاوماقوولان و تێکرای قۆشــەنداران ڕۆژی دووشــەممۆ ٨ی کولــەمانگ چوونــە ڕکێف‌ڕاموسانی. شازادە هەر ئەو ڕۆژەی کە گەیشتێ چوو بۆ باغی کەماڵئابادی بەگلەربەگ کە دەنگوت بەهەشتە و ئەوانەی کــە لــە خزمــەت ڕکێفــی‌دا بــوون، هەرکام چۆنیان ڕێدەکەوت و لێیان‌دەوەشاوە لە گەڕانگــەڕی باغەکــە چادریــان هەڵدا و ئۆقرەیان گرت. خودی بەگلەربەگ و مەحموودخان و عەسکەرخانیش لە تەنیشت بــاغ خێــوەتی بــە جوێیــان هەڵــدان و بنــەیان داکوتــا. لــەم کاتــەدا سمایل‌ئاغای بشکوفتی کە ئێستا و ڕابردوو بەگلەربەگ لە سەرخێلایەتی خێــڵی خۆی خستبوو، لە ڕێگای عەسکەرخانەوە دیارییەکی شایانی نــاردە خزمــەت و

هەر بە داوای ئەویش چۆوە سەر دۆخی جارانی. عەسکەرخانیش بە مەبەستی تەمێکردن و گوێبادانی عێلی هەرکی ڕانەسپێردرا کە ماوەیەک پێشتر هەڵیانکردبوویە سەر ناوچە و مەڵبەندەکانی ورمێ. هەر بەڕاستی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەرکی سەرشانی بە جوانی ڕاپەڕاند و بە سلامەتی و دەستی پڕدەسکەوتەوە گەڕایەوە. هەروەها بەڕێز میرزا بوزورگی قایمەقام وانە میرزا عیسای باوکی قایمەقامی دووەم کە بە داهات و دەرکەوتی دیوانی ورمێدا چووبۆوە، ١١٦٩٦ تمەنی خستبۆوە سەر ئەستۆی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ و پسوولەی لێوەرگرت. دوای ئەم کارانە کاروانی بەختیاری جارێکی تر بەرەو خۆی بزووت و لەو ڕۆژانەدا نەزەرعەلیخان لە سەرکردایەتی سوارانی ئەفشار لادرا و لە سەرەتادا ڕاهێنەری پرکێش بۆ تاراوگە دوور خرایەوە. وا داندرا کە هەر پوولێکی دەمێنێ ئاغاحەیدەری فەڕاشی تایبەتی پادشا لە ڕێگای مەحموودخانەوە لە بەگلەربەگی وەربگرێ و بیگەیەنێتە خەزێنەی میری.

## شەڕی حەیدەری و نیعمەتی لە ورمێ کە شازادەی زۆر تووڕە و چراغپێ کرد

لەم سەروبەندەدا پاش چوونی تەشریفی شازادەی جێگرەوەی میر لە ورمێوە بۆ خۆی، شەڕی نێوان حەیدەری و نیعمەتی قەوما. وەک ڕوون و ئاشکرایە ئەم قڕە و هەرایە لە کۆنەوە لە مابەینی لات و شەلات و تاوانکارانی [هێندێک] ناوچە و هەرێمی ژیانی مسولمانان‌دا باوە. وەکوو دەڵێن و لە نێو چین و توێژەکانی جەماوەردا باسی دەکرێ ئەم ناکۆکییە لەمێژە لە نێوان مریدانی شانیعمەتوڵلای وەلی کرمانی و سەید حەیدەری دەروێشی تەبەسی‌دا کە لە شاری تەورێز نێژراوە، سەری هەڵداوە. بەکورتی لە ڕۆژانی عاشوورا و تازیەداری‌دا کە خەڵکی ورمێ بەپێی داب‌ونەریتی کۆن لە تەکیە و مزگەوتان‌دا سەرقاڵی سەرتووڵکە و چەمەری‌گێڕان بوون، لاتەوپاتە و پیاوخراپان کرتیانە گرمە و هەرا و شەڕی حەیدەری و نیعمەتییان ساز کرد و بەم بیانوویەوە هەڵیانکوتایە سەر ماڵان و دەستیان لە کوشتار و تاڵان نەپاراست و هەرتک لا چەند کەسیان لێ‌کوژرا و تاقمێکیش بە بریندارى کەوتنەوە. سەرەنجام لوتفعەلی‌خانی قاسملوو سەرکردەی لقی هەشتی ئەفشار بە فەرمانی حوسێن‌قولی‌خانی برای هێزەکەی خۆی کۆکردەوە و لە سانی دا و بە هەڕەشەوگوڕەشان ئاگری ئەم ئاژاوەیەی ڕۆمرکاند. کاتێک شازادە [عەبباس‌میرزا] لە خۆیە ڕووداوەکەی بیستەوە وەکوو گڕالک دەرهەڵبوو. هەر بۆیە لەڕێوە گزیری توند و تیژی ناردن بۆ ورمێ کە جڵەودارانی سەرناسی ئەم کارە لادینانە و بەدفەڕانەیە بگرن و بیانبەنە خۆی. لەبەرەوەی تاوانباران و قەلەوقوتەی گومناو پاش ئەم ڕووداوانە ڕەویبوون و خۆیان وەبەردەستان

نەدابوو، گزیرانی راسپێراو لەبری ئـەوان دەسـتەیەک کاسـپکاری بـێتـاوانی بازاڕیـان گـرتن و بـە چۆڵـەپێچکـراوی بردیـانن بـۆ خـۆی. بـەناچار حوسێنقوڵیخانی بەگەربەگ بە مەبەستی تکا و پاڕانـەوە بـۆ بـێگوناهـان، کەلبەڕەزاخانی ئێشیکئاغاسی کوڕی عەلیڕەزاخان و عەلیمرادبەگی سـەرلکی کوڕی ڕەحیمخان و حوسێنبەگی ڕیشسپی خێـڵی قۆرخلـووی بـە نامەیەکـەوە ناردن بۆ خۆی. لەم بەینەدا نەجەفقوڵیخانی دووەم کوڕی بەگەربەگ کـە لـە زیـارەتی نەزرگـە و مەرقـەدی ئیمامـان گەڕایـەوە و گەیـشتەوە وڵات، حوسێنقوڵیخانی باوکی لەڕێوە دوابەدوای ئەوان بەڕێی کرد بۆ خزمەت شازادە. خوداوراستان نەجەفقوڵیخان لەو جەنگەیەدا گەیشتێ کە گیراوانی بـێتـاوان درابوونـە چنـگ میرغـەزەبان و خـەریکی سـزادانیان بـوون. بەگەربـەگزادە هەرچەندی داپاڕی و خۆی هێناوبرد هیچی بۆ نەکرا. لەو کاتەدا عەسـکەرخانی پیر لە پێش شازادە کڕنۆشی برد و بە خاکەڕایی هەزار سوێندی بە خـاکی پـای خوارد کە ئەمانە هەموویان کاسپکار و دووکاندارن و قەت لەو کارە نابەجێیەوە نەگلاون و ئەم هەرا و کەتن و ئاژاوەیە کردەی چەپەلکاران و لاتولووتی بێناون کە ئێـستا بـازرەن و خۆیـان حەشـار داوە. ئەگـەرچی بـە تکـا و پاڕانـەوەی بەگەربـەگزادە و عەسـکەرخان ئـەو کۆمەڵـە گـیراوەی چێـوەچزە نـەدان و لێیانخۆش بوو، بەڵام ئاگری تووڕەیی بەڕێزیان هەر دانەمرکا. لەجیاتی ئەوان کەلبەڕەزاخان و عەلیمرادبەگ و حوسێنبەگی بە تێهەڵدان دان و فـەرمووی بـە ڕولان بیانتەزێنن و تەنانەت حوسێنبەگی ڕیشسپی بێچارەیان فەلاقەش کرد. ئەوسا بڕی دووهەزار تمەنیان جەلیمە بە تاوانبارانـەوە بەسـت و گزیـری بـە زەبروزەنگ و ترسن لە ماوەیەکی کەمدا شەش گەڕەکی شاری ورمێیان تێکوەردا و خەڵکیان هەڵپێچا و لێیانئەستاندن و دایانە دەست کاربەدەستانی دیوانی بەرزی میری.

## شەڕی قەڵای ڕەواندز ناسراو بە سیدەک لە ساڵی ۱۲۳۱ی کۆچی/۱۸۱۵ ـ ۱۸۱٦ی زایینیدا

پێویست بە روون کردنەوەیە میری رەواندز کە لە لایەن دەوڵەتی گەورەی عوسمانییەوە لەو خاک و مەڵبەندە ئاڵای هێز و حوکمڕانێتی هەڵدابوو، لەبەر مەودای کەم و نیزیکایەتی و تەنینەوەی دەسەڵاتی، جاروبارە هۆمەن و راماڵی دەبردە سەر ناوچەی شنۆ. کاتێک ئەم هەواڵانە بێنێوبڕ بە گوێی دەوڵەتی پایەدار گەیشتنەوە، وای لێهات کە بەرپەرچدانەوەی میری ڕەواندز وەکوو ئەرک لەسەر شانی حکوومەت ڕەنگی دایەوە. لەم ساڵەدا شازادەی جێگرەوەی میر، محەممەدباقرخانی سپاسالار، کوڕی پیرقولیخانی سەرداری قاجاری لەگەڵ کۆمەڵێک سەرکردەی ئازەربایجانی وەکوو نەزەرعەلیخانی مەرەندی، برایمخانی شامبەیاتی، سمایلخان و براکەی چوونە ژێر فەرمانی سپاسالارەوە و تێکڕا ڕوویان کردە مەڵبەندی هەستبزوێنی ورمێ و لەوێ هۆردووبەزیان کرد.

لەم بالەشەوە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ، بەپێی فەرمانی مەزنانی دەسەڵات، نەجەفقولیخانی کوڕی وێڕای لوتفعەلیخانی برای کە سەرکردەی لقی هەشتی ئەفشار بوو بەرێی کردن و عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی و عەبدوسسەمەدخانی برای و مەحموودخانی قاسملوو و ڕەحمەتوڵڵاخانی فەرماندەی تۆپخانە و ئەسەدوڵڵابەگی عەرەبلووی سەردەستەی تۆپخانە و خەزانئاغای فەرماندەی تۆپخانەی ڕەگەڵ خستن. هەموویان شانبەشان بە دەهەزار سوارە و پیادە و تۆپ و تۆپخانە و قۆرخانەوە کۆچاوکۆچ بەرەو قەڵای ڕەواندز کەوتنەڕێ. سەرەتا سمایلئاغای بشکوفتی کە پێشەنگ بوو

بێ لێکدانەوە و بە کەترەخەمی هەڵیکردە سەر شووورەی سیدەک. قەڵانشینان ئەگەرچی ئازایانە بەرەورووی بوونەوە، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا و بە شکاوی سەریان بردەوە بەر حەساری قەڵا و پیاویان ناردە لای میری ڕەواندز کە بگاتە فریایان، کەچی پیاوەکە نەگەیشتەجێ و بە دەست پاسەوانانی سپای ئێران گیرا و بە حوکمی سەرکردە کوژرا. لەو کاتەدا هێزە نەبەزەکان پەساپەسا وەدەرکەوتن و دەورەی دیواری قەڵایان تەنی. پاشان لە چەند شوێنێکی لەبار تۆپی قەڵاشکێنیان دابەستن و گوللەی ئاگرداریان چەشنی گلێرە بە سەر ژووری حەوشەدا باراند. بە دەستووری فەرماندەی تۆپخانە، تۆپچی ٧٠٠ تا ٨٠٠ تۆپەڵەی ئاورباریان هاویشتە قەڵا و لەڕێوە بورجێک قەڵشتی تێکەوت و داڕووخا، هەر بۆیە قەڵانشین تووشی دڵەڕاوکە و تۆقین بوونەوە و لە جەرگەی شەودا بن دیوارێکیان کۆڵی و خۆیان گەیاندە لێرەوارەکانی دەوروبەر. بەڵام بەر لە ڕاکردن چەند سوارەیەکی ئەفشار و کەسانێکی دیکەی وەکوو «عەلی» تەوردار و مەهدی تەپڵچی لقی ئەفشار بە گوللەی گەرمەوە بوون.

هەر چۆنێک بێ لە ماوەیەکی کورتدا قەڵای سیدەک گیرا و دەسکەوت و خەنیمەتێکی زۆر کەوتە چنگ سپای ئێران. پاش ئەم سەرکەوتنە دەستەیەک سەربازی ئازا بە سەرکردایەتی ئەحمەدبەگی سەرپەلی یەکەم لەوێ بنکەیەکی سپایان دانا و مەتەرێزیان دابەست و هێزە باڵادەستەکان بەرەو ڕەواندز بزووتن. هێشتا دوو فرسەخ نەڕۆیبوون کە هەڵیکردە کرێوە و باکوت و سەرمایەکی سەخت باڵی ئەنگاوت. دوا بەفرێکی وا قورس باری کە هەموو ڕێگا و ڕەوگەکان گیران و بواری هاتوچۆ نەما. گەلێک قۆشەنچی و یەکسم ڕەقهەڵاتن و کەسیرە بوونی و لە پێپەڕین و بە ناچار کەوتە ژێر پاشماوەی لەشکر گەڕایەوە و ڕووکاری ئەم سەرکەوتنە کەوتەژێر پەردەی دواکەوتن. لەم سەروبەندەدا هەواڵی هاتنی بالوێزی دەوڵەتی شکۆمەند لە هەرێمەکانی ئێراندا بڵاو بۆوە.

هەر لەم ساڵەدا میرزا محەممەدعەلی سەرحیسابی ئازەربایجان ناسراو بە ئەشکەبۆس بۆ جارێکی تر ڕووی کردەوە ورمێ و کەوتەوە پێداچوونەوەی داهات و دەرکەوتی دیوانی و لە نێو پەڕاوانیدا هەمووی دەنووسینەوە و تۆماری دەکردن. لەم کاتەدا شازادەی جێنشینی‌میر نامەیەکی نارد بۆ حوسێنقولی‌خانی بەگلەربەگ کە دەبێ بە ئاگاداری میرزا محەممەدعەلی سەرحیساب پێنسەد سوارەی سکۆرتێ و هەشتسەد سوارەی لەشکری و دوو لقی مەشقپێکراو و دووسەد و بیست کەس تۆپچی ئەفشار ساز و پەرداخ و ئامادە بکا و چاوەڕوانی فەرمانی تازە بێ.

هەر لەم ساڵەدا ئەحمەدخانی موقەددەمی بەگلەربەگی مەراغە لە میاندواو چۆوە بەر دلۆڤانی خودا.

# ڕاسپێردرانی عەسکەرخان بۆ میوانداری کردنی باڵوێزی ڕووسیا

ساڵی ١٢٣٢ی[1] کۆچی/ ١٨١٦ ـ ١٨١٧ی زایینی، «ئەلێکساندر یەرمیلۆف»ی باڵوێزی ڕووسیا بەرەو ئێران بزووت. باڵوێز پیاوێکی زانا، بەڵام توند و تیژ و قسە تاڵ و لووتبەرز بوو. پاش ئەوەی لە ماوەی دوو مانگا توانی کاروباری تفلیس و قەرەباغ ڕێکبخا، لە لایەن وڵاتی خۆیەوە بە مەبەستی ڕاگەیاندنی چەند بابەتێکی کە حکوومەت ڕایئەسپاردبوو بەرەو پایتەختی شاهەنشاهی ئێران کەوتەڕێ. چونکە دەبوو پیاوێکی وریا و کارزان بەرەوپیری بچێ و میوانداری بێ، فەرمان درا کە عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی بچێتە ئوچکلیسا و پێشوازی لێبکا.

عەسکەرخان بەپێی فەرمان بە تەدارەکی شایانەوە لە ورمێوە بەرەو شوێنی دیاریکراو ڕۆیی و بەخێری هێنا و پێکەوە ڕوویان کردە ئێرەوان. سەرەتا حەسەنخان ناسراو بە سەفدەری غازی برا چووکەی ناوداری حوسێنخانی سەردار کە لە دەرەوەی ئێرەوان و لە سەیرانگایەکی خۆش سەراپەردەیەکی گەورەی بۆ ڕازاندبۆوە چەند هەنگاوێک بە پیریەوە هات و دەستی نایە نێو دە[illegible]تی باڵوێز کە بە دابی ئەوان نیشانەی دۆستایەتی و خۆشەویستییە و بە مێرسی مێرسی دەستی گوشی! ئەوسا پێکەوە چوونە نێو خێوەتی خان و دوای میوانداری کران لە خاکی ئێرەوان تێپەڕی و لەگەڵ عەسکەرخان بەرەو تەورێز کشا. ئەو ڕۆژەی دەگەیشتە تەورێز لە ئاوایی «سەبەلان»ەوە هەتا کۆشکی حکوومەت، نیزیکەی ٢٥٠٠٠ سوارە و سەرباز و ٢٠٠٠٠ پیادە و ٤٠٠٠٠ کەس

---

[1] - لە دەقەکەدا نووسراوە ١٣٣٢ کە هەڵەیە.

سەنعەتکار و کاسبکار و دووکاندار وێڕای ٤٠ دەزگا تۆپ ئەوبەرەوبەر ڕاوەستابوون و جەماوەرەکە دەتگوت وێنەی بە دیوارەوە هەڵاوەسراوی بێدەنگن و سەرتاپاخوار ببوونە چاو و گوێ و لە باڵوێز ڕامابوون.

بەم شێوەیە ئەلێکساندر یەرمێلۆف ئاوای پێشوازی شیاو لێکرا و پێی نایە تەورێز. بۆ سبەینێ لەگەڵ عەسکەرخانی میواندار چووە خزمەت شازادەی جێگرەوەی‌میر و دوای دیدار و وتوویژ هیچ وتەیەکی نەرم و نیانی لە زمان شازادەوە نەبیست چونکە بیری پیرۆزی بەرێزیان بە لای شەڕ و کێشەدا شکابۆوە و دەیهەویست کۆنەقینی برێژێ و تۆڵەی پێشوو بکاتەوە. بەناچار نێردراوی دەوڵەتی رووس بە دڵناخۆشی و ناهومێدی وێڕای عەسکەرخانی میواندار بەرەو بارەگای پاشای ئێران بزووت. لەبەرەوەی تەواوی ڕاپۆرتەکە لە «ناسخوتتەواریخ»دا نووسراوە و لەمە پتر پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نیە، خۆم لێ‌بوارد.

## ڕەنجانی ئەفشاران لە هەڵسوکەوتی نالەباری مەحموودخانی قاسملوو و هاوار بردنیان بۆ لای جێنشینیمیر و لابردن و تەمێکردنی یەک لە دوای یەکی چەند کەس لە ژمێریاران

پێشتر باسی کرا کە میرزا محەممەدعەلی ژمێریاری دیوانی بالا سالی پێشوو دارایی دیوانی ورمێی نایە بەردەستی لێومشاوەی مەحموودخانی قاسملوو و خۆی ڕۆیی بۆ تەورێز. ناوبراو بێپارسەنگ جوولایەوە و خۆی لە داڕووتاندن و شلتاغ نەپاراست. خەڵکی ورمێ لە زەبروزەنگی باجوەرگرانی و لە هەڵسوکەوتی نالەباری خۆی وەتەنگ هاتن. وای لێهات کە هێشتا چل ڕۆژ بە سەر جێژنی نەورۆزدا تێنەپەڕیبوو کە پیتاکی نۆ مانگە کۆکرابوویەوە. محەممەدعیساخان و خودادادخانی کوڕانی ئیمامقولیخانی خوابەخشیو لەبەر زوڵم و زۆرەملی پیاوەکانی مەحموودخانی قاسملوو هەڵاتبوونە خۆی و مەزنانی ئەفشار لە دەرفەتێک دەگەڕان کە سکالای لێبکەن. خوداوڕاستان لەم کاتەدا کە مەزن و ماقووڵ و بازرگان و ئاغاوەتی ورمێ وێڕای مەلا ئاغارەزا قازی کوڕی خوابەخشیو میرزا محەممەدحوسێنی ئیمامجومعەی ورمێ چووبوونە تەورێز بۆ پێشوازی باڵوێزی ڕووس، هەلەکەیان بە لەبار زانی و هەموویان لای جێنشینیمیر کەوتنە سکالا و گلە و گازندە و گوتیان مەحموودخان تەنگی پێهەڵچنیوین. مەحموودخانیش کە لەوێ بوو، شازادە عەبباسمیرزا پاش هەڵچوون فەرمووی کە فەتحعەلیخانی نووری مازندەرانی بیداتە بەر مست و شەپلاغە و ئەویش چاکی لێدا و ڕوومەت و پشتەملی بە زللە سوور هەڵگێرا. ئەوسا میر دەستووری دا کە دەسبەسەر بیبەن بۆ مەراغە و وا داندرا کە هەرگیز دەست وەرنەداتە کاروباری پیتاکی ورمێ و ئەوەی بە زیادی ئەستاندوویەتی لە

بنی بێتەوەدەر و بیداتەوە. پاشـان فـەتح عـەلی خـان لـــەبری مـەحموودخان ڕاسپێردرا و شانبەشانی گەورەپیاوان و جـەماوەری ئەفـشار لـە بنـەبـانـــی مـانـگی جیمادی دووەمدا بەرەو ورمێ کەوتەڕێ. فەتح عەلی خـانی مازنـدەرانی دوای ئەوەی گەیشتە شوێنی کاری خۆی کەوتە نووسـینی پـسوولەی پیتـاک و داهاتی دیوانی دەسەلاتی ورمێ و بە سەربەستی ملی لێنا.

لـەم سـەروبەندەدا کوردەکـانی ڕەوەنـد هـەرا و ئاژاوەیـان نایـەوە و سنوورەکانیان شلەقاند، بۆیە بەناچار حوسـێن قولـی خـانی بەگلەربـەگ بـە مەبەستی خاشەکێشانی ئەم توخم و تۆوەی ئاژاوەیە کە ببوو بە هۆی شـێوانی کاروباری حکوومەتی و ژیانی حەشامەتی ورمێی تێکدابوو، نەجەف قولی خـانی کوڕە گەورەی لە جێی خۆی دانا و دوای جێژنی ڕەمەزان بە ڕێگـای سـندووسدا چوو بۆ سولتانییە، چونکە کاروانی کەژاوەی پیرۆزی خاقانی بەرزەشان لەوێ بنەی داکوتابوو. فەتح عەلی خانی نووری مازندەرانی کە لە مالی حاجی سـەفی دادەنیشت بـە ئامـانجی هێـور کردنـەوەی خـێل و خانـەدانی ئەفـشار مـیرزا محەممەدسەعیدی کەلانتەری مەلبەندەکەی بانگهێشت و بە ڕاوێژی ئـەو کەوتـە سەرژمێری خانووبەرەکانی شار و پێوانی زەوی‌وزاری گوندان و بە هیچ کلۆجێک لای لە نەجەف قولی خانی بریکار نەدەکردەوە و گوێی پێـی نـەدەبزووت، بۆیـە کاروباری مەلبەندەکە و ناوچەکانی سەرسنوور زیاتر لە پێشوو ئالۆزکان.

لەم کاتەدا شەڕفرۆشانی هەرکی شوویان لێ‌هەلکێشا و زەرەدیان گەیاندە ناوچەکانی ورمێ. جەماوەری ئەفشار بە بێ‌وەفا دەرچوون و فەتح عـەلی خـانی نوورییان دنە دا بۆ لێدان و دەمکوتی سەربزێوان. ئەویش بـە هێزێکـی تـەیاری حکوومەتەوە لە شار دەرکەوت و لـەنـاکاو بە سەر سەربزێوانی هـەرکی دادا و مال و خەنیمەتێکی زۆری لێگرتن و تالانی کردن و بە دەستی پـڕ و سـەرکەوتوو گەڕایەوە ورمێ. سمایل بەگی خەلـەج بـە درێـژی چۆنیـەتی ڕووداوەکـەی لـە نووکەوە نووسییەوە ـ بـەپـەلـە بـە عەبدوڕڕەزابەگی پێشخزمەتا نـاردی بـۆ

حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ. کاتێک کاغەزەکەی سمایلبەگ لە چیمەنی سولتانییە خرایە بەرچاوی بەگلەربەگ بە بێوەفایی ئەفشاران و سەربەخۆیی فەتحعەلیخانی نووری زۆر تێکچوو. دوای ئەگبیر لەگەڵ عەسکەرخان کە ئەو دەم ئەرکی میوانداری کردنی بالوێزی رووسی لەسەر شانی نەمابوو، لە هەلێکی لەباردا چۆنیەتی رووداوەکانی بە خزمەت میری مەزن راگەیاند. ئەوسا فەرمانێک لە لایەن پاشاوە بۆ فەتحعەلیخان نووسرا [کە بگەرێتەوە] و لەسەر داوای حوسێنقولیخان، میرزا محەممەدتەقی قەواموددەولەی ئاشتیانی داندرا هەتا بە سەر کوبەندی پیتاکی ورمێ رابگا و وا بڕیار درا کە بە مۆر و پسوولەی بەگلەربەگ بە سێ قیست هەرچی هەیە بدرێ بە دیوانداراانی پایەبەرز. دوای ئەم قەراروبڕییە بەگلەربەگ وێڕای میرزا محەممەدتەقی قەواموددەولەی ژمێریاری دیوانی بالا و عەسکەرخان رووی کردەوە ورمێ و لە رۆژی جێژنی قوربانیدا پێینایەوە کۆشکی دەسەلاتی. ئەجەفقولیخانی بریکاری حکوومەت لەگەڵ خەلکی ولاتەکە زۆر چاکی پێشوازی لە باوکی بەرزمجێی کرد و بەگلەربەگ هەروەک پێشوو لەسەر کورسی دەسەلات پالیدایەوە. میرزا محەممەدتەقی کەوتە سەر لێهەلێنان و پێوانی زەویوزاری مەلبەندی ورمێ و فەتحعەلیخانی نووری خۆی لە دەستێومردان کێشایەوە و گەرایەوە تەورێز.

لەم سالەدا کە میرزا محەممەدتەقی لە ورمێ سەرقالی سەر لێهەلێنان و پێوانی ملکوماشی لادێکان بوو، لە ماوەی چوار مانگدا هەموو حیساباتی خستەوە سەریەک و کۆتایی پێهێنا. بەلام بە دنە و هەلفریوانی میرزا لەنێف یەکێک لە نووسندەکانی خۆی ویستی کە بکەوێتە سەرژمێری جەماوەر و وەکوو شارۆکەی سەلماس لە ورمێ سەرانە دابنێ و ئەم سەردەقە نالەبارە بشکێنێ و قازانجێکی بێژمار وەچنگ بێنێ. هەر بۆیە کەوتنە سەرژمێری حەشامەت و لەم بێنەوبەرەدا «رەحیم»ناوێکی قەسابی خەلکی «گەزنەق» کاتێک نۆرەی هات و چوونە لای کە سەرقالی گۆشتفرۆشتن بوو، خوێنی وەکول هات و گوتی:

سەرێک کە باری قورسی سەرانە بیگرێتەوە بۆ برینێ دەبێ! بۆیە هەر لەرێوە بەو کێردە تیژەی بە دەستییەوە بوو سەری خۆی بڕی و ئەم بار قورسەی بە شیاوی سەر شانی خۆی نەزانی. کاتێک ئەم هەواڵە لە ئازەربایجاندا بڵاو بۆوە، میرزا محەممەدتەقی و کارگێڕانی دیوان زۆر ترسان و سامیان ڕێنیشت و لە کردەی خۆیان پاشەگەز بوونەوە. خێرایەکی بڕی ٧١٠٠٠ تمەنی تەورێزی پیتاکی وشکەماڵ و نەغدینە و ٧٠٠٠ خاڵوار دەغڵودان بۆ ورمێ دیاری کرا و بەپێی فەرمانی بانگکرانەوەی گەڕایەوە بۆ تەورێز. دواتر حاجی محەممەدحەسەنبەگی تەفرشی بۆ بە سەر ڕاگەیشتنی دیوانی دارایی ورمێ داندرا و بەڕێ کرا.

## دژایەتی سمایلئاغای بشکوفتی سەرخێلی شکاک لەگەڵ دەوڵەت و کوژرانی بە دەست عەبدوسسەمەدخان

پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە سمایلئاغای کوڕی میرزائاغای سەرخێلی بشکوفتی لەسەر چیای بناوی نازلوو قەڵایەکی قایمی ساز کردووە کە بریتییە لە دوو دەستە وەتاغ و باڵەخانەی دەر و ژوور و دوو حەساری پتەو. ئەم کابرایە پێشتر لە شەڕەکانی نێوان دەوڵەتی ئێران و عوسمانیدا چۆتە بەرکێفی جێنشینیمیر و گەلێک خزمەتی بەرچاوی کردووە و بە سیلەنیگای میرانە خوێندراوەتەوە و وردەوردە بڕەوی ئەستاندووە و دەستی زۆرەملانەی گەیاندۆتەوە سەر تێکڕای خێلاتی ورمێ. لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی فەرمانی دیوانی میری یەکێک بوو لە پێملانی حوسێنقولیخان. بەڵام چونکە شەڕفرۆشی و پێلێهەڵێنانی کەسانی ئاوا کردەیەکی سروشتییە و [بەدڕەوشتی] لە خوێنیان دایە، هەمیشە بەگلەربەگی پایەبەرز بەرپەرچی دەدانەوە و نەیدەهێشت چورتە بکەن. [خانی کورد] لە ساڵانی پێشوودا بە مەبەستی پتەو کردنی بناغەی دۆستایەتی و خزمایەتی و ڕێوشوێنی سەر وەبەرهێنان کچی خۆی دابوو بە فەرەجوڵلاخانی کورە گەورەی عەسکەرخان. لەم سەردەمەدا بە پشتیوانی و متمانەی تێکەڵاوی لەگەڵ عەسکەرخان و سەختی قەڵاکەی هەدای نەدا و دیسان دەرگا و دەروازەی سەربزێوی و بەدفەڕی خستنە سەرپشت و ڕێگای هاتوچۆی خەڵکی بەست و هەڵیکوتایە سەر چەند گوندێکی گەرانگەڕی قەڵاکەی و ماڵ و دارایی و دەغڵودانی بە تاڵان بردن. کاتێک بەگلەربەگ هەواڵی هەرا و دژایەتی سمایلئاغای بیستەوە، سەرەتا بۆ ئەوەی قسەی خۆی بڕیبێتەوە و خزمایەتی عەسکەرخانیشی تێهێنابێ، عەبدوسسەمەدخانی لەگەڵ عەلیسوڵتانی ڕیشسپی تایفەی کەڵهوڕ و چەند کەسێکی باوەڕپێکراو ناردنی بۆ قەڵا هەتا بەڵکوو بتوانن بە پەند و ئامۆژگاری بیهێننە سەر ڕێگای ڕاست. خانی عەبدولمەلیکی لەسەر

فەرمانی حوکمدار رووی کردە قەڵای سمایلئاغا و لە قەڵای خوارەوە کۆمەڵێک لە پیاوەکانی کە زێرەوان بوون، خەبەریان دا بە سمایلئاغا کە ئەوە عەبدوسسەمەدخان هاتووە. ئەوسا لەسەر ئیزنی خانی بشکوفتی مەلا سالحی هاونشین و هاودەمی چوو بە پیر عەبدوسسەمەدخانەوە و بردیانە حەوشەی سەرەوە. سمایلئاغاش چەند هەنگاوێک لە حەساری سەرەوەرا هاتەخوار و پێکەوە گەرانەوە دیوەخان. عەبدوسسەمەدخان کەوتە ئامۆژگاری کردن و دڵدانەوەی و گەلێکی بەڵێن پێدا، بەڵام هیچ قسەیەکی وای لێ نەبیست کە نیشانەی رەزامەندی و خێر و چاکەی پێوەبێ. عەبدوسسەمەدخان هەروا بە نەرمی و گەرموگوری دەیدواند و پەندەکانی خۆی دووپات دەکردەوە و دەیگوت کەلەوەکێشی و دووبەرەکایەتی لەگەڵ دەوڵەت هەمیشە تێشکان و خەسارباری بە دواوە دەبێ و ئاکامی تاڵی لێدەکەوێتەوە. ئەو بلەوەزە بە بیستنی ئەم وتانە دەرهەڵبوو و تەنانەت لەبەر خۆیەوە جنێویشی بە عەبدوسسەمەدخان دا! هەر بۆیە عەبدوسسەمەدخانی شێری توورەی بەسام و دڵ پڕ لە کینە هەستا و لە دڵی خۆیدا سوێندی خەستی خوارد و گوتی ئەگەر بێڵم بە زیندیسەر بمێنێ دەبێ هەتا دنیا بە دنیایە نامەردی رۆژگار بم. ئەو کات لە قەڵای سمایلئاغا هاتەخوار و پێی‌نایە ئاوزەنگی و پاش دوو کاتژمێران خۆی گەیاندەوە لای حوسێنقولیخان لە شار و چۆنیەتی دیدارەکەی بۆ گێرایەوە. ئەمجارەیان بەگلەربەگ خودی عەسکەرخانی نارده لای سمایلئاغا و ئەویش رۆژی یەکشەممۆ ١٤ی مانگی موبارەکی محەررەم وێرای چەند کەس لە پیرەمپیاوان و کەیخودایان و برازایەکی و نەزەرعەلیخانی کوری چوو بۆ قەڵا و لە داوێنی دابەزی. دوابەدوای وی عەبدوسسەمەدخان لەگەڵ سوارانی ناوداری بەرزکێفی خۆی کەوتەرێ. بەڵام عەسکەرخانی کارزان چونکە دەیهەویست ئەو... بە کەمەندی تەگبیر بگرێ نەک بە شەڕ و لێکدان، پیاوێکی فامیدەی نارده لای و لێی‌راسپارد کە بڵێ خۆشە بێتە خوارەوەی قەڵا و چاوم پێی‌بکەوێ و

هینــدێکی بدوێنم. سمایلئاغا گوتی بــاشە بــەڵام دەبــێ بارمتــە بنێــرێ بــۆ ئێرە و خــۆی بە تــەنیا بێتە بەرپاڵی قــەڵا. عەسکەرخان بــۆ ئــەوەی دڵــنیای بکاتەوە نەزەرعەلیخان و فەرەجوڵلاخانی وەکــوو بــارمتە ناردن بــــۆ قــــەڵا. سمایلئاغا ئاهێکی هاتەوەبەر و لەگەڵ خزمەتکارێکی خــۆی چوو بۆ ژێر دەواری عەسکەرخان کــە لــە نیزیــک مێــرگ و چیمــەنی «جــەنزە» هەڵــدرابوو. لــەو جەنگــەدا عەبدوســـسەمەدخان وێــڕای ســواران و یــــەک دوو پــەلــــە ســەرباز گــەیشتێ و کاتێک دیتی کە سمایلئاغا لەگەڵ براکــەی ســەرقــاڵــی ســــواڵ و جــوابــە، لەسەر خوانی زینەوە هــەرای لــە عەسکەرخان کــرد و گــوتــی:

هەرکە دوژمنت هاتە بەردەستی مەهێڵە دەرچێ!

سمایلئاغا بە دیتنی عەبدوسسەمەدخان و بیستنی ئەو لەتکە شێعرە خۆی گەیاندە ئەسپەکەی و هێشتا پێیەکەی دیکەی نەنابوویــە ئــاوزەنگی کــە لەپــڕ عەبدوسسەمەدخان تەقەی لێکرد و بە فیــشەکێک متــەقی لــێبــڕی. ســواران و سەربازان بە دیتنی ئەم دیمەنە کردیانــە تەقــە و چەنــد کەسێکی کــە لەگــەڵ سمایلئاغا بوون دەسرێژیان لێکرا. عەسکەرخان وەختایەک ئاوای دیت لە تاوی نەزەرعەلیخان و فەرەجوڵلاخان کەوتە دڵەڕاوکە و نیگەرانی و دەیگــوت نــەکا دانیــشتووانی قــەڵا بیــانکووژن و (دیــارە عەبدوســسەمەدخان بــەو ڕووداوەی نەزانیبوو.)[1] بەڵام کاتێک تەقەی تفەنگان بەرز بۆوە و شریخەشریخ گەیشتە گوێی

---

[1] - وا دیارە کە مەحموود رامیان و پەرویز شەهریار ئەفشار ئەم رستەیان لێزیاد کردووە و هەر خۆشیان خستوویانەتە نێو کەوانەوە و پاساویان بۆ شێوەی کوشتنەکەی هێناوەتەوە. رستەکانی دوایی ئەم ڕاستییە بە ڕوونی دەردەخەن.
کتێبی « تاریخ خروج اکراد و قتل [و] غارت شیخ عبدالله بدبنیاد و اغتشاش و فتنه زیاد در مملکت آذربایجان در سنه ۱۲۹۷» کە دوابەدوای میرزا رەشید و بە قەڵــەمی عــەلی کــوڕی کۆنەخانی ئەفشار نووسراوە دەڵێ: «عەبدوسسەمەدخانی خودالێخۆشبوو بــە فــەرمانی باردگای بەرزی پیروز سمایلئاغای کوشتووە.»

قەلانشینان، ئەزمرعەلیخان هێندە وریا بوو(!) کە زانی سمایلئاغا کاری کراوە و کوژراوە و کردی بە شادمانی و مزگێنی دا بە کوردان کە لە سایەی خوداوە پێکهاتوون و ئەوەش کە دەیبیستن تەقەی شادییە. ئەوانیش بڕوایان پێکردن و لێیانخافڵ بوون و دووبرالە هەلەکەیان قۆزتەوە و خێرایەکی لێیسوار بوون و وەکوو تیری ساردەکەوان بەرەو هۆرددووبەز فڕین و باوکی مەزن و مامی ناوداریان بە گەڕانەوە و دەربازبوونیان گەشانەوە و گیانێکی تازەیان بە بەردا کرایەوە. پاشان سواران و سەربازان پەلاماری قەلایان دا و تەواوی ماڵ و سامانی سمایلئاغایان بە تالان برد، بەلام میرزائاغا و عەلیئاغا و یەحیابەگی کوڕانی هەلاتن و وەبەردەستان نەکەوتن. دواتر جازی [خاتوونی] ئازا و ئاقلمەندی ژنی سمایلئاغا رووی کردە تەورێزی ناوەندی دەسەلات و سکالای بردە بەر جێنشینیمیر. بە مەبەستی راگەیشتن بە داواکەی، عەلیخانی ئەفشار کە سەرۆکی دەزگای پاراستنی بارەگا بوو هاتە ورمێ و لەبەر پاراستنی ڕێوشوێنی خێلاتی قەراروبڕییەکی لە نێوانیدا پێکهێنان و گەڕاوە.

## شەڕ لەگەڵ عێلاتی سەربزێو لە ناوچەی لاجان

وەکوو ڕوون و ئاشکرایە هۆزی بلباسی دانیشتووی ناوچەی لاجانی سەر بە ورمێ بێنێوبڕ گێرە و کێشەیان ناوەتەوە و پەلاماری خەڵک و خاکی ورمێ و مەراغەیان داوە و لەم دەستەوارە پەڕاپەڕانەدا نووسراونەوە و تیشکەی تێکەیشتنی چاوەدێران و خوێنەرانی بە سەردا باریوە. ئەم هۆزە دیسان لەم ساڵەدا ئاگری ئاژاوە و کەڵەزەڕی هەڵگیرساند و ئەسپی تالان و دەسدرێژی لە ناوچەکانی ورمێ و مەراغە تاو دا. کاتێک ئەم هەواڵانە لە لایەن حوسێنقولیخانی بەگلەربەگەوە گەیشتنە گوێی پایەبەرزانی دەوڵەتی ئێران، قەلاچۆی توخم و تۆوی شەڕ و گەڕی ئاژاوەگێران بوو بە ئەرکی سەر شانی حکوومەتی شکۆمەندی بالادەست. لە لایەن خاقانی ئێرانەوە سەرکردەی بێهاوتا ئەمیرخانی قاجار خاڵی شازادەی جێگرمووەی میر ڕاسپێردرا کە بە هێزی شان و باهۆی سپای موقەددەم و ئەفشار و تۆپ و تۆپخانەی ئاگربار بڕوا بۆ دەمکوتی ئەو هۆزە و لە خاکی چارەڕەشیدا بیانگەوزێنێ و خەڵکی ئازەربایجان ئاسوودە بکا. هەر بۆیە سەرکردەی ناوبراو وێرای سپای موقەددەم و ئەفشار و حوسێنقولیخان و حاکمانی ئەو مەڵبەندە لە خاکی گەرمێنی نێزیکی شارەزوور کە پەنا و پەسیوی ئەو هۆزە لارێیە بوو، هەڵیکردە سەریان و لە هەردک بەرانەوە تەنووری تێکهەڵچوون و لێکدان نێڵ درا. لەشکری موقەددەم و ئەفشار وەکوو چیا بە سەر پەناگای ئەو جەماوەرە بەرچاوەدا ڕووخان و بە تەوژمی بای پەلامار کردیانن بە تۆوی هەرزن. لەو پێکدادان و هەرایە دا نێزیکەی هەزار کەس لە هۆزی بلباس کەوتنە بەر مەودای شیر و نێزەی خەزاکەران و هەزارەزیلەیان

هەڵاتن بۆ کێوان و چەکوچۆڵ و بارگە و بنەیان لەو سەحرایە فڕێ دا. ئەوسا گەوهەر و زێڕ و زەمبەر و یەکسم و خەنیمەتێکی بێژمار کەوتە چنگ سپای موقەددەم و ئەفشار و ئەمیرخانی قاجار زاڵ و سەرکەوتە و بە دەستی پڕەوە گەڕایەوە. بەپێی فەرمانی گەورەپیاوانی حکوومەت، عەبدوسسەمەدخانی ئەفشار ناسراو بە عەبدولمەلیکی لەگەڵ تایفە و هێزەکانی بەرڕکێفی لە ناوچەی سندووس کە کەوتۆتە نێوان ورمێ و کوردستان، حوکمڕانێکی دانا کە ببێتە بەرگر و لەمپەر و نەهێڵێ دەستیان درێژ بکەنە سەر ناوچەکانی ورمێ.

# شەڕ و پێکدادان و گیرانی مستەفائاغای هەکاری حوکمڕانی ئالباغ لە ساڵی ١٢٣٥ی کۆچی‌دا

ئالباغ شارۆکەیەکی نێوان خاکی ورمێ و سەلماسە و لەبەر دەستی دەوڵەتی گەورەی عوسمانی‌دایە کە مستەفائاغای لەوێ بە حوکمڕان داناوە. لەم ساڵەدا دانیشتووانی ئەو شارۆچکەیە بە پشتیوانی شەڕفرۆشانی دراوسێ و بە فیتی حوکمداری خۆیان ڕێگایان بە ڕێبواران و کاروانچییانی ورمێ و سەلماس دەگرت و ڕووتیان دەکردن و دەیانکوشتن. ئەم کارانە کە دەبوونە هۆی دوژمنایەتی نێوان دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی، لە لایەن حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگەوە بە خزمەت جێنشینی‌میر ڕاگەیەندران. لە لایەن شازادەی مەزنەوە گەلێک حوکم و فەرمان نووسران بۆ لوتف‌عەلی‌خانی قاسملوو سەرکردەی لقی هەشتی ئەفشار، محەممەدوەلی‌خانی کوڕی حوسێن‌قولی‌خان فەرماندەی سوارانی حکوومەتی، عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی ئێلخانی کوردەکانی بشکوفتی، یۆسف‌خانی گورجی سەرکردەی هێزی پاڵەوانانی یەنگی‌مسوڵمان و فەرماندەی تۆپخانە و سۆهراب‌خانی گورجی فەرماندەی لقی حەوتی ئەفشار. ئەمانە هەموویان بە سەرکردایەتی حوسێن‌قولی‌خانی بەگلەربەگ چوونە شەڕی کوردانی ئالباغ هەتا لێیان‌بدەن و هەرچی بە تاڵان بردوویانە لێیان‌بستێننەوە. جا بۆیە ئەو هێزانەی ڕاسپێردرابوون یەک لە دوای یەک لە چیمەنی ئۆرشەکی سەلماس کۆبوونەوە و چەشنی دەریا شەپۆلیان دا. سەرەتا عەسکەرخانی ئێلخانی کوردان بەپێی ئەرکی ڕاسپێردراوی هەنگاوی نا بەڵکوو بێ‌ئەوەی کار بگاتە شەڕ و لێکدان بتوانێ بە فێڵەبازی ماڵ و سامانی بە تاڵان‌براو لە چەپەڵکاران وەرگرێتەوە. ئەوسا کەیخودایەکی زمان‌لووس و دەم‌پاراوی نارده

لای مستەفائاغا و مەبەستەکەی خۆی پێراگەیاند. کاتێک ڕاسپاردەی عەسکەرخان بە گوێی مستەفائاغا ئاشنا کرا، گوتی وڵامی خانی ئەفشار چوونە مەیدان و شیر و نێزە هەڵانە. سەرەنجام هێزەکان پێکەوە لە مێرگ و چیمەنی دۆرشەک هەستان و هەڵمەتیان بردە سەر ئاوایی ئالباغ. ئەوانیش ئازایانە و چاونەترسانە بەرەگەیان لێ‌تەنین و بەرەنگاریان بوونەوە و شەڕێکی سەختیان لە نێوانی‌دا قەوما. لەو کاتەدا یۆسفخانی گورجی فەرماندەی تۆپخانە دەستووری ئەقەی دا و سەربازان گوللەیان بە سەردا باراندن و چەکدارانی مەشق‌پێکراو لە شەڕگەدا کەوتنە جۆڵانە و لەولاشەوە ئالباغی ئەوەندەی بۆیان دەکرا لێیان‌وەخۆکەوتن. ئاخرییەکەی هیچیان بۆ نەکرا و پەنایان بردەوە بەر قاپێلکی قەڵا. ماوەی سێ مانگی تەواو دەورەی ئالباغیان دا و چونکە دەوڵەتی عوسمانی هیچ یارمەتییەکی بۆ نەناردن و کەم‌بوونی ئازووخەشی هاتە سەری، بەناچار دانیشتووانی قەڵا کەوتنە پاڕانەوە و دەستیان بەردایەوە و گوتیان ئەوەی بردوومانە دەیدەینەوە و گەلێک دیاری بەرچاویش دەنێرینە خزمەت. بەم شێوەیە توانیان ئەو سێلاوی بەڵایە لەسەر خۆیان لابەرن و وەکوو مەرج مستەفائاغایان نارده ئەوڕێزی ئاوەندی دەسەڵات.

# هەڵبژێرانی حوسێنقوڵیخانی بەگلەربەگ بە مەزنەوەزیر و کۆچیدوایی لەناکاوی لە ساڵی ١٢٣٦ی کۆچیدا

دەسپێکی نەورۆزی پیرۆزی ئەم ساڵە کە نیزیکەی دوو کاتەژمێر و چوار خولەکی ئەستێرەگەری لە شەوی پێنجشەممۆ ٢٩ی جیمادی دووەم / ٣ی ئاوریلی ١٨٢١ی تێپەڕیبوو، خۆر گەیشتە کەلووی کاوڕ و مانگی خاکەلێوەی داگیرساند. حوسێنقوڵیخانی بەگلەربەگ دوای تازەبوونەوەی ساڵ و تێپەڕینی جێژن تەشریفی بردە باغی خوڕڕەمئاباد لە باراندێز کە خۆی سازی کردبوو. لەو شوێنە چەند ڕۆژێک وێڕای برایان و کوڕانی و مەزن و ماقووڵانی ئەفشار بە خۆشی و شادی و ڕاوشکار ڕایبوارد. پاشان کە بەرەو شار گەڕانەوە لە بەستێنی چۆمەڵی شاراجۆ کە سەیرانگایەکی کەموێنەیە دەستووری فەرموو تا برایان و کوڕانی کە هەموویان سوارچاک بوون بیکەنە نەقڵە و ڕمبازی. خۆشی ئەسپی میرانەی هێنایە جۆلانە و مامزەی لێ ئەنگاوت و وا تیژ و خێرا دەبەزی کە حەشامەتەکە واقیان بردەوە و کەوتنە تاریفاتی. لەو کاتەدا میرزا هەمزەی [illegible]زلووی پێشکاری بەگلەربەگ یەکسمی دەنگ دایە مەیدان و بەگلەربەگیش کەوتە سەری و دارتەقڵەیەکی تێهەڵکرد و سەری میرزا هەمزەی پێکا و زاماری کرد، بەڵام لەناکاو چاووزاری ڕۆژگار ئەنگاوتی و ئەسپی خۆشبەزی بەگلەربەگ سەرسمی دا و کەسێک کە لە مەزنایەتیدا چەشنی ئاسمان و بۆ گرانی و سەنگینی وەکوو زەوی وابوو گلی. حوکمڕان بەم تێکهەڵگلانە زام و خوڕپە و تاسانی کەوتە ئازای ئەندامی. ئەوانەی لە خزمەت ڕکێفیدا بوون بە دیتنی ئەم دیمەنە تۆقین و

داترووسکان و خێرایەکی بە کەژاوە بردیانەوە شـار. بـەڵام هـەر نەیـدەتوانی بجووڵێتەوە و هیچ هێزێکی دەبەردا نەمابوو. بۆ سبەینێ نامەبەرێک لە تـارانی پایتەختەوە گەیشتە ورمێ و فەرمانێکی لە لایەن میری گەورە فەتحعـەلیشـای قاجارەوە هێنا کە پوختەی مەبەستەکەی ئاوا بوو: حاجی محەممەدحوسێنخانی ئیسفەهانی کە مەزنەوەزیری دەوڵەت و لە دەهەنـدەییدا حاتـەمی دووەم بـوو، چەند رۆژێکە کە بارگە و بنەی بردۆتە جەغزی هەرمان. دوای ئەو لە هەرێمەکانی ئێراندا خەڵاتی ئەم پلە بەرزە شایانی قەڵافەتی لێوەشاوەی حوسێنقولیخـانی بەگلەربەگی ئەفشارە کە باپیر و خاڵی شازادانە و سەر و سەرۆکی ئازادانە. هەر بۆیە بەگلەربەگ وەختایەک ئەم فەرمانەی پێگەیشت و زیارەتی کرد دەبێ بەرەو پایتەخت باژوێ و شانازی دەرانەراموسان بخاتە سەرشانی.

بەگلەربەگ دوای زیارەتی فـەرمان ئەگـەرچی زۆر ناسـاغ و نـەخۆش و بێهێز بوو، بە مەبەستی سەروەبەرهێنانی حوکمی میری مەزن، جـارێ مزڵـی گواستەوە بۆ باغی کـەمـالئـاباد و نەجەفقولیخانی کوڕی کـردە بـریکـاری. بـەڵام سات بە سات حاڵی پتر دەشێوا و دەم بە دەم هەناوی هەناسە و هـاڵاوی تێدا نەدەما. بەڕێز میرفەیازئاغای حەکیمی ورمێ کە لەم رۆژانەدا بـە دەورەیدا دەهات و دەرمانی دەکرد، هەر بە لێزانی و شـارەزایی و هەڵاویـشتنی دەمـاری جومگەی دەیزانی دەردەی پێمردنییەتی، بۆیە گوتی نابێ بچی بۆ ئەم سەفەرە و زۆر بە جوانی گێڕایەوە بۆ شار. بەگلەربەگ گوێی بۆ ویستی حەکیمی چازان شل کرد و بە قسەی ئەو کەوتە خواردنی چێوی هاڕدراوی چینی.

هەر لەم رۆژانەدا میری گەورەی سێبەری خوا بـە ئاغامحەممەدحەسـەنی پێشخزمەتی تایبـەتی خـۆیدا جـلوبـەرگی خـەڵاتی نەورۆزانـەی بـۆ نـارد. بەگلەربەگ ئەگەرچی بە جێوبان کەوتبوو دیـسانیش بـە شـێوەیەکی شـایان پێشوازی کرد لە دیاری میرانە و بەژن و باڵای پێڕازاندەوە. پاش ئەوەی مـیرزا محەممەدتەقی قەوامودەولە لە پێداچوونەوەی کاروباری دیوانی دارایـی بـۆوە

هاتە سـەر گەڕانـەوە و بەگەربـەگیش پێنـسەد تمـەنی ئەشـرەفی لـە پێنـاو خەڵاتەکەدا دایە ئاغامحەممەدحەسەن و لەگەڵ قەوامودەولە بەڕێی کردەوە بـۆ پایتەخت. بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ نەخۆشییەکەی دەیتەنییەوە. هەر لـەم ڕۆژە تـاڵ و نابەخێرانە و لە کلکەی مانگی ڕەجەبدا ئاخوند محەممەدحوسێنی ئیمامجومعەی هێژا رووی کردە مەڵبەندی نەمان. کوڕەکانی بریتی بوون لـە مـەلا ئاغـاڕمزای دەمراستی مسکێنان، مەلا مووساڕەزا، ئاغاعەلیئەشرەفی ئیمامجومعە، حاجی ئاغامەجید و ئاغاحەسەن.

ئیمامجومعەی خوابەخشیو ئەگەرچی هەزاران هەزار تمەنی خێر و خێراتی شەرعی بە دەستی گەیشتبوو، بـەڵام لـە مالـی دنیایـە هیچـی نـەبوو، بۆیـە عەسکەرخان خەرجوبەرجی سەرەخۆشی و تازیەداری وەئەستۆی خـۆی گـرت و تەرمەکەی ناردە بەرەدەرانەی مەزارگەی پیرۆزی پیاوچاکان و ئیمامان. جـا بـا ئێستا بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

لە مەودای ئەم ماوەیەدا کە حوسێنقولیخان حالـی پەرێـشان و ناسـاغ بوو، حەکیمانی شارەزا چێوی هـاڕدراوی چینییـان دەدایـە و نەیـدەتوانی بـە کاروباری دەسەڵات ڕابگـا. بۆیـە فیتنەگێـڕان هـەلیان بـۆ ڕەخـسا و شـاوری دووبەرەکایەتی نێوان مەحموودخان و عەسکەرخانیان خۆش کرد کە دوو خەنیمی بـەرەوڕوو بـوون. بـۆ وێنـە لـە کـەیخودایانی ئەفـشار ئەڵـلاوێردیبـەگ و خوداوێردیبەگی قاسملوو، ڕەجـەبعـەلیبـەگ و سمایـلبـەگی کۆهـەکلوو و مەمەدسەلیمبەگی گەنجالیخانی یەکتریان گرت و لەو لاشەوە بـرایمئاغـای سـەرۆکی ناوچـەی سـۆما و میرزائاغـای سەرخێـلی بـشکوفتی پێکـەوە لـە عەسکەرخان هەڵگەڕانەوە و خۆیان بە لایەنگری مەحموودخان دانا. کار گەیشتە جێیەک کە چەند ڕەخنەیەکی حکوومەتی خرایە سەر شـانی عەسـکەرخان و لـە سەرەتای مانگی شابانـدا وێرای مەحموودخان چوونە تەورێز. لەگەڵ ئەمـەشدا عەسـکەرخانی دووربـین قـەت سـستی نەنوانـد و ڕۆژ و شـەو بـە دڵـپاکی و

خۆشەویستی بە کاروباری مەڵبەند ڕادەگەیشت و خۆی لــە خــۆش کردنــەوەی بەگڵەربەگ لانەدەگرت. بۆ نموونە بڕی دووسەت ئەشرەفی بۆ سەدەقەی ســەری بەگلەربەگ نابوویە ژێر سەرینی و دەیدا بە هەژاران و بەلــەنگازان و هــەروەها وشترێکیشی لە مەیدانی «سەردەری» بۆ کردە قوربانی و بــە ســەر مــسکێنانیدا دابەشی.

بەڵام لەو لاوە کاتێک مەحموودخان لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی کە باسیان کرا گەیشتنە تەورێز و گازندە و سکاڵای خۆیان خستەڕوو، بەڕێز میرزا ئەبولقاسمی قایمەقام و وەزیری جێنشینیمیر چونکە لە ناخ و ڕواڵــەتا بەڕاستی جــامینی عەسکەرخانی دەویست بە مەبەستی ڕوون بوونەوەی ئامانج و بێدەنگ کردنــی سکاڵاکەرانی بەرچاوتەنگ، بەپێی فەرمان عەسکەرخانی بانگهێشتە ناوەنــدی دەسەڵات کــە لێــرە لێکۆڵــینەوەی لەگــەڵ بکــرێ و ڕووی ڕاســت و درۆی داد و هاوارەکەیان دەرکەوێ.

دوای چەند ڕۆژێک کە عەسکەرخان گەیشتە تەورێز و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا و کوتەی سکاڵاکەران بە درۆ دەرچوو، بە فەرمانی جێگرەوەیمــیر کــورد و ئەفشاری یەکانگیر تەمێ کران. بۆ وێنە سمایلبەگی کۆهەکلوویان دوای ســزادان بردە بازار و جاڕیان کێشا کە هــەر کــەس بــەدخواز و دژبــەری خزمــەتکارانی ڕووڕاستی دەوڵەتی مەزن بێ ئاوای دەچزێنن. پاش ئــەم ڕووداوانــە جێگــرەوەی پایەبەرزی میر عەسکەرخانی خەڵات کرد و دووبارە کردییەوە بــە سەرپەرســتی کوردان و مەحموودخان و هاوڕێیانی بە سەرشۆڕی و خەسارباری ناردەوە ورمێ.

کاتێک چل ڕۆژ بە سەر خواردنی چێوی چینیدا ڕابرد و حوسێنقولیخــان پێی چاکتر نەبوو، بەلکوو ڕۆژ بە ڕۆژ دەردەکەی برستی زیاتر لــێبــڕی، ڕۆژی هەینی ٢٢ی مانگی شابان، میرزا جــانی و مــیرزا بابــای حــەکیمانی تــەورێزی بەگوێرەی فەرمانی شازادە هاتن بۆ دەرمان کردنی بەگلەربەگ. ئەوانیش کە لــە ئەزمی دەماری خورد بوونەوە زانیان ناڵێ و شەپلە لێیــداوە. دیــسانیش هــەر

چۆنێک بێ ڕۆژی یەکشەممۆ ٢٤ی مانگی شابانی مەزن، ئەو ئازیزەیان بەوپەڕی نەخۆشی لە ژووری خەڵوەتخانەوە ڕاگواست بۆ قەڵا و باڵەخانەی سەردەری. بەڕێزیان لە ئاڵوگۆڕی حاڵ و ڕۆژەوە تێگەیشت کە جەنگەی پێچانەوەی بارگەی ژیانە. دوو ڕۆژ بەر لە ڕووداوەکە برایان و کوڕەکانی لەگەڵ کەس‌وکاری نیزیکی خێڵی ئەفشاری بانگهێشتنە لای خۆی و یەک یەک وەسیەتی بۆ کردن و دوایین ماڵاوایی لێ خواستن و گوتی گەردنم ئازا بکەن. بەم شێوەیە شەوی چوارشەممۆ ٢٧ی مانگی شابان نەجەف‌قولی‌خانی کوڕە گەورەی کردە سەرومسێت و جێنشینی خۆی و لەگەڵ بانگی بەیانی هەتاوی ژیانی ئاوا بوو و ڕۆیی بۆ ژێر ئاڵای ڕەحمەتی یەزدانی. بەری‌بەیانی تەواوی خێڵ و خانەدان کردیانە هاوار و شین و قوڕپێوان و دەتگوت ڕۆژی حەشر و حەلەلایە. دوای شۆردن و خەڵاتپێچ و نوێژ لەسەر کردن، تەرمەکەیان ڕاگواست بۆ مەزارگەی بەرزی پیاوچاکان. «مونشی» شاعیری ئوروومی ڕێکەوتی کۆچی‌دوایی خوداڵێخۆشبوو حوسێن‌قولی‌خانی ئاوا هۆندۆتەوە:

نووسی پێنووسی مونشی لە بۆ ساڵی وەفاتی
دەبتە ئاوەدەنگی ئیمام حوسێن، حوسێن‌قولی‌خان[1]

خوداڵێخۆشبوو حوسێن‌قولی‌خان هەمیشە یەکێک بوو لە سەرتۆپانی ئەمیرانی بارەگای پاشا و مەزن و ماقووڵانی ڕۆژگار ئێرەیی‌یان پێدەبرد. چوار [illegible]زادەی ناوداری کوڕانی خاقان کە بریتی بوون لە مەلیک‌قاسم‌میرزا، مەلیک‌مەنسوورمیرزا، یەحیامیرزا و جیهانسۆزمیرزا لە داوێنی خوشک و کچی ئەو بەربوونەوە.

---

[1] - «بود انیس جناب حسین، حسین‌قلی‌خان». بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٢٣٦ی کۆچی/ ١٨٢٠ی زایینی.

ئاسەواری خێر و چاکەی کە لە پاش ئەو خوابەخشیوە بەجێماون بریتین لە: ١- باغی کەمال شانبەشانی ئاوایی دزەی سیاوەش مەشهوور بە کەمالئاباد. ٢- پردی سەر چۆمی باراندیز کە زۆر چاک و پتەو سازکراوە. ٣- بالەخانەی هەرمباشی دیوانخانە ناودێر بە سەردەری. ٤- باغی خورڕەمئاباد لە نیزیک گوندی باراندێز و زارکی مەزاری شێخلەر. ٥- بازاڕی بەزازخانەی کۆنی ورمێ.

پاش کۆچیدوایی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ، ئیمامقولیخانی دووەم ناسراو بە بیووکخان کە دوای نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ لە هەموو کوڕەکانی گەورەتر بوو ڕۆیی بەرەو دنیای پاشین.

کوڕانی حوسێنقولیخان بریتی بوون لە: نەجەفقولیخان، ئیمامقولیخانی دووەم، برایمخان و حاجی محەممەدوەلیخان کە لە داوێنی کچی عەلیڕەزاخانی قاسملوو بەربووونەوە. حاجی سولەیمانخان، حاجی شاسوارخان، ئەبولفەتحخان، محەممەدخان و سمایلخان کە لە کۆشی کچی خوابەخشیو محەممەدقولیخان کەوتبوونەوە. عەبدولغەنیخان، محەممەدکەریمخان، ئەسەدوڵلاخان و زولفەقارخان کە لە خاتوونێکی تایفەی خەلەج بە وەلەد ببوون.

## گوێزرانەوەی دەسەڵات بۆ نەجەف قولیخانی کوڕی حوسێنقولیخان و ڕووداوەکانی سەردەمی حکوومەتەکەی

پاش ئەوەی کە حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ دنیای ڕووخەکی ژیانی بەرەو هەرێمی هەرمان بەجێهێشت، بیووکخانی کوڕیشی ناسراو بە ئیمامقولیخانی دووەم چل ڕۆژ دوای باوکی مالاوایی لە ژیان کرد. کاتێک هەواڵەکە بە تاران و تەورێزی ناوەندی دەسەلات ڕاگەیەندرا، بەپێی فەرمانی جێنشینیمیر و لەسەر داوای مەزن و ماقوولانی ئەفشار، جارێ نەجەفقولیخانی کوڕە گەورەی جێی باوکی گرتەوە. پاشان بە نەتەرێکی خۆشاژۆدا هەواڵی کۆچیدوایی باوکی پایەبەرزی نارد بۆ بارەگای میری مەزن فەتحعەلیشای قاجار. پاشای بەختەوەر بە بیستنی نەمانی ئەم ئەمیرە ناودارە زۆری پەژارە دەربڕی و فەرمووی بەڕاستی جێگای داخە. هەروەها کچی بەگلەربەگ کە لە ڕیزی قەرەواشانی حەرمسەرای فەرمانڕەوایەتیدا خۆی دەنواند و دایکی شازادە یەحیامیرزا و جیهانسۆزمیرزا بوو زۆری بێتێکچوو و خەم دایگرت. ئەوسا بەگوێرەی فەرمانی پاشا کاغەزێکی سەرەخۆشی و دڵدانەوە و حوکمی حوکمڕانی و پیرۆزبایی نووسرا و هەروابێتەوە دەستوور درا کە بە مەبەستی ڕێزی خەلاتی خاقانی و لەبەر شانازی بەگلەربەگی تازە و ڕۆنیشتنی لەسەر تەختی دەسەلات، لە بارگای جێنشینیمیرەوە چەند پیاوماقوولێکی حکوومەت بچنە ورمێ. لەوێ پشکی ئەم سەفەرە بە ناوی بەڕێز حاجی میرزا ئاقاسی ناوبەدەرەوە دەرکەوت کە ئەو سەردەمە مامۆستای منالانی

شازادەی جێگرەوەی‌میر بەتایبەت محەممەدمیرزا بـوو. حـاجی مـیرزا ئاقاسـی لەگەڵ حاجی میرزا مووساخانی کوڕی میرزا عیساخان ناسراو بە میرزا بوزورگی قایم‌مەقامی فەراهانی بـرا چووکـەی مـیرزا ئـەبولقاسمی قـایم‌مـەقامی دووەم خەڵاتەکەیان هەڵگرت و بەرەو ورمێ بزووتن. کاتێک ڕۆژی شـەممۆ ١٠ی مـانگی نێوجێژنان گەیشتنە گوندی «بالاو»ی یـەک فرسـەخی ورمـێ، سولـتان‌بـەگی ئەفشاری پیاوی عەسـکەرخان خێرابـەکی ئەسـپی لینـگ دا و خـۆی گەیانـدە نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگ و مزگێنی هاتنی خـەڵات و فـەرمانی حکوومـەتی دایە و ئەویش بە قەوارەیەک قوماش بەسەری‌کردەوە.

ڕۆژی یەکشەممۆی ئەم مانگە لوتف‌عەلی‌خانی مامی نەجەف‌قولـی‌خـان سەرکردەی لقی هەشت و عەبدوڵـلاخانی قاجـار فەرمانـدەی لقـی حـەوت بـە هێزەکانی خۆیانەوە حازر بوون و عەسـکەرخان و عەبدوسـەمەدخان وێـڕای سوارانی مەشق‌پێکراو و لاوانی فیرەی عەبدولمـەلیکی و مـەحموودخان لەگـەڵ ئەفشارانی ساین‌قەڵا لە چیمەنی قەرەحەسەنلوو لەسەر ڕێ‌وشـوێنی لەشکری کۆبوونەوە و سەفیان بەست و خەڵکی شار بە گەورە و چکۆلەوە چوونە پێشواز. دیمەنی ئەو جێژنە ئەوەندە جوان و شادی‌هێن و شکۆمەند بوو کە دڵی پیران بـە باری لاوی‌دا گەشانەوە و لەشی بەباری وشک‌هەڵاتوو خوێنیان تێزایـەوە. بـەم شان و شەوکەت و شادمانییە نەجەف‌قولـی‌خـانی بەگلەربـەگ بـە ڕوخـسار و سرشتی میرانەوە بوو بە میوانداری مەزنانی بارگا و کەوڵی خەڵات و شانازی و سەربەرزی بە شانی دادا. بەڕێز میرزا عەبدوڵڵای خوێبەخوێنی مەڵبەند کـە لـە تۆرەمەی شێخ ئەبووبەکری[1] عارفی سەربەدەرەوە بوو، بـە زمـان و ڕاوێژێکـی ڕەوان و پاراو دەقی فەرمانەکەی خوێنـدەوە و گوێـدێرانی خـوار و ژووری لـێ ئاگادار کردەوە. دوای گەڕانەوە بۆ شار و دیوانی حکوومـەت، بـەڕێزانی مـەزن

---

1 - هەتا ماوەیەک بەر لە ئێستا گۆرستانێک هەبوو بە ناوی گۆرستانی شێخ ئەبووبەکر کە ئێستا [تێکدراوە] و قوتابخانەیەکی لێ ساز کراوە. م پ

حاجی میرزا ئاغاسی و حاجی میرزا مووساخان لە باڵەخانەی سەردەری جێگای تایبەتیان بۆ دیاری کرا.

پاش ئەوەی بەگەربەگ لەسەر کورسی دەسەڵات پاڵی دایەوە، لەبەر چەند تێبینییەک مەحموودخانی ئەفشاری سایینقەڵای لە سەرۆکایەتی دیوانی حکوومەتی لابرد و لەڕێوە عەسکەرخانی لە جێی دانا، چونکە خەڵکی شارەکە سەبارەت بە هەڵسوکەوتی نالەباری ناڕەزامەند بوون و هاواریان دەهات. کەلبەڕەزاخانی کوڕی عەلیڕەزاخانی خاڵی بەگەربەگ بوو بە ئێشیک‌ئاغاسی و سلێمان‌بەگی سابلاغیی موکری پلەی سەرکردایەتی یەساوڵانی درایە. چاوەدێری تایبەتی دیوان خرایە سەر شانی سمایل‌بەگی خەلەج کوڕی خان‌ئەمیربەگ کە خزمی بەگەربەگ بوو. حاجی میرزا محەممەدشەریفی کوڕی حاجی ڕەمەزان کرایە سەرحیسابی خەرج‌وبەرجی دیوان. میرزا عەبدوڵڵای عەبدولمەلیکی کوڕی میرزا ئەبولحەسەنی وەکیلی پێشووی ورمێ پلەی وەکیلایەتی باربوو کرا. میرزا محەممەدسەعیدی برای حاجی میرزا محەممەدشەریفی ناوبراو بوو بە کەلانتەری[1] مەڵبەندەکە.

پاش جێبەجێ بوونی ئەم کارانە لە کلکەی مانگی نێوجێژناندا پیاوماقووڵانی دەسەڵات گەڕانەوە. نەجەفقولیخانی بەگەربەگ بەوپەڕی ئەمەگناسی و پێزانین و داوای لێبووردنێکی زۆر هەزار تمەنی لە جێی خەڵاتەکە کردە دیاری و عەسکەرخانیش هەشتسەد تمەنی بە وشکەپووڵ و وشکەماڵ پێشکەش کرد. مەحموودخانیش کاتژمێرێکی لەندەنی کە بایی شێت تمەن بوو داینە خزمەتی و ئەو بەڕێزانە بەوپەڕی ڕەزامەندی و سپاسەوە ڕوویان کردەوە تەورێز و تاران.

---

1 - دەکرێ بڵێین لەو سەردەمەدا پلەدارێک بووە کە بەشێک لە ئەرکی سەرۆکی شارەوانی و سەرۆکی ئاسایشی ڕاپەڕاندووە

# شەڕی قەڵای مووش

یەکێک لە ڕووداوە بەرچاوەکانی پاش ئەوەی نەجەفقولیخان لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵی داوە، تێکهەڵچوون لەگەڵ سەلیمپاشا و گیرانی قەڵای مووشە. وا دیار و ئاشکرایە کە لەم ساڵەدا دەستەیەک لە خێڵات و کوردەکانی سەر بە دەوڵەتی گەورەی ڕۆم لە خاکی ئەواجیقی چاڵدێرانی خۆیەوە کە سەرهەدێکی دیاریکراوی نێوان دەوڵەتانی ئێران و ڕۆمە دەبوونە هۆی شێوانی سنوورەکە و جاروبارە ئەوەندەی بۆیان کرابا بارودۆخیان دەشڵەژاند. هەر بۆیە پاش ئەوەی کە حاکمان و خزمەتکارانی بارەگای پیرۆز هەواڵەکەیان بە پێچکی تەختی پادشایەتی ڕاگەیاند و چۆنیەتی قەومانی ڕووداوەکان بڵاو بوونەوە، میری مەزن لێبڕا کە سەربزێوانی کەوشەنان دەمکوت بکرێن. بەپێی تەگبیر و ڕاوێژی میرزا بوزورگی قایممەقام و گەورەپیاوانی حکوومەتی شکۆمەند فەرمانێک نووسرا بۆ شازادەی جێگرەوەیمیر کە لە ماوەیەکی کورتا هێزەکانی ئازەربایجان کۆ بکاتەوە و بیاننێرێتە بەرەنگاربوونەوەی خەتاکارانی سەرسنووری ڕۆم. جێگرەوەیمیر بەگوێرەی فەرمان گەلێک حوکمی نووسین بۆ حاکمانی ناوچە و مەڵبەندەکان کە تێکرایان حازر بن و ئەو گەلەکۆمەگییە نەجەفقولیخانی بەگەربەگیشی گرتەوە و فەرمانی پێدرا کە دوو لقی سەربازانی ورمێ لەگەڵ لوتفعەلیخانی سەرکردەی لقی هەشت و عەبدوڵلاخانی قاجاری فەرماندەی لقی حەوت و هەزار سوارەی ژێرڕکێفی عەسکەرخانی عەبدولمەلیکی بنێرێتە دەورەی مووش. هەروەها دەستوور درا بە حوسێنخانی سەرداری حوکمڕانی ئێرەوان و حەسەنخانی برای ناسراو بە سەفدەری غازی ساریئەسلان کە بە تەواوی هێزەوە بڕۆنە سەر سەلیمپاشای

حاكمی مووش و هەلكەنە سەری و بیچوخستێنن. دوا بە دوای ئەوان سپای مەراغە، تەورێز، قەرەجەداغ و خۆی و سوارەی چەرداوەڕوو و قەرەپەپاغی سندووس بە حوكمی جێگرەوەی‌میر بە تۆپ و تۆپخانەوە سنووری بایەزیدیان هەلبوارد و خۆیان گەیاندە حوسێن‌خان و حەسەن‌خانی ساری‌ئەسلان. حوسێن‌خانی سەردار نەقی‌خانی قەرەپەپاغ و پەرویزخانی چەرداوەڕووی لەگەڵ تاقمێكی دیاری‌كراو ناردە یاریدەی عەسكەرخانی پێشەنگ و نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگی وێڕای لقی حەوت و هەشت لای خۆی ڕاگرت. هەر لەوێ مەحموودخانی ئەفشاری ساین‌قەلای ئیزن دا كە بە ڕێگای مەراغەدا بگەڕێتەوە و بچێ كوردەكانی سابلاغی موكری كۆ بكاتەوە و وەك تای تەورداس ئامادە و چاوەڕوانی هەوالی دووبارە بێ. بەلام لەو لاوە كاتێك عەسكەرخان و عەبدوسسەمەدخانی دلێری برای وێڕای سوارانی بەرركێفیان بەر لە هەموو قۆشەنەكان گەیشتنە دەورەی قەلای مووش، سەلیم‌پاشا بە هێزی خۆی نازی و لە قەلاتەوە دەركەوت و سپای هێنا و سەفی بەست و لە سانی دا. عەسكەرخانیش بە سپای سوارەوە لە بەرامبەری‌دا ڕاوەستابوو كە لەو دەمەدا نەقی‌خانی قەرەپەپاغ و پەرویزخانی چەرەداوەڕوو وێڕای هێزەكانیان گەیشتن و هەر لەڕێوە كە چاویان بە سەلیم‌پاشا و قۆشەنی كەوت بێ سێ‌ودوو و بێ ئیزنی عەسكەرخان هەلیانكردنە سەری و شەڕیان هەلگیرساند. عەبدوسسەمەدخان كە دیتی ئەم حالە بەم حالە ناشێ خۆی بۆ ڕانەگیرا و چووە هانای نەقی‌خان و ـرویزخان و بەجارێك قرمەقرمی تەپل و توورەتووری زورنای هەلای تێكهەلچوون دەنگی دایەوە و بوو بە بەزم و هەرایەك وەرە سەیری! عەبدوسسەمەدخان كە جەرگی بە قەد حەوت سێلان دەبوو بە هەلمەتێكی شێرانە بالی چەپی لەشكری سەلیم‌پاشای لێك‌بلاو كرد و چەند كەس لە چاوناسانی كوردانی ڕۆمی بە زەبری شیر و نیزە لە خاكی نەمان گەوزاندن. لە بالەكەی دیكەوە كە نەقی‌خانی قەرەپەپاغ و پەرویزخانی چەرداوەڕوو بەوپەڕی ئازایەتی

سەرقاڵی لێکدان بوون و پاڵەوانانە تێرادەچوون، لەپڕێ شکستیان بە سەر شانیدا هات و بەناچار روویان لە شەڕ وەرگێڕا و کوردانی رۆمی بە ورەیەکی بەرزەوە کەوتنە سەریان. لەم کاتەدا عەسکەرخانی کارزان خۆی گەیاندە بەر لێشاوی راکردووان کە پێشیان بگرێ و نەهێڵێ هەڵێن، بەڵام لەناکاو کوردانی رۆمی بە شیری رووتەوە گەیشتنێ و هەڕایانکردە سەر عەسکەرخان. لەو گێژاوی هەرایەدا ئەسپی خانی ئەفشار کەوتە نێو قوڵکەیەکی پڕ قوڕ و لیتە و تێچەقی و نەیتوانی ببزوێ. هاورکێفانی کە ئاوایان چاو پێکەوت هەموویان یەکسمیان تاو دا و خۆیان گەیاندە سەری. محەممەدجەعفەرێکی پیاوی خان لە ئەسپەکەی دابەزی و عەسکەرخانی لێسوار کرد و لەو گێژەنی نەمانە رەتاندی. بەڵام محەممەدبەگ گیرا و کوژرا و سۆقی محەممەدی چاوەدێریش بەخسیر کرا و چەند کەسێکی دیکەی یارانی خانی ناودار بە دیل گیران.

لەو کاتەدا حوسێنخانی سەرداری حوکمرانی ئێرەوان وێرای هێزەکانی گەیشتێ و بە چۆنیەتی رووداوەکانی زانی. سەبارەت بە پرکێشی و خودبەسەری نەقیخانی قەرەبەباغ و پەرویزخانی چەرداوەروو نارەزامەندی دەربڕی و زۆریان بە سەر رۆیی و گەلێکی بە عەسکەرخان هەڵکوت و دڵنوایی کرد. بەڵام عەبدوسسەمەدخانی پاڵەوان وەها سەرقاڵی شەڕ بوو کە بە چۆنیەتی حاڵوباڵی کاکی و گیرانی هاورێیانی نەدەزانی. بەکورتی دوای پەیدابوونی حوسێنخانی سەردار و دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشار و لوتفعەلیخانی ناودار و عەبدوڵلاخانی قاجار، ئێرانی ورەیان بەرز بۆوە و شانبەشانی یەکتر و بێ راوەستان پەلاماری سەلیمپاشایان دا. گوڕم و هەڵمەتی هێزەکانی ئێرانی هێندە بەتەوژم بوو کە سەلیمپاشا و کوردانی رۆمی خۆیان بۆ رانەگیرا و بە شەلەشەل و راکەراکە و کەوتن و هەستانەوە بەرەو قەڵای مووش رەوین و کەوتنە کۆکردنەوەی ئامرازی بەرەنگاری و قەڵاداری. وەختایەک سەلیمپاشا لێیروون بۆوە کە چەند کەس لە یارانی عەسکەرخان بە زیندوویی گیراون و پێشتر لە

دوورەوە دەنگ و ئاوازەی جوامێری و پیاوەتی ئەوی بیستبوو و بە چاوی خۆشی دیتبووی، بەناچار ئازادی کردن و بەڕێی‌کردنەوە نێو هۆردووی ئێرانییەکان. پاشان کە دوو بەتڵی شەو چوو بوو لە قەڵای مووشەوە چەشنی مشک بە کونی دیواری قەڵادا بۆی دەرباز بوو.

بەیانی کاتێک حوسێن‌خانی سەردار بە ڕۆیشتنی سەلیم‌پاشای زانی، بێ‌شەڕ و هەرا قەڵای مووش کەوتە بەردەستی دەوڵەتی پایەبەرزی ئێران. بەڵام سەلیم‌پاشا دواتر پیاوی نارده لای هێزەکانی ئێرانی و گوتی سەر لە پێناو و شاخۆشەویستم. ئەوسا حوسێن‌خانی سەردار عەسکەرخانی لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی سپا بەڕێکردە کن سەلیم‌پاشا و گوتی ئەگەرهاتوو خانی ئەفشار بۆی دەرکەوت کە درۆ ناکا با بڕوای پێ‌بێنێ و بە ڕێزەوە بیهێنێ. عەسکەرخان ڕۆیی و دڵخۆشی داوە و دڵنیای کردەوە و هێنایە هۆردووبەزی دەوڵەتی مەزن. وەختایەک چۆنیەتی ڕووداوەکانیان بە خزمەت جێنشینی‌میر ڕاگەیاند، خەڵاتێکی بە مەبەستی شانازی باربوو کرد و بۆی نارد. لە سەرەتای مانگی محەڕڕەمدا لەشکر و سەرکردەکان هەموویان ئیزن دران و بەرەو مەوتەنی خۆیان گەڕانەوە.

# شەڕی ئێران و عوسمانی لە تۆپراققەڵا و شکانی سەختی عوسمانییەکان

سولتانی عوسمانی بە مەبەستی تۆڵەی شکستی قەڵای مووش، حاجی حەسەنپاشای سپاسالاری ناسراو بە چەمەن ئۆغلی بە شێست هەزار چەکداری رۆمییەوە بەرەو ئازەربایجان گاڵ دا. کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتە بارەگای فەرمانڕەوایەتی لە تەختی دەسەڵاتەوە فەرمان نووسرا بۆ شازادەی جێگرەوەی‌میر کە بە هەموو هێز و لەشکری ئازەربایجانەوە بچێتە بەرەنگاربوونەوەی سپای عوسمانی. سەرکردایەتی سپای عێراقیان خستە ئەستۆی لوتفعەلیخانی کوتوواڵ (قەڵادار) و ناردیانە ئازەربایجان کە لە رکێفی جێگرەوەی‌میردا رێوشوێنی شەڕی پیرۆز بەڕێوەبەرێ. بۆیە لە لایەن جێنشینی‌میرەوە چەند فەرمانێکی سەر لە پێناوی نووسراو بۆ حاکمان و سەرکردەکانی لەشکری حکوومەت و لەم نێوەدا نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێش حوکمی بۆ چوو کە دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشار و پێنسەد کەس سوارە بە سەرکردایەتی محەمەدوەلیخانی برای بەگلەربەگ و بە فەرماندەیی لوتفعەلیخانی مامی بەگلەربەگ بنێرێ و ئەسەدوڵلاخانی عەرەبلوو وەک سەرتیپی تۆپخانە و فەزانئاغای سەعدلوو وەک سەرلق بەڕێ بکا و عەسکەرخان بە دەمسپی و کەیخودا دابنێ و لە کلکەی مانگی شەشەکاندا ببزوون و لە «مێرگی باغی» مەڵبەندی دڵبزوێنی خۆی بکەنە کاروانی شکۆمەندی جێگرەوەی‌میر. کاتێک هەمووی ئەمانە لە ماوەیەکی کورتا بە ساز و پەرداخی گەیشتنە مێرگی باغی خۆی، شازادەی جێنشینی‌میر هۆردووی بەختیاری لەوێوە دەنگ دا و چوونە ئەواجیقی چالدێران.

بەلام با چەند وشەیەک سەبارەت بە حوسێنخانی سەرداری حوکمڕانی نێرەوان و حەسەنخانی ساریئەسلانی برای بخرێنەڕوو. پێشتر باسی کرا کە دوای ڕاکردن و خۆ بە دەستەوەدانی سەلیمپاشا، حوسێنخان و براکەی ئەو ناوچەیان داگیر کرد و بۆ ماوەی چوارمانگ لە قەلای مووش بنەیان داکوتا. کەچی لەپڕ لە ئاخری مانگی شەشەکاندا چاردە پاشا (سەرکردە) لەگەڵ هێزەکانی ڕۆم داوەرین و خۆیان نواند. حوسێنخانی سەردار لەڕێوە ساریئەسلانی برای نارد کە بەرەگەیان لێبگرێ و بەرەنگاریان ڕاوەستێ و لەم شالاوەدا گوڵچێچێن ئۆغلی سپاسالاری لەشکری ڕۆم بوو. هێشتا هیچ لایەک دەستی نەبزاوتبوو کە مزگێنی درا بە ساریئەسلان ئەوا قۆشەنی بەختیاری جێگرەوەیمیر گەیشتە تۆپراقەلا. هەر کە ئەم هەواڵەی بە گوێی ئاشنا کرا خێرایەکی سەری یەکسمی وەرسووڕاند و خۆی گەیاندە ڕکێفی شایانی و ئاوزەنگی بەتاڵ کرد و بە خزمەتی ڕاگەیاند کە پێمخۆشە هەوساری سەرکردایەتی مەیدانم باربوو بفەرمووی. بەلام شازادە ئیزنی نەدا چونکە بەڕێزی بەرزمجێیان ڕۆژی یەکشەممۆی بۆ تێکهەڵچوون دیاری کردبوو، هەروابێتەوە هێشتا پاشماوەی سپا نەگەیشتبوونە کاروانی شکۆمەندی. ساریئەسلان دەستی هەڵنەگرت و گوتی لە دەورت گەڕێم:

ئەتۆ ئەمڕۆ لە دەشتی شەڕگە بڕوانە کەوا هەردەم
بزانە چی بە سەردێنم پڵینگی شەڕکەری سەردەم

بەگشتی پاش پێداگری و سووربوونی لەسەر داواکەی، شازادەی هێژای کامڕەوا ئیزنی تێکهەڵچوونی دا و ئەویش سەری دانەواند و بەهەشتاو خۆی گەیاندە پەنا تۆپراقەلا. چونکە ئامانجی ڕۆمییەکان لەو هرووژم و هەرایە گرتنی ئەو قەلایە و دەرکێشان و دابڕینی بوو لە چنگ هێزەکانی ئێران. بەلام مەزنانی نێرەوان و قەلاداران بە فەرمان و جەختی سەرداری ناوبراو شێلگیر و

پتەو خۆیان دایە قەڵاداری و چاویان لــە پێمـل بــوونی حکوومــەتی عوسمــانی نووقاند. لەو کاتەدا حاجی ئیمامعەلی بەگی خــۆیی ناســراو بــە حــاجی بــەگی سەرلکی تۆپخانە بە چەند دەزگا تــۆپی جیــاوازی گەیــشتنەجێ و تۆپــەکانیان بەرەو ڕۆمییان دابەستن و ئاگریــان دان. تۆپچییــەکی عوسمــانی وەبــەرهات و گوللەتۆپ کردی بە حەوانیلکە و تەواوی ئازای ئەندامی لەتوکوت بوو.

لەم گرمە و هەرایەدا حاجی حەسەنپاشای ناســراو بــە چێچــێن ئۆغــلی سپاسالاری بایەزیــد لەگــەڵ چەنــد ســەرکردەیەکی وەکــوو عەبدوڵلاپاشــا و مرادپاشا و برایمپاشا هەڵیانکردە سەر حەسەنخانی سەردار. لەو برە هێرشەدا شوێنەواری تێکشکان لە نێو سوارانی نەقیخانی قەرەپەپاغی ئێروانیدا خــۆی دەرخست و جــەنابی جێگــرەوەیمیر کــە لەســەر گردێکــەوە دەیــڕوانی هــەر پەکووپەکووی بوو. کەچی لەو وەختەدا حەسەنخانی سەردار بە هەشــتهــەزار سوارەوە گەیشتە بەرڕکێفی جێنشینیمیر کە کراسی بە نوشتەی گوللەبەندی لــە بەردا بوو. لەوێوە ئەسپی دەنگ دا و هۆمەنی بردە سەر دوژمنان و حەولەوەلای خستە دەروونی ڕۆمییان. دوا بە دوای وی ئەسەدوڵلاخانی ئەفشاری عــەرەبلوو ســەرتیپی تۆپخانـــە، لوتــفعــەلیخــانی ســـەرکردەی لقـــی هەشـــت، محەممەدوەلیخانی فەرماندەی سوارانی ناودار، لوتفعــەلیخــانی کوتــووال، برایمخانی سەرلق، برایمخانی سەردار و سمایلخانی بەیاتی قاجار ئەو دوو برا ئازایە لەگەڵ عەبدوسسەمەدخانی بــرای عەسکەرخانی ســەرکردەی ســواران، گورمیان بەستە سەر جەرگەی لەشکری ڕۆمییەکان و بوولەرزەیان تێخستن.

لەم جەنگەیەدا لوتفعــەلیخــانی کوتــووال ومبەرتفــەنگی شــەرکەرانی عوسمانی هات و بە فیــشەک ئــەنگوا و چــووە نێــو ڕیــزی شــەهیدانی شــەڕی پیرۆزەوە و بوو بە ڕووســووری دنیــا و قیامــەت. کاتێــک خەزاکــەرانی ئێــران پیاوێکی ئاوا ناوبەدەرەوەیان بە کــوژراوی و شەلالــی خــوێن هاتەبــەرچاوی، چەشــنی شــێرانی دەرهەڵــبوو خۆیــان هاویــشتە نێــو گێــژاوی نــەمان و

ئەسکەندەرخانی قاجار کە فەرماندەی تۆپخانە بوو لەگەڵ تۆپچییەکانی چەند هەڵمەتێکی سەختی بردە سەر لەشکری عوسمانی و لە جێگای خۆی هەڵیکەندن. بەڕاستی کوشتارێک کرا کە خڕ و دۆڵ بە تەرم و تەرمەکی کوژراوان وەکوو تەپۆڵکان ملیان قوت کردەوە و چیا بە خوێنیان بوو بە رووبـاری جەیحوون. دەتکوت لەو دەشت و گردانە گوڵاڵەیان چاندووە یان خاکی شەرگەیان بە رەنگی ڕۆنیاس هەڵشێلاوە و سووریان هەڵگێڕاوە. جەلالەدین چێچێن ئۆغلی سرشتی گورگانەی فڕێ دا و کەوڵی مەڕی بە سەر خۆی هەڵکێشا و بۆ ڕاکردن لە هاوڕێیانی تێپەڕاند و لاقی لێبوونە باڵ و لەگەڵ حافز عەلیپاشا خۆیان هاویشتە سەنگەر و لەوێ لەنگەریان گرت. ئەو کات ئێرانی هەڵیانکوتایە سەر مەتەرێزی ڕاکردووان و دەستیان لە تاڵان و چلپاندن نەگێڕایەوە. چێچێن ئۆغلی بە ڕاکردن خۆی گەیاندە عەرزەڕۆم و فەرماندەکانی دیکە هەر یەکەی بۆ لایەک بازرە بوون. جانیخانی سەرۆکی دەزگای ئاسایش مزگێنی ڕەوینی چێچێن ئۆغلی برد بۆ شازادەی بەرزەجێی جێگرموەیمیر و دەمخۆشانەی دەرایە و بە سەرکرایەوە. بەکورتی لەو تێکەوڵێکە سەیر و سەمەرەدا لە حەفتاهەزار کەسی سپای عوسمانی نیزیکەی پەنجاهەزاریان یان گیران یا کوژران و بەرەو هەرێمی نەمان چوون. سەرانسەری هۆردووگای ڕاکردووان بە چنگ لەشکری ئێران داڕووتا و تاڵان کرا. میرزا فەزلولڵای خاوەری بە نازناوی «شیرازی» دەستەشێعرێکی سەبارەت بەم سەرکەوتنە هۆنیوەتەوە کە ڕێکەوتی ڕووداوەکەی ئاوا خستۆتەڕوو:

ڕێکەوتی سەرکەوتنم لە پیری عەقڵ پرسی
گوتی لە شاهی عەبباس دەرگای ڕۆم کرانەوە[1]

❖❖❖❖

---

1 - «گفتا ز شاه عباس ابواب روم مفتوح». کە وشەی یەکەمی لێلابچێ دەبێتە ساڵی ١٢٣٨ی کۆچی : ١٨٢٢ ـ ١٨٢٣ ی زایینی.

## شێوانی کاروباری حکوومەتی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ و نێردرانی میرزا محەممەدتەقی قەواموددەولەی ئاشتیانی بۆ پێداچوونەوەی بەشی دارایی و مردنی مەحموودخان

میرزا محەممەدتەقی قەواموددەولە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی خوابەخشیو حوسێنقولیخانی بەگلەربەگدا سەروبەری کاروباری دارایی مەڵبەندی ورمێی بردبۆوە سەر یەکتر و کۆی کردبۆوە، دیسانیش لەسەر فەرمانی جێگرەوەی میر نێردرایەوە ورمێ کە بە گرێوگۆڵی کاری سەرکار و پاکاری حکوومەتیدا بچێتەوە، هەتا بتوانێ سەنگوسووکی بخاتەوە گەڕ و کارەکان ڕاست بێنێ. کاتێک پێینایە ورمێ بە هان و هاودەستی مەحموودخان کە لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمی نەجەفقولیخانەوە لەبەر چەند هۆیەک دەم لە پووش و خانەنشین دەژیا و عەسکەرخان بە تەواوی کاروباری مەڵبەند و حکوومەت ڕادەگەیشت، کەوتە بێپارسەنگی. پێداپێدا پسوولەی باج و پیتاکی دەنووسین و تەنانەت دەستی درێژ کردە نێو کاروباری دەسەڵاتیش و وای لێهات کە بەگلەربەگ هەوساری کارانی لە چنگ دەرچوو. خەڵک بەناچار لەبەر زوڵم و زۆرملی قەواموودەولە وەتەنگ هاتن و زیرەیان لێهەستا و هاوار و ناڵەیان گەیشتە ئاسمان. لەم ماوەیەدا نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ بەوپەڕی پشوودرێژی و لەسەرەخۆیی لە هەڵسوکەوتی زۆردارانی دەروانی و سەرەنجام چۆنیەتی ڕووداوەکانی لە کاغەزێکا نووسی و بە کابرایەکی باوەرپێکراودا ناردی بۆ خاکی بەرێی میری بەرزەشان فەتحعەلیشا لە تارانی پایتەخت. پاشای پایەبەرز کاتێک نامەکەی نەجەفقولیخانی خوێندەوە، لەمێژینەبوونی خزمەتی بەگلەربەگانی ئەفشار، بەتایبەت خوابەخشیو حوسێنقولیخانی تێهێنا. ئەوسا

بە فەرمانێک داوای کرد کە نەجەفقولیخان هەتا تاران بێ و گیر نەبێ. هەربۆیە لە سەرەتای مانگی شاباندا بەگەربەگ بە تەگبیر و ڕاوێژی عەسکەرخانی ڕیشسپی، خۆی ساز کرد بۆ سەفەر و ڕۆژی یەکشەممۆ ٧ی ئەو مانگە تەشریفی لە ورمێوە بزووت و قۆناخی یەکەمی بردە کەریزەی ئەنزەل و لەوێ وچانی دا.

دوای ڕۆیشتنی نەجەفقولیخان، سەر لە ئەنگۆری ڕۆژی دووشەممۆی ٨ی مانگی شابان لەو دەمەدا کە مەحموودخانی ساینقەلای ئەفشار دەستنوێژی تازە کردبۆوە و خەریکی بەجێهێنانی نوێژی ئێوارە بوو، بە مەرگی مفاجا گیانی لە دەس دا.

بۆ سبەینێ میرزا محەممەدتەقی قەواموددەولە و عەسکەرخان لەگەڵ مامۆستایان و پیاوماقوولانی ئەفشار لەسەر مەیتەکەی کۆبوونەوە و پاش ئەوەی ناشتیان خێر و خێراتیان بۆ بەخشییەوە و جارێ لێیگەڕان کە لە هەڵێکی گونجاودا ڕایگوێزن بۆ بەردەرانەی بەرزی ئیمامان.

نەجەفقولیخان مەودای ڕێگای کورتا و گەیشتە تەورێز و دوای ئەوەی چووە خزمەت جێنشینیمیر، ئیزنی وەرگرت و بەرەو تارانی پایتەخت کەوتەڕێ و لە شەوی نەورۆزی پیرۆزی میریدا ژێردەرانەی بارەگای فەرمانڕەوای ڕامووسی. بەپێی فەرمان لە بالەخانەی یۆسفخانی سپادار جێگایان بۆ دابین کرد. لەوێ هەواڵی سەبارەت بە ورمێ بڵاو بوونەوە و بە خزمەت نەجەفقولیخان ڕاگەیەندرا کە پاش ئەوەی تەشریفیان لە ورمێ دەرکەوتووە، دیسان میرزا تەقی قەوامودەولە دەستی کردۆتەوە بە زۆرەملێ و نووسینی پسوولەی پیتاک. جەماوەری ئەفشار بە ئاماژە و دەی عەسکەرخان لێیوەخۆ کەوتوون و زەبروزەنگیان نواندووە و ڕووداوی دزێو قەوماوە و کار گەیوەتە جێگایەک کە قەوامودەولە پەنامەکی بەرەو تەورێز ڕایکردووە.

# گەڕانەوەی نەجەفقولیخان و بەخشرانی شانازی حکوومەتی ورمێ بە شازادە مەلیکقاسممیرزا و مانەوەی خانی ئەفشار لە پلەی بەگلەربەگایەتیدا

شازدە مەلیکقاسممیرزا کوڕی فەتحعەلیشای قاقان (خاقان) کە لە داوێنی کچی ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ بەربۆتەوە، لەگەڵ شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا برای دایک و بابییە.

وەکوو پێشتر باسی کراوە، وەختایەک کە جێگرەوەی پایەبەرزی میر دەڕۆیی بۆ حوکمڕانێتی لە هەرێمی ئازەربایجان، فەرمانڕەوا فەرمووی کە ئەم دوو برا تەمەن کاڵ و منالە لەگەڵی بڕۆن هەتا لە ژێر سێبەری سۆز و ڕاهێنانی بەڕێزیاندا هەڵدەن و پێبگەن. لەو ڕۆژگارەدا کە نەجەفقولیخانی خالۆزای شازادەکان سەرلەنوێ بە خەڵات و حوکمی دەسەڵات و مۆرنەقیمی باربووکراوی پادشاوە لە تارانەوە هاتەوە تەوریز، جێگرەوەی بەڕێزی میر وای بڕیار دا کە حکوومەتی ورمێ و سەرۆکایەتی ئەفشاران بە ناو بۆ مەلیکقاسممیرزا بێ و بەرەسمی بە چنگ نەجەفقولیخانەوە بێ! ئەویش بۆ ئەوەی فەرمانی شازادەی بەجێهێنابێ بە ڕووی خۆشەوە سەری ڕەزامەندانەی لەقاند و ئەو کات بە ئەگبیری پیاوماقووڵانی جێگرەوەیمیر هەموو نۆکەر و غولام و خزمەتکاران کەوتنە ژێر حوکمی شازادەی مەزنەوە.

بەکورتی پاش نووسرانی حوکمی چارنووسی ڕەحمەتبار بەڕێز شازادەی گەورە لە خزمەت جێگرەوەیمیر ئیزنی خواست و ڕۆژی پێنجشەممۆ ١١ی مانگی شەشەکانی شکۆمەند لە تەوریزەوە بزووت. میریمیرانی گەورە نەجەفقولیخان و عەسکەرخانی ڕدینسپی خێڵ و جەماوەر لە ڕکێفی شازادەی

بەرزەجیدا بوون. پاش بڕینی چەند ڕۆژەڕێیەک لە نیزیک ورمێ بەگلەربەگ و عەسکەرخان لە پێشدا ڕۆیشتن هەتا پێداویستییەکانی ڕێوشوێنی پێشوازییەکی شایان پێکبێنن. ڕۆژی سێشەممۆ ١٦ی مانگ جەماوەری خێڵی ئەفشار هەتا مێرگ و چیمەنی گوندی قەرەحەسەنلوو بە پیرییەوە چوون و شازادەی بەرزەشانیان بەوپەڕی شەوکەتەوە گەیاندە باغی کەمالئاباد. تەشریفی سێ ڕۆژ لەو باغەدا بنەی خست و ڕۆژی هەینی ١٩ی مانگ بە دەروازەی گەڕەکی هەزاراندا پێیناپە کۆشکەڵی سەردەری و خانەمیر بە پێوقەدەمی پیرۆزی شازادەی کامڕەوا ڕازایەوە و شۆق و شەبەنگی دایەوە. لە دیداری گشتیدا بە چاوی سەرنجەوە لە حاڵوباڵی ئەمیرانی ئەفشار خورد بۆوە و هەر کەس شانی چۆن هەڵیدەگرت بەسەریکردەوە و بە سیلەچاوی میرانە خوێندییەوە. عەسکەرخان سەرلەنوێ جڵەوی حکوومەتی کوردستانی درایەوە دەستی و نەجەفقولیخان وەک جاران کاروباری گرینگی وڵاتەکەی کەوتەوە ئەستۆی.

## ئەو ڕووداوانەی کە لە مەودای سالانی ١٢٤٠ ـ ١٢٤١ی کۆچی / ١٨٢٤ ـ ١٨٢٥ی زایینیدا قەومان

سەرەتای نـەورۆزی پـیرۆزی ئـەم سـاڵ کـە شـنەی گیـانپـەروەرێنی خاکەلێوەی بەهار بە بۆن و بەرامەی خۆشی مێشک و هەناوی خەڵکی زەمانــەی دەلاواندەوە، سی و شەش ساڵ بە سەر فەرمانڕەوایەتی فەتحعەلیشای قاجاردا تێپەڕیبوو کە پێیدەڵێن قەڕنێک. هەر بۆیە گەورەپیاوانی دەوڵــەت و کاریتــە و کۆلەکەی دەسەلات، بەڕێزیان بە ساحێبقران ناودێر کرد. لەبــەروەی هێنــدەی کوڕ و کوڕەزا لە پشتی کەوتبۆوە بە ئەبولملووک و کەیوومەرسی سەرزنجیرەی پادشاهانی پێشدادی ناوی دەهات! بەم بۆنەوە گەلێک جێژنی گەورە و شایانیان پێکهێنا و کردیانە بەزم و هەرا. لە ورمێش سەر گەرمی بــادەی شــادی و دڵ لــە گەشە و نەشە بوون، بەتایبەت کە هێژا مەلیکقاسممیرزا ئیزنی دیــداری گشتی دا و دەستووری فەرموو کــە بیکەنــە چــۆپی و چراخــان. سپاســالاری گــەورە و سەرکردەکانی لەشکر کە لە خزمەتیدا ئامادە بوون بە دەنگی بــەرز پیرۆزبــایی ئەم ڕێکەوت و خەلاتە یەزدانییەیان لێکرد.

پاش ئەم کارانــە حــاجی عــەلیارخانی ســەرۆکی تــیرەی گۆنــدوزلوو، محەممەدحەسەنبەگی پێشکاری کــردە کــەیخودای کــاری خــۆی و دیاریيــەکی بەرچاو و شیاوی نارده خزمەتی کە حوکمی سەرۆکایەتی ناوچەی دۆڵ بە نــاوی محەممەدتەقیبەگی کوڕە گەورەی لێبدرێ. چونکە شــازادە پێــشتر فــەرمانێکی ئاوای بە ناوی محەممــەدڕەفیعبەگــەوە نووســیبوو، داوای حــاجی عــەلیارخان وەرنەگیرا. هەر بۆیە محەممەدحەسەنبــەگ کــە کەیخودایــەتی لێکرابــوو بــەم هەڵوێستەی شازادە تــۆرا و بـــەرمو تــەورێز بـــزووت. نەجــەفقولــیخــان مامۆستایەکی دینی لەگەڵ ئەسەدولــلابەگی عــەرەبلووی ســەرتیپی تۆپخانــەی

نارِدن کە بچن و بیگێڕنەوە، بەلام بە گوێی نەکردن و هەتا تەورێز ڕانەوەستا. پاش ڕۆیشتنی ئەو شازادی بەرزەجێ جارێ میرزا مەسعوودی ئەنساری لە جێی دانا و میرزا سمایلی ئاشتیانی کردە دەمڕاستی وەرگرتنی پیتاکی حکوومەت.

ڕووداوێکی دیکەی ئەم ساڵە پەیدابوونی قاتیوقڕی بوو. هەروەها لەم ساڵەدا «ئەلێکساندر باولیچ»ی خونکاری دەولەتی گەورەی ڕووسیا بە مردنی خۆی مرد. خەلکی ئازەربایجان و مسولمانان کە دانیشتووی ئەوبەری چۆمی ئاراس و مەڵبەندی قەفقاز بوون، کەوتنە سەرهەلدان و ڕاپەڕین دژی دەولەتی ڕووسیا و بە نووسی نامە ئیزنیان لە فەرمانڕەوای ئێران و پێشەوایانی دینی دەخواست کە ڕێگایان بدەین هەتا خۆیان بدەنە شەڕی پیرۆز.

ساڵی ١٢٤١ی کۆچی لەبەر کەمبوونی دەغڵودان و بلاوبوونەوەی ملۆزمی کرم لە نێو بەرهەمی کشتوکاڵیدا، گرانی و پەرێشانی مەڵبەندی ورمێی هەڵگرت و هەتا تەواوی ناوچە دوورەدەستەکان پەڕی هاویشت. زۆربەی جەماوەری ورمێ خۆیان بێنەدەژیا و لە برسان مەوتەنیان چۆڵ کرد و ڕۆیشتن. لەم سەروبەندەدا لە تەورێزەوە «میرزا موقیم»ناوێک بە پێشنیاری میرزا تەقی قەوامودەولەی پێشوو کاروباری وەزارەت و کۆکردنەوەی دارایی ورمێی خرایە سەر شانی. ئەگەرچی گەنم و جۆ وەکوو دەرمانی چاوئێشە وابوو، بەلام دیسانیش ئەو کابرا ناجسن و زالمە بە ئاشکرا پسوولەی دانی پیتاکی دەنووسی بۆ جەماوەری ئەفشار و گزیری لەزەبر و توند و تیژی بە سەر وەردەکردن. بەناچار خەلکی بێچارە لەبری هەر خالوارێک چوار تمەنیان دەدا و ملیان پێدادێنا. وا هات کە شازادەی بەرزەجێ لە دە ڕۆژەی یەکەمی عاشووورادا بە هانی مەیلی نەوسانی تاسەی بزووت کە چاوی بە شەڕی حەیدەری و نیعمەتی بکەوێ کە لە هەموو جێیەکی ئێرانا باو بوو. لۆتیوپۆتی گەڕەکان و لات و شەلاتی کەسنەناس کە هەمیشە خوازیاری ئەم بۆچوونە هەڵبەستراوانە بوون بە چەکەوە لە مەیدانی سەردەری کۆبوونەوە. هەردک لا واتە حەیدەری و نیعمەتی

بەرەورووی یەکتر راوەستان و سەرەتا بە جەفەنگ و چنگەپرکە و پاشان بەراستی تێکبەربوون و شەڕی ئەوەندە قورسیان لە نێوانیدا قەوما کە چەند کەس تێداچوون و زۆریان برینی قووڵیان هێنا. شازادەی بەرزمجێ کە لە باڵەخانەی سەردەری دانیشتبوو و دەیڕوانی تۆقی و هەڵاتەوە ژوورا

لەم کاتەدا عەسکەرخان کە بە مەبەستی برینەوەی دەستی چەوسێنەوەی میرزا موقیم لە بیانوویەک دەگەڕا، ئەم هەرایەی خستە ئەستۆی و شەڕانی و چەقۆکێشی تێندان کە دەریبەڕێنن. لەبەروەی جەماوەری ئەفشار کێردیان گەیبوویە یەسقانی و گیانیان هاتبوویە سەر لێوان بەتێکڕا هەرایان کردە سەر ماڵی میرزا موقیم و ئەویش زانی ژیانی کەوتۆتە مەترسی و پێینایە ئاوزەنگی و بەپرتاو بۆی دەرچوو. پاش رۆیشتنی ئەو میرزا مەسعوود و میرزا حوسێنی برای عەسکەرخان بوونە هاودەست و پێشکاری سەربەخۆ.

هەروەها لەم ساڵەدا سنووردارانی ئێران و رووس کێشەیان لە مابەینیدا قەوما و هەردک دەوڵەت بەراستی نێوانیان شێوا و کار گەیشتە گەف و هەرا. زانایانی ئایینی کە خۆیان بە جێنشینی ئیمام [مەهدی] دەزانن، بەتایبەت بەرێز سەید محەممەدی ئیسفەهانی بۆ شەڕی پیرۆز لەگەڵ حکوومەتی رووسیا فتوای دەقوبۆغریان دا. هەروەها بەرێزی خاوەنشکۆ فەتحعەلیشایان پاڵ پێوەنا کە قەراروبڕی ئاشتبوونەوە و پێکهاتنیان لەگەڵ هەڵوەشێنێتەوە. لەبەروەی بە ئامانجی [تاوتوێ کردنی] ئەم مەبەستە دەستەیەک لە مەزنەمامۆستایان دەچوونە تاران، شازادە مەلیکقاسممیرزاش ئاغاعەلیئەشرەفی ئیمامجومعەی ورمێی بەشان و شەوکەتەوە بەرێکردە تەورێز.

## گیرانی قەڵای گەنجە و کوژرانی ئەمیرخانی سەردار

لەبەروەی کە قەڵای گەنجەی قەرەباغ جەوادخانی قاجار پێشتر حوکمڕانی بوو، لەم سەروبەندەدا جێگرەوەی‌میر، ئاغورلووخانی کوڕی جەوادخانی لەگەڵ محەممەدوەلی‌خانی ئەفشاری قاسملوو کە سەرکردەی سوارانی ئەفشار بوو ناردی بۆ ئەو شوێنە. جەماوەری گەنجە بوونە پشتیوانی ئاغورلووخان و لەگەڵ سپای رووس تێکەوتن و شەڕیان کرد و سەرەنجام سەرکەوتن و کوڕی جەوادخانیان بە یارمەتی محەممەدوەلی‌خان بردە سەر تەختی دەسەڵات. لەم کاتەدا کە بەڕێزی جێگرەوەی‌میر بە مەبەستی گرتنی قەڵای شووشی قەرەباغ دەبزووت، ئەمیرخانی سەرداری خاڵی خۆی وێڕای دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشار بە سەرکردایەتی لوتفەعلی‌خانی کوڕی ئیمام‌قولی‌خان و عەبدوڵلاخانی قاجار و محەممەدوەلی‌خانی کوڕی حوسێن‌قولی‌خانی فەرماندەی سوارانی ئەفشار و عەبدوسسەمەدخان و نەزەرعەلی‌خانی مەرەندی ناردنە گەنجە. خۆی لە سەرەتای مانگی محەڕڕەمدا گرێی کەمەندی گەمارۆی لە قەڵای شووشی توند کرد و لە هەموو بالانەوە مەتەرێزی قایمی وردەوردە بەرەوپێش برد. پارێزەرانی قەڵا دەیانکردە هەرا کە یاریدەر و پشتیوانمان دەگاتێ و گەرماوگەرم بە گوێیان‌دا دەخوێندن و غەزاکەرانی ئیسلامیان لە کاری خۆیان دڵسارد دەکردەوە. لە لایەکەوە محەممەدمیرزای کوڕە گەورەی جێنشینی‌میر لەگەڵ محەممەدقولی‌خانی کوڕی ئاسەفوددەولەی خاڵۆزای ڕاسپێردرا کە بچێتە گەنجە و نەهێڵێ هێزەکان لەگەڵ ڕووسان پێکدادەن و شەڕیان لە نێوانی‌دا بقەومێ. کەچی لەو لاوە مینڕاڵ مەدەتۆف کە لە دەوڵەتی ڕووسیادا بە چالاک و ئازا دەناسرا، وێڕای ... ژمێرێکی زۆری ساڵدات و سوارە و پیادەی قازاخ و ئەرمەنی و بیست تۆپی ئاگربار و تۆپچییانی ناوداری پەنجەپۆلاوە ڕووی کردە گەنجە.

ئەمیرخانی سەردار گەنجەی ئەسپاردە دەست نەزەرعەلی‌خانی مەرەندی و خۆی ڕۆژی شەممە ١٤ی مانگی سەفەر لە ڕکێف شازادەی بەرزەجێ محەممەدمیرزادا بەرەو شەڕ و تێکهەڵچوون بزووت. لە نێو کاول و هەرەسەکانی «شەمەش کۆر»، شەڕێکی قورس لە نێوان ئەو سەردارە بەغیرەتە و سپای مەدەتۆفی بادیەوادا قەوما. فەرەجوڵلابەگی ئەفشاری مەحموودلوو سەردەستەی

سوارەی ئەفشار کە پێشەنگ بوو، بێ ترس و خۆف لەگەڵ بەرایی لەشکری رووسیا لێکی دا. قۆشەنی رووسان بە هاویشتن و تەقاندنی فیشەک و گوللەتۆپان کۆمەڵی قزلباشانیان لێک‌بلاو کرد. لەو بگرە و بەردەیەدا فەرمجوڵلابەگ ئازایەتی نواند و سەری چەکدارێکی رووسی بڕی و خلۆری کردەوە بەر سمی ئەسپی سەردار و ئافەریمی لێکرا و دەسخۆشانەی درایە. بەکورتی ئەمیرخانی سەردار کە پیاوێکی زۆر بەجەرگ و چاونەترس بوو سەرەرای ئەوەی لە چەند جێگاوە قووڵ ئەنگوابوو، بەلام دیسانیش کۆڵی نەدەدا و هەروا ئازایەتی و چالاکی دەنواند کە خوداوراستان گوللەیەکی ئاگرین پێکای و گیانی دایە دەست بەدیهێنەری گیان. سپای ئێران بە کوژرانی سەردار ورەی دابەزی و کەوتە پێ‌پرکە و زاڵبەگی گۆندوزلووش گیرا. مەدەدۆف دوای پرش‌وبلاوبوونی ریزەکانی لەشکری وەکوو دەریا پرشەپۆل، بە تۆپ هاویشتن و بێ دەرد و کوێرەوەری بەرەو گەنجە ئاژاوتی. نەزەرعەلی‌خانی مەرەندی قەلای چۆل کرد و رەوی. ئێرانییەکان بە مەبەستی راگەیاندنی چۆنیەتی رووداوەکان، لوتفولڵابەگی موقەددەمیان ناردە خزمەت کاروانی شکۆمەندی جێگرەوەی‌میر.

کاتێک ئەم هەواڵە سامناکە لە قەلای شووشی بە خزمەت جێنشینی‌میر راگەیەندرا بە کوژرانی ئەمیرخانی خاڵی هاڵۆزکا و تێکچوو. لەرێوە خێلاتی قەرەباغی لەگەڵ مەهدی‌قولی‌خانی جەوانشێر بەرەو قەرەجەداغ کۆچ‌پێدا و دەستی لە گەمارۆی شووشی هەلگرت و بەپەلە رووی کردە گەنجە و کاتێک گەیشتێ کە مەدەدۆف گرتبووی. تازە شەڕ نەدەکرا و ئێرانی بلاوەیان لێکردبوو. ئەوسا دەستووری دا کە نەزەرعەلی‌خانی مەرەندی بێنن و کاتێک هات بە سەری‌دا نەڕاند و قسەی سووکی نایە پارسەنگی و فەرمووی ریش و سمێڵیان هەلکەندەوە و نەوتی [رەشیان] لە دەموچاوی هەلسوو و پشتاوپشت سواری کەرێکی بێ‌جلوبەرپان کرد و بە نێو هۆردوودا گێڕایان.

❖❖❖❖

## شەڕی دووبارەی جێنشینیمیر لەگەڵ هێزەکانی مەدەدۆف و ئاکامی تێکهەڵچوونەکە و دەوری ئەفشارانی ورمێ

بەڕێزی جێگرەوەیمیر کە خۆی گەیاندە گەنجە مینراڵ مەدەدۆف شەوێکیان لە قەڵابە دەرکەوت و پشتی بە حەوشەوە دا و لە مەیدانی تێکهەڵچوون چەقی. هەر لەم کاتەدا مینراڵ پێسکۆویچ بە چوارهەزار سالدات و تۆپخانەوە گەیشتە لای مەدەدۆف و ئەویش پێیگەشایەوە و پشتی پێیئەستوور بوو. جێنشینی پایەبەرزی میر کاتێک زانی مەدمدۆف یارمەدری گەیوەتە لای، بەپارێز هەنگاوی نا نەکوو بە شەوگوردی رووسان بتەزێن.

بۆ سبەینێ کە رۆژی دووشەممە ٢٠ی مانگی سەفەر بوو، دوو لەشکری بێسنوور لە خەوی قورس هەستان و سەفیان بەستن. سپاسالاری دەوڵەتی رووس قۆشەنی سووربۆشێ شەرابنۆشی کە سەرمەستی شەرپەرست بوون چەشنی دیمەنی بووکان و چاوی کەڵەشێران تیفتیفەی دان و جوانی کردن. پاشان تۆپی سماتەشکێنی لەسەر رێوشوێنی دیاریکراوی سپای رووسان بەرەو ئێرانییەکان دابەستن. لەم لایەوە ئەسەدوڵلاخانی ئەفشاری عەرمبلووی سەرتیپی تۆپخانە، شەشسەد تۆپی بەرەورووی رووسان رێک و راست کرد. لوتفعەلیخانی ئەفشار و محەممەدوەلیخانی برازای لەگەڵ دوو لق سەرباز و سوارانی دسکەرەوەی ئەفشار کەوتنە باڵی راست و لە قوڵی چەپ برایمخانی سە، تیپ و سوارانی موقەددەم و موکری و پیادەکانی ئەستەرابادی و مازندەرانی دامەزران و خودی جێگرەوەیمیریش لە پەنا دۆڵێک بنەی داکوتا. قاسمخان، سۆهرابخان، حاجی بێژەنخان و بەحیاخانی پێشخزمەتی تەورێزی هەموویان لە خزمەت رکێفیدا بوون.

بەڵام مەدەدۆف تۆپخانە و سەربازانی رووسی بەرەورووی سپای ئازەربایجان دامەزراند و تاقمی قازاخی لە حاند قۆشەنی مازندەرانی و عێراقیدا

قوت کردموه. لەشکرچییانی ئازەربایجانی پەلاماری کردیکیـان دا کـە رووسـان گرتبوویان و کردیانە تەقە و هەرا و هێزی خەنیمیان دەرپەڕاند. سوارانی ئێرانی بەرەو قازاخان کورمیان بەست و لە جێی خۆیانیان هەڵقەندن. شەڕێکی قورس و بەسام لە هەردک باڵەوە دەستی پێکرد و تەقەی سەربازان و گـورەی سـواران و گرمە و شریخەی تۆپـانی شـەویلاکەهەژدیهای ئـاگرپژێن و شـیرە و تـوورەی زوڕنای چاومشانی شەڕ زریکەزریک و تلپەتلپی خستە جەرگی چیـا و دەشـت و تەلانەوە، بەڵام چ کەردەن کە ئێرانی بە ویستی پەروەردگار سـەرکەوتنیان لـە چارەی نەنووسرابوو.

سەرەنجام شوێنەواری شکان و بەزین لەشکری ئێرانی گرتەوە و رەویـن. جێنشینیمیر کاتێک زانی ئامانجی نەپێکاوە بە راکردن خۆی گەیانـدە لێـواری رووباری ئاراس و لە پۆپەی کێوێک داسەکنی و هێور بۆوە. ئەنجا هەزارەزیلەی سپا پۆلپۆل دەچوونە خزمەتی و هـەر لـەوێ دەسـتووری فـەرموو کـە نابـێ هیچکەس بێئیزنی ئەو خۆی بداتە بەرەنگاربوونەوەی رووسـان. لـە جەنگـەی تێپەڕینی سپای ئێراندا سێهەزار ساڵدات و حەوسەد سوارەی قـازاخ بۆسـەیان نابوویەوە و بەرەگـەیان لـێ تـەنیبوون هـەتا ئەوەنـدەی دەتـوانن دەسـتیان لێنەپارێزن و ببـانکووژن و دایانـرووتێنن. خوداوراسـتان دوو لقـی حـەوت و هەشتی ئەفشار لەگەڵ سەرکردەکانیان گیرۆدەیـان بـوون. لوتـفعـەلیخـانی سەرلق کاتێک لە باروبۆخەکەی رِوانی فەرمـانـی دا بـە سەربـازانـی کـە لێیان وەدەست بێن و بە تەقـەی تفـەنگان بیانـرەتێنن. بەراسـتی چەکـدارانی گیانفیدای ئەفـشار کـە لـەو شـکانە گـشتییە زۆر تـوورە بـوون، پیـاوانـە وەخۆکەوتن و چەقین و گەلێکیان زەبری بـەرچاو وەشـاند. رەحمەتوڵـلاخانی گێزازی فەرماندەی تۆپخانە کە لاوێکی کەڵەگەت بوو بێسێودوو چووە یاریدەی سەربازانی ئەفشار و ئەم کۆمەڵە بە گژ ساڵدات و قازاخی رووساندا چوونەوە و تێکهەڵچوون و خوێنێکی زۆریان رشت. لەو گێـژاوەدا محەممەدحەسـەنئاغـای

قاسملووی سەردەستە کوڕی محەممەدعیساخانی برازای لوتفعەلیخانی سەرلک کوژرا و قلیجسولتانی ئامۆزای مەحموودخانی ساینقەڵاش دوابەدوای رۆیی. لوتفوڵلاخانسولتانی موقەددەم برینێکی سەختی هێنا و جەبارسولتانی ئەفشار برازای غەفاربەگی سەردەستەی لکی حەوت خۆی بە ئاو دادا و رووبار وەهای برد کە تازە هیچکەس بە ژین و مەرگی نەزانی و بێسەروشوێن چوو. دووهەزار کەس سالدات و قازاخی رووسیش بە زیندوویی یەخسیر کران.

لەم کاتەدا هێزێکی دونبولی خۆیە کە ئاوای چاوپێکەوت، بێئیزنی جێنشینیمیر لەبەر خزمایەتی و دراوسێیەتی خۆیان گەیاندە قۆشەنی ئەفشار و چوونە یاریدەیان و زەینالخانی سەرکردەیەکی موقەددەمیش دەماری خێلایەتی تێهێنا و غیرەتی بزووت و چوو بە هانایانەوە. پاش ماوەیەک شەڕ و هەلسووڕان و داسووڕان کۆمەڵێکی بەرچاوی رووسان بوونە چێشتەی شیر و تفەنگان. فەرەجوڵلابەگی سەرلقی سوارەی ئەفشار، سەری بڕاوی رووسانی خستە بەرچاوی جێگرموەیمیر و بە سێسەد تمەن دەسخۆشانە سەربەرز و شادمان [هەر گیفەی سمێلی هات] و هەرکام لە پلەدارانی سپا بە چەشنێک بە سەرکرانەوە. لەم گرمە و هەرایەدا کە هەوڵ شەوی مانگی رەبیعی یەکەم بوو، بەفرێکی ئەوەندە قورس باری کە خێوەتی لەشکرچییان لە سەحرادا دەتگوت جەوالی بە لۆکە ئاخنراون و ئەستوندەک چەشنی نەمامی تازە نێژراو خۆیان دەنواند. لەبەر سۆزەی سەرما ترسی ئەوە هەبوو کە ئادەمیزاد و یەکسم کەسیرە و سەکەت بن، هەر بۆیە ئیزنی گەڕانەوەی قۆشەنی دا.

لەو لاوە کاتێک هەواڵی تاڵ و ناخۆشی شکانی گەنجە لە ئەهەری قەرەجەداغ گەیشتە گوێی فەتحعەلیشا، بە مەبەستی دڵدانەوەی جێنشینیمیر تەشریفی بەرەو تەورێز بزووت و لە کێوی سەهەند سەراپەردەی فەرمانڕەوایەتی هەلدرا و چاوەڕوانی پێشوازی و بە پیرەوەچوونی خەلکی ئازەربایجان مانەوە.

هەر لەم ماوەیەدا شازادە مەلیکقاسممیرزای حوکمڕانی ئەفشاری ورمێ بەپێی فەرمان ڕۆیی بۆ بەرڕکێفی موبارەک و دوای چەند ڕۆژێک کە کاروانی کەژاوەی پیرۆزی دەچوو بۆ تارانی پایتەخت، ئیزنی لە خزمەت باوکی وەرگرت و وێڕای لوتفعەلیخانی سەرکردە و بەڕێز ئاغاعەلیئەشرەفی ئیمامجومعەی ورمێ و عەسکەرخان و هاورکێفانی دیکەی گەڕانەوە بنەی خۆیان.

لەم کاتەدا مەدەدۆفی سەرداری رووس وڵاتەکەی بە چۆلی هاتەبەرچاوی و هەلەکەی بە لەبار زانی و بە چۆمی ئاراسدا پەڕییەوە و پێینایە ئەردەوێل و مشگینشار (مشکینشار). مەدەدۆف لە ئەردەوێل ئەوەندەی کاری دزێو و ناجەیاز کردن کە تەنانەت نووسینەوە و گێڕانەوەشیان جێگای شەرمەزارییە. ئاخرییەکەی بە فەرمانی جێنشینیمیر هێزێک بۆ لێدانی دیاری کرا و نێردرا و ئەم سەرکردە بەدگووزەی لە ئەردەوێل دەرپەڕاند. لەم ڕۆژانەدا جێنشینیمیر لەبەر هێندێک کردەوەی پێچەوانە و کەلەوەکێشی نەزەرعەلیخانی مەرەندی کەوتە سزادانی، بۆیە خزم و کەسەکانی هەلگەڕانەوە و چوونە پاڵ مەدەدۆف.[1]

[1] - لێرەشدا دیسان نووسەر لە ڕەوتی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆی مێژووی ئەفشار لای داوە. بۆیە هەڵمانپەرتاوت و سەباردت بە شەڕەکانی دیکەی جێگرەوەیمیر لەگەڵ رووسان سەرچاوەی باشتر بە دەستەوەن. ئێمەش لە چوونی جێنشینیمیرەوە بۆ ورمێ کارەکەیمان داگیرساندۆتەوە. م. پ

## چوونی جێنشینیمیر بۆ ورمێ؛ گۆڕانی ئەرک و ڕاسپاردەی شازادە مەلیکقاسممیرزا و داگیرسانی وتووێژی ئاشتی لە نێوان نوێنەرانی ئێران و ڕووسیادا

جێگرەوەیمیر کە لە سەردەمی دوایین شەڕەکانی نێوان ئێران و ڕووسا لە کێوی سەهەند بنەی داکوتابوو، بە بیستنی هەواڵی پەیتاپەیتای هێزەکانی ئێران تۆقی و خوتخوتەی کەوتە دەروونی. پاشماوەی لەشکر کە لە خزمەت ڕکێفیدا بوون وردەوردە بلاوەیان لێکرد و جگە لە تاقمێکی تایبەت نەبێ کەسی بە دەورەیەوە نەما. جێگرەوەیمیر بەناچار بەرەو سەلماس بزووت و لەوێوە بە تەگبیری بەڕێز میرزا ئەبولقاسمی قایمەقام چوونە شاری ورمێی بە باش و بەرژەوەند زانی.

بەلام با لێرەدا چەند وشەیەکیش سەبارەت بە ورمێ بخرێتەڕوو. پێشتر سۆهرابخانی گورجی سەرکردەی لقێک چەکداری ئەفشار لە لایەن دەولەتەوە ڕاسپێردرابوو کە مواجب و مانگانەی لقێکی ئەفشاران لە بەشەپیتاکی ورمێ دابین بکا و پاشان ڕێکیان بخا و بیانباتە بەرڕکێفی جێگرەوەیمیر. دوای ئەمەی کە بە زولم و کەلەزەری مووچە و مانگانەی لقەکەی ورمێی وەرگرت، وای دانا کە چەکدارەکان لە مێرگی کۆربلاغی ئەنزەل ئامادە بن و سەرلەبەری مواجبی خۆیان وەربگرن. جا لەبەرەوەی بەدزی بیستبووی کە جێنشینیمیر لە تەوریز [illegible]کردووە، پاش ئەوەی تەواوی سەربازەکان کۆبوونەوە، نیوەشەو بە یەغدانی پڕ لە پوولەوە بۆی دەرچوو. بەیانی کە چەکدارەکان بە دەربازبوونی سۆهرابخانیان زانی گەڕانەوە ورمێ.

لە لایەکی ترەوە چونکە شازادە مەلیکقاسممیرزا بە مەبەستی پاراستنی باری تەناهی و ژیانی خەلکی ورمێ توندی لە قەلەوقوتە و لات و شەلاتی شارەکە دەکێشا و بە قەدرایە سەری موویەک چاوی لێنەدەپۆشین، چەند کەسێک لە شەڕفرۆشانی سەرناس و ناوبەدەرەوە گیران و بە فەرمانی بەڕێزیان

کوژران و بەجارێک دەرگای خاتر گیران گالـە درا، هـەر بۆیـە چەپەڵـکارانی بەدناکار هارووژان و کردیانە پشێوی. لوتفعەلیخانی قاسملووی سـەرکردەی لکی هەشت بە مەبەستی هێور کردنەوەی باروبۆخەکە و دەمکوتی سـەربزێوان، شەو و ڕۆژ بێنێوبڕ قەرەوڵی لە بازاڕ و شەقام و کۆڵانان دادەنا و وڵاتەکەی بـە چاکی دەپاراست و خۆشی دەگەڕا و بە سەر باری گـشتی ڕادەگەیـشت. شـازادە مەلیکقاسممـیرزا، جەمـشیدبەگی سـندووقداری خـۆی بـە سـکاڵانامەیەکەوە سەبارەت بە هەرا و هەڵلای لات و شەلاتان ناردە خزمەت جێگرەوەیمیر. ناوبراو لە «سێداقە»ی سەڵماس بـە خزمــەتی گەیـشت و نامەکـەی شـازادەی خـستە بەرچاوی و ئەمەش لە کاتێکا بـوو کـە کـاروانی شکۆمەندی بـــەرەو ورمـــێ دەبزووت و ئەوەندەی تری سەفەرەکە مسۆگەر کرد.

کاتێک کاروانی بەرزی لە ڕۆژی یەکشەممۆ ۲۱ی مانگا گەیـشتە نیزیـک ورمێ شازادە و نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ لەگەڵ جەماوەری ئەفشاری ورمێ کەوتنە تەدارەکی پێشوازی و تەشریفی کە هات لە قەڵا و باڵەخانەی سـەردەری دابەزی.

جێنشینیمیر هەر کە گەیشتەجێ لـەڕێوە حـاجی بێـژەنخـانی گـورجی ڕانەسپارد کە بچێتە لای ژێنراڵ پێسکۆویچ لە تەورێز و ڕێگای ئاشتی و پێکهاتن خۆش بکا. پێشتر فەتحعەلیخانی کوڕی هیدایەتوڵلاخانی ڕەشتی بەگلەربـەگی تەورێزیش چووبووە لای سەرکردەی ڕووس و وتووێژی سەبارەت بە پێکهاتن و تەسالحەی خستبوویەڕوو. دوای ماوەیەک حاجی بێژەنخان گەڕایەوە و پەیامی ڕێککەوتنی هێنا بۆ خزمەت جێگرەوەیمیر کە چەند مەرجێکی لـە خـۆ دەگـرت. بۆیە جێنشینیمیر مەلیکقاسممیرزای برای خۆی بە مەبەسـتی گەیانـدنی ئـەم هەواڵانـــە نـــاردە بارەگـــای بـــاوکی تاجـــداری فەرمانـــڕەوای و جـــارێ نەجەفقولیخانی کردە حاکمی ورمێ. هەروەها شازادە بارامیمیرزای کوڕی خۆی کـە لـەم ڕۆژگـارەدا حوکمـڕانی خـۆی بـوو لـــەگەڵ مـیرزا محەممەدتـەقی قەوامودەولە و یۆسفخانی تۆپچیباشی و کۆمەڵێکی زۆر بە ڕێگای میاندواو و چۆمی جەغەتوودا وێڕای حەرەمخانەی پادشـایەتی بـەڕێی کـردن بـۆ تـارانی

پایتەخت. دەستووری فەرموو کە لوتفعەلیخانی ئەفشار لەگەڵ لقی حەوت و هەشت دەوری بەرنەدەن. پاشان تەشریفی بردە شارۆکەی دێخورگان و لەوێ چاوی بە پێسکۆویچی سەرداری رووس کەوت و سەبارەت بە شەڕ و ئاشتی کەوتە وتووێژ. پێسکۆویچ لە بابەت پێکهاتنەوە سەری رەزامەندانەی لەقاند و بە چەند مەرجێک لە لایەن دەوڵەتی خۆیەوە تەسالحەی قبووڵ کرد. پوختەی مەرجەکان ئەمە بوو کە ئێرەوان و ئۆردووباد و نەخجەوان کە دەوڵەتی رووس بە دەستی زۆر گرتبوونی هەر لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بمێننەوە و چۆمی ئاراس وەک سنووری نێوانیان دیاری بکرێ. تالش و موغانیش کە بە دەست دەوڵەتی گەورەی ئێرانەوە بوون بدرێنە چنگ رووسان و دەوڵەتی ئێران بڕی دە میلیۆن ئەشرەفی یەکمسقالی بۆ قەرەبوو کردنەوەی زەرەد و زیانی شەڕی چەندین ساڵە وەئەستۆی خۆی بگرێ. مەرجێکی بەرچاوی دیکەش ئەمە بوو کە هێزای جێگرەوەیمیر [عەبباسمیرزا] وێرای شازادە محەممەدمیرزا لە بابەت ئەو رووداوانەی کە پێشتر قەوماون بە رێگای دەوڵەتی رووسیادا داوای لێبووردن بکەن لە خونکاری ئەو وڵاتە.

بەکورتی پاش قاڵەقاڵم و دەمەتەقەیەکی زۆر پێکهاتنەکە بە حەوت میلیۆنونیو برایەوە و ئەوسا فەتحعەلیخانی بەگەربەگی تەورێز و نەزەرعەلیخانی برازای عەسکەرخانی ئەفشار کە هەردک پیاوی ماقووڵ و باوەڕپێکراو بوون، وەک کەیخودا دیاریکران و چوونە تارانی پایتەخت.

بەڵام فەتحعەلیشا لە حاند ئەم پێکهاتن و بڕە دراوەی کە دەبوو لە پێناو رێککەوتن بدرێ سەری بادا و فەرمووی پێیڕازی نیم و لەسەر شەڕ پێیداگرت. هەر بۆیە ئەو دوو کەسە بێئەوەی بە ئاکامی دڵخواز بگەن گەڕانەوە و جێی فەرمانڕەوا فەرمووبووی رایانگەیاند. پێسکۆویچ جارێکیتر ئاڵای دژایەتی هەڵدا و جێگرەوەیمیر چوو بۆ خاکی گەرووس. سەربازانی دەوڵەتی رووس دیسان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. بۆ وێنە شەشهەزار کەسی لەشکری رووس و هەشتسەد سوارەی قازاخ بە هەشت دەزگا تۆپەوە چوون بۆ گرتنی سەڵماس و ورمێ. چونکە وەرزی زستان و سەرما و کرێوە و باکوت بوو،

چەکدارانی رووس نەیانتوانی لە دەرەوەی ئاوەدانی بژین بۆیە لە مالآن بنەیان داکوتا و خۆیان تاقەت کرد. لەم سەروبەندەدا هەموو رۆژێ تەتەرێک لە لایەن پێسکۆویچەوە دەگەیشتە لای نەجەفقولی‌خانی بەگلەربەگ و دەقوبۆغر دەیگوت دەبێ بەگلەربەگ خۆی بە خەلکی رووسیا بزانێ و لەگەل مەزن و پیاوماقوولانی ئەفشار هەموو رۆژێک لە دیوانی حکوومەت ئامادە بێ. بەگلەربەگ گالتەی بەم پێشنیارە دەکرد و جەفەنگی پێ‌لێدەدا و گوێی نەدەدایە و لەبەر بەرژەوەندی رۆژگار دەحاواوە و ددانی بە جەرگی خۆی دادەگرت. هەمیشە گوێقولاغی شەڕ و ئاشتی لە ئاکام و داهاتووی کارانی دەروانی هەتا سەرەنجام پەیتاپەیتا خەبەر هات کە خاقان لەسەر تکا و داوای پیاوەگەورەکانی خزمەتی و بەگوێرەی پێشنیاری بالوێزانی هەردک ولات پێکهاتنەکەی بە هەشت کروور بڕیوەتەوە و کۆتایی پێهێناوە. پاشان شازادە مەلیک‌قاسم‌میرزا و مەنووچێهرخانی موعتەمەدودەولە و نەزەرعەلی‌خانی برازای عەسکەرخانی ئەفشاری ورمێ ئەو برە دراوەی لەسەری رێککەوتبوون لە تارانەوە بردوویانەتە تەورێز.

پاش بەڕێوەچوونی ئەم کارانە جێگرەوەی‌میر و پێسکۆویچ لە ئاوایی تورکمان‌چای نێوان زەنجان و تەورێز چاویان بە یەکتر کەوت و پەیماننامەی ئاشتی بەو چەشنەی کە لە دیرۆکاندا دیارە و تۆمار کراوە لە مابەینیاندا نووسرا و مۆر کرا.[1] دوای گۆڕینەوەی دەقی پەیماننامەکە پێسکۆویچ هێزەکانی رووسیای لە هەرێمی ئازەربایجان دەنگ دا و بەرەو پێترزبوورگ کەوتەڕێ. بەڕێزی جێنشینی‌میر دیسان بە سەربەستی لە ناوەندی دەسەلاتی پالی دایەوە.

❖❖❖❖

---

[1] - پەیماننامەکە بە پەیماننامەی تورکمان‌چای بەناوبانگە و رۆژی ٥ ی شابانی ١٢٤٣ی کۆچی ١٠/٢٢ ١٨٢٨ی زایینی نووسراوە. (سەرجەم پەیماننامەکانی مێژوویی ئێران لە سەردەمی هەخامەنشیرا هەتا چەرخی پەهلەوی، ٥٥٩ی بەر لە زایین هەتا ١٩٤٢ی زایینی. کوکردنەوەی ع وەحید مازندەرانی. دەزگای بلاوکردنەوەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە ... ـەتی پادشایەتی، سالی ١٣٥٠ی هەتاوی/١٩٧١ی زایینی. تاران.)

## ئەو ڕووداوانەی کە لە خولی دووەمی حوکمڕانێتی نەجەفقولیخانی بەگەربەگدا قەومان

ڕوون و ئاشکرایە کە وەختایەک نەجەفقولیخانی بەگەربەگ بۆ جاری دووەم لەسەر تەختی دەسەلات پالی داوە، ئەوەنـدەی شـیری دەیبـڕی بـەپێی سینگفرەوانی و مەزنایەتی کاروباری ولاتەکەی ڕێـک دەخـست و سـەروبەری دەبرنەوە سەر یەکتر. هەروەها لوتفعەلیخانی بەرزمجێی مامی کە سـەرتیپی لقی حەوت و هەشت بوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرک و ڕاسـپاردەی دیـوانی بەوپـەڕی لێوەشاوەیی هەلدەسووڕا. بەگەربەگ فەرەجولـلاخانی کـوڕی عەسـکەرخانی کردە سەردەستە و شێخ قولیبەگی کوڕی خوابەخشیو مەحموودخان بـەگوێرەی حوکمی دیواندارانی گەورە بوو بە سەرلک.

لەم سالەدا میرزا محەممەدعەلی ئاشتیانی ناسراو بـە ئەشـکەبۆس کـە یەکێک بوو لە نووسندەکانی میرزا ئەبولقاسمی قایمەقام لە تەورێزەوە کرایە لێپرسراوی پێداچوونەوە و کۆکردنەوەی دارایی دیوانی حکوومەت و هاتە ورمێ و نامەیەکی لە لایەن جێگرەوەیمیرەوە هێنابوو بۆ لوتفعەلیخانی سـەردار کـە دەبـێ پـشتیوانی بـێ و ئەوپـەڕی یارمـەتی بـدا، لەبـەروەی پێـشتر پلـــەی سەرۆکایەتی و پێشکاری لە ئەستۆی میرزا حوسێنی برای عەسـکەرخان بـوو، ئەش کەبۆسی ناوبراو کەوتە لێپرسینەوەی و داوای پاشماوەی داهـاتی چەنـدین سالەی دیوانی لێکرد. ئەویش تێکەوت و حیساباتێکی بە مەبەستی دامالینی هەر چەشنە گومانێکی سەبارەت بە خۆی خستەڕوو، بەلام قبوول نەکرا و بە حوکمی ئەشکەبۆس بەرێزەوە دەست بەسەر کرا! هەروەها حاجی عەلیارخانی سـەرۆکی تیرەی گۆندوزلووی لە بابەت پیتاکی نـاوچـەی دۆلـەوە هـەلپێچـا و پـــاش بە گژدا چوون و لێتووڕە بوون لە بەندی توند کرد. وای لێهـات کـە بەرەبـەرە

هەڵسوکەوت و دابی تازە و ناڵەباری میرزا خەڵکی ورمێی وەتەنگ هێنا و تێکڕا ڕوویان کردە مەحکەمەی بەڕێز ئاغاعەلیئەشرەفی ئیمامجومعە و کردیانە داد و هاوار. ئیمامی ڕێزدار چەند جارێک بە زمانێکی خۆش و نەرم پەند و ئامۆژگاری بە گوێی ئەشکەبۆس هەڵخوێند، بەڵام کاری تێنەکرد. سەرەنجام بەگوێرەی ئەرکی ئایینی ئاغاعەلیئەشرەف بۆ نەهێشتن و هەڵوێزنینی ماشەری زوڵم و زۆرەملی و پرسرانی سکاڵای مەزلوومانی ئەفشار، لە شارەوە بزووت هەتا بە ڕێگای گۆلی ورمێدا بچێتە تەورێز.

لەم جەنگەیەدا جێنشینیمیر کە بە مەبەستی چوونە بارەگای پیرۆز لە تەورێزەوە گەیبوویە ئەردەوێڵ و لەوێ ئاوڵ و خێوەتی میرانەی هەڵدابوو، لوتفعەلیخانی سەرداری لەگەڵ دوو لقی ئەفشاران بانگهێشتن کە وێڕای هێزەکانی دیکە و تۆپخانە و چەند سەرکردەیەکی دیکە بیاننێرێ بۆ سولەیمانی. لوتفعەلیخان سەرەتا ڕێزدار ئاغاعەلیئەشرەفی ئیمامجومعەی لە مێرگی سێداقەوە گێڕایەوە و گوتی هەڵەکەی ناڵەبارە و خۆی ڕووی کردە ئەردەوێڵ و چۆنیەتی بەسەرهاتەکەی لە جێگای خۆیدا باسی دەکرێ.

دوای ڕۆیشتنی لوتفعەلیخان، عەسکەرخانی سەرۆکی تیرەی ئیمانلوو، عەبدوسسەمەدخانی برای کە چەندین ساڵ حاکم بوو لە سندووس و لەم ساڵەدا بەپێی فەرمانی گەورەپیاوانی دەوڵەت بە لێخراوی لە ورمێ دەژیا، سکاڵانامەیەکی سەبارەت بە میرزا محەممەدعەلی ئەشکەبۆس دایە دەستی و ناردی بۆ خزمەت جێنشینیمیر. عەبدوسسەمەدخان و نەزەرعەلیخانی برازای پاش ئەوەی گەیشتنە ئەردەوێڵ نامەکەی عەسکەرخانیان دایە خزمەت دەمڕاستی دەسەڵات، لەبەروەی ئەو پایەبەرزە تەواو متمانە و باوەڕی بە قسەی عەسکەرخان هەبوو، ئاوری تووڕەبوونی سەبارەت بە ناکامی میرزا محەممەدعەلی ئاشتیانی گرفەی کرد و لەوێوە لە لایەن جێنشینیمیرەوە نامەیەکی نووسی بۆ فەتحعەلیخانی نووری مازندەرانی کە خێرایەکی

ئەشکەبۆس بداتە بەر شەپۆلی زەبروزەنگ و بیگرێ و بە چۆلەپێچکراوی بینێرێتە تەورێز. «سەیفعەلیبەگ»ناوێکی لایەنگری ئەشکەبۆس کە بەو فەرمانەی زانی بەپرتاو ئەسپی لینگ دا و خۆی گەیاندە ورمێ و ناوبراوی ئاگادار کردەوە و ئەو ملهوڕەش لە سێباری شەوا ڕایکرد و بەرەو ئەردەوێل فڕی. بەریبەیانی تیرەی ئیمانلوو لەگەڵ پیاوەکانی عەسکەرخان پێکەوە چوونە سەر بەندیخانە و حاجی عەلیارخانی گۆندوزلوو و میرزا حوسێنی وەزیریان لە داوی ئەشکەبۆس ڕزگار کرد. ڕۆژی هەینوو ٢ی مانگی جیمادی یەکەم عەبدوسسەمەدخان و نەزەرعەلیخان وێڕای فەتحعەلیخانی نووری گەیشتنە ورمێ.

هەر لەم ساڵەدا مینراڵ «گێریبایدۆف»ی باڵوێزی دەوڵەت بەرزی رووسیا بە مەبەستی پێراگەیاند و ئاگادار کردنەوەی فەرمانڕەوای ئێران سەبارەت بە ئاشتینامەکە دەچوو بۆ تارانی پایتەخت. کاتێک جێگرەوەیمیر پێیزانی نەزەرعەلیخانی ئەفشاری زمانپاراوی فەرانسەییزانی ناردە پێشوازی کە لە تفلیسەوە لەگەڵی بێ هەتا تەورێز و پاشان برۆنە تاران.

کاتێک گریبایدۆف وێڕای نەزەرعەلیخانی میوانداری گەیشتە تەورێز بۆ ماوەی مانگێک لەوێ مایەوە و پاشان بێ پرس و ڕاوێژی جێنشینی ڕێزداری میر کۆنسوول و جێگرێکی لەبری خۆی لە تەورێز دانا و بێئیزن وەرگرتن لە [عەبباسمیرزا] بەوپەڕی شکۆمەندی و بێباکی بەرەو تاران کەوتەڕێ و سەنگبایی ـازادەی وەبەرچاو نەهێنا. ڕۆژی یەکشەممۆ ٥ ی مانگی ڕەجەب گەیشتە پایتەخت و بەپێی فەرمانی فەتحعەلیشا، زیللوسسوڵتان لەگەڵ میرزا محەممەدعەلیخانی کاشانی و محەممەدوەلیخانی ئەفشاری قاسملوو چوونە پێشوازی و بەوپەڕی ڕێزەوە هێنایانە شارەوە.

❖❖❖❖

## هەڵبژێردرانی برایمخانی سەردار بۆ حوکمڕانێتی ورمێ و تەنینەوەی نەخۆشیی تاعوون

ڕوون و ئاشکرایە کە لەم سەروبەندەدا برایمخانی سەردار کوڕی جانمحەممەدخانی قاجار یەکێک لە پیاوانی چاوناسی ئەستەراباد کرایە حاکمی ورمێ و پاش ئەوەی گەیشتەجێ لە باڵەخانەی سەردەری مزڵی دانا و کاروباری پێشکاری و وەزارەتی دایە دەستی لێوەشاوەی باوەری باوەرپێکراوی خۆی حاجی برایم و خۆی کەوتە لێپرسینەوەی داد و داوای جەماوەر. ماوەیەکی وای بە سەر دەسەڵاتیدا تێنەپەڕیبوو کە نەخۆشی لێوەگری تاعوون لە شار و گوندان باڵی ئەنگاوت و هەموو شەو و ڕۆژێک کۆمەڵێکی بەرچاوی نێر و مێ و گەورە و گچکەی لە ناخێ ڕۆکردن و بەرەو هەرێمی نەمانی ڕادان. هەر بۆیە خەڵک لە ترسی گیانیان پەرەمپەرەم ببوون و برایمخانی سەرداری حوکمڕان لە شارەوە بنەی گواستەوە بۆ باغی کەماڵئاباد. نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ لەگەڵ خاوخێزانی ڕۆیی بۆ ئاوایی نەجەفئابادی ملکی خۆی لە قەرەباغی ئەنزەل. عەسکەرخان لە گوندی کەرێزە و قوشچی ماڵ و کۆچی دانا و هەروەها مەزن و ماقووڵانی ئەفشار و خەڵکی ورمێ ئەوەندەی هەنگاویان بڕی کرد چوونە شوێنی دوور و نیزیک و بلاو بوونەوە. چەند کەس لە خانان و سەرناسان بەم بەڵا و بەتایە تێداچوون و بەرەو ماڵی یەکجارەکی ڕۆیشتن. بۆ وێنە خوداداخانی کوڕی ئیمامقولیخانی مامی بەرزەجێی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ، کازمخان و ئەحمەدپاشاخان کوڕانی خوابەخشیو محەممەدقولیخان و تاقمێکی دیکەش. داوێنی ئەم دەرد و بەڵایە ماوەیەک وڵاتی داگرت و وردەوردە هەڵوێزندرا و کۆکرایەوە و سێبەری ڕەوی.

## مەرگی لەناکاوی لوتفعەلیخانی سەرتیپی ئەفشار
## بە هۆی ڕووداوێکی کە قەوما

وەکوو پێشتر باسی کرا بەڕێزی جێنشینیمیر وەختابەک دەچوو بو تاران لە ئەردەوێل لوتفعەلیخانی لەگەل دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشار داوا کرىن تا وێڕای ئەو هێزانەی کە بە سەرکردایەتی ڕەحمەتوڵلاخانی فەرماندەی تۆپخانە بە مەبەستی پاراستن و ڕاگرتنی سولەیمانی دەڕۆیشتن، بڕۆن و بدەنە پالیان. لوتفعەلیخان بەپێی فەرمان وێڕای هێزەکانی دەولەت بزووت و چونکە لە ماوەی مانەوەیاندا گەلێک خزمەتی شایانی ئەنجام دا و بە گوێی گەورەپیاوانی دەسەلات گەیشتەوە، جێنشینیمیر بە دەسخۆشانەی خزمەت و گیانفیدایی ڕاسپێردراوەکان بەتایبەت لوتفعەلیخانی ئەفشاری قاسملوو کاغەزی ڕێزلێنان و خەلاتی میرانەی بۆ ناردن و بە سەری کردنەوە و بە مەبەستی شانازی و شانەبەرزەی لوتفعەلیخان خەلات و نیشانی تایبەتی پلەی سەرتیپی دوو لقی ئەفشاری بۆ ناردە سرلەیمانی. سەرتیپ چۆن شیاوە ئاوا چوو بەرەوپیری فەرمان و خەلاتەوە و قەلافەتی خۆی بە دیاری و میدال و نیشانەی ئازایەتییەوە ڕازاندەوە. لە جەنگەی گەڕانەوەی ڕێوڕەسمی پێشوازیدا دوو لقی ئەفشار چەشنی دەریا دەهاژان و شەپۆلیان دەدا و کردبوویانە تەقەی خۆشی و شادی و سواران سەرقالی تەقلە و غار و ڕمبازی بوون. وا هات ئەسبی ئەسەدوڵلابەگی میرئاخوری سەرتیپ کە لە خزمەتیدا شان بە شان دەڕۆیی جووتەیەکی هاویشت و لاقی لوتفعەلیخانی سەخت ئەنگاوت و لوولاکی شکا و ئەو کێوە مەند و بەدەمارە دلی لە خۆ بڕوە و لە خوانی زینەوە هەلدێرا. بەڕێزیان بە سواری کەژاوە بردەوە مال و بەو دەردەوە بە جێوبان بۆی

کەوت. چەند شکستەبەندیکیان هێنا و بە مێو بۆیان هەڵبەستەوە بەلام چارەی نەبوو، هەتاکوو ڕۆژی پێنج‌شەممۆ ١٨ی مانگی جیمادی دووەم مەلی ڕووحی ڕەوانی لە قەفەزی قاپۆڕی لەشی‌ڕا فڕی و چوو لەسەر لکی داری تووبای [بەهەشت] هەڵنیشت. دوو لقی ئەفشار ڕووباری خوێن چەشنی جەیحوون لە چاویانەوە سەرەوخوار لووزەوی بەست و پاشان بە جلکی ڕەشەوە تەرمەکەیان بەڕێکردە مەزارگەی پیرۆزی ئیمامان و خۆیان گەڕانەوە ورمێ. نەمانی سەرتیپ لە ورمێ ڕەنگی دایەوە و نەجەف‌قولی‌خان و کەس‌وکاری کەوتنە پرسە و تازیەداری.

هەر لەم قۆناخەدا شازادەی جێگرەوەی بەڕێزی میر بەگوێرەی فەرمانی باوکی پایەبەرزی خۆی خاقانی خاوەن‌شکۆ، بە ئامانجی ڕێکخستن و تەکوز کردنی کاروباری یەزد و کرمان و ناوچەکانی خوراسان بزووت. فەرەیدوون‌میرزای کوڕی لە ئازەربایجان کردە جێنشین و محەممەدخانی زەنگەنەی سپاسالار و میرزا ئیسحاقی کوڕەزای میرزا عیسای قایم‌مەقامی بە ڕیش‌سپی و پێشکار دانان.

# ئاژاوه و قاتیوقڕی ورمێ له سالی ۱۲٤۸ی
# کۆچی /۱۸۳۲ ـ ۱۸۳۳ی زاییینیدا

چونکه لهم سالهدا [عهبباسمیرزای] جێنشینیمیر له ناوچهکانی خوراسان خهریکی ڕێکخستنی کاروبار و دابینکردنی باری ئاساییشی ئهو ههرێمه بوو، ئازهربایجان بێجگه له لقی حهوت و ههشت که سهرکردهکهیان چووبۆوه بهر دلۆوانی خودا هیچ هێزێکی دیکهی تێدا نهمابوو. جهماوهر و عێلاتی شهڕفرۆشی سهرسنووران کاتێک دیتیان ولاتهکه چۆله، ههلهکهیان به لهبار زانی و پێیان له بهرهی خۆیان زیاتر ڕاکێشا و زهرهد و زیانیان بهدی هێنا. بهتایبهت له شاری ورمێدا که دهچێتهوه سهر ناوچهکانی عهشایرنشین و به خاکی دهولهتی گهورهی عوسمانی و مهلبهندهکانی ڕۆمهوه نووساوه، له لایهک جهماوهری شنۆ و زهرزا و له لایهکی ترهوه ئوردانی دهشت و تهرگهوهڕ و سۆما و برادۆست پالیان وێک دا و کردیانه ههرا و ههنگامه. له سهرێکیشهوه جهماوهری ئهفشار لهبهر زۆرهملی و چهوساندنهوهی برایمخانی سهردار وهگیان هاتن و سهریان له حاند فهرمانی حکوومهت بادا و وای لێهات که تاقمێکی بهدناکار و ـجسن شهوێکی ههڕایانکرده سهر تاول و خێوهتهکانی له باغی کهمالئاباد و وهبهر فیشهکانیان دا. ههروهها ملۆزمێک که پێیدهلێن سن کهوته نێو دهغلودان و سهرپاکی خوارد و شیلهی لێبڕی و بهلای قاتی بالی ئهنگاوت. بهکورتی له ههموو سهرانهوه هۆکاری پهرێشانی کهوتنه سهر یهکتر و باجئهستێنانی توند و تیژیش به سهر خهلکی بێچاره وهربوون. بهناچار حهشامهتی ورمێ بهتێکڕا پهنایان برده بهر مهحکهمهی بهڕێز میرحهمیدئاغای

شێخولئیسلام و کردیانە هاوار و لیللا. شێخولئیسلام بە مەبەستی ڕاگەیانـدنی سکاڵای جەماوەر چووە لای برایمخانی سـەردار و داد و هاوارەکـەی بـە گـوێی هەڵخوێند. چونکە هیچ وڵامێکی سەبارەت بە قسەکانی خۆی وەرنەگرتەوە، گڕی گرت و گەلێک قسەی ڕەقوتەق و سارد و سـووکی نایـە پارسـەنگی سـەردار و حاجی برایمی وەزیری و بە تووڕاوی گەڕاوە ماڵی خۆی. ئەوسا وێڕای کۆمەڵـێک لە چینی مسکێن و تووڕەمەی ئەفشار خۆی ساز کرد و بەرەو تـەورێز کەوتـەڕێ. پاش ئەوەی گەیشتنەجێ لـە ڕێگـای محەممـەدخانی زەنگەنـەی سپاسـالارەوە سکاڵای خۆیان بە خزمەت شازادە فەرەیـدوونمـیرزا ڕاگەیانـد و تکایـان کـرد پێڕابگا. داواکـەیان لـێقبـووڵ کـرا و لەبـەر خـاتری بـەڕێز میرحەمیـدئاغا شێخولئیسلام و بەزەیی هاتـن بـە چینـی هـەژاردا بـڕی شـەشهـەزار تمـەن وشکەپووڵ و شەشهەزار خاڵوار حاسلاتیان لـە پیتـاکی ساڵـی داهـاتوو بـۆ شکاندن و پێیانبەخشرا. ئەو کـات شێخولئیـسلامی هێـژا و جـەماوەر شـاد و کامەران گەڕانەوە ورمێ.

بەڵام دوای ڕۆیشتنی شێخولئیسلام و کەیخودا و ڕدێنسپییەکانی ئەفشار بۆ تەورێز، کاتێک حوکمڕان تەماشای کـــرد وڵات چـۆڵوهۆڵـە، بـە تۆڵـەی دەسڕێژ و تەقەی لاتەوپاتە و چەپەڵکاران بۆ سەر خێوەتەکانی، چـەند کـەس لە پیاوماقووڵانی ئەفشاری ورمێی گرتن و لـە بەنـدی تونـد کـردن. بـۆ وێنـە سمایلخانی برووجێردی کەلانتەری ورمێ و ئاغافەتحولڵای دەمڕاستی مسکێنان گیران. چونکە لەو سەروبەندەدا عەسکەرخانی ناساز و وەرەنگـاز نەیـدەتوانی بچێتە دیوانی حکوومەت، بە مەبەستی ئازاد کردنی ئەم دوو کەسە چەند جارێک حاجی مەلا محەممەدی کوڕی خودالێخۆشبوو مـەلا محەممـەدباقری نـاردە لای سەردار، بەڵام تکای نەگیرا. ئاخرییەکەی ئـەو خانـە بەغیرەتـە دەسـتەلاوێکی تیرەی ئیمانلووی نیومشەوێک چەکدار و پەرداخ ناردە گرتووخانە و بە زۆرەملێ هەردکیان دەرباز کردن. لەو دەمەدا پیاوانی حکوومەت و زیندانەوانان دەسـتیان

وەبەرهێنان و کەوتنە بەرەنگاری و هەرایەکی گەورە بالی ئەنگاوت و یەکێک لە پیاوانی عەسکەرخان بە فیشەک ئەنگوا و کوژرا. برایمخانی سەردار لە جەرگەی شەودا برازایەکی خۆی بە نامەیەکی سەبارەت بە ڕاپەڕین و ئاژاوەی جەماوەری ورمێوە بەڕێکردە تەوریز و دوای شەش ڕۆژ چەند گزیرێکی بەزمبروزەنگ لە لایەن فەرەیدوونمیرزاوە نێردرانە ورمێ هەتا ئەوانەی ئاوایان کردووە بە دەسبەسەری بیانبەنە تەوریز. عەسکەرخان ئەگەرچی هەر نەخۆش و بناوبێر بوو، دیسانیش بە سواری کەژاوە بەرەو تەوریز بزووت، بەلام لە ئاوایی عەسکەرابادی ملکی خۆی نەخۆشییەکەی هێندەی لێ توند کرد کە نەیتوانی بچێ و لەوێ بنەی دانا بۆ پشوودان.

لەم ڕۆژانەدا هەوالی داندرانی جانگیرمیرزای کوڕی جێنشینی‌میر بۆ حوکمڕانێتی ورمێ و هێور کردنەوەی بارودۆخی سنووران تەواو بلاو بۆوە.

## لابرانی برایمخانی سەردار و نێردرانی جانگیرمیرزا بۆ سەرۆکایەتی ئەفشاران لە ورمێ

پێشتر باسی کرا کە لە ڕۆژگاری حوکمڕانێتی برایمخانی قاجـاردا لەبـەر لێنەومشاوەیی و کەمتەرخەمی ناوبراو، سەربزێوانی ناوچەکان لەو مەڵبەندەدا ئاگری ئاژاوەیان هەڵگیرساند و هەرا و هەڵلایەکی زۆر گـەورەیان نایـەوە. بـۆ وێنە شامرادبەگی میری ڕەواندز سەرەتا دەستی درێژ کردە سەر «سەردەشـت»ی موکری و بە زۆرەملی لەوێوە پەلی هاویشتە شـارۆچکەی شـنۆ. بەڕێوەبـەرانی ناوچەکە چۆنیەتی ڕووداوەکانیان بە خزمـەت بـرایمخـانی حوکمـداری ورمـێ ڕاگەیاند و ئەویش دەیزانی چونکە جەماوەری ئەفشار و خەڵک لەگەڵـی نـین و ڕوویان لێوەرگێڕاوە هیچی بۆ ناکرێ بۆیە بەناچار چلۆنایەتی بارودۆخەکەی لە نامەیەکدا بە خزمەت گەورەپیاوانی دەوڵەت و جێنشینیمیر ڕاگەیاند. شـازادە پاش ئەوەی بە هەڵومەرجەکەی زانی فەرمانێکی نووسی بۆ خوسرەوخانی کوڕی ئەمانوڵلاخانی والی کوردستان کە وەخۆ بکەوێ و خاشەی میری ڕەواندز بکێشێ. هەروەها جێگرەوەیمیر شـازادە جـانگیرمیرزای دانـا بـە حوکمـداری ورمـێ و ڕێکخستنی کاروباری ئەو مەڵـبەندە. وا دانـدرا کـە محەممـەدخانی سـەرتیپی ئێرەوانی لەگەڵ دوو لقی ئەفشار و سوارانی قەرەپەپاغی سندووس و موقەددەمی مەراغە و موکری هەڵکەنە «سەردەشت»ی موکری و مـیری ڕەوانـدز بـڕمتێنن و نەهێڵن داخلی بە سەر ناوچەکەوە بمێنێ. شازادە جانگیرمیرزاش بە چاردە دەزگا تۆپ و چوارسەد سالداتی ڕووسەوە کە هەزارەزیلەی تازە کـۆکراوەی ڕووسـان بوون و هەروەها شەشسەد سەربازی نوێی خۆیە و هەزار سوارەی حەیدەرانلوو بە ڕێگـای سەلماسدا چـوو بـۆ ورمـێ. ڕۆژی پێـنجشـەممۆ ۲۳ی مـانگـی جیمادی یەکەم لە عەسکەرابادی ملکی عەسـکەرخان دابـەزی و خـانی ئەفـشار

بەوپەڕی ڕێزموە پێشوازی لێکرد و بە دەورەیدا هاتوچوو. بۆ سبەینێ عەلیئەکبەرخانی نووری مازندەرانی کە یەکێک بوو لە غولامانی بەرکێفی شازادە جانگیرمیرزا، مزگێنی چوونی بەڕێزیانی برد بۆ نەجەفقولیخان لە ورمێ و ئەویش قەوارەیەک قوماشی دایە بە دەمخۆشانە. بۆ بەیانی ٢٤ی مانگ کە هەینی بوو تەواوی جەماوەری ئەفشار چوونە پێشوازی و ئێوارەیەکی درەنگ شازادەی پایەبەرز بە دەروازەی مەشهەد (بالاو)دا پێینایە خانەمیری ورمێ و هەر کە گەیشتێ لەڕێوە قەوارەیەک پارچەی تورمە و دەستێک جبەی سلسلەدار و خەنجەرێکی جەوهەرداری کردە خەڵاتی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ. وا داندرا کە هەموو ڕۆژێ لەبری شازادە لە دیوانی داد دابنیشێ و لەگەڵ خوداقولیخانی کوڕی محەممەدقولیخانی بەگلەربەگی سەرۆکدیوان و عەسکەرخانی ڕیشسپی تیرەی عەبدولمەلیکی و عەبدوسسەمەدخان و ئەحمەدخانی ساینقەڵا و مووساخانی قاسملوو بە تەواوی کاروباری گرینگی مەڵبەندەکە و هاوار و سکاڵای خێڵ و خەڵک ڕابگەن. شازادە هەرکلم شانی چۆنی هەڵدەگرت باربووی چاکی بە خەڵات دایە و پلەی سەرۆکایەتی دەزگای پیتاک درایە دەس میرزا حوسێنی برای عەسکەرخان و بە سەر کرایەوە.

پاش ئەم کارانە شازادەی بەرزەجێ جانگیرمیرزا، سەرەتا محەممەدخانی سەرتیپی ئێرەوانی لەگەڵ دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشاری ورمێ بەرەو شنۆی زەمزا گاڵ دا. لقی حەوت عەبدوڵلاخانی قاجار سەرکردایەتی دەکرد و لقی هەشت ـبیقولیخانی کوڕی محەممەدعیساخانی قاسملوو سەرلق و عەلینەقیخانی برای سەردەستەی بوو. محەممەدخان لەبەروەی سەرۆکانی زەمزا سەبارەت بە پاراستنی شنۆ سست جووڵابوونەوە و کەمتەرخەمییان نواندبوو هەڵیپێچان و گوێی بادان و یەکێک لە ئاغایانی زەمزا بە ناوی میرزا مارف کە دابوویە پاڵ میری ڕەواندز گرتی و چۆلەپێچی کرد. ئەوسا هێزەکانی ئەفشاری نارده ناوچەی سۆما و برادۆست و بە دەستی زۆر قەڵای «کانیمێش»ی سەر بە برادۆستیان لە

چنگ پیاوانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی دەرکێشا و لەوێوە چوونە ناوچەی دەشتی تەرگەوەڕ و قەلاتی «بەردەسوور»یان گرت. محەممەدبەگی دەشتی لەگەڵ پیاوەکانی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و هەڵاتن بۆ قەڵای «کەللەگا». پاش ئەوەی ئەم ناوچانە هێور بوونەوە بە فەرمانی شازادەی بەرزەجێ بەرەو قەڵای «سەردەشت»ی موکری ئەسپیان تاو دا. «قەرەچۆمئاغا»ناوێک لەگەڵ تفەنگچییەکانی لەوێ بۆی دەرچوو. پاشان محەممەدخانی سەرتیپ تۆپەکانی بە ڕموگەی ڕژد و هەڵەمووتا بردن بۆ سەر قەڵای دەربەند و قەمچۆغە[1] کە قەڵاتی میری ڕەواندز و یەکجار قایم و پتەو بوون و تۆپی قەڵارمێنی لێ ئاگردان و خاپووری کردن. لەو لاشەوە لەشکری بەغدا و ئامێدی هاتنە سەر میری ڕەواندز و لێی وەخۆ کەوتن و دەورەیان دا. میر وەختایەک تەماشای کرد لە چوار لاوە دەورەی گیراوە و لە شەشدەری نەردێندا تێماوە و چاری ناچارە، سەرەتا چوارهەزار تمەنی بە وەزیری بەغدادا بەڕێکرد و هەرای ئەوانی لە کۆڵ خۆی کردەوە و پاشان سێهەزار تمەنی دا بە محەممەدخانی سەرتیپی ئێرەوانی و کاغەزی لە شازادەی گەورە فەرەیدوونمیرزای فەرمانفەرمای ئازەربایجان و محەممەدخانی زەنگەنەی سپاسالاری سپای ئازەربایجان نووسی و پەشیمانی کردنەوە. ئەوسا محەممەدخانی سەرتیپ بۆ وەرگرتنی پیتاک و داهاتی دیوانی سولەیمانی ڕاسپێردرا و مایەوە و هێزەکانی ئەفشار و سووارانی سپای ورمێ گەڕانەوە. بەڕاستی ناوچەکانی ورمێ و دەوروبەری زۆر چاک هێمن و هێور بوونەوە و چونکە ئەم سەرکەوتنانە بە ناوی جانگیرمیرزا تەواو بوون، بەوپەڕی سەربەستی شانی لە حوکمڕانی شل کرد.

❖❖❖❖

---

1 - نووسیویەتی قەمچەقای.

## کۆچی‌دوایی عەسکەرخانی سەرداری
## ناوداری ئەفشاری ورمێ

لەم سەردەمەدا کە تەمەنی ژیانی عەسکەرخان گەیبوویە سنووری هەشتا ساڵێک خوار و ژوورتر، لەبەر لەش بەباری و لاوازی و پیری، ئەو خانە کامەرانە بە جێوبان بۆی کەوت. حەکیمانی ناوچەکە هەمیشە بە سەرییەوە بوون، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ نەخۆشییەکەی پتری دەتەنییەوە هەتاکوو وای لێهات کە ڕۆژی شەممۆ بەر لە بانگی نیوەڕۆی ٨ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٤٩ی[1] کۆچی/ ٢١ی نوامبری ١٨٣٣ی زایینی بە پیر بانگاوازی یەزدانەوە ڕۆیی و چۆوە بەر دڵۆڤانی زیندوویەکی وا کە هەرگیز نامرێ. بەڕێز میرزا عەلی‌حوسێنی ناسراو بە مونشی بەڕاستی جوان ڕێکەوتی کۆچەکەی هۆنیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| کاتێک مەلی رووحی پاکی عەسکەرخان | لەم رکەوە بۆ نێو بەهەشتێ فڕی |
| خامە هات و نووسی بە گریانەوە | سەد ئاخ فەلەک پەردەی ئەفشاری دڕی |

عەسکەرخانی خوداڵێخۆشبوو نیزیکەی دوو لەسەر سێی تەمەنی خۆی لە شەڕگان‌دا تێپەڕ کرد و سەلماندی کە لێی‌دەوەشێتەوە هەتا وەک یەکێک لە پیاوماقووڵانی دەوڵەت و خێرخواز و خزمەتکاری خێڵ و خەڵک دابندرێ. کوڕەکانی بریتی بوون لە: فەرەجوڵلاخان، کەلبالی‌ئاغا، ئەسەدوڵلائاغا و فەرەجوڵلاخان.[2]

---

1 - « صد اه فلک پرده ز افشار درید » بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ١٢٤٩ی کۆچی.

2 - دوو جاری فەرەجوڵلاخان نووسیوە و هیچ سەرچاوەیەک نیە بزانم وایە یان نا.

هەر لەم ساڵەدا قەڵاکانی ئەمیرئاباد، خەبووشان[1] و سەرەخسی سەر بە خوراسان بە دەست [عەبباس‌میرزای] جێنشینی‌میر کە ئەو سەردەمە فەرمانفەرمای هەرێمەکە بوو گیران. وەکوو نووسراوە و دەگێڕنەوە، لە ئەفشارانی ورمێ ئەسەدوڵلاخانی ئەفشاری عەرەبلووی سەرتیپی تۆپخانە و فەزان‌ئاغای سەعدلووی سەرلق و محەممەدوەلی‌خانی ئەفشاری قاسملوو وێڕای سوارانی سپای ئەفشار لە خزمەت ڕکێفی شازادەدا بوون.

---

1 - نووسراوە جنووشان بەڵام هەڵەیە و خەبووشان دروستە

# ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٤٩ی کۆچی لە سەردەمی حوکماتی جانگیرمیرزادا و کۆچی‌دوایی عەبباس‌میرزا و کاردانەوەی لەسەر بارودۆخی ورمێ

کاتێک جانگیرمیرزا حوکمڕانی ورمێ و خۆی و سەلماس بوو، پاش ئەوەی کە توانی کاروبارەکەی ورمێ ڕێکبخا و دەستی کەوتەوە بەرخۆی، مستەفاقولی‌میرزای برای بەر و پشتی خۆی لەو شارە کردە بریکار و بەرەو خۆی و سەلماس کەوتەڕێ. دوای ڕۆیشتنی شازادە، مستەفاقولی‌میرزای برای کە لاوێکی بێ‌ئەزموون و لە خۆبایی بوو بە هەڵفریوانی چەند کارگێڕێکی گەندەڵکار کە لە ڕاستی‌دا شەیتان‌سرشت و خەیانەتکار بوون سەبارەت بە دەوڵەت چەند دابێکی نالەباری تازەی داخست و باج و پیتاکی زیادەی خستە سەر داهاتی دیوانی. بەرەبەرە ئاگری داپڵۆسین و کرووسینەوەکانی پەرەیان ئەستاند و دەستەیەک لە خەڵکی شارەکە کە برستی دەرچوونیان هەبوو مەوتەنی خۆیان بەجێدەهێشت و دەچوونە ناوچەکانی دوور و نیزیک. بەڕێز ئاغاعەلی‌ئەشرەفی ئیمام‌جومعە کە پەنا و پەساری هەژاران بوو لە چنگ ئاهـ و نالەی جەماوەری بێ‌دەرەتان وەتەنگ هات و بە مەبەستی لابردنی زوڵم و زۆرەملێ ڕۆیی بۆ خۆی و سکالای خەڵکی ورمێی گەیاندە لای جانگیرمیرزای بەرزموەجاغ. میرزادە تکا و سکالای ئەو پایەبەرزەی بەدڵ وەرگرت و بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێی کردەوە و ئەحمەدمیرزای برای خۆی لە خۆیە کردە بریکاری حکوومەت و بەرەو ورمێ بزووت. سەرەتای مانگی سەفەر چووە سەردانی ناوچەی مەرگەوەڕ. کاتێک گەیشتە گوندی باراندێز چونکە لە تیرەی خەلەج بوون خۆیان لە حاند فەرمانی حکوومەتی کلا دەکرد و حازر نەبوون باج و پیتاک بدەن بە دەسەڵات. هەر بۆیە

چەند کەس لە ناوبەدەرموەکانی ئەو تیرە سەربزێوەی گرت و لە ڕۆژی چلەی [ئیمام حوسێن]دا فەرمووی کە سزا بدرێن. [جەللادەکان] بێ‌سێ‌ودوو کوڕیان لەبەر چاوی باوک و باوکیان لەبەرچاوی کوڕ وەکوو مەڕ سەر بڕین!! هەروەها تاقمێک لە ژنان و کچانی خەلەج یەخسیر کران و بە سەر ڕووتی بە شار و گوندان‌دا گێڕایانن!! لەم سەروبەندەدا حاجی عەلیارخانی سەرۆکی گۆندوزلوو کە پیاوێکی زەنگین بوو هەزار تمەنی لێ‌ئەستاند.

هەر لەم ساڵەدا و ڕۆژی چوارشەممۆی ١٢ی مانگی ڕەبیعی دووەم مامۆستا مەلا ئاغاعەلی‌ئەشرەفی ئیمام جومعە کۆچی‌دوایی کرد. هەروەها لەم ساڵە پیر ئێش و ژان و تالەدا شازادەی جێگرەوەی‌میری حکوومەتی هەتاهەتایی [واتە عەبباس‌میرزا] وەختایەک لە خوراسان سەرقاڵی ڕێکخستنی کاروباری ئەو هەرێمە و وەدەست‌هێنانی کۆمەڵێک سەرکەوتنی دیار و بەرچاو بوو، لە شەوی ١٠ی جیمادی دووەم‌دا ماڵاوایی کرد لە جیهانەوانی جیهانی نەمێن و خۆنەگر و تەشریفی هەواری ژیانی بەرەو جێ‌سانەوەی هەرمان گواستەوە و ئێستا بە درێژی لەسەر چۆنیەتی نەمانی شازادە دەڕۆین. لەو ڕۆژانەدا کە بەڕێزیان سەرکەوتنی خەبووشانی وەدەست هێنا پێی‌نایە خاکی پاکی [مەشەد] و لەوێوە خێرایەکی هەتا توربەتی شێخی جام ئەسپی لینگ دا و محەممەدخانی قەرایی ناسراو بە کەللەکەن (سەربڕ) کە سەربزێوی دەکرد و هەدای نەدەدا گرتی و بە دەس‌بەسەری ناردی بۆ ئازەربایجان و پاشان کەوتە سەر هەوای گرتنی غووریان و قەڵای هیرات. بەڵام کە شازادە تەشریفی چووبوو بۆ خوراسان، بەڕێز میرزا ئەبولقاسمی قایم‌مەقام و گەورەپیاوانی باوەڕپێکراو کاغەزی ڕووراستانەیان نووسیبوو بۆ فەرمانڕەوای گەورە و گوتبوویان کە بەپێی توێژینەوەی دوکتۆرانی شارەزای فەرەنگ و ئێران لەم کاتانەدا بزووتن و سواربوونی شازادە زەرەدی پێوەیە و خراپە، بەڵام بڕوای بە گوتەی حەکیمان و غولامانی ڕووڕاستی نەکرد و ڕۆیی. هەر بۆیە فەتحعەلی‌شا نامەی لێ‌نووسی و

جەختی لێکرد کە نابێ لە جێی خۆی بجوولێتەوە. کاتێک جێنشینیمیر زانی کە قایمەقام ئەم سالەمەخەتەی کردەوە زۆر لەو بەرزەجێیە تووڕە بوو، بەلام چونکە نەخۆشییەکەی تەنیبوویەوە بەناچار گەڕایەوە خاکی پیرۆز. ئەوسا محەممەدمیرزای کوڕە گەورەی خۆی بە شێست هەزار چەکداری زبرومشێنەوە ناردە سەر قەلای هیرات. لە هێزەکانی ئازەربایجان محەممەدوەلیخانی سەرکردەی سوارانی سپا و عەلیقولیخانی سەرتیپ و عەلینەقیخانی سەرلکی برای وێڕای دوو لکی حەوت و هەشتی ئەفشاریش لەم پەلاماردا بەشدار بوون.

بەکورتی دوای محەممەدعەلیمیرزای[1] ناسراو بە دەولەتشای حوکمڕانی کرماشان، جێنشینیمیر لە تەواوی کوڕانی خاقان گەورەتر بوو. ئەویش بیست و شەش کوڕی لە دوا بەجێما کە محەممەدمیرزای مەزنی هەموویانی جلەوی حکوومەتی درایە دەست و جێی باوکی گرتەوە.

پاش کۆچیدوایی عەبباسمیرزا، هێندەی پێنەچوو کە ئەم هەوالە سامناکە تێکڕای هەرێمەکانی ئێرانی تەنییەوە. محەممەدمیرزا بە تەگبیر و لێزانی گەلالەی پێکهاتنی لەگەل «کامران»ی والی هیرات دارشت و بەپەرتاو خۆی گەیاندەوە خاکی پیرۆز.

---

[1] - ناوبراو نۆبەرەی فەتحعەلیشا بووە و سالی ۱۲۰۳ی کۆچی پێیناوەتە جەغزی ژیان و سالی ۱۲۳۷ی کۆچی مردووە.

## ئەو ڕووداوانەی کە لە سایەی زەبروزەنگی جانگیرمیرزاوە لە ورمێ قەومان

کاتێک هەواڵی کۆچی‌دوایی جێنشینی‌میر لە تەورێز تـەواو بـڵاو بـۆوە، محەممەدخانی سپاسالاری پێشکاری شازادە فەرەیدوون‌میرزا قاقەزێکی سەبارەت بەم ڕووداوە نووسی بۆ نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگ و بە نامەبەرێکی تیژبەزدا ناردی بۆ ورمێ. نەجەف‌قولی‌خان کە نامەکەی گەیشتە دەسـتی لەگـەڵ ڕێـزدار میرعەبدولحەمیدی شێخولئیسلام و میرزا موسلیمی عارفی سـەربەدەرەوە ڕۆژی هەینی ۸ی مانگی ڕەجەب لە پەنادا چوونە خزمـەت شـازادە جـانگیرمیرزا و بـە سەری زمانان هەواڵی نەمانی جێگرەوەی‌میریان بـە گـوێی هەڵـێنا. شـازادەی بەرزەجێ بە بیستنی ئەم هەواڵە بە چەپۆک و مستان وەرگەڕایە سەر و سینگ و بەرۆکی دادڕی و ئۆقرەی لێ‌هەڵگیرا و کەوتە تازیـەداری و شـینگێـڕان. پـاش سەرەخۆشی و تازیەتباری هێندەی پێنـەچوو کـە خەبـەری دانـدرانی شـازادە محەممەدمیرزا بۆ جێنشینایەتی‌میر ڕوون بۆوە و هەموو وڵاتی داگرت.

هەر لەم سەروبەندەدا تەتەرێکی باوەڕپێکراو لە لایـەن خوسـرەومیرزای برای بەر و پشتی جانگیرمیرزا گەیشتە ورمێ و پەنامەکی بە شازادەی ڕاگەیانـد کە قایم‌مەقام پیلانێکی گێڕاوە هـەتا نێـوانی ئێمە بشێوێنێ و بۆیە دەبێ وریـا بین و هەنگاوی بەپارێز باوێین. شازادە جانگیرمیرزا هـەم بـە نـەمانی بـاوکی ناوداریبیەوە تـەواو دڵـتەنگ بـوو، هـەم جێنـشینایەتی‌مـیری و پادشـایەتی محەممەدمیرزای دوای باوەگەورەی تاجداری بە لاوە تاڵ و ناخۆش بوو. چونکە لە دەروون‌دا خۆی بە شیاوی ئەم پلە و پایەیە دەزانی. تەنانەت چەند جارێکی بە سەر زمانی‌دا هات و گوتی ئەی خودایە جانگیری غولامی تۆ چـۆن سـەر وەبـەر

گوێلکپەرستی بێنێ؟! بەکورتی چونکە هەوای سەرهەڵدان و تاسەی تاج و تەختی ئێرانی لە سەریدا بوو، ململانی و دژایەتی خۆی بە تەپی عالەم ئاشکرا کرد. بەڕێز محەممەدخانی زەنگەنەی سپاسالار چەند جارێک کاغەزی دڵدانەوەی نارده خزمەتی و لەو خەیاڵاتە پووچ و بێهوودەیەی دەگێڕایەوە و بە پەند و ئامۆژگاری ڕێگای ڕاستی وەبەر دەنا بەڵام هیچ فایدەی نەبوو. سەرەنجام وادیارە بەناچاری کەوتە خۆ ساز کردن بۆ پێشوازی محەممەدمیرزای جێگرەوەی فەرمانڕەوای ئێران کە لە تارانەوە وەکوو فەرمانفەرای ئازەربایجان تەشریفی دەهات و مستەفاقولیمیرزای برای لەبری خۆی کردە حوکمداری ورمێ و بەپەلە تێکشا. کاتێ کە میرگی ئۆجان تاوڵ و خێوەتی سەراپەردەی شازادەی جێگرەوەی میری لێهەڵدرابوو، گەیشتە خزمەتی و شەرەفی دیداری پێبرا. جا لەبەرەوەی کە میرزا ئەبولقاسمی قایمەقام زۆر چاک بە نیازی نالەبار و پێچەوانەی جانگیرمیرزای دەزانی، هەروەختایەک کەلێن و هەلی بۆ هەڵکەوتبایە زمانی سەبارەت بەو شازادە بەرزمجێیە بە خراپ دەسووڕا و ئەوەندەی کرابا بۆی تێدەچاند. هەتا وا هات کە ڕۆژی چوونە تەورێز کە ١٨ی ڕەبیعی یەکەم بوو بەدزی جانگیرمیرزا و خوسرەومیرزای برایان گرتن و چاویان کۆلین و بە دەسبەسەری ناردیانن بۆ ئەردەوێل! پاشان براکانی دیکەی واتە ئەحمەدمیرزا و مستەفاقولیمیرزا کە وەکوو بریکاری جانگیرمیرزا لە ورمێ و خۆی و سەلماس حکوومەتیان دەکرد [لێخران]. جێنشینی پایەبەرزی میر فەرمانێکی نووسی بۆ نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ کە وەکوو سەردەمی پێشوو دەکرێتەوە حوکمڕان و پێویستە مستەفاقولیمیرزا بە دەسبەسەری بنێرێ بۆ ناوەندی دەسەڵات. بەگلەربەگ بەپێی حوکمی محەممەدمیرزا، شازادەی ناوبراوی بە عەبدوسسەمەدخان و فەرەجوڵلابەگی سەردەستەی سوارەی سپادا بەڕێکردە تەورێز. بەڵام کاتێک بەگلەربەگ دیسانەوە گەڕایەوە سەر تۆخی جارانی و خەڵاتی حوکماتی ئەفشارانی کردەوەبەری و لەسەر تەختی شکۆمەندی دەسەڵات

پالـی داوە، سـەرەتا بـە شـوکرانەی ئـەم بەسـەرکرانەوەیە تەشـریفی بـردە خوێندنگای شار و فـەرمانی نۆژەن و ساز کردنـەوەی حوجرەکـانی مزگـەوتی گەورە و لێدرانی تۆقی زێرینی گومبەز و هەڵاومسرانی چلچرا و دانانی مینبەری دا. پاشان فەرمووی کە میرزا محەممەدشەریفی [خەتخۆش] سوورەی موبـارەکی «ئینسان»[1] لە تانەڵەی دامێنی مزگەوت بنووسێتەوە.

هـەر لـەم سالـە دەنـگ و باسـی کـۆچیدوایـی خاقـانی خوابەخـشیو فەتحعەلیشا لە ئیسفەهان تەواوی وڵاتی داگرت. جێگـرەوەی پایەبـەرزی مـیر محەممەدشا لە تەورێزەوە تەشریفی بـردە تـارانی پایتـەخت و لـە ڕۆژی ١٤ی ڕەمەزانی پیرۆزی ئەم ساڵدا کە ١٢٥٠ی کـۆچی مانگییـە، لـە جێگـای بـاپیری خـاوەنشـکۆی کامـڕەوای دانیـشتە سـەر تـەختی فەرمانڕەوایـەتی و تـاجی پاشاهانەی گەیاندە ڕۆپەی ئەستێرەکانی دووبرالە.

---

1 - سوورەتەکە ئاوا دەست پێدەکا: «هلْ اتی علی الانسان...

## چوونی جانگیرخان بۆ تاران و بردنی دیاری لە لایەن نەجەفقولیخانەوە بۆ محەممەدشای قاجار

پاش ئەوەی فەرمانڕەوای پایەبڵند محەممەدشای قاجار لەسەر تەختی پادشایەتی پاڵی دایەوە و جاڕی پلەی بەرزی وەزارەتی ئەسپاردە دەستی لێوەشاوەی بەڕێز میرزا ئەبولقاسمی قایمەقامی سەیدی فەراهانی، حاکمانی خاوەندەسەڵات و بەگلەربەگانی تەواوی ناوچە و مەڵبەندەکان بە دیاری و پێشکەشییەوە روویان دەکردە بارەگای پێشەوایەتی و لاشیپانەی دەرگانەی میریان ماچ دەکرد. بۆ وێنە نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار کە حوکمڕانی ورمێ بوو، جانگیرخانی کوڕی پاکسرشتی خۆی بە کۆمەڵێک دیاری شایانەوە ناردە پیرۆزبایی پادشای نوێ بۆ تاران. بەگلەربەگزادە پاش ئەوەی شانازی چوونە بەردەرانەی بەرزی پێبڕا، نامەی پیرۆزبایی باوکی و ئەو شتانەی کە بە دیاری بردبوونی وەبەرچاوی موبارەکی پادشای خستن و ئەویش بە سۆزی میرانە بە سەری کردەوە. چونکە فەرمانڕەوای مەزن دەیزانی کە ئەم بنەماڵەیە لەمێژە تێکەڵی خانەدانی پادشایەتین و بوونە خزم و بەڕاستی خزمەتکارن، یەکێک لە کچانی قاقان کە لە باوکەوە خوشکی شازادە یەحیامیرزا و جیهانسۆزمیرزا و پوورزای جانگیرخان بوو، لەو خانزادەیەی مارە کرد. هەروەها فەرمانیدا کە بڕی پێنسەد تمەن بخرێتە سەر مووچە و مانگانەی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ. دوای ئەم کارانە لە کانگا و سەرچاوەی پێشەوایەتیڕا حوکم نووسرا کە نەجەفقولیخان بۆ سەری سێجارە حکوومەتی نەپسێتەوە و سەربەخۆ بێ و هەروابێتەوە جانگیرخانی کوڕی هێژای بچێتە

شوێنی برایمخەلیلخانی برای بەگلەربەگ کە پێشتر بریکاری بوو. ئەوسا جانگیرخان بە شادی رووی کردەوە ورمێ و رۆژی پێنجشەممۆ ٢٥ی مانگی رەبیعی دووەم گەیشتەوە. نەجەفقولیخان چووە پێشوازی خەلاتی پاشا و شایی و داوەتێکی شایانی بۆ زەماوەندی کورەکەی ساز کرد. بەکورتی ماوەی چەند ساڵێک بە سەربەستی لە ورمێ حکوومەتی دەکرد هەتا سەرلەنوێ دەسەلات درایەوە دەست شازادە مەلیکقاسممیرزا.

## گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ شازادە مەلیکقاسممیرزا
## و ئەو ڕووداوانەی کە لەو چاخەدا قەومان

ڕۆژی چوارشەممۆ ١٩ای جیمادی یەکەم حەسەنبەگ یەکێک لە غولامانی شازادە مەلیکقاسممیرزا بە نامەی چارەنووس و حوکمی دەسخەتی محەممەدشاوە گەیشتە ورمێ. لە دەقی فەرمانەکەی پادشادا نووسرابوو: دەبێ نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ بزانێ کە مامی بەڕێز شازادە مەلیکقاسممیرزا لە هەڕەتی مێرمنالیڕا لایەنگرێکی ڕووڕاستی دەولەت بووە و گەلێک خزمەتی شایانی کردووە بە جێنشینی خوابەخشیوی میر. هەروەها سەردەمێک کە قارەمانمیرزای برای دایک و باوکیمان دەسەڵاتداری ئازەربایجان بووە، هەم لە دەورانی ژیانیدا و هەم پاش نەمانی زۆری دلسۆزی و دلۆوانی بۆ نواندووە، بۆیە ئێستا کە بۆ خۆی داوای حکوومەتی ورمێی لە بەڕێزمان کردووە کە زێدی باب و باپیرانی دایکێتی، ئێمەش بەوپەڕی مەیل و ڕەزامەندی باربووی ئەو مامە مەزنەمان کرد. فەرمان دەدەین بەو نۆکەرە دەولەتخوازە کە خۆی و تێکڕای ئەفشار لەمڕۆ بەو لاوە بە حوکمڕانی سەربەخۆی خۆیانی بزانن و لە حوکمی ڕبارەک لانەدەن و ئیتر تەواو.

دوا بە دوای ئەم فەرمانە خودی شازاد مەلیکقاسممیرزاش لە تارانەوە هاتە تەورێز. چونکە لەو کاتەدا قارەمانمیرزای برای محەممەدشا حوکمڕانی تێکڕای ئازەربایجان بوو، شازادە مەلیکقاسممیرزا لایەنی بە سەرکردنەوەی تایبەتی میرانە و مامێتی و گەورەیەتی تێهێنا و گوێی نەدایە وازۆی بەهمەنمیرزا و مالاوایی خواست و گەیشتە ورمێ. ئەم کارەی لە دلی

بەهمەن‌میرزا گران هات و بوو بە گرێ لە دەروونی‌دا و ڕقی لێ‌هەڵگرت و لە جێی خۆی‌دا باسی دەکرێ کە چۆنی تۆڵە لێکردۆتەوە.

شازادە مەلیک‌قاسم‌میرزا کە بۆوە بە حوکمـڕان، هەوسـاری کاروبـاری بریکاری حکوومەتی دایە دەستی لێومشاوەی نەجەف‌قولی‌خانی خاڵۆزای. میرزا باقری قەزوێنی و میرزا حوسێنی ئاشتیانی کردنە سەرحیسابی دیوانی دارایـی. خۆی بەپێی تەمەنی گەنجی کەوتە گەشت و سەیران و ڕاوشکار و چوونە دەشت و کێوان. ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٥٨ی کۆچی /١٨٤٢ ـ ١٨٤٣ی زایینی.

## ئەو ڕووداوانەی کە بوونە هۆی لەسەر کار لادرانەوەی شازادە مەلیکقاسممیرزا

ئەوەی ڕاستی بێ مەلیکقاسممیرزا کە لەگەڵ مەلیکمەنسوورمیرزا لە بەر و پشتی دایک و باوکێک کەوتبۆوە و کچەزای ئیمامقولیخانی بەگەربەگی ئەفشار بوو، لە نێو کوڕانی خاقانی خوابەخشیودا بۆ جوانچاکی و گەلەکەتی و ئاقڵمەندی بەناوبانگ و لە هەمووان سەرتر بوو. لەم سەردەمەدا کە بۆ جاری دووەم لە لایەن پادشای غەزاکەر محەممەدشاوە کرایەوە حوکمڕانی ئەفشاری ورمێ، چونکە سرشتی ئەو شازادەیە تێکەڵاوی عەیش و نۆش و ڕابواردن و کەیف و جەفەنگ بوو، سەرنجێکی وای نەدەدایە کاروباری حکوومەتی و لای لێنەدەکردەوە. زۆرتر دەچوو بۆ گەشت و سەیران و ڕاو لە نێو باغ و کۆساران. جا بۆیە وای لێهات کە تاقمێک ئادەمیزادی نزم و نەوی و خوێڕی لە دەوری دامودەزگای میری کۆبوونەوە و دەرگاکانی دەستدرێژی و چەوساندنەوەی جەماوەری ئەفشاریان خستنە سەرپشت. دابی تازەی ناشیاویان داهێنا و کەوتنە لارێیی و خەتاکاری. کاتێک لاساری و خیرەسەری ئەم خەنیمانەی دەوڵەت ..غزی هەڵبوارد و لە ڕادە دەرچوو، سەرۆکان و سەرکردەکانی ئەفشاری وەکوو عەسکەرخانی کوڕی ڕەسەنزادەی لوتفعەلیخانی سەرتیپ، شێخالیخانی کوڕی مەحموودخان، عەبدوسسەمەدخانی مەزنی تیرەی عەبدولمەلیکی، حاجی عەلیارخانی گۆندوزلوو و چەند کەسێکی دیکە بە مەبەستی سکاڵا و دادخوازی بەرەو تەوریزی ناوەندی دەسەڵات بزووتن. لەوێ بە تەگبیر و دنەی بەهمەنمیرزا - بۆ ئەوەی تۆڵەی [سووکایەتی] پێشوو لە مەلیکقاسممیرزا

بکاتەوە – هەموویان پەنایان بردە ژێر گومبەزی موبارەکی حەزرەتی سەید هەمزە کە پەناگای بێبەشان و سێبەر و پەساری دادخوازانە و لەوێ گرووپیان گرت و لە شوێنی خۆیدا پتری لەسەر دەڕۆین.

لە لایەکی ترەوە یەحیاخانی چێهریقی حاکمی سەلماس و ئێلخانی کوردان لەسەر باج و پیتاکی حکوومەتی ناوچەی سۆما و برادۆست لەگەڵ شازادە مەلیکقاسممیرزا ناکۆک بوو. دیارە خوشکی یەحیاخان لە ریزی ژنانی رووبەندەپۆشی فەرمانڕەوایەتیدا و دایکی عەبباسمیرزای دووەم کوڕی محەممەدشای غازی بوو. بۆیە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کارگێڕانی حکوومەتی ورمێ کە پیتاکی سۆما و برادۆستیان وەرگرتووە دەبێ بیدەنەوە، چونکە هەردک ناوچەکە سەر بە سەلماسن و نابێ تازە خۆ لە کاروباری وێندەرێ هەڵقوتێنن. هەر بۆیە یەحیاخان تەنیا لەبەر ئەم مەبەستە ڕۆژی سێشەممۆ ٧ی مانگی محەرەم گەیشتە ورمێ و پاش ئەوەی چووە خزمەت شازادە، لە ماڵی فەرمجوڵلاخانی کوڕی خوابەخشیو عەسکەرخان بوو بە میوان. پاش تێپەڕینی دە ڕۆژەی عاشوورا، یەحیاخان دیداری لەگەڵ شازادە مەلیکقاسممیرزا تازە کردەوە و دەسخەتێکی محەممەدشای پێنیشان دا کە تێیدا نووسرابوو لەبەرەوەی ناوچەی سۆما و برادۆست و داهاتی دیوانی بشکوفتی بەشێکن سەر بە سەلماس، حکوومەتی ورمێ دەبێ خۆی تێوەرنەدا. شازادە دەستیدەستی بە ئێلخانی حوکمڕان کرد و لەوێ ڕایگرت و نامەیەکی نووسی بۆ تارانی پایتەخت هەتا بزانێ سەرجەلەی پێشەوایەتی دەفەرموێ چی.

هەر لەم ساڵەدا بوولەرزەیەکی بەهێز ورمێ و خۆی ڕاتلەکاند. شوکر بۆ خودای گەورە کە ورمێ زەرەدی پێنەگەیی، بەڵام لە خۆیە چەند خانووبەرە و باڵەخانە هەرەسیان برد و ڕووخان و خەڵکێکی زۆر تێداچوون.

مەلیکقاسممیرزا سەرەڕای نووسینی کاغەزێک سەبارەت بە یەحیاخانی ئێلخانی کوردان بۆ بارەگای محەممەدشا، تۆزێکیش دەربارەی

شوو لێهەڵکێشان و کۆسپ و تەگەرەنانەوەکانی فەتحوڵلاخانی سەرتیپ دوابوو که لەم کاتەدا وێرای دوو لق چەکدار لە سەفەری خوراسانەوە گەڕابۆوە ورمێ. بەم پێیە ڕۆژی چوارشەممۆ ٢٩ی مانگی محــەررەم مەشـەدی «شـابان»نـاوێکی غولام و خزمەتکاری شازادەی بەرزەجێ کە نامەی بردبوویە تـاران، هاتــەوە و کاغەزی دەسخەتی موبارەکی لەگەڵ خۆی هێنا کە تێیدا هاتبوو: «دەبــێ مــامی بەڕێز مەلیک‌قاسم‌میرزا بزانێ کە نامەکەی گەیوەتە دەستم و کاکڵ و نێوەرۆکیم بۆ دەرکەوتووە. سەرەتا سەبارەت بە فەتحوڵلاخانی سەرتیپ نووسیبووت کــە خەریکە تەنگ و چەڵەمە دەخاتە نێو کاروباری دەسەڵاتی مامی هێـژاوە، بۆیـە لەسەر داوای تۆ فەرموومانە بێتە تاران و ماوەیەک لێرە بمێنێتەوە. سـەبارەت بە یەحیاخانی ئێلخانی کوردان ئەو مامە دەبێ گوێ بۆ قسە و داواکانی شل بکا و وەریانبگرێ و کارێکی وا بکا شوکرانەی ببژێرێ نەک دڵی بـشکێ و نارەزامەنـد بێ. برای کامڕەوامان بەهمەن‌میرزای دەسەڵاتداری ئازەربایجان نامەیـەکی لــە بابەت کۆزیلکەبەستنی جەماوەری ئەفشاری ورمێـوە نووسـیوە کـە ماوەیەکـە هاتوونە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات و پەنایان بردۆتە بەر سەید هەمزە و لەوێ مانیان گرتووە. لە وڵامدا نووسیمان و فەرمورمان کە بەهمـەن‌مـیرزا زۆر چــاک دڵیان بداتەوە و بە ئومێدواری بیاننێرێتەوە ورمێ. ئـەو مامــە ڕێـزدارە دەبــێ باشیان لەگەڵ بجوولێتەوە، بەتایبەت چاکەی خزمەتەکانی لوتف‌عــەلی‌خــانی سەرتیپ بـاوکی عەسـکەرخان بـۆ کورەکـانی وەبـەرچاو بگـرێ.» دوای ڕوون بوونەوەی کاکڵی دەسخەتی پـیرۆز، فەتحولـلاخانی سـەرتیپ سـەری وەبــەر فەرمانی میر هێنا و سەرەتای مانگی سـەفەر بـەرەو پایتـەخت بـزووت. پـاش ڕۆیشتنی وی شازادەی گەورە، غەفاربەگی سەردەستەی لکی حەوتی ڕاسپارد کە بچــێ و بــە ڕۆژی ڕوون دوو بەیـداخی لکـی حــەوت و هەشــت لــە مالــی نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگەوە بەرێتە خانەمیری ورمێ. پاشان شازادەی بەڕێز

کەوتە خۆنواندن و شانبەشانی باغی ئەزەر، باغێکی لێدا و بە «باغی شا»ی ناودێر کرد و دواتر کەوتە نۆژەن کردنەوەی قەڵا و باڵەخانەی سەردەری.

پاش ئەوەی فەتحوڵڵاخان بەپێی فەرمان خۆی گەیاندە تاران و سەربەرزیی دیداری فەرمانڕەوای ئێرانی پێبڕا، دەستوور درا کە لە ماڵی محەممەدحەسەنخانی سەردار ناسراو بە خانباباخانی ئێرەوانی نیشتەجێ بێ. لەو کاتەدا حاجی میرزا ئاقاسی ئێرەوانی وەزیری محەممەدشا بوو کە لە دڵی خۆیدا مەلیکقاسممیرزای خۆشنەدەویست و بۆ تێکدانی کاروباری حکوومەتی شازادەی بەرزەجێ، برایمئاغای کوڕی عەلیخانی سەرداری ماکۆیی کە ئامۆزای خانباباخانی سەردار و لاوێکی بوێر و ئازا بوو، جارێ کردی بە فەرماندەی لەفی حەوتی ئەفشار کە پێشتر عەبدوڕڕەززاقبەگی کوڕی میرزا محەممەدی عەبدولمەلیکی سەرکردەی بوو. دیارە فەرماندەیی لەفی هەشت هەروا لە چنگ عەزیمئاغای کوڕی عەبدوسسەمەدخاندا مایەوە. برایمئاغای ماکۆیی کە ڕەنگە وەزیر ڕێوشوێنی تێکدەرانەی وەبەرنابێ، دوای ئیزن خواستن لە خزمەت محەممەدشا پاش چەند ڕۆژان گەیشتە تەورێز. دوا بە دوای ئەو یەحیاخانیش پێینایە تەورێز و بە هاوکاری عەلینەقیخانی ئەفشاری قاسملووی سەرۆکدیوان چەند ڕێوشوێنێکی بۆ پاڵپشت و پتەوبوونی کاری خۆی لە بەهمەنمیرزای ساحێبئیختیار (حوکمڕان)ی ئازەربایجان وەرگرت و بەرەو تاران ڕۆیی. بەم شێوەیە بوو کە لە هەموو لاوە ڕێ خۆش دەکرا بۆ لادرانی شازادە مەلیکقاسممیرزا.

دوای ڕۆیشتنی یەحیاخان، بەهمەنمیرزای حوکمدار بۆ بەرژەوەندی ڕۆژگار خەڵاتێکی نارد بۆ مەلیکقاسممیرزای مامی و دڵخۆشی داوە کە لەسەر تەختی دەسەڵاتی هەروا سەربەخۆ دەبێ. بەڵام برایمئاغا کاتێک لە تەورێزەوە گەیشتە ورمێ یەکراست چوو بۆ سەرسەرای عەبدوسسەمەدخان و لەوێ بنەی دانا. ڕاست لەو سەروبەندەدا ڕێزدار مەلیکقاسممیرزا بە مەبەستی سەیران و

شادی یان دارشتنی بناغەی بینایەک لەسەر پۆپەی «شێخ‌نەپەسی» کە جێیەکی خۆش و دڵگرە و کەوتۆتە لێواری رووباری شاراجۆ، تاوڵ و خێوەتی هەڵدابوو. برایم‌ئاغای سەرلق لەبەر بادیهەوایی و بەرزەفڕی و پشنگەرمی بە گەورەپیاوانی دەوڵەت نەچوو بۆ دیداری شازادەی بەرزمجێ. بۆیە سبەینێ شازادە گزیری توند و تیژی ناردن کە پلەدارانی لقی حەوت بە کەلەگایەتی بێنن هەتا لێیان‌بپرسێتەوە و هەڵیانپێچێ کە بۆچی بێ ئیزن چوونە پێشوازی سەرلقی نوێ. برایم‌ئاغا بێ‌شەرمانە لێیان‌وەجواب هات و تڕۆی کردن و هەسی‌دانەوە. چونکە بەیداخی لقی حەوت لە خانەمیری ورمێ بوو، چەند رۆژێک سوال و جوابی توند و تاڵ لە مابەینیاندا ئاڵوگۆر کران. سەرەنجام بەڕێز میرعەبدولحەمیدئاغای شێخولئیسلام لەگەڵ چەند مامۆستایەک و سەرکردەکانی ئەفشار بوونە نێوبژیوان و گەرد و تۆزی نێوانگرژی و هەراکەیان رۆمرکاندەوە.

هەر لەم ماوەیەدا بەحیاخانی چێهریقی کە گەیبوویە پایتەخت بە پشتیوانی حاجی میرزا ئاقاسی و بە خۆتێوەردانی خوشکێک و کچێکی کە هاوسەری فەرمانڕەوای پایەبەرز بوون، بەرگەخەڵاتی حوکمڕانیی ورمێ و سەلماسی وەرگرت و بەژن و باڵای پێ‌ڕازاندەوە و شاد و کامڕەوا بەرەو شوێنی مەبەست گەڕایەوە. لە رۆژی چوونی‌دا کە پێنج‌شەممۆی ٥ی مانگی سەفەر بوو، پیاوماقووڵان و ئەمیرانی ئەفشار چاکیان پێشوازی لێکرد و پاش ئەوەی لەسەر تەختی حوکمات پاڵی دایەوە لە خێڵ و خانەدانی ئەفشاری رِوانی و هەر کەس شانی چۆن هەڵیدەگرت خەڵات و پلەی باربوو کرد.

## خەڵاتبەخشینەوەی یەحیاخان و شەڕکردنی لەگەڵ عێلاتی سەربزێو و ڕووخاندنی قەڵاکانی کانیمێش و بەردەڕەش

کاتێک بنەبانی مانگی سەفەری ساڵی ١٢٦٠ی کۆچی /١٨٤٤ ـ ١٨٨٥ی زایینی داهات و دوو کاتەژمێر بە سەر شەوی پێنجشەممۆدا تێپەڕی و هەتاو گەیشتە کەلووی کاوڕ و خاکەلێوە خۆی نواند، ئێلخانی جێژنی نەورۆزی بە دابی خۆی بەڕێوە برد و جێژنانە و خەڵاتی شایانی دایە جەماوەری ئەفشار و بە سەید و مەلا و سەرکردە و مەزن و ماقوولەوە هەمووی بەسەرکردنەوە و جبە و مێزەر و عەبا و قوماشی ماهووتی بەخشییەوە. دەڵێن ئەوانەی دابەشی کردوون بایی شەشسەد تمەنی تەورێزی زیاتر بوون. یەکێک لەو کارە خێرانەی کە ئەو پیاوە بەدڵ و دەروونە لە مەودای دەسەڵاتداری خۆیدا کردوویەتی هەڵگرتنی مەڕانە و گارانانە بوو لەسەر خەڵکی قەڵا بۆ ماوەی دوو ساڵ. هەروەها ئاوی ڕووباری شاراجۆ کە لە سەردەمی حوکماتی کەڵبالیخانی ئەفشاری یەکەم حوکمداری ئەم مەڵبەندەوە بەستێنی بۆ خۆش کرابوو و بە نێرینەی شاردا سەرەوخوار دەڕۆیی و هەموو گەڕەکەکانی نەدەگرتەوە و خەڵکی پێ پاراو نەدەکرا و هاوینان زۆری کەم دەکرد، ئێلخانی قۆڵی هەڵماڵی هەتا کەرێزێک بۆ خێری خۆی بە یادگار لێبدا. هەر بۆیە بەڕێز مەلا مستەفای کوڕی مەلا یەحیا کە پیاوێکی باوەڕپێکراو بوو داینا بە دەمراست و کەیخودای ئەو کارە چاکە و دراوێکی زۆری لێخەرج کرد، بەڵام چونکە حکوومەتەکەی تا سەر نەڕۆیی کارەکەش بە ناتەواوی پەکی کەوت.

قەڵایی «کانیمێش» و «بەردەڕەش» دوو قەڵای کۆن و لەمێژینەی سۆما و برادۆستن و هەردکیان بە خواکرد و سەخت و پتەو دادەندرێن. لەم ساڵەدا تاقمێک

لە شەڕفرۆشانی بنەگرتوویان، پەلیان بزاوت و ئەوەندەی بۆیان دەلوا دەستیان کرد بە چەتەیی و ڕێگری و دارووتاندنی کاروانەکانی خەڵکی ورمێ. هەروابێتەوە وادیارە پەلاماریان دەبرد سەر گوندەکانی نیزیکی ناوچەی ورمێ و دەستیان لە تاڵانوبرۆ نەدەپاراست. بۆ نموونە لە کاتی بەربەرەکانیدا کوڕێکی جحێڵی مەلا محەممەدی کەیخودای یوورقانلوو بە چنگ ئاژاوەگێڕان کوژرا. مەلا محەممەد کە پیرێکی کۆنەساڵی زمانپاراو و ناوداری ڕۆژگار بوو، لە تاوی کوژرانی کوڕی وەکوو شێتان ڕووی کردە تارانی پایتەخت و داد و هاواری خۆی بردە بەرڕکێفی محەممەدشای غەزاکەر کە پێی‌نابوویە ئاوزەنگی و لەسەر سەفەر بوو. فەرمانڕەوای دانپەروەر کە زۆر بە ڕێزەوە لە پیاوانی کۆنەساڵی دەڕوانی، بەزیی بەو پیرە دڵبریندارەدا هات و لەرێوە فەرمانی نووسی بۆ یەحیاخانی ئێلخانی کە بەهێزی سپای ئەفشاری ورمێ تاوانباران سزا بدا و قەڵاکانیان تەخت بکا و داریان لەسەر بەرد نەهێڵێ. مەلا محەممەدخان حوکمی حاکمی وەکوو نوشتەی چاووزار لە باسکی متمانەی شەتەک دا و ڕووی کردە ورمێ. ئێلخانی بەپێی فەرمان قۆشەنێکی زۆری لە سەرباز و تۆپچی و سوارەی ئەفشار و قەرەپاپاغەکانی دانیشتووی سندووسی کۆکردنەوە و لەشکری بردە سەر ئەو ناوچەیە. پیاوماقووڵانی ئەفشاری وەکوو عەلیقوڵیخان کە پێشتر سەرتیپی چەکدارانی لقەکانی ئەفشار بوو لەگەڵ عەسکەرخانی کوڕی لوتفعەلیخان و چەند مەزنێکی دیکەش لەو هرووژمەدا بەشدار بوون. لە ماوەی دوو سێ مانگا هەردک قەڵا گیران و وەها کاول کران کە ناسەواریان نەما و تاوانبارانی شەڕفرۆشانیش پێوەبوون و گیران.

## کۆچی‌دوایی محەممەدشا؛ تاج لە سەرنانی ناسرەددین‌شا؛ باربووکرانەوەی حوکماتی ورمێ بە نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگ بۆ جاری چوارەم و پێهەڵاچوونی پلەی مەلیک‌قاسم‌میراز بۆ فەرمانفەرمایەتی ئازەربایجان

سالی ١٢٦٤ی کۆچی/ ١٨٤٧ی زایینی پاشای خـەزاکەر محەممەدشا ژانـی لاق و جومگەئێشە هێز و برستی لێبڕیبوو. ئەگەرچی زۆری کەیف بە ڕاپەڕاندنی کاران دەهات و هەمیشە مەیلی بۆ بڕیار و بەرەنگاری دەبزووت، بەڵام نەخۆشی درێژخایـەن دەسـتی لێخـەی نـەدەکردەوە و ئەگـەر دایـدەگرت ئاراوقـارای لێهەڵدەگرت. لەم ساڵەدا ئاساغی ئەوەندەی لێتوند کرد و هێرشی بۆ هێنا کـە شا زانی جەنگەی خواحافیزییە لە تاج و تەختی جیهانی رووخەک و کاتی چوونە بۆ هەرێمی هەرمان. چونکە جێگرەوەی‌میر ناسرەددین‌شا لە ئازەربایجان بـوو، فەرمانڕەوا وەسیتەکانی کردن بۆ مەهدی‌عولیای کەڵەژنی دایکی ناسرەددین‌شا. سێ و پێنج خولەک بە سەر شەوی سێ‌شەممە ٦ی مانگی شەشەکان‌دا تێپەڕیبوو کە پاشا چۆوە بەر دلۆڤانی خودا.

کاتێک هەواڵی کۆچی شـای بەهەشـتەلان گەیـشتە تـەوریزی ناوەنـدی دەسەڵات، شازادەی جێگرەوەی‌میری دەوڵەتی خۆڕاگر ناسرەددین‌شـای قاجـار دوای سەرەخۆشی و تازیەداری ماوەیەکی کەم لە جێی خـۆی نـەبزووت. مـیرزا محەممەدتەقی وەزیری لەشکر کە لـەم کاتـەدا وەکـوو ڕاسـپاردە چووبـوو بـۆ ئەرزەڕۆم و گەڕابۆوە و لە خزمەت ڕکێفی‌دا بوو، دەستووری پـێ‌فەرمــوو کــە شان‌بەشانی میرزا فەزلولڵای نەسرولمەلیکی وەزیر بــە قۆشــەن و ئێلجـارەوە بڕۆنــە تــاران. لــەو دەمــەدا عــەلی‌قولــی‌خــانی کــوڕی محەممەدعیـساخان و

عەلی‌نەقی‌خانی بـرای و عەسـکەرخان و یۆسـف‌خـانی کـورانی خوابەخـشیو لوتف‌عـەلی‌خـانی سـەرتیپ و فەتحولـلاخانی کـورانی نەجـەف‌قولـی‌خـانی بەگلەربەگی ئەفشاری ورمێ لــە تــەوریز بـوون. فەرمانــڕەوای تــازە شــازادە مــەلیک‌قاسـم‌مـیرزای دانــا بــە فەرمانفــەرما (حوکمــڕان)ی ئازەربایجــان و نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگی وەکوو بریکاری شازادە کردە حوکمـداری ورمـێ. ئەوسا فەتحوللاخانی کوری بە حوکمی پاشا و پارچەخەلاتی بریقەداری چەشنی خۆرەوە گەڕایــەوە ورمــێ. بـــەلام بــەگوێرەی فــەرمان، عــەلی‌قولـی‌خــان و عەسکەرخان و یۆسف‌خان لە ڕکێفی بەرەو سـەرکەوتنی‌دا چوونــە تــاران. دوای بڕینی مەودای ڕێگا و هەلبواردنی چەند جـێ‌وچانێـک، کــاروانی بەشـەوکەتی ناسرەددین‌شا، ڕۆژی ۲۱ی مانگی نێوجێژنان گەیشتە تاران و حەق چوو لە جێی خۆی دانیشت.

حاجی میرزا ئاقاسی پیر و وەزیری محەممەدشا کـە لــە ترسـان پـەنای بردبوویە بەر گومبـەزی شـاعەبدولعەزیم، لەسـەر ئیزنـی پاشـا ڕۆیـی بـۆ بەردەرانەی بەرزی ئیمامان و بەڕێز میرزا تەقی‌خانی ئەمیرنیزام (سپاسالار) بوو بە وەزیر و بە ئەتابەکی مەزن[1] ناودێر کرا.

بەلام لەم لایەوە دوای ماوەیەک شازادە مەلیک‌قاسـم‌مـیرزا سـەرلەنوێ حکوومەتی ورمێی وەکوو بریکار دایەوە دەست نەجەف‌قولی‌خـانی بەگلەربـەگ. بۆیە ئەو ڕۆژەی کە بـــە خەلاتـــی پاشــا و شــازادەی فەرمانفـەرماوە خـۆی ڕازاندەوە و لەسەر تەختی دەسەلات پالی دایەوە، چـۆن شـیاوە خزمـەتکارانی حکوومەتی بەسەرکردنەوە و پلەی شایانی باربوو کردن.

[1] - لە دەقەکەدا نووسراوە «آقابیگ اعظم» کە لە ڕاستی «اتابیک اعظم» دروستە

## ئەو ڕووداوانەی کە لە خولی تازەی حوکماتی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگدا لە ورمێ قەومان

وەکوو دیارە لە سەرەتای ئەم ساڵدا یەحیاخانی حوکمڕانی ورمێ لەبەر چەند هۆیەکی بەرچاوی وەکوو پاکردەحیسابی چەندین ساڵەی داهاتی دیوانی ورمێ و لق و پۆپی زیادەی بانگ کرابوویە تەورێز و لەوێ مابۆوە و هێشتا محەممەدشا دەستی لە داوێنی ژیان بەرنەدابوو. دوای ڕۆیشتنی ئیلخانی، حاجی غەفوورخانی زەرزا لەگەڵ میرزا عەلی سەڵماسی پێکەوە کاروباری دامودەزگای دەسەڵاتیان هەڵدەسووڕاند و وەکوو بریکار و دەمڕاست دەجووڵانەوە. کاتێک هەواڵی سامناکی کۆچیدوایی پادشای غەزاکەر لە تەواوی ئێراندا بڵاو بۆوە و مەڵبەندی ورمێشی گرتەوە، حاجی غەفوورخان ئیدی هەل و دەرفەتی ژیانی لە نێو ئەفشاراندا بەدی نەکرد و بەدزی تێیتەقاند بەرەو شاری شنۆ. لە کاتی تێپەڕینی بە گوندەکانی دەوروبەری باراندێزدا، سەربزێوانی خەلەج سەرمڕێیان بە حاجی غەفوورخان و حاجی عەبدولوەهابی کوڕی و پیاوەکانی گرت و بەوپەڕی سووکایەتی دایانماڵین و تەواوی ئەسپ و تفەنگەکانیان لێئەستاندن و بەڕەڵلایان کردن و وا دەگێڕنەوە کە حاجی برینداریش کراوە. کاتێک حاجی غەفوورخان و یارانی ئاوا بە شەق و شڕی گەیشتنەوە شنۆ، سەرۆکانی زەرزا دەرهەڵبوون و بێ ترس و خۆف وێکڕا هەڵیانکوتایە سەر باراندێز و بە قەدرایە سەرەموویەک دەستیان لە تاڵان و کوشتار نەپاراست و تۆوی بێبەزەیی و شەڕنانەوەیان لەو خاکەدا چاند. سەرەنجام شەپۆلی ئەم ڕووداوانە بوونە هۆی بەدیهاتنی هەرا و هەڵچوونێکی گەورە لە مەڵبەندی ورمێدا و وردەوردە ئەم شوو لێهەڵکێشانە سەربزێوانی دەشت و تەرگەوەڕیشی گرتەوە. ئەوانیش شێری

نەیارانەیان لە کالان هەلکێشا و بە سەر گوندەکانی ورمێیان دادا و هەرچەنـدی بۆیان لوا کوشتار و تالانیان کرد. لەم کاتەدا فەتحولـلاخانی سـەرتیپ کـوڕی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگی جێگری حوکمڕانی ورمـێ کـە خزمـی ئاغاکـانی خەلەج بـوو، لـە لایـەن گـەورەپیاوانی دەولـەتەوە ڕاسـپێردرا بـۆ چزدانـی سەربزێوانی دەشت و تەرگەوەڕ. خان بەپێی فەرمان هەنگاوی هاویـشت، بـەلام لەبەروەی هێزێکی وای بە دەستەوە نـەبوو، ئـەو جـۆرەی پێویـست و شـیاوە نەیتوانی گوێیان بابدا و بیانتەزێنێ.

ڕووداوێکی دیکە سەبارەتە بە نژایەتی و سەربزێوی سەرۆکانی دەشـت و تەرگەوەڕ لەسەر نووروللائاغای سەر بە دەولەتی ڕۆم کە لە نێو عێلی هەکاریدا حوکمـاتی دەکـــرد. لـــەم سـەروبەندەدا نووروڵـلائاغا لـە دەولـەتی خـۆی هەلگەڕایەوە و لە ترسی لێپرسینەوە و هەلپێچران پەنای هێنایە بەر سەرۆکانی ناوچەی دەشتی سەر بە ورمێ. کارگێڕانی حکوومـەتی عوسمـانی کاغـەزێکیان دەربارەی گرتنـی نووروڵـلائاغا نووسـی بـۆ شـازادە مـەلیکقاسـممـیرزای فەرمانفـەرمای ئازەربایجـان و ناردیـان و ئـەویش حـوکمێکی بـەڕێکرد بـۆ نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ کە بە دەستی زۆر لە چنگ سـەرۆکانی ناوچـەی دەشتی دەربێنێ و بیداتەوە کارگێڕانی دەولەتی عوسمانی.

بەگلەربەگیش نامەیەکی نووسی بۆ سەرۆکانی دەشت و داوای نـاوبراوی کرد و ئەوانیش بە خزمەتیان ڕاگەیاندەوە کـە جـێبـەجێ کــردنی فـــەرمانی دەسەلاتدارانی ئێران بە ئەرکی سەر شانی خۆمان دەزانین، بـەلام دەرپەڕانـدنی پەنابەر لە دەرانەی خۆ بەپێچەوانەی شەرەف و پیاوەتییە، هەر بۆیە بە سەر و مال بۆ پاراستنی تێدەکۆشین و ملمان بۆ چۆنیەتی چارەنووس ڕاکێشاوە. جـا بۆیە وا هات کـە بـە زەبـری قۆشـەن نووروڵـلاخان لـە چنگیـان دەرکێـشن و بەگلەربـەگ بەنـــاچار جانگیرخـــانی کـــوڕە گـــەورەی خـــۆی لەگـــەل عەبدوسسەمەدخان و لقێک سەرباز و دەزگا تۆپێـک نـاردنی هـەتا زۆر چـاک

سەربزێوان بچوخسێنن و نوورڵلاخانیان لە دەستی دەربێنن و بیگرن. هێزەکـان لە دەوروبەری ئاوایی «بەنـد» کـە گەروولـەی ناوچـەی دەشـت و تەرگـەوەڕە هۆربووبەزیان کرد. نەجەف‌قولی‌بەگی سەردەستە، نەوەی حاجی عـەلیارخانی گۆنـدوزلووش لەگـەڵ تفەنگـدارانی ناوچـەی دۆڵ و پۆلێـک سـوارەی نـاودار گەیشتنیە. کوردەکانی دەشتیش بە مەبەسـتی بـەرەنگاری پێکـەوە داوەریـن و هاتنە بەرەوە. چەند ڕۆژێک ئاگری شەڕ و تێکهەڵچوون هەر بڵێسەی هات، بەلام شەو و ڕۆژ بێ‌پسانەوە کوردەکانی ناوچـەی تەرگـەوەڕ و مەرگـەوەڕ دەهاتنـە یاریدەی خەڵکی دەشت. ڕۆژێکی تفەنگدارانی کورد کە هێندە ئـەنگیومن کەمتـەر وایە فیشەکیان بە خەسار بچێ، لە گەڕانکەڕی گوندی بەند خۆیان گەیاندە سەر تیرەشانی کێوان و وەکوو تەرزە گوللەیان بە سەر کۆمەڵی ئەفشاراندا باراند و پتر لە حەفتا هەشتا کەس کە زۆربەیان تفەنگچی ناوچەی دۆڵ بـوون بریندیـان هێنا یان کوژران. سەرەنجلم جەماوەری ئەفشار کەولی شـەرمەزاری ڕاکردنیـان خستە سەر شانی و هەلاتن. لەم کاتەدا نەجەف‌قولی‌بەگی سەردەستە کە لاوێکـی بوێر بوو زۆری ئازایەتی نواند و دەڵێن زۆر بـێ‌شـەرمانە چـەنـد جنێوێـکی تـاڵ و نـاخۆشی حـەواڵەی عەبدوسسەمەدخانیش کرد.

## پێهەڵچوونی پایەی عەسکەرخانی کوڕی لوتفعەلیخان بۆ پلەی سەرتیپپایەتی لقی حەوت و هەشتی ورمێ و هێوربوونەوەی سنوورەکان لەبەر هەڵسووڕانی ئەم فەرماندەیە

لەم ساڵەدا کە خاوەنشکۆ ناسرەددینشای قاجار لە تارانی پایتەخت ڕۆنیشتە سەر تەختی دەسەڵاتی جیهانداری و پلەی وەزارەتی نایە بەردەستی لێوەشاوەی میرزا تەقیخانی مەزنەوەزیر ، وەکوو پێشتر باسی کرا عەسکەرخان و یۆسفخانی برای لە خزمەت ڕکێفیدا چووبوونە تاران. لە سەرەتای داگیرسانی دەسەڵاتی بەختیارانەی فەرمانڕەوادا بە تەگبیر و ڕای مەزنەوەزیر هەرکام لە ئەمیرانی بارەگا پایە و پلەیەکیان وەردەگرت و لەم نێوەدا سەرتیپپایەتی دوو لقی حەوت و هەشتی ئەفشار باربووی عەسکەرخانی کوڕی لوتفعەلیخان کرا. ئەوسا لە پۆپەی دەسەڵاتەوە فەرمان درا بە بەڕێزیان کە خێرایەکی بەرەو مەوتەنی ببزوێ و بە دوو لقی حەوت و هەشتەوە کە ئەو دەم جەعفەرخانی ئەفشار فەرماندەی لقی هەشت و غەفاربەگی سەردەستە جاری سەرکردایەتی لقی حەوتی دەکرد و لە لاجانی ساباڵغ بنەیان داکوتابوو، ئەو مەڵبەندە بپارێزێ. با شاراوە نەبێ کە زۆر کەس لە ئەمیرانی ئەفشار و خەڵکی دیکەش بە ئاواتی سەرکردایەتی ئەم دوو لقەوە بوون، بۆ وێنە عەلیقولیخانی کوڕی محەممەدعیساخانی ئامۆزای عەسکەرخان. بەڵام یۆسفخانی برای عەسکەرخان ماوەیەک لە پایتەخت مایەوە هەتا سەرکردایەتی لکی تازەی ئەفشاری وەرگرت و ئیزنی لە بارەگا خواست و بەرەو ورمێ بزووت.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر قسەی خۆمان. پاش ئەوەی عەسکەرخانی سەرتیپ گەیشتەوە ورمێ و لە سەردان و دیداری جەماوەر بۆوە، بەپەلە بەرەو

لاجان باڵی گرت و ماوەیەک کەوتە ڕێکخستنی سپای بەرکێفی و ڕێکوپێک کردنی کاروباری ئەو مەڵبەندە.

هەر لەم ساڵەدا عارفی پوختە و تەواو ئاخوند مەلا عەلی ساحێب موغبەرە کۆچیدوایی کرد. ئەم مامۆستایە سەرەتا بە کاروباری شەرعی و ئایینی ڕادەگەیشت و لە ئاخری‌دا دەردی قەلەندەری و عیرفان داوێنی بیری پاکی گرت و کەوتە چلەکێشانی تاقەتپرووکێن و لە نێو عارفانی نیعمەتوڵلاهی‌دا بوو بە عارف و سالکێکی بەناوبانگ.

## ڕاگوێزرانی حکوومەتی ورمێ بۆ محەممەدڕەحیممیرزای زیائوددەولە کوڕی عەبباسمیرزا

پێشتر باسی کرا کە یەحیاخانی ئیلخانی حاکمی پێشووی ورمێ لە جەنگەی کۆچیدوایی پاشای غازی محەممەدشادا لە تەورێز بوو. کاتێک ناوبراو لەسەر کورسی دەسەڵاتی ورمێ لادرا و چوو بۆ مەراغە، بە تەگبیر و ڕاوێژی گەورەپیاوانی دەولەت محەممەدڕەحیممیرزای زیائوددەولە کە میرزادەیەکی لێوەشاوەی زانابوو بۆ حوکمڕانێتی و ڕێکخستنی کاروباری ناوچە سنوورییەکانی خۆی و سەلماس و ورمێ هەڵبژێردرا و نێردرا. بۆیە بەڕێزیان بە تەواوی هێز و دەسەڵاتەوە بە ڕێگای مەراغەدا بزووت و عەبدوسسەمەدخانی عەبدولمەلیکیشی لە ڕکێفیدا بوو. شازادە وەختایەک گەیشتە ناوچەی شیشەوانی ملکی مەلیکقاسممیرزای فەرمانفەرما شەو و ڕۆژێک بە میوانی مایەوە. پاشان کەوتەڕێ و بە سابلاغدا تێپەڕی و عەسکەرخانی سەرتیپ کە بە لقی حەوت و هەشتی ئەفشارەوە لە لاجان بنەی دانابوو، بزووت و لە دەوروبەری ناوچەی سندووس گەیشتە کاروانی شکۆمەندی. لەم کاتەدا خانانی قەرەپاپاغ و سەرۆکانی بلباس و سایری عێلە کوردەکان بە دیاری و دەستی پڕەوە چوونە پێشوازی. بۆ وێنە سەمەدخانی زەرزا لەگەڵ حاجی غەفوورخانی برای و عەبدوللەتیفخانی کوڕی گەیشتنە ڕکێفڕامووسانی بەڕێزیان. بە تەگبیری عەسکەرخانی سەرتیپ لەبەروەی خەریکی ناکۆکی و ئاژاوەنانەوە بوون لەڕێوە گیران. هەروەها لە هەر جێیەکی ناوچەی بۆڵ و شوێنەکانی تر دز و ڕێگر و شەڕەخۆر هەبوون، یەکیەک لە داو دەکەوتن و زەبریان

لێدەوەشا و سزا دەدران. بۆ نموونە «عەرەب قووژ»ی ڕەوەند کە خەڵکی «نەناس»ی بۆڵ و شەڕفرۆش بوو، بە چنگ نەجەفقولیبەگی سەردەستە گیرا و بە فەرمانی حوکمڕان کوژرا.

بەکورتی کاتێک بیری بەڕێزیان لە بابەت ڕێکخستنی کاروباری گرینگ و هێمنایەتی ئەو ناوچانەوە ئاسوودە بوو، بە ناوچەی بۆڵدا کشا و بە تەنتەنە و شەوکەوتەوە رووی کردە خانەمیری دڵبزوێنی ورمێ و لە سەرەتای سەرماوەزدا گەیشتەجێ. لەوێ بەر لە هەموو شتێک سەمەدخانی زەرزا و حاجی غەفوورخان و عەبدوڵڵەتیفخانی بە کۆت و زنجیرەوە بەڕێکردە تەورێز. هەر لەم ڕۆژانەدا عەلیئاغای سەرخێڵی بشکوفتی کە بە شکاک مەشهوورن، دژی دەوڵەتی هەتاهەتایی دەجووڵاوە و هەدای نەدەدا و هەر بۆ شەڕەنگێزی دەستی داگرتبوو بە سەر گوندی «هووسین»ی ملکی عەسکەرخانی سەرتیپدا و ڕێگای کوێخا و نۆکەر و سەرکار و پاکارەکانی نەدەدا دەسوەردەنە هیچ کارێک. عەسکەرخان چۆنیەتی هەڵسوکەوتی [ناڵەباری] لە کاغەزێکا نووسی و بە پیاوێکی خۆیدا ناردی بۆ کاربەدەستانی دەوڵەتی مەزن. هەر بۆیە بەپێی فەرمانی دیواندارانن، بیووکخانی برا چووکەی سەرتیپ کە بە ناوی ئیمامقولیخانی باپیرییەوە ناودێر کراوە و هێشتا ئەو دەمی هیچ پلەیەکی لەشکری نەدرابوویە، لەگەڵ چەند دەزگا تۆپ و لەقێکی ئەفشار نێردرایە ناوچەی سۆما و برادۆست و لە دەشتی هووسین شەڕیان لە مابەینیدا قەوما. عەلیئاغا کە تفەنگدار و تەنگێوەیەکی بەناوبانگ و ئازای ڕۆژگار بوو، خۆی لە ئاگری خەسارباری تۆپان کەنار دا و گەیشتە پەسار و ڕەوەزی چیایەک و لەوێوە دەستی کرد بە تەقە. بەڵام سەرەنجام لە بەختی بڵیندی دەوڵەت گیرا و هێندێک ماڵ و دارایی و نەغدینەی بازرگانان و کاروانچییانی کە پێیبوو، لێئەستێندرایەوە. پاشان بیووکخان ئەو سەربزێوەی هێنایە ورمێ و شازادە زیائوددەولە لە بەندی پەستاوت. لەبەرەوەی لاساری و سەرهەڵدان و

کەلەوەکێشی ئەو پرکێشە بلەوەزە زۆر بە گوێی بەرپرسانی گەورەی حکوومەت گەیبۆوە، بە چۆلەپێچکراوی ناردیانە تارانی پایتەخت. دواتر بە تەگبیری عەسکەرخانی سەرتیپ و لە ڕێگای عەبدوسسەمەدخانەوە سەرخێلایەتی عێلی بشکوفتی درایە «میرزائاغا»ی برا گەورەی عەلیئاغا.

هەر لەم سەروبەندەدا زیائودەولە لە بابەت داهاتی کوردستانەوە عەبدوسسەمەدخانی هەلپێچا و گوتی دەبێ برێکی بێنی و بیدەی و ئاخرییەکەی هێندێکی پێبەخشی و کێشەکە چارەسەر کرا و کۆتایی پێهات.

## ڕاگوێزرانی حکوومەتی ئەفشاری ورمێ بۆ مستەفاقولیمیرزا

پاش ئەوەی دوو ساڵێک بە سەر حکوومەتی شازادە زیائوددەولەدا تێپەڕی، بەپێی قەڵەی چارەنووس فەرمانی لادرانی لێدرا و مستەفاقولیمیرزای باوکبرای جێی گرتەوە و بەوپەڕی پارسەنگ و پیاوچاکی دەستی کرد بە حکوومەت و دڵی جەماوەری ڕاگرت. بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتیدا تەواوی کوڕان و خزمان و غولامانی عەبدوسسەمەدخان کەوتنە دڵەخورتێ و وای لێهات کە سمایلخان و محەممەدسادقخان ناسراو بە ئاغاخان لە ترسی تووڕەیی و سزادانی بەڕێزی بەرزەجێ خۆیان لە ماڵبەندەکە پێڕانەگیرا و ماوەیەک لە کەلێن و قوژبنان خۆیان شاردەوە و ئاخرییەکەی هەڵاتنە تەورێز کە باوکیان لەوێ بوو.

وەکوو پێشتر ئاماژەیەکی پێکرا لە سەرەتای دەسەڵاتی خوابەخشیو محەممەدشای غەزاکەردا، جانگیرمیرزا کە حوکمڕانی ورمێ و خۆی و سەڵماس بوو، کەوتە خەیاڵی دژایەتی و بەربەرەکانی لەگەڵ محەممەدشای کاکی و بارەگای میری پێیزانییەوە. بۆیە عەبدوسسەمەدخان بەگوێرەی فەرمان جانگیرمیرزا و مستەفاقولیمیرزای برای بە دەسبەسەری سواری بارگینێک کرد و بەوپەڕی سووکایەتی و بێحورمەتی بردنی بۆ تەورێز. لێرەدا بوو کە چاوی جانگیرمیرزا و خوسرەومیرزایان کوڵین و بەرییان کردن بۆ ئەردەوێل. ئەم ڕقە هەتا ئێستاش لە سینگی بەڕێزیاندا مابۆوە و بۆیە هەر ڕۆژەی بە بیانوویەک گەڕی لە کوڕان و دەستوپێوەندەکانی دەهاڵاند و هێندەی ئێشاندن کە بازرە بوون و دەرپەڕین.

## داندرانی لقێکی تازەی شەرکەرانی ئەفشاری بە سەرکردایەتی یۆسفخانی برای عەسکەرخان؛ لێخرانی ئەمیرکەبیر و مستەفاقولیمیرزا و کۆچیدوایی عەبدوسسەمەدخان

پێشتر باسی کرا کە دوای عەسکەرخانی سەرتیپ، یۆسفخانی برای لە پایتەخت مابۆوە و چاوەڕوانی بەسەرکردنەوەی میرانە بوو. هەتاکوو وا هات کە بە تەگبیری ئەتابەکی مەزن میرزا تقیخان سەرکردایەتی لقێکی تازەی سپای ئەفشارانی باربوو کرا و سەربەرزانە ئیزنی گەڕانەوەی درا بۆ ورمێ. وا داندرا کە بەگوێرەی بۆچوونی ورد و باریکی عەسکەرخانی سەرتیپ لقێکی تازە بێجگە لە لقی حەوت و هەشت دابمەزرێ و پاش ڕێکخرانی بەپەلە لەگەڵ سەرلقی خۆیان بەرێیان بکاتە تاران، چونکە لەو کاتەدا ئالای سەرکەوتنیشان بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروبار و هێور کردنەوەی ئیسفەهانی ناوەندی دەسەڵات و تەمێ کردنی سەربزێوانی ئەو هەرێمە هەڵدرابوون. بەکورتی کاتێک یۆسفخانی سەرلق گەیشتەوە ورمێ عەسکەرخانی سەرتیپ بەپێی فەرمان کەوتە ساز کردنی لقی تازە و لە ماوەیەکی کورتا کۆمەڵێک چەکداری کارامە و پەرداخی ڕێکخستن کە بریتی بوون لە سەربازان و پلەدارانی پیاوماقوولی ئەفشار و لاوانی تازەپێگەیشتووی ناودار. بەڕاستی هێزێکی ئاوا ڕێکوپێک و هەڵبژاردە لە نێو سپای دەوڵەتی شکۆمەندی ئێراندا وەبەرچاو نەدەهات و نە کەس دیبووی و نە کەس بیستبووی!

لــە بنــەبانی ئــەم ساڵــەدا شــازادە مــستەفاقوڵی‌مــیرزا بــە لێخــراوی بانگ‌کرایەوە تارانی پایتەخت و لەوێ جڵەوی دەســەڵاتی مازنــدەرانی درایــە و ڕۆیی. پاش ڕۆیشتنی وی شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزا وەکوو بریکار حکوومەتی ورمێی بە دەستەوە گرت.

هەر لەم ساڵەدا میرزا تەقی‌خانی ئەمیرکــەبیر لەبــەر کۆمەڵــێک هۆکــار کەوتە بەر غەزەبی میرانە و نێردرایە کاشان و لە حەمامی «فین»دا ڕووی کــردە دنیای پاشین.[1] پاش ئەو پلــەی مەزنەوەزیرایــەتی بــاربووی مــیرزا ئاغاخــانی نووری مازندەرانی کرا کە پێشتر پێی‌دەگوترا ئیعتیمادوددەولە و وەزیری لەشکر بوو. لەبەروەی مستەفاخانی کوڕی نەسروڵلابەگی ئۆستاجلوو لە تــافی لاویڕا سەرەڕای خزمەت کردنــی دەوڵــەت کەســێکی وریــای لێوەشــاوەی ســەرناس و خاوەن‌قەڵەمێکی شارەزا بوو، لەم ڕۆژگارەدا کە وەزارەتــی گرینگــی دەرەوە بــە چنگ میرزا سەعیدخانی شوقاقی ئەنسارییەوە بوو، ئەویان بەسەرکردەوە و بە جێگری وەزیری دەرەوەیان دانا و لە تەورێز نیشتەجێ بوو.

هەر لەم ساڵەدا عەبدوسسەمەدخانی سەرۆکی تیرەی عەبدولمەلیکی کە لە تەورێز بنەی داکوتابوو بە مردنی خۆی مرد و دەستی لە داوێنی جیهانی نــەمێن بەردا. بەڕاستی پیاوێکی ئازا و جوامێرێکی بە دڵ و دەروون بــوو. خوابەخــشیو ئاخوند مەلا محەممەدڕەزا موفتی ئاوای ڕێکەوتی نەمانی هۆنیوەتەوە:

---

1 - میرزا تەقی‌خانی کوڕی حاجی قوربانی سەرئاشپەز گۆیا دەوروبەری ساڵی ١٢٢٣ لە دایک بووە و ڕۆژی هــەینی ١٧ی ڕەبیعــی یەکــەمی ساڵــی ١٢٦٨ی کــۆچی بــە فــەرمانی ناســرەددینشــای قاجــار کــوژراوە. بــەڕێز محەممەدعــەلی سولــتانی مێژوونــووس و توێژەرەوەی کورد لای وایە کوردە و بڕیارە کتێبێکی لەسەر بنووسێ بە ناوی «امیرکــبیر کُرد و کُردستان». بڕواننە گۆڤاری مەهاباد. ژمارە یەک. لاپەڕە ٥٢ – ٥٤. ساڵــی ١٣٨٠ی هەتاوی ١ ٢٠٠١ی زایینی

لەڕۆژی وەفاتیدا وابوو لە شاری تەورێز

کە خوێناو هاتە خوارێ لە چاوی کێوی سورخاو

موفتی نووسی ڕێکەوتی نەمانی خانی سەردار

بێپەردە ئەجەل هات و پەردەی ئەفشار دادڕاو[1]

کوڕانی ئەو خوالێخۆشبووە بریتیین لە: ١- حەمیدخان عەزیمئاغا کە سەردەمایەک فەرماندەی لقێک سەربازی ئەفشار بوو. ٢- جەعفەرقولیخان سەرلکی تۆپخانە. ٣- سمایلخانی سەردەستەی تۆپخانە. ٤- ئاغاخانی سەرتیپ، زاوای میرزا مستەفاخانی بەهائولمولک بریکاری وەزارەتی دەرەوە. ٥- فەتحعەلیخان کە بە جحێڵی مرد.

---

1 - «بیپرده اجل پرده افشار درید»، بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ١٢٦٨ی کۆچی؛ ١٨٥١ - ١٨٥٢ی زایینی.

# ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٦٩ی کۆچی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی چاوقوڵکە لە ورمێ و پێکهاتنی لقێکی لەشکری لە لاوانی ئاشووری و ئەرمەنی

لەم ساڵەدا فەرمانێک نووسرا بۆ محەممەدکەریمخانی کوڕی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار کە لکێکی سپای ئەرمەنی و نەسارای ورمێ وەکوو پێشتر بە چنگ جوبرائیلخانی کوڕی سەمسامخانی مەسیحی گورجی و سولەیمانخانەوە بوون، ڕێکوپێکیان بکا و خۆی ببێتە فەرماندەیان. ڕاهێنەرێکی فەڕانسەوی لە لایەن دەوڵەتەوە داندرا و ڕاسپێردرا کە لەسەر ڕێسا و ڕێوشوێنی لەشکری ڕایانبێنێ و بیانکاتە شارەزا و کارامە. خانی ناوبراو بەپێی فەرمان لە ماوەیەکی [کەمدا] لقێکی تەواو کە بریتییە لە هەزار کەس کۆی کردنەوە و پیر و لاوی ئەرمەنی و نەسارای ڕێکخستن. میرزا موتەللیبی کوڕی خوداڵێخۆشبوو میرزا سەعیدی کەڵانتەری پێشووی ورمێ بوو بە چاوەدێر و عەبدوللەتیفی کوڕی خوابەخشیو حاجی حەمەکەریمبەگی سەرجارچی بوو بە یەکێک لە سەردەستەکانی ئەو لکە. چونکە لەم جەنگەیەدا یۆسفخانی فەرماندەی لقی تازە وێڕای پیاوەکانی خۆی لە مێرگی قەرەحەسەنلوو بۆ مەشق و ڕاهێنانی لەشکری تاوڵ و خێوەتی هەڵدابوو، محەممەدکەریمخانیش لەگەڵ چەکدارانی بەرکێفی لەو مێرگ و چیمەنە بنەی داکوتا و بە کاری خۆیەوە خەریک بوو. لەم سەروبەندەدا بەڵای چاوقوڵکە لە شار و گەڕەکەکانیدا بلاو بۆوە و کۆمەڵێک لە ترسان شار و خانە و لانەی خۆیان چۆل کرد و چوونە دەوروبەر و گوندە دوورەدەستەکان. کۆمەڵێکیش خۆیان دایە دەست چارەنووسی یەزدانی و چورتەیان نەکرد. کاسپکاران و دووکانداران و هەژاران لە شەقام و کۆلان و مزگەوت و بازاڕ و گەڕەکاندا شەو و ڕۆژ کەوتنە بەخشینەوەی خێر و سەدەقە و تازیەداری بۆ حەزرەتی سەروەری

شەهیدان [ئیمام حوسێن]. بەکورتی زۆر کەسی سەرناس و ئاسایی بەم بەلایە تێداچوون و سێ مانگی پتر پێچوو هەتا وردەوردە پەتاکە هێور بۆوە و ڕۆمرکا.

هەر لەم ساڵەدا میرزا فەزلوڵلای نووری مازندەرانی برا گەورەی میرزا ئاغاخانی مەزنەوەزیر کە وەزیری لەشکر و پێشکاری ئازەربایجان بوو بە مەبەستی ڕاگەیشتن بە کاروباری گرینگی ملکایەتی و لەشکری ورمێ لە لایەن دەوڵەتی مەزنەوە بە ڕێگای سەلماسدا گەیشتە شار و لە تەلاری خوابەخشیو قاسمخانی ئەفشاری قاسملوو جێ و شوێنی بۆ دیاری کرا و پاش ماوەیەک بە ڕێگای سندووسدا دیسان چۆوە تەورێز.

هەر لە درێژە و کۆتایی ئەم ساڵەدا میرزا مستەفاخانی ئەفشاری ئۆستاجلوو کە جێگری وەزیری دەرەوە و دانیشتووی تەورێز بوو، لەسەر کاری خۆی لابرا و بەبێدەسەلاتی بانگکرایە پایەتەخت.

هەر لەم ساڵەدا حیشمەتوددەولە هەمزەمیرزای فەرمانفەرمای ئازەربایجان لەگەڵ میرزا فەزلوڵلای وەزیری لەشکر بانگکرانە پایتەخت و میرزا سادقی نووری ناسراو بە قایمەقام لە ڕکێف شازادە فیرووزمیرزای مەشهوور بە نوسرەتوددەولەدا بۆ سەرۆکایەتی و پێشکاری ئازەربایجان ڕاسپێردران. هەر لەم سەردەمەدا یۆسفخانی فەرماندەی لقی تازە وێرای چەکدارانی لە مێرگی قەرەحەسەنلوو بنەی داکوتابوو و محەممەدکەریمخانیش هەرواتر.

لەم سەروبەندەدا بەلای چاوقولکە کە لە ساڵی ڕابردوودا باڵی ئەنگاوتبوو دیسان سەری هەڵدایەوە و لە ورمێ پەرەی ئەستاندەوە و جەماوەرێکی زۆری پێمردن. هەر لەم ساڵەدا جانمحەممەدخانی قاجار لەسەر حکوومەتی ئەفشاری ورمێ وەلادرا و حاجی محەممەدشەریفخانی قاجار برای محەممەدڕەحیمخانی عەلائوددەولە جێی گرتەوە و سەرەنجام لقی چەکدارانی ئەرمەنی و ئاشوری لەبەر کۆمەڵێک هۆ هەڵوەشایەوە.

## ڕاگوێزرانی جڵەوی حکوومەتی ورمێ بۆ دەست ئەکبەرمیرزای کوڕی قارەمانمیرزا کوڕی جێنشینیمیر لە ساڵی ١٢٧٢ی کۆچی/ ١٨٥٥ ـ ١٨٥٦ی زایینیدا

عەلیقولیخانی میرپێنج[1] و عەسکەرخانی سەرتیپی لقەکانی ئەفشار لەگەڵ بیووکخانی برا چووکەی ماوەی چوار ساڵ و هێندێک بوو کە شانبەشانی هێزە باڵادەستەکان لە خوراسان مابوونەوە. دوای ئیزندرانیان گەڕانەوە تارانی پایتەخت و لەوێ بنەیان داگرت. لەو دەمەدا کە میرزا سادقی نووری مازندەرانی قایمەقام دوای بانگکرانە تاران لەسەر بزووتن بوو بەرەو ئازەربایجان، بەپێی دەنگ و بڕیاری گەورەپیاوانی دەوڵەتی مەزن وا داندرا کە عەلیقولیخان بە پلەی میرپێنجایەتی لە تەورێز بێ و بە کاروباری گرینگی لقەکانی سپای ئازەربایجان ڕابگا و عەسکەرخانی سەرتیپ و بیووکخانی فەرماندەی لقی حەوت پێکەوە بگەڕێنەوە ورمێ.

لەم کاتەدا یۆسفخانی سەرکردەی لقی تازەی ئەفشاریش کە لە چنگ زوڵم و ئاکاری پێچەوانەی یاسا و ڕێسای لەشکریی حاجی محەممەدشەریفخانی قاجاری حاکمی ورمێ بۆ سکاڵا و دادخوازی هاتبوو گەیشتە تەورێز و بە دیداری براکانی شاد بوو. کاتێک ئاکاری نالەبار و هەڵسوکەوتی خراپی حوکمڕان لەگەڵ جەماوەری ورمێ، بەتایبەت لەشکرچییان بۆ بەرپرسانی حکوومەت ڕوون بۆوە، جارێ نادرقولیخانی مافی لەگەڵ یۆسفخانی سەرلک نێردرا کە لە ڕاستەقینەی مەبەستەکان بکۆڵنەوە و

---

[1] سەرکردەی هێزێکی پێنج هەزار کەسی. نووسەر میرپێنجی بە میرپێنجە هێناوە و هەردک شێوە دروستن، بەڵام دواتر میرپێنج بۆتە باو.

پێیان ڕابگا و بە چەشنێک پێکیان بێنێتەوە هەتا خودی عەسکەرخانی سەرتیپ دەگاتەوە. ئەو کاتەی کە حاکمانی بەشەوکەت و شان لە شازادانی پایەبەرز بۆ ناوچەکانی ئازەربایجان هەڵدەبژێردران و دەنێردران، ڕێزدار سوڵتان ئەحمەدمیرزا عەزوددەولە یەکێک لە کورانی فەرمانڕەوای خوابەخشیو بۆ حوکمدارێتی ورمێ داندرا. کاتێک بادیەهوایی و فیز و خۆ بەزلزانی شازادە بۆ عەسکەرخانی سەرتیپ ڕوون بۆوە، داندرانی بە بەرژەوەند نەزانی و هێژا ئەکبەرمیرزای کوڕی خوابەخشیو قارەمانمیرزای خاوەندەسەلاتی پێشووی ئازەربایجانی داوا کرد و قۆڵی لەسەر کێشا. لەبەروەی کە میرزا سادقی قایمەقام تەواو بڕوای بە ئاوەز و زیرەکی عەسکەرخانی سەرتیپ هەبوو، داواکەی لێقبووڵ کرد. سوڵتانئەحمەدمیرزای ناردە ناوچەی ئەردەوێل و مشکینشار و حوکمڕانێتی ئەفشاری ورمێی دایە دەست ئەمیرزادە ئەکبەرمیرزا و میرزا مستەفاخانی ئەفشاری ئۆستاجلووی چازان و لێومشاوەی بۆ کرایە پێشکار. هادیخانی عێراقی هەروەک جاران بە ئەتابەکی میرزادە داندرایەوە و سەرۆکایەتی غولامانی بارەگا و سەرفەڕاشێتی خزانە ئەستۆی خانجانخان و حاجی سەفدەرقولی برای.

بەڵام کاتێک یۆسفخانی سەرلک لەگەڵ نادرقولیخانی مافی گەیشتنە ورمێ و کەوتنە ڕاپەڕاندنی کاروباری حکوومەتی و لەشکری، لەم دەمەدا حاجی محەممەدشەریفخانی حاکم کە لە تەلار و باڵەخانەی سەردەری بنەی دانابوو، تەنیا بۆخۆی مایەوە و مەهدیخانی کوڕی و دوو سێ کەس لە کۆنەغولامانی و ئەوانی دیکە تێکرا بڵاوەیان لێکرد.

لەو لاوە چونکە حوکمڕانی تازە و عەسکەرخانی سەرتیپ دەبوو لەبەر چەند ڕێوشوێن و قەراروبڕیەکی سەبارەت بە مەڵبەندەکە لە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات بمێننەوە، عەسکەرخان وای بە چاک و بەرژەوەند زانی کە بیووکخانی برا چووکەی پێشتر بچێتەوە ورمێ و لەجیاتیان خەریکی جێبەجێ کردنی

کاروباری حکوومەتی و لەشکری بێ و یۆسفخان دووبـاره بڕواتـەوه تـەورێز. بەینوبەینەللا بیووکخانی سەرلق لە ماوەیەکی کەمدا شار و ناوچەکانی سـەر بە ورمێی تەواو ڕێکخست و چـاوەڕوانی هـاتنی مـیرزادەی حوکمـڕان و بـرای دڵسۆزی خۆی مایەوه... .

پاش ئەوەی ڕێزدار ئەکبەرمیرزا و عەسـکەرخانی سـەرتیپ ڕێوشـوێنی سەبارەت بە کاروبـاری حکوومـەتی ورمێیـان پێراگەیانـدن، لـە تـەورێزەوه کەوتنەڕێ و مزلاومزل بەرەو ورمێ کشان و هێندەی پێنەچوو کە گەیشتنە شوێنی مەبەست. بەڕاستی لەو ڕۆژەدا لەبەر پێوقەدەمی پـیرۆزی مـیرزادەی نـاودار و سەرتیپی لێزان و وشیار، مـەزن و مـاقوولان و خەڵـکی ئەفـشار کەشـانەوه و داوەتیان لە دەروونیدا گەڕا. دوای ئەم کارانە عەسکەرخانی سەرتیپ شانی دایە بەر ڕێکوپێک کردنی کاروباری سەرسنووران و هێزە ئازاکان و وای لێهـات کـە پاش ماوەیەکی کەم خەڵک ئارام و ئاسووده و ئازاد لە جێوبـانی هێمنایـەتی و ئەناهیدا خەوتن.

## بەربەرەکانی عەسکەرخان لەگەڵ سەربزێوانی سنووران و گیرانی قەڵای بەردەسوور و پێشوازی عەلینەقیخانی ئەفشار لە باڵوێزی ڕووسیا

وەکوو زۆر جار لەم ڕووپەڕانەدا باسی کراوە مەڵبەندی دڵبزوێنی ورمێ کەوشەنێکی گرینگ و گەورەی نێوان دەوڵەتانی ئێران و عوسمانییە و بریتییە لە چەندین ناوچە و هۆز و عەشیرەت و جەماوەرێکی بەربڵاوی زۆری دیکەی تێدا دەژی. بۆ وێنە عێل و عاشیرەتەکانی ناوچەی مەرگەوەڕ و دەشتی تەرگەوەڕ و سۆما و برادۆست هەر لە کۆنەوە لەبەر شەڕفرۆشی و ڕکێشی قەڵای سەخت و پتەویان لەسەر تیرەشان و دوند و پۆپەی چیای بەرز و بەردەڵانی ڕژد و هەڵەمووت ساز کردووە. بە پشتگەرمی ئەو قەڵاتانە هەرگیز دەستیان لە ڕووژم و تاڵانوبڕۆ نەپاراستووە و تەرخی سەربزێوی ناکەن. پێشتر لە باسی سەبارەت بە قەڵای کونەمێش و بەردمرەشی ناوچەی برادۆست بە چەند دێڕێک پوختەیەک خراوەتەڕوو کە لە سەردەمی حوکمڕانێتی یەحیاخانی چێهریقی ئێلخانیدا بە فەرمانی خوابەخشیو محەممەدشای خەزاکەردا چۆن لەشکر پەلاماری داون و تێکیڕووخاندوون. دوو قەڵاتی دیکەش کە یەکیان قەڵای بناری مەرگەوەڕ و ئەوی تریان قەڵای بەردەسووری دەشتە جێیباسن.

بەڵام قەڵای بنار کە قەڵەمی بگێرەوەی بەسەرهات لەبەر گێڕانەوە و نووسینەوەی سووچێکی ڕووداوەکانی دەلەرزێ و خوێن دەدەڵێنێ لە شوێنی خۆیدا باسی دەکرێ.

جەماوەر و کوردانی دانیشتووی قەڵای بەردەسوور کە بنکە و پەناگای سەرۆکانی دەشت و تەرگەوەڕە ماوەیەک سەرقاڵی شەڕنانەوە و ڕکێشی بوون و زەرەد و زیانیان دەگەیاندە گوندەکانی دەوروبەر. هەر بۆیە میرزادە ئەکبەرمیرزا بە تەگبیری عەسکەرخانی سەرتیپ لە نووکەوە هەمووی بە گوێی کاربەدەستانی

ئازەربایجان ڕاگەیاند. ئەوانیش فەرمانیان نووسی و جەخت کرایەوە کە سەرەتا پاسەوانی وریا و بنکەی سەربازی لە پیاوانی ئازای دەسکەرەوە دابنێن و ئەگەر وڵامی سەربازانی بنکەیان نەدایەوە و شەڕ هەڵگیرسا، قەڵاکە خاپوور بکەن و داری لەسەر بەردی مەهێڵن و جووقەواری لێ ببڕن.

بەکورتی عەسکەرخانی سەرتیپ کە پیاوێکی بەتەگبیر و دووربین بوو، پەڕڕەوخانی یەکێک لە سەرۆکان و ڕیشسپییەکانی ناوچەکەی بانگهێشت و دڵی داوە و سەرۆکایەتی دەشتی دایە دەستی. پاشان جەعفەرسوڵتانی خەلەجی و باراندێزی کە پیاوێکی کۆنەساڵی ڕۆژگار بوو وێڕای کۆمەڵێک سەرباز بە مەبەستی سەقامگیری و چەقینی دەسەڵاتی پەڕڕەوخان ناردی بۆ قەڵای بەرباس. بەدزی جەعفەرسوڵتان و سەربازانی ڕاسپارد کە قۆرخانە و پێداویستییەکانی خۆیان لە نێو بار و بارخانەدا بەرن بۆ نێو قەڵا و ئەگەر دانیشتووانی قەڵا لە ئاپۆرەدانی سەربازان تۆقین و ویستیان پێشیان پێبگرن، بڵێن ئێمە تەنیا بۆ پشتیوانی و ڕێکخستنی کاروباری پەڕڕەوخان هاتووین و هیچ ئەرکێکی دیکەمان نیە. بەم تەگبیر و ڕێوشوێنە جەعفەرسوڵتان و سەربازانی چوونە ژوورەوە و بێهیچ کوێرەوەری و گرێ و کۆسپی پەلامار دەستیان بە سەر قەڵادا گرت و بە کەڵەگایی دانیشتووانیان وەدەرنان و لە جێگای دیکەیان نیشتەجێ کردن.

هەر لەم ساڵەدا عەلینەقیخانی ئەفشاری ورمێ سەرتیپی تۆپخانە ڕاسپێردرا بچێتە پێشوازی نێردراوی دەوڵەتی ڕووسیا ژێنراڵ «برۆسیلۆف» کە هاتبوو هەتا دەوڵەتی ئێران ئاگادار بکاتەوە وا «ئەلیکساندر پاولیچ» خونکاری تازەی ڕووس چۆتە سەر تەختی دەسەڵات. برۆسیلۆف لەم سەفەرەدا «بارتالامی پالکۆنیک» نێردراوی جێنشینی نوێی قەفقازیشی لەگەڵ بوو کە بەرەو تارانی پایتەخت دەبزووتن. وەختایەک گەیشتنە سەر کەوشەنی ئێران فیرووزمیرزای نوسرەتوددەولەی فەرمانفەرمای ئازەربایجان سەرەتا قاسمخانی سەرتیپی بۆ میوانداری و پێشوازی کردنیان بەڕێ کرد. پاش ئەوەی لە تەوریزی ناوەندی

دەسەلات دابەزین و چەند ڕۆژێک مانەوە، عەلی‌نەقی‌خانی قاسملووی ئەفشاری ورمێی دانا بە میوانـدار، سەرتیپی ناوبراو بەوپەڕی گـەرموگـوڕی لەگەڵـیان ڕۆیی و دوای بڕینی مەودای ڕێگا، ڕۆژی یـەکشـەممۆ ١٧ی ڕەمـەزان گەیـشتنە تاران و ڕاسپاردەی سەرشانی خۆیان ڕاگەیاند.

لە سەردەمی حوکمڕانیتی ئەکبەرمیرزادا کە میرزا مستەفاخانی ئەفـشاری ئۆستاجلوو بۆ ماوەی ساڵێک وەزیر و پێـشکاری مـیرزادە بـــوو. لەبـەروەی ڕووحی بـەرزی لەگـەڵ ئـەم کارانـە یـەکتری نەدەخوێنـدەوە و بـە دڵـییەوە نەدەنووسان، خـۆی دەستی لـە کار کێشایەوە و دوورەپەرێز دانیشت. پاشـان کار و پلەی بـەرباس بـە تـەگبیری عەسـکەرخانی سـەرتیپ خرایـە ئەسـتۆی ئارەحمان‌پاشاخانی کوڕی خودادادخانی ئەفشاری قاسملوو ئامۆزای سـەرتیپی بەرزەشان و بە خانی وەزیر ناودێر کرا.

## شەڕی قەڵای هیرات و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە تا شوێنێکی کە بە مێژووی ئەفشاری ورمێوە گاوکراون

پێشتر باسی کرا کە عەبباس‌میرزای جێگرەوەی‌میر دەیهەویست هێرش بەرێتە سەر هیرات کە بە فەرمانی خاقانی باوکی پەشیمان بۆوە و محەممەدمیرزای کوڕە گەورەی خۆی ناردە گرتنی ئەو هەرێمە. بەڵام لەبەرەوەی عەبباس‌میرزا کۆچی‌دوایی کرد، محەممەدمیرزا بە چەشنێک لەگەڵ والی هیرات بێتهات و گەڕایەوە. کەچی کاتێک محەممەدمیرزا بوو بە فەرمانڕەوا دیسان مەیلی چوونی بەرەو هیرات بزووت و سەرەتا «غووریان»ی گرت و پاشان کەمەندی گەمارۆی لە دەوری هیرات شەتەک دا و تەنگی پێهەڵچنی. لەم کاتەدا دەوڵەتی ئینگلیس ناڕەزامەندی و پێناخۆش‌بوونی خۆی دەربڕی و تەپڵی شەڕی کوتا، بۆیە محەممەدشا لە گرتنی هیرات پاشەگەز بۆوە و گەڕایەوە. دواتر دەوڵەتی ئینگلیس ویستی کە دەستی درێژ بکاتە سەر حکوومەتی ئەفغانستان و چەند ڕووداوێک قەومان کە بە دوور و درێژی لە دیرۆکاندا نووسراون.

هەتا ئەم سەردەمە کە هەڕەتی فەرمانڕەوایەتی ناسرەددین‌شایە خەڵکی هیرات شازادە محەممەدیۆسفی ئەبدالییان بە حوکمرانی خۆیان هەڵبژاردبوو، بەڵام ئەمیر دۆست‌محەممەدخان کە قەندەهاری گرتبوو خۆی لە گرتنی هیراتیش خۆش کرد. بۆیە محەممەدیۆسفی ئەبدالی هاواری هێنایە بەر دەوڵەتی ئێران و بە نامەی سەرکزانە داوای یارمەتی کرد. بەتایبەت پیاوی ناردە لای سامخانی

ئێلخانی زەعفەرانلوو و ئەویش بە هەزار سوارە و پێنسەد شەمخاڵداری[1] بەناوبانگەوە بەرەو هیرات بزووت. سامخان بۆیە هات هەتا ئەگەر لەشکری کابول بەرەو ئەم باڵە ببزوێ ئێلخانی پێی‌ڕابگەیەنێ و ئەو دەم قۆشەنێکی گەورە و گران لەگەڵ والی خوراسان بکەوێتە بەربەرەکانی. ئەمیر دۆستمحەممەدخان زۆر لەم هەڵوێستە ترسا و گەلێکی پیلانگێڕا بۆ دەرپەڕاندنی سامخان. زۆر وادە و بەڵێنی بێ‌دراوی راسپارد لە جەماوەری هیرات تا وای لێهات خەڵک تێن دران و دڵیان لێی‌ڕەش هەڵگەڕا و ناچاریان کرد کە لە خاکی هیرات وەدەرکەوێ و تەنانەت خۆیان لە کوشتنیشی خۆش کرد. بۆیە سامخانی ئێلخانی لە ڕووی ناچاری قاقەزی نووسی بۆ حیساموسسەلتەنەی والی خوراسان و داوای لێکرد هەر چۆنێک بۆتان دەکرێ لەم داوی مەرگە دەربازم کەن. حیساموسسەلتەنە تاقمێک چەکداری ناردن و ڕزگاری کرد. چونکە نامەی هاوارهێنانی عەلیخانی سیستانیش لەم ڕۆژانەدا لە «سێکووهە»وە گەیبوویە کە ئەمیر دۆستمحەممەدخان کوڕی خۆی ناردۆتە پەلاماردانی خاکی سیستان و دەیهەوێ دەستی لە کوشتار و تاڵان نەپارێزێ، کاربەدەستانی باڵای دەوڵەت بڕیاریان دا کە خێرا سپایەکی بێ‌ئامان بە مەبەستی پاراستنی خوراسان و بەرپەرچدانەوەی کابولییەکان بنێرن. بۆیە لەسەر فەرمانی میری مەزن ناسرەددینشای قاجارەوە دەستوور درا کە هێز و لق و سوارەی وڵات کۆببنەوە. یەکێک لەو لقانەی بانگکرا، لقی تازەی بەرکێفی یۆسفخانی سەرلقی ناودار بوو کە ئاوازەی بۆ ڕێکوپێکی و پەرداخی لە ئێراندا دەنگی دابۆوە. ناوی سەرکردەکانی خوار و ژووری ئەم لقە بریتییە لە: نەجەفقولیبەگی نەوەی حاجی عەلیارخانی گۆندوزلوو سەردەستەی یەکەم، بیووکخانی کوڕی

---

[1] - شەمخاڵ چەشنێک تفەنگی سەربڕ بوود. تفەنگێکی قورس کە لە دەردودرا دادەگیراوە و باڕووت و پەرۆ و ساچمەی تێدەکرا

مستەفاقولیخانی قاسملوو سەردەستەی دووەم، ئاغابەگی برای نەجەفقولیبەگ سەردەستەی [سێهەمی] بەهادوران، ئاغابەگی کوڕی عەبدوللابەگ سەردەستەی چوارەم، لوتفوللابەگی ئەفشاری بەکەشلوو سەردەستەی پێنجەم، ئاغابەگ سەردەستەی شەشەم، مەهدیخانی کوڕی تەقیخان سەردەستەی حەوتەم، برایمسولتان سەردەستەی هەشتەم، حوسێنبەگی کوڕی قارەمان سەردەستەی نۆهەم و فەتحوللابەگی کوڕی محەممەدئاغای موکری سەردەستەی هەوالکران.

بەکورتی عەسکەرخانی سەرتیپ بەپێی فەرمان لە ماوەی چەند ڕۆژاندا لق و دەستە و پەلەکانی ڕێکخست و لەگەڵ یۆسفخانی برای ناردنی بۆ تاران. هەروەها هەموو هێزەکان کە چەشنی دەریا شەپۆلیان دەدا پەساپەسا وێرای سەرکردەکانی خۆیان دەگەیشتنە لای حیسامووسسەلتەنەی والی خوراسان. بۆ وێنە چەکدارانی ئازەربایجانی وەکوو لقی خۆی بە سەرکردایەتی باقرئاغا، لقی تازەی مەراغە بە سەرلکایەتی ئەسکەندەرخانی کوڕی حوسێنپاشاخانی موقەددەمی میرپێنج، لقی سەربازانی شوقاقی بە فەرماندەرێتی ئەبولفەتحخانی کوڕی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگی قاسملوو و سوارانی قەرەپەپاغی بەڕێکێفی حەسەنخانی کوڕی نەقیخانی حاکمی سندووس هەموویان چووبوون.

لەو ڕۆژانەدا کە غووریان ئاوڵ و خێوەتی لەشکری حیسامووسسەلتەنەی لێهەڵدرابوو، وا هات کە بێئەوەی نیگادێرانی قۆرخانە - کە چەند کەسێک بوون لە لقی تازەی ئەفشار- ئاگایان لێبێ، قۆرخانە ئاوری گرت و سەت بار باڕووت سووتا و بوو بە دووکەڵ و بەفیڕۆ چوو. لە پازدەی مانگا ئەللاوێردیخانی سەرلقی تۆپخانە بە چەند دەزگا تۆپ و حەفتا بار قۆرخانەوە لە خاکی پیرۆزی [مەشهەدەوە] ڕووی کردە غووریان. لەو کاتەدا سەردار ئەحمەدخانی قەلاتگەیی و شازادە موحسینی دووڕانی بە حوکمی میرزادە محەممەدیۆسف وێرای دووهەزار سوارەی ئەفغان بەرەو لەشکرگای

حیساموسسەنتەنە بزووتن. کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتە لای حیساموسسەنتەنە، خێرایەکی سامخانی ئێلخانی وێڕای سوارانی خوراسانی و هەزارە و سەفەرعەلیخانی سەرتیپی شاسەیوان و لقێکی تەرشیزی بە دوو دەزگا تۆپەوە ناردنی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەفغانییەکان. لە پەنا قەڵای «زیندەجان» ئەو دوو لەشکرە هارووژاوە تێکهەڵەنگووتن و شەڕی گەرم قەوما. هەر لەو جەنگەدا ئەفغانی ڕەوین و دیل و خەنیمەتێکی زۆر کەوتە دەستی هێزەکانی ئێرانی. ئەمە یەکەم سەرکەوتن بوو کە بۆ حیساموسسەنتەنە وە چنگ هات و پاشان بە فەرمانی ئەو سەردارە دەورەی غووریان درا.

لەم کاتەدا حەسەنعەلیخانی[1] سەرکردەی هێزی گەڕووس بە کەوکەبە و شەوکەتەوە گەیشتە هۆردووبەز و ئێرانی ورەیان بەرز بۆوە و لە چوار لاوە غووریان دەورە درا. سەردار مەجیدخانی ئەفغانی کە حاکمی غووریان و زاوای عیساخانی سەرتیپی کارگێڕی هیرات بوو تۆقی و بە قورئانی پیرۆزەوە گەیشتە لای حیساموسسەنتەنە و بەخشرا. کاتێک غووریان گیرا و بلاوبوونەوەی ئەم هەواڵانە لەرزەیان خستە دەروونی دانیشتووانی هیرات، هۆردووی بێ بەرگێڕەوە بەرەو هیرات هەستا و ڕۆژی دووشەممۆ سەرەتای مانگی شابان لە یەک فرسەخی قەڵا بە شەوکەتەوە بنەی دانا و دوای دوو ڕۆژ لەوێوە بزووتن و ڕۆیشتن. سامخانی ئێلخانی زەعفەرانلوو لەگەڵ پێنسەد سواری خوراسانی و کوردان و پاشاخانی موکری برازای عەزیزخانی موکری سپاسالاری تێکڕای

---

1 - مەبەستی لە ئەمیرنیزامی گەڕووسییە کە بە فێڵ و تەڵەکە توانی هەمزاغای مەنگور هەڵخەڵەتێنێ و قازی قاسمی باپیری قازی محەممەد بە دوایدا بنێرێ و خۆشە و دانەخۆرەی بکا و ڕایکێشێ بۆ سابڵاغ (مەهاباد) و سوێندی بەدرۆی بۆ بخوا و پاشان وێڕای هاورکێفانی بیکووژێ. ئەمیرنیزام لەبەر خوێنتاڵی و چروچاوی چرچ و کردەوەی ناشیرینی سەبارەت بە نەتەوەی کورد، لە موکریان بە «وەزیرەچرچە» ناوی زڕاوە.

ئێران و دوو لقی سمنانی و دامغانی و سوارەی کورد و تورک و چوار دەزگا تۆپ وەکوو پێشەنگ و پێشڕەوی هێزە بالادەستەکان دەبزووتن. قۆشەن هەتا مێرگی سەنگەسپی (سپیسەنگ) کە تیرهاوێژێکی دەمێنێ بۆ قەلا چوونە پێش. لەم کاتەدا لەشکری ئەفغانان کە لە بۆسەدا بوون بێترس دەرپەڕین و شەمخالیان لێئاگردان و هێزەکانی ئێرانیان بە تەرزەی گوللان چزدان. ئەمیر حوسێنخانی برای سلەخانی ئیلخانی لێبان وەشەڕ کەوت و ئیلخانی و پاشاخانی موکریش چوونە یاریدەی و هەلمەتیان بردە سەر ئەفغانییانی لە بۆسەدەرپەڕیو و بوو بە هەرا و قرمەقرم و زرموکوتێکی سەیر. لەم کاتەدا حیساموسسەنتەنە گەیشتێ و کە دیتی شەڕێکە کەوچکی تێناگەڕێ، دەستووری فەرموو کە حەسەنعەلیخانی سەرتیپی دوو لقی گەڕووس و ئەبولفەتحخانی ئەفشاری قاسملووی لەگەل لقێکی شوقاقی و یەکێکی نەیشابوور و یۆسفخانی سەرلقی تازەی ئەفشار و کۆمەلێک لە سوارانی پەنجە بە خوێن هەڕاکەنە سەر خەنیمان، چونکە بەڕاستی حیساموسسەنتەنە زۆر بە ئازایەتی ئەم هێزانە دەنازی. ئەوانیش لەڕێوە هێرشیان برد و چالاکی بەرچاویان نواند و بە لایەکدا تۆپەکانیان بردنە سەر گرد و تەپۆلکەی سوار بە سەر شەڕگەدا و ئاگریان بەردایە سەر سوارە و پیادەی هێرات. بەڕاستی لەو شەڕ و تێکهەلچوونەدا لقەکانی گەڕووس و ئەفشار بەوپەڕی مەردایەتی تێراچوون و سەردەستەکان و سەربازانی گیانبەختکەر چۆنی دەکرێ ئاوایان ئازایەتی و پالەوانەتی نواند. بۆیە ئەفغانی بەناچار شکستیان بە ملیدا برا و بە ڕاکردن و چەک فڕێدان بەرەو شار تێیانقووچاند. ژمارەی کوژراوانی شار گەیشتە حەفتا کەس کە سەرلکێکیشیان لەگەل بوو. لەو گێژاوی هەرایەدا بەیداخداری لقی نەیشابووری باسکی برینێکی قوولی هێنا و بەیداخەکەی لە دەستی بەری و جەماوەری هێرات هەلیانگرتەوە و بردیان. هۆردووی ئێران باوەشی لە بەژنی قەلا وەرێنا و سەرقالی قەلاگیری بوو کە محەممەدیۆسفمیرزا بە فێلوفرت و ڕێخۆش کردنی عیساخانی سەرتیپی هێراتی

کەوتە داو. لەبەروەی کە قۆشەنی ئێران گەرانگەری قەلاتی هیراتیان بە خۆراگری و ورەی بەرزەوە تەنیبوو، شازادە محەممەدیۆسف زۆری خەم خوارد و چەشنی ماسی کەوتە نێو تۆڕ و داوی دڵەراوکە و لە راستیدا وەکوو یۆسفی کەنعانی خۆی لە نێو چواردیواری هیراتا لە چاڵاو و سیاچاڵا هاتە بەرچاوی و بۆ رزگاربوونی تێما. بەناچار نامەیەکی نووسی بۆ رێزدار سولتانمرادمیرزا حیسامەوسەسەڵتەنە و برای خۆشی وەکوو بارمتە ناردە نێو کاروانی ئەستێرەبەرز و دوو تۆپیشی رەگەڵ خست کە یەکیان پێشتر لە جەنگەی گەمارۆی هیراتا توانیبووی لە سپای خوابەخشیو محەممەدشای غازی بیئەستێنێ و ئەوی دیکەش هەمزەمیرزای حیشمەتوددەولە دابووی بە یارمحەممەدخانی وەزیر. هەروەها بەیداخی کابرای بەیداخداری نیشابووریش نێردرایەوە و تکای کردبوو کە لەشکری بەختیاری ئێران هەتا غووریان بکشێتەوە و خودی شازادە محەممەدیۆسفیش دوابەدوایان دەگاتە خزمەت والی پایەبەرز. داواکانی وەرگیران و وڵامیان درایەوە، بەڵام فێڵی کرد و بەڵێنی خۆی نەبردە سەر و شانی لە قەڵاداری توند کرد و چاوی لە ئاکامی پەیمانشکاندنی نووقاند، هەر بۆیە حیسامەوسسەڵتەنە فەرمانی دا کە سەرلەنوێ هۆردوو بگەرێتەوە. پێشتر مەجیدخانی سەردار زاوای عیساخانی سەرتیپ لە گرتنی غووریاندا هەنگاوێکی هاویشتبوو، ئێستاش ویستی خزمەتێکی باش و بەرچاوی کردبێ، بۆیە لە عیساخانی راسپارد و داوای لێکرد ئیزنی بدا ئەم کار و خزمەتەش راپەڕێنێ. عیساخان قبووڵی کرد و تکایەکی کە محەممەدیۆسفمیرزا لە حیسامەوسسەڵتەنەی کردبوو دووپاتی کردەوە و مەرج و پەیمانی دانا کە شازادە محەممەدیۆسفمیرزا و شازادە محەممەدحەسەن و ئەوانی تر کە سەرچاوەی چەپەڵکارین بە چۆڵەپیچکراوی بیانئێرێتە خزمەتی حاکمی پایەبەرز. حیسامەوسسەڵتەنە داواکەی لێوەرگرت و دوای چەند رۆژان عیساخان بەڵێنەکەی بەجێهێنا و خۆی لە هیرات پاڵی داوە. هەر لەم رۆژانەدا پەرویزخانی

سەرکردەی سوارانی چەرداوەڕوو و ئەسکەندەرخانی کوڕی حوسێنپاشاخانی موقەددەم لەگەڵ لقێکی هێزی مەراغە گەیشتە پاڵ قۆشەنی شکۆمەندی ئێران. بەڵام کاتێک حیسامولسەڵتەنە بۆی دەرکەوت کە ئەم گفت و پەیمان و خزمەتەی عیساخان سەبارەت بە دەوڵەتی گەورەی ئێران لەبەر سەربەخۆبوونی خۆی بوو لە هیرات، لێیوەخۆ کەوت و سپای باڵادەستی لە غووریانەوە بەرەو هیرات گاڵ دا و لەڕێوە فەرمانی شەڕ و هەڵمەت و تێکهەڵچوونی دا و لە جێگای خۆیدا دەیگیرینەوە.

# چەند هەنگاوێک بۆ نۆژەن کردنەوەی دووکان و بازاڕی ورمێ و سازبوونی دووبەرەکایەتی

وەکوو دیارە عەسکەرخان دوای ئەوەی لکی تازەی لەگەڵ یۆسفخانی سەرلکی برای ناردە قەڵای هیرات، خۆی بە دوو لقی حەوت و هەشتەوە لە ورمێ مابۆوە. بیووکخانی برا چووکەی کە بە ناوی ئیمامقولیخانی باوەگەورەیەوە کرابوو، شەو و ڕۆژ بە دەورەی سەرتیپی کاکیدا هەڵدەسووڕا و خزمەتی دەکرد و بە دڵوداو گوێی بۆ فەرمانەکانی ڕادەداشت. ئەگەرچی لەگەڵ سەرتیپ لە دایک و باوکێک کەوتبوونەوە، بەڵام لەبەر چاک پەروەردە کران و ڕاگرتنی ئەدەب خۆی بە یەکێک لە خزمەتکارانی کاکی دەزانی و بە گیان و دڵ سەری وەبەر باری فەرمانی دێنا.

بەڕاستی عەسکەرخانی سەرتیپ کات و تەمەنی بەنرخی خۆی بەختی ڕێکخستنی کاروباری حکوومەتەکەی میرزادە ئەکبەرمیرزا دەکرد. هەروەها ئەرک و خزمەتی دیوانی کە بریتی بوو لە پاراستنی هێمنایەتی سنوور و وەرگرتنی بیتاک و دانانی سەربازان لەسەر شانی ئەو هەڵدەسووڕا. جا لەبەروەی کە بیری بەرزی بە سەر ئاوەدانی وڵات و ئاسوودەیی و حەسانەوەی ..سپکارانەوە دەسووڕایەوە، تەمای گرت کە بازاڕ و قەیسەری کۆنی ورمێ کە بەڕاستی دەتگوت کاولاشە سەرلەنوێ بە شێوەیەکی تازە و چاک و لەبار نۆژەن بکرێنەوە. بۆیە وەستاکار و نۆباروانی شارەزا و لێزانیان لە تەورێزی ئاوەندی دەسەڵات و خۆیەوە هێنان و کەوتنە سازکردنەوە و کەڵنەی بازاڕ و دووکانە گەورەکان. لەبەروەی کۆڵانی زینڕووەکانی ئێستا کەوتبووە دیوار بە دیواری مەحکەمەی بەڕێز حاجی ئاغامەجیدی ئیملمجومعەی ورمێ و دەرگای کۆڵانەکەی

ویکدینا و تەنگەبەری دەکردەوە و بازارەکەی پڕگەورە دەبۆوە، بەڕێز حاجی ئاغامەجید وەدەنگ هات و بەری پێگرتن و لە عەسکەرخانی سەرتیپی راسپارد کە ئەم کارە بەپێچەوانەی ئایینی رووناکیدەری ئیسلامە و بەمەش رانەوەستا و یەکێک لە نۆبارەوانانی تەوریزی گرت و فەلاقەی کرد و بە شووڵان چزاندی. جا چونکە سەرتیپ پیاوێکی بەغیرەت و دەریای هێمنی و لەسەرەخۆیی بوو ددانی بە جەرگی داگرت و پیشی خواردەوە و بە ناحەزی لەگەڵ ئیمامجومعە نەجووڵایەوە. بەڵام لەم کاتەدا کەسانێکی فیتنەگێڕ هەلەکەیان خواستەوە و کەوتنە شەیتانی و شۆفاری و نانەوەی دووبەرەکایەتی لە نێوان ئەم دوو گەورەپیاوەدا و کارەکە گەیشتە جێگایەک کە ئیمامی بەڕێز چەند مەبەستێکی دیکەشی کردە بەڵگە و بیانوو و لەگەڵ دەستەیەک مامۆستای پایەبەرز بە مەبەستی سکاڵا بەرەو تەوریز بزووت و لەوێوە رووی کردە تارانی پایتەخت.

زۆر چاک بوو کە لەم کاتەدا میرزا سادقی قایمەقامی پێشکاری ئازەربایجان لە تاران بوو. کاربەدەستانی حکوومەتی لێکۆڵینەوە و پێکهێنانەوەی هەردک لایان خستە ئەستۆی وی و هێزا حاجی ئاغامەجیدیان بەوپەڕی رێزەوە لەگەڵی ناردەوە.

دوای گەیشتنەوە تەوریز عەسکەرخانی سەرتیپیش بانگ کرا و چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەک بۆ روونبوونەوەوە رووی راستی رووداوەکان پێکهات. لەبەرەوەی خودی قایمەقام زۆری بڕوا بە زیرەکی و مەندی و پتەوی بیر و بۆچوونی عەسکەرخان هەبوو، تەنانەت لە کاروباری گرینگی حکوومەتیدا پرسی پێدەکرد و لە دوو بە دوویی‌دا راوێژی لەگەڵ دادەمەزراند. هەروەها چونکە رێزی دینیشی بە ئەرکی سەر شانی دەزانی، سەرەنجام پێکهێنانەوە و ئاشتی کردنەوە و وێکرا بەرێی‌کردنەوە بۆ ورمێ. هەر لەم رۆژانەدا قورەکاری بە خەرجی قورس و گرانەوە کە هەموو لە گیرفانی سەرتیپ چووبوو کۆتایی پێهات و دووکان و بازار ساغ بوونەوە و رەنگ و روویان گرتەوە. لەبەرەوەی بیووکخانی

سەرلقیش تەلاری تازەی دەویست بۆ نیشتەجێبوون، لە پەنا قەڵا و باڵەخانە کۆنەکان چەند خانووبەرەیەک بە نرخێکی گونجاو لە خاوەنەکانیان کڕدرایەوە و بەپێی نەخشە بینای تازە بناغەی دانرا و لە ماوەیەکی کورتا کۆتایی پێکهات.

بەکورتی دوای تەواوبوونی تەلارەکە بۆ ودم و پیرۆزی، عەسکەرخان سەرتیپ میواندارییەکی ساز کرد و لەم کۆڕەدا بوو کە نێوانناخۆشی مابەینی عەسکەرخان و مامۆستاپان بنەی برا و چارەسەر کرا.

## درێژەی شەڕی هیرات و ئاکامی بڕانەوەی

سالـی ۱۲۷۳ی کـۆچی/۱۸۵٦ ـ ۱۸۵۷ی کاتێـک گـەمارۆی قـەڵای هـیرات ڕۆژانێکی زۆری بە سەردا تێپەڕی، قەڵانشینان لەبەر نەبوونی خورد و خۆراک و هێرش و زەبری سپای ئێران وەتـەنگ هـاتبوون و پـۆلپـۆل وەدەرەدەکـەوتن و پەساپەسا دەهاتنـە بـەر پەسـاری ئـاڵای بـەرزی قۆشـەنی شکۆمەند و لـە برسیایەتی و پەرێشانی دەخەلەستن. هەر بۆیە عیـساخانی سـەرتیپ گـەلێک دەترسا و چەند جارێک بە زمـان لـە ڕێـزدار حیسامو سـسەنتەنەی ڕاسـپارد و بەڵێنی دان، بەڵام چونکە تازە درۆکانی لە لای والی بە پووچەڵ دەرچووبوون و گەلێک جار پەیمانشکاندنی لـێ بـەتاقی کردبـۆوە، ئیتـر گـوێی نەدەدایـە قسەکانی و پتر تەنگەی گەمارۆی دەکێشا. لەم ڕۆژانەدا شازادە محەممەدیۆسف و حاجی غولامعەلیخانی ئەفغان و چەنـد کەسێکـی دیکـەی گـیراو کـە لـە هـۆرنوودا دەسبەسەر بوون، ناردنی بۆ تارانی پایتەخت و خۆی بە ورەیـەکی بەرز و هەنگاوی پتەو چاکتری شان لە دەورەدان شل کرد. بەڵام لەو لاوە چونکـە میری بەرزەجێ بە درێژبوونەوەی ماوەی گەمارۆی هیرات قەلس و تووڕە ببـوو چەند حوکمێکی توند و تیژ و پڕ هەڕەشەی ناردن بۆ حیسامو سسەنتەنەی مـامی بەڕێزی خۆی و گەلێک بەڵێن و پەیمانی خستەڕوو. کاتێک حیسامو سسەنتەنە و سپای ئێران بە هەڵچوونی بیری پیرۆزیان زانی، تێکـڕا نامـەیان نووسـی بـۆ خزمەتی موبارەکی و گلێتیان پێدا کە ئەرکی سـەر شـانی خۆیـان ڕادەپـەڕێنن و قەڵای هیرات بەردەست دەکەن. بـۆ نموونـە حەسـەنعـەلیخـانی گـەڕووس، ئەبولفەتحخانی ئەفشاری قاسملوو، عەبدولعەلیخانی موقـەددەمی مەراغـە، یۆسفخانی ئەفشاری قاسملوو سەرکردەی لقی تازە، کـەریمخـانی ئەفـشاری قاسملوو برای ئەبولفەتحخان و چەند کەسێکی دیکە بەڵێنیان دا و سـووربوونی خۆیان لەسەر گرتنی قەڵای هیرات ڕاگەیاند. بەڵام محەممەدڕەزاخانی کۆرکۆری و

یۆسف‌خانی سەرلکی ئەفشار و ئەسکەندەرخانی موقەددەم وەپێش هەموو کەس کەوتن و بەرەورووی بورجی فیلخانە سەنگەری قایمیان دابەست و کەوتنە قووڵ کردنی زەوی و هەتا ڕێکی دۆلایی خەندەکی گەڕانگەڕی قەلا ڕەهۆلەکانیان ڕۆبردن. حەسەن‌عەلی‌خانی گەرووس و خان‌باباخان و ئەبولفەتح‌خانی ئەفشاریش ڕێچکەی بەپێچ و گەوەیان هەتا لێواری خەندەک بردن و شازادە حیساموسسەڵتەنەش ناوچەی هیراتی وەکوو ماستی مەیبو لێکرد و لەسەر ئەستۆی سەرکردەکانی دانا کە لە نێوەڕاست مانگی محەڕڕەمەوە هەتا سەرەتای سەفەر قەڵاکە بگرن و خۆیان لە بڕوبیانووی پووچ و بێ‌جێ لادەن. بەکورتی ڕۆژی ٢٥ی مانگی محەڕرەم لەو کلاوقووچەوە کە قاسم‌خانی سەرتیپ سازی کردبوو، وەختایەک داوایان کرد ڕێچکەیەک بەرەو شار بکرێتەوە، تۆپێک لە بورجی خواجە عەبدولمەهدیڕا هەڵدرا و لەپڕێ گوللە هات و لاقی کابرایەکی تۆپچی لێ گردەبڕ کرد. قاسم‌خان زۆری لە دڵی گران هات و فەرمانی هێرشی دا و هەتا ٢٩ی مانگی محەڕرەم ئەو گۆڕستانەی کە خەڵکی شار بە شانی خەندەکەوە کردبوویانە مەتەرێز، سەربازەکانی بە پەلاماری بوێرانە و چاونەترسانە گرتیان و لەم هەڵمەتەدا دوو سەربازی قەرابی و تەرشیزی زامدار بوون. جارێکی تر ئەفغانی هەڵیانکوتایە سەر سەنگەری قاسم‌خان و کرێیانە تەقە، بەڵام هێزەکەی بەرکێفی خۆیان ڕاگرت و هەنگاویان بەرەو دواوە نەنا و دەوری سەد کەسیان ئەفغانی گۆڕەهوو کردن و ئەوانی دیکەشیان تاراندن. بۆ سبەینێ نەنیک چەکداری قەزوێنی هرووژمیان بردە سەر کلاوقووچەیەکی کە قەڵانشینان بە مەبەستی بەربەرچی لێدانی ڕەهۆڵ و بنکۆڵی سپای ئێرانی لەوێ بنەیان داکوتابوو. ئەفغانی بەو ڕێگایەدا کە لە دەرەوەی بورج بۆ پارێز و کاتی پێویست هەیانبوو دەربەڕین و نۆ کەس لە سەربازانی لقی قەزوێنیان دانە بەر گوللان، بۆیە پاشماوەی هێزەکە بەپرتاو گەڕانەوە مەتەرێزەکانی خۆیان. لەم جەنگەیەدا نەجەف‌قولی‌بەگی ئەفشاری گۆندوزلوو کە شۆڕەلاوێکی ئازا و بەجەرگ بوو

وێڕای سەربازانی لقی تازەی ئەفشار و ئەسکەندەرخانی موقەددەمیش لەگەڵ چەکدارانی موقەددەم سەرقاڵی شەڕ و لێکدان بوون. بەڵام هێندەی پێنەچوو کە ئەفغانی شکستیان بە سەر شانی خەڵکی شاردا سەپاند کە وێڕابوویان بۆیان دەرکەون و هەڵبڕدابڕیان تێخستن.

گەمارۆ درێژەی کێشا و هیچ ڕۆژێک چەکدارانی ئێران لە شەڕ و لێکدان نەدەکشانەوە و پێیان لەسەر بەڵێنی خۆیان دادەگرت و ئازایەتی بێ وێنەیان دەنواند. وای لێهات کە عیساخان و قەڵاداران کەوتنە باری تەنگەتاوی و بەناچار سەبارەت بە ڕادەست کردنی قەڵا پێکەوە باس و ڕاوێژیان دامەزراند. ئاخرییەکەی ڕۆژی شەممۆ ٢٥ی مانگی سەفەر عیساخان چەشنی قابۆڕێکی بێ گیان بە باڵەپڕژە و سەرلێ شێواو چارەی نەما و کلیلەکانی قەڵای بە دەستەوە دا. بە ئاماژەی حیسامو سسەنتەنە خودبە و سکە بە ناوی ناوداری شاهەنشای ئێران خوێندرایەوە و لێدرا و سەرکەوتننامە نێردرایە بارەگای فەرمانڕەوای پایەبەرز و حیسامو سسەنتەنە و سەرکردەکانی دیکە لە لایەن پادشاوە خەڵات کران و کەوڵی سەربەرزی بە شانیان دادرا.

کاتێک یۆسفخانی سەرلک هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بە نامەیەک نووسی بۆ عەسکەرخانی سەرتیپی کاکی هێژای و بۆی ناردە ورمێ، بە فەرمانی میرزادە ئەکبەرمیرزای حوکمڕان و عەسکەرخان سێ شەو و ڕۆژ بازاڕیان ڕازاندەوە و کردیانە چراخان و جێژن و شادی.

# ڕاپەڕینی میرسولتانی بناری و شەهیدبوونی عەسکەرخانی سەرتیپ

بۆ شیکردنەوە و بەدواداچوونی ئەم باسە بە دوور و درێژی، دەبێ بڵێم ناوچەی مەرگەوەڕ کە هەروا چەند فرسەخێک لە شاری ورمێوە دوورە و کەوتۆتە دراوسێیەتی دەشت و تەرگەوەڕ و بەرمو رووگە هەڵکەوتووە، شوێنێکی پڕئاژاوەیە و فیتنەی لێهەڵدەستێ. دانیشتووانی بریتین لە کوردی چەند توخمە و تێکەڵاو و قەڵای بنار کە یەکێک لە قەڵا سەیر و بەرزەکانی سەر بە ورمێیە، بە شانی قیبلەدا کەوتۆتە سەری ئەو سەری مەرگەوەڕ و فرسەخێکی لەگەڵ «ناوچیا»ی[1] خاکی عوسمانی نێوانە و لە کۆنەوە ملکی باب و باپیری میرسولتانی بنارییە. میرسولتان لە تۆرەمەی ئەمیرخانی برادۆستی بناغەدانەری قەڵای دمدمە کە پێشتر باسی سەربزێوی و سەرهەڵدانی خرایەڕوو.

لەم سەردەمەدا سەرۆکایەتی ناوچەی بەرباس لە لایەن دەوڵەتی مەزنەوە درابوویە دەست شازادە مەلیکمەنسوورمیرزای دایکبرای مەلیکقاسممیرزای فەرمانفەرما و ئەویش لەبری خۆی شازادە نیعمەتوڵلامیرزای کوڕی مەحموودمیرزای بە حوکمڕان دانابوو، بەڵام نیعمەتوڵلامیرزا و جەماوەری دیکە لەبەر شەڕنانەوە و دەسدرێژییەکانی میرسولتانی بناری نەدەحەسانەوە و دەستیان نەدەڕۆیی. بۆیە بوو کە شازادەی پایەبەرز بە مەبەستی خاشەکێشانی فیتنەی ئەو سەربزێوە یاغییە دەستەوداوێنی عەسکەرخانی سەرتیپی خاڵۆزای بوو. بە تەگبیری وی چۆنیەتی بارودۆخەکەیان بە گەورەپیاوانی حکوومەت ڕاگەیاند. کاربەدەستانی ئازەربایجان لەڕێوە حوکمیان نووسی و جەختیان کردەوە کە عەسکەرخانی سەرتیپ بێڕابگا و تەواوی قەڵاکانی سەر بە ورمێ و

---

[1] نووسیویەتی نەوچە و بەڵام ناوچیایە کە ناوچەکەی بەناوبانگە.

بەتایبەت قەڵای بنار بکەنە بنکەی لەشکری و پاسەوانیان بۆ دیاری بکرێ. سەرتیپ سەرەتا قەڵای بەردەسووری کردە ئامانج و بە تەگبیر و راوێژی بەڕێوجێ تاقمێک سەربازی لەوێ خزاند و پاشان تێکیڕووخاند. پاشان بە تەگبیری لەبار و گفت و بەڵێنی بڕدراو توانی میرسوڵتان بانگ بکاتە لای خۆی و نێوەرۆکی فەرمانی گەورەپیاوانی دەسەڵاتی پێرابگەیەنێ، چونکە هەتا ئەو دەم میرسوڵتان گوێی نەدەدایە حوکمی هیچکام لە حاکمان و نەدەهاتە قەڵای ورمێ و سەری وەبەر نەدێنان. بەپێی هەلومەرجی تەنگەتاوی سەردەم میرسوڵتان دەستی بەرداوە و بەڵێنی خزمەتکردنی دا. دواتر وێرای حاجی میرزا عەولا و لوتفولڵابەگی سەرکاری دێهات و دەستوپێوەندەکانی سەرتیپ و چەند سەردەستە و سەربازێک ئیزنی گەڕانەوەی درا بۆ قەڵای بنار. بەڵام کاتێک گەیشتەوە قەڵاتی خۆی ملی نایەوە لە سەربزێوی و بادیهەوایی و گوتی من سەر بە دەوڵەتی عوسمانیم! حاجی میرزا عەولا و لوتفوڵلابەگ لە ئاکاری لاسارانەی تۆقین و ترسان کە بیانکووژێ، بۆیە بە پەند و ئامۆژگاری لاواندیانەوە و بە خێرخوازی ڕێگای چاکیان وەبەر نا، بەڵام هەر تۆزێکیش بە گوێی ئەو پیاوەدا نەچوو و پتری پێ لێهەڵێنا و کەوتە پرکێشی. دانیشتووانی بەردەسووریش وە شوێن هەڵوێستی میرسوڵتان کەوتن و بە دەنگ‌نێری تێکەوتن و کەوتنە سەرەوشێنی. دوو کەیخودا باوەڕپێکراوەکە لە رووی ناچاری و پەنامەکی نامەیەکیان نووسی بۆ عەسکەرخانی سەرتیپ و ڕەپوڕاست گوتیان کە ئێمە ئێستا لە قەڵاتی بناردا لە ترسی پرکێشی و تیتاڵی ئەم پیاوە چەشنی ماسی کەوتووینە تۆڕ و داوی دڵەڕاوکە و تەنگەژە و چاوەڕوانی فەرمانی بەڕێزتانین. سەرتیپی ناودار بە بیستنی ئەم هەواڵانە خۆی لە خاشەبڕکردنی ئەو پیاوە هەڵکرد و دەس بە کار بوو. هێشتا لە هێزەکانی ڕانەسپاردبوو کە بێڕاوەستان لەگەڵ شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزا و نیعمەتولڵامیرزا پێی‌نایە ڕکێف و کەوتەڕێ. لایەنگرانی بەتایبەت حاجی میرزا مەهدی مستەوفی زۆریان

وەبەرهەڵخوێند و بە دەورەی‌دا هاتن کە نەچن بۆ ئەو سەفەرە پڕ سام و ترسە و گەلێک بەلگەی پتەویان بە گوێی دادا، بەلام هیچ فایدەی نەبوو. ڕۆژی شەممۆ کلکەی مانگی جیمادی یەکەم لەگەل لقێک سەرباز و تۆپخانە و سوارانی دڕ و ئازا لە ورمێوە بزووت و ڕۆژی یەکەم لە قەلای باراندێز لای دا و بۆ بەیانی هەر لەسەر ئەو هەوایە هەلیکردە قەلای تەرگەوەڕ و فەرمانی خاپوورکرانی دا. پەڕموخانی لەبەر چەند سووچ و تاوانێک گرت و بە زنجیرپێچی ناردی بۆ ورمێ و لەوێڕا ڕۆیی بۆ ناوچەی مەرگەوەڕ. شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزا و نیعمەتوللامیرزا لە سەرەتاوە وێڕای بوون و ئەوسا مێرگی «دزگیر»ی سەر بە دەشتی مەرگەوەڕی کردە هۆردووگا و تاول و خێوەتی لێ‌هەلدا. لەم کاتەدا حەسەن‌خانی سەرتیپی سوارەی قەرەپەپاغ لەگەل چەکدارانی و میرزائاغای سەرخێلی شکۆفتی وێڕای ئیلجاڕی سۆما و برادۆست بەپێی حوکمی مەزنەپیاوانی دەولەت دوابەدوای یەکتر پەیدا بوون و دایانە پال هۆردوو. لە ڕاستی‌دا ژمارەی لەشکرچییانی دەشتی مەرگەوەڕ سەری دەگەیشتە سێ‌چوارهەزار سوارە و سەرباز و کێو و سارای ناوچەی مەرگەوەڕ لەبەر هاژانی چەکدارانی قۆشەن دەتگوت دەریای پڕشەپۆلی بەسامە.

بەکورتی سەرتیپ بۆ سبەینێ محەممەدسولتانی خەلەجی لەگەل دەستە سەربازێک ناردە قەلای بنار و داوای کرد میرسولتان بێ و ئەویش زۆر ئازایانە بەرەو هۆردووبەز کەوتەڕێ. کاتێک گەیشتە خزمەت سەرتیپ دەستی کرد بە جامەلووسکێ و ڕیایی‌بازی و سەبارەت بە ڕابردوو داوای لێبووردنی کرد و پاڕایەوە کە قەلای بنار تێک‌وپێک نەدرێ و لە بەرامبەردا ئەوەندەی بۆ بلوێ دیارییەک دەنێرێ بۆ کاربەدەستانی بالای ئازەربایجان. سەرتیپ ئەم جارەیان لەبەر بەرژەوەندی ڕۆژگار ڕەزامەندی لەسەر داواکانی دەربڕی و لەم بارەوە کاغەزی نووسی بۆ نوسرەتوددەولەی فەرمانفەرما (حوکمڕان) و میرزا سادقی قایمەقام و چۆنیەتی ڕووداوەکانی لێ‌ڕوون کردنەوە و هەتا هاتنەوەی ولام هەر

لەوێ مایەوە. میرسولتانیشی ئیزن نەدا کە بگەڕێتەوە قەڵای بنار و لە هۆردووودا دەست بەسەر رایگرت. ئەو پیاوە ئەگەرچی لەبەر چاوان ڕەش ببوو، بەڵام گرفتار و بێکۆت و زنجیر لە ژێر دەواری حاجی میرزا عەوڵا و لوتفولڵابەگدا هەلکورما. هەڵبەت لەوێ بەدزی هەواڵێکی درۆ و بێبنەمای بیستبوو کە محەممەدسولتانی خەلەج و سەربازەکانی کوتوپڕ بە دەست جەماوەری قەڵای بنار کوژراون. میرسولتان بەم دەنگۆیە زۆر تۆقی و تەماشای کرد کە تازە لەو داوی بەڵایە ڕزگاری نابێ و بە خراپترین شێوە سزا دەدرێ و تۆڵەی لێدەکرێتەوە. بۆیە لەبەر خۆیەوە بیرێکی گەڵاڵە کرد کە ئەگەر بێتوو هەلێک وەچنگ بێنێ و لەناکاو سەرتیپ بە زەبری خەنجەر بکووژێ، دەتوانێ لەو گێژاوە پڕسام و خۆفە دەرباز بێ و هەڵێ. هیچکەس بەم ئامانجە شاراوەی نەدەزانی و خۆشی فکری لەوە نەدەکردەوە ئاخر ئەگەر شتێکی ئاوا بکا لەڕێوە دەکوژرێتەوە. بەککوو ئەو کابرایە چەندە نەفام و خەیاڵاوی بوو کە لە نێو هۆردوویەکی سێهەزار کەسی و گیانفیدایانی جوامێردا خۆی لە کوشتنی ئەمیرێکی ئاوا ئاقلمەند خۆش دەکرد.

بەکورتی میرسولتان هەموو ڕۆژێ بە دەم ئەم خەیاڵەوە رایدەبوارد کە دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێ و ویستی حەشاردراوی دەروونی وەکردەوە بگێڕێ. شەوێک لە شەوان پاش ئەوەی بەیان بەربوو، ئەو کابرایە بە سەر لێشێواوی لە خێوەت و حەپسخانەی خۆی کە نیزیکی تاولی عەسکەرخانی سەرتیپ بوو دەرپەڕی. وەختایەک کە شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا و سەرتیپ و نیعمەتوللامیرزا پێکەوە لە دوو ڕەکات نوێژی بەیانی ببوونەوە و خەریکی نزا و پاڕانەوە و تەسبیحات بوون، لەپڕێ خۆی بە تاول داکرد و پاش سەلام و کڕنۆش بردن، سەرتیپ تێیڕاخوڕی و فەرمووی بۆچی بێئیزن و سەربەخۆ هاتوویە ئێرە؟! لە وڵامدا عەرزی کرد کە قسەیەکی نەهێنیم پێتە و دەبێ بە گوێی بەڕێزتانیدا بچرپێنم. هەر کە ئیزنی وەرگرت، لە سەرتیپ نیزیک بۆوە و

دەسبەجێ بە خەنجەر داگژایە سینگ و شان و پیلی. لەم کاتەدا شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا و نیعمەتوڵلامیرزا سامیان ڕێنیشت و بە بزرکاوی لە تاوڵ دەرپەڕین و هاواریان کرد. ئەو کەسانەی کە لە دەواری سەرتیپ نیزیک بوون وەخۆهاتنەوە و سەرەتا لوتفوڵلابەگی سەرکار بەرەو هەراکە ڕۆیی و نەقیخانی وەکیلیش دوا بە دوای گەیشتێ و کاتێ وەژوور کەوتن سەرتیپی شۆڕەلاو لە ژێر قەلافەتی چوارشانەی ئەو پیاوەدا شەلاڵی خوێنی خۆی ببوو. لەڕێوە لوتفوڵلابەگ لێیوەدەست هات و خەنجەرەکەی لە چنگی دەرهێنا و سۆرانییەکەی پڕدایە و لە مەچەکی خۆی هالاند و ڕایکێشا و بە خەنجەرەکەی زەبرێکی وای لە دەمی دا کە نووکی لە پشتەسەری هاتەدەر. ئەوسا کەسانی گیانفیدا پەیتاپەیتا گەیشتنێ و هەموویان دایگژانێ و برینی ئەستەمیان تێکرد. سەرتیپ وەختایەک خوێن بە هەموو ئازای ئەندامیدا دەهاتەخوار هەستا و هەتا لە تاولەکەی هاتەدەر ئەوەندەی خوێن لەبەر ڕۆیی و فیچقەی کرد کە بە لادا هات و گیانی دایە دەست خولقێنەری جیهان. بەم کارەساتە بوو بە ڕۆژی واوەیلا لەو سەحرایەدا و شەقژنی شین و شەپۆڕ و گریان گەیشتە بەرپەرۆچکەی ئاسمان. جەماوەری قۆشەن بەجارێک هرووژمیان هێنا و چەندەکی میرسوڵتانیان بە شیر و خەنجەران قەڵتوبڕ کرد و بە لەتوپەتی بە دەم ئاوریانەوە نا و سووتاندیان.

پاش ئەوەی کە باڵی بەختی شەهیدبوون سێبەری بە سەر سەرتیپ کێشا، قۆشەنچی تۆقین و پۆلپۆل دەڕۆیشتن و بلاوەیان لێکرد. لەم کاتەدا جەعفەرقولیخانی سەرلک و لوتفوڵلابەگی سەردەستە و حاجی میرزا عەوڵا و لوتفوڵلابەگ تەرمی ئەو شەهیدە خوابەخشیوەیان نایە کەژاوە و شەوێک لە باراندێز مانەوە و بۆ بەیانی گەیاندیانە شار. بردنەوەی مەیتی سەرتیپ بۆ شار بەڕاستی وەکوو ڕۆژی ڕابوونەوە وابوو. گەورە و گچکە هەڵپشکووتبوون و سینگیان دەکوتا و بە سەری خۆیاندا دەدا و بە بانگ و سەلا دەگریان و بابەڕۆیان بوو. سەرەنجام کۆڕی سەرەخۆشی لە لایەن میرزادەی حوکمران و

مەزن و ماقوولانی ئەفشارەوە بۆ ناندرا و لە ئاخری‌دا ئەکبەرمیرزای حاکم هاتە کۆڕی سەرەخۆشی و کەوتە دڵدانەوەی نەجەف‌قولی‌خانی بەگلەربەگ و دایکی مەینەتباری سەرتیپ.

جەنازەی سەرتیپیان بە ئامانەتی لە موغبەرەی ئاخوند مەلا عەلی عارف ناشت هەتا دواتر بەڕێی بکەن بۆ بەر دەرانەی بەرزی مەزارگەی ئیمامان. «مونشی» شاعیری ورمێیی ئاوای ڕێکەوتی نەمانی هۆنیوەتەوە:

نووسی پێنووسی مونشی میسرەعێک پڕ و تەواو

حەیف بۆ عەسکەرخانی[1] ناکامێکی شۆڕەلاو

ڕۆژگار تێپەڕین و کاتێک لەم ساڵەدا هەواڵی کوژرانی عەسکەرخانی سەرتیپ گەیشتە هیرات، یۆسف‌خانی سەرکردەی لقی تازەی ئەفشاریش کە لە ڕیزی هێزە باڵادەستەکان‌دا بوو، لەسەر فەرمانی ناسرەددین‌شا پلەی سەرتیپایەتی هەرسێک لقی ئەفشاری باربوو کرا. لەبەروەی بیووک‌خانی سەرلک لەگەڵ چەکدارانی لکی حەوت ئەرکداری پاراستنی تەورێزی ناوەندی دەسەلات بوو، پاش ئەوەی هەواڵی کوژرانی کاکی بڵاوبۆوە، میرزا سادقی قایمەقام سێ ڕۆژان لەسەریەک ڕووی کردە بنکەی سەرکردایەتی و بەشدار بوو لە کۆڕی پرسەی عەسکەرخان‌دا و پاش سەرەخۆشی لە بیووک‌خان و دڵداری دانەوەی، ئیزنی دا هەتا بگەڕێتەوە ورمێ بۆ پتەو بوونی کاروباری حکوومەت و ڕێکخستنی ئەرکەکانی. جا لەبەروەی زۆر بەتوندی جەختی کردبۆوە لەسەر سزادانی کوڕانی میرسوڵتان و ڕێکوپێکی ناوچەی مەرگەوەڕ کە پاوانەمیری شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزا بوو، هەر کە گەیشتەوە ورمێ، جەعفەرخانی سەرلکی ویرای لکی هەشتی ئەفشار بەڕێکردە مەرگەوەڕ.

---

1 - «بەعسکرخان ناکام جوان حیف»، دەبێتە ١٢٧٣.

## نێردرانی جەعفەرخانی سەرلک بۆ ڕێکخستنی کاروباری ناوچەی مەرگەوەڕ و قەڵای بنار و ناکۆکی نێوان سنووردارانی ئێران و عوسمانی لەسەر ملکایەتی ئەو قەڵایە

جەعفەرخانی سەرلک بە ئامانجی ڕاپەڕاندنی ئەرک و فەرمانی سەر شانی لە ناوەندی ناوچەی مەرگەوەڕ بنەی داکوتا و هەموو ڕۆژێک ئاگری شەڕ و لێکدان دەستەچیلەی زیاتر وەبەر کرا. ئاخرییەکەی خان‌ئەبدال و مەحموود و جانگیری کوڕانی میرسولتان خۆیان بۆ ڕانەگیرا و بە فرکان‌فرکان هەڵاتن و بوونە دەستەوداوێنی پاشای مووسڵ و خۆیان بە ڕعێت و جەماوەری دەوڵەتی عوسمانی دانا. پاشای مووسڵ «ئەحمەدئاغا»ناوێکی لەگەڵ تاقمێک چەکدار ناردنە یاریدەی کوڕانی میرسولتان و ڕایئەسپاردن ڕەپ و ڕاست بڵێن کە خاکی بنار کەوتۆتە «ناوچیا» و سەر بە دەوڵەتی عوسمانییە و دانیشتووانی لە کۆنەوە بەرفەرمانی حکوومەتی ڕۆم بوون. جا بۆیە بەگوێرەی پەیمانی نێوان هەردک دەوڵەتەکە، دەستێوەردانی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران لەو خاکەدا و نانەوەی سەرئێشە بۆ دانیشتووانەکەی نابەخێر و بەپێچەوانەی یاسایە. کاتێک ئەحمەدئاغا گەیشتە ورمێ دیداری کرد لەگەڵ ئەکبەرمیرزای حوکمڕان و بیووک‌خانی سەرلق و ڕاسپاردەکانی پاشای مووسڵی پێڕاگەیاندن. میرزادەی حوکمڕان و بیووک‌خانی وردبین تۆزێک لەم کارە ڕامان و قووڵبوونەوە و وایان بە باش و بەرژەوەند زانی کە جارێ هێز و تۆپخانەیان لە مەرگەوەڕەوە بگێڕنەوە شار و کەریم‌خانی سەرخێلی ڕەوەند بە مەبەستی ڕاگرتنی بارودۆخی ناوچەکە بنێرن، هەتا پاش پرس و ڕا لەگەڵ کاربەدەستانی ئازەربایجان بزانن دەوڵەت دەڵێ چی، لەسەر ئەو ڕووداوانە بڕون و ڕەخنەی حکوومەتی نەیەتەوە سەریان. حاجی میرزا محەممەدخانی سەرقەڵەمی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی

ئازەربایجان کاغەزێکی لە وڵامی ئەکبەرمیرزای حاکمی ورمێدا نووسیوە و چونکە کاکڵ ومەبەستەکەی سەبارەتە بەم رووداوە دەقاودەق دەخرێتەروو:

«لە دەورت گەڕێم! دوێنێ کە ٢ی مانگی رەمەزان بوو، پیاوی ئاغا بیووکخانی سەرلک هات و نامەی بەنرخی ئێوەی هێنان و بەڕێز وەرگیران و سەبارەت بە باروبۆخی ئەو ناوچانە ئەوپەڕی ئۆخژنی خستە دڵ و دەروونەوە. مەلای [رۆمی] دەڵێ:

چونکە تۆ بووی کانیاوی مەسنەوی

بێتوو گەر زیادیش بکا هەر تۆ هەوی

نووسراوەکانی پێشتری بەڕێزی بەرزمجێتان زۆری نیگەرانی و دڵەڕاوکەی نایەوە، بۆیە دەبوو نامەیەکی ئاواش بگاتێ کە دڵ پێی بگەشێنەوە. لەم یەکدوو رۆژەدا کە نامەبەری پایتەخت دەڕوا ئەم کاغەزەی بەڕێزیشتان دەنێرینە خزمەت گەورەپیاوانی دەسەڵات، هەتاکوو ئەوانیش هەڵسووڕان و تێکۆشانی ئێوەیان لە بابەت رێکوپێک کردنی کاروباری مەرگەوەڕ و بنارەوە بۆ روون بێتەوە و جڵەودارانی دەوڵەتی بەرەوگەشە لێی ئاگادار بن. چونکە لە رووی نێوەرۆکی ئەو نامانەی پێشتر ئێوەی هێژا و سەرلک نووسیبووتان و نێردرابوونە پایتەخت، بەشێکی لە لایەن کاربەدەستانی مەزنی دەوڵەتی گەورەوە وا لێکدرابۆوە کە بێ و نەبێ حکوومەتی عوسمانی بە هێز و قۆشەنەوە بەرەو مەرگەوەڕ و بنار تێکشاوە، هەر بۆیە هێندێکی ئاڵۆزی و هەڵچوون بە شوێنەوە بوو. منی خزمەتکار بەپەلە ئەم کاغەزانە دەنێرم هەتا هەموو گومانەکان برەوێنەوە. عەلیقولیخانی ئەفشاری میرپێنجی سەر بە فەرمان کە [قەرارە] لە تارانەوە بێ، ئەگەر بەڕێزی بەرزەجێی بەشەوکەتی هێژا مەزنەوەزیر بزانێ چما قۆشەنێک لە وڵاتی عوسمانیڕا نەهاتووە، ئاینێرێ و خودبەخود دەبێ کێشە و دەمەقرەکە ببڕێتەوە و رێگا نەدرێ کە ئاغایان بخزێنە نێو خاکی دەوڵەتی

گەورەوە. ڕێوشوێنێکی دیاری کردووە و نووسیویەتی کە پوختەکەی لە کاغەزی شازادەی بەڕێز روکنوددەولە ئەردەشێرمیرزادا وەبەرچاوی جەنابتان دەکەوێ. هەر چۆنێک بێ ئەگەر بەم تەگبیرە چاکەی ئێوەی بەڕێز و سەرلک، کەریمخانی سەرخێڵی ڕەوەند بتوانێ بارودۆخی مەرگەوەڕ هێور بکاتەوە و شەڕنانەوەی جەماوەری [قەلای] بنار داکووژێنێ باشترین ڕێچارەیە. مەزنانی دەوڵەت بە ئاشکرا نووسیویانە و فەرموویانە کە لە پێشدا بە ئاقڵ و تەگبیر و ڕاوێژ و دڵدانەوە [لەگەڵیان تێکەون]، پاشان ئەگەر نەکرا بە قۆشەنی ورمێ بچنە سەریان و چما پێویست بوو لە چەند شوێنی دیکەوە دەبێ هێز کۆبێتەوە و تۆخمەیان قەلاچۆ بکرێ. بەکورتی شێوەی هەڵسوکەوت و جووڵانەوەی جەنابتان و تەگبیری چوونی کەریمخان بۆ مەرگەوەڕ و بنار ئەگەر بە هیوای خودای گەورە بتوانێ بارودۆخەکە ڕێکبخاتەوە ئەوەندە ومبەر دڵان دەکەوێ کە هەر نەبێتەوە. ئەحمەدئاغای نێردراوی پاشای مووسڵ هاتە ئێرە و زۆر چاکی جواب درایەوە و بێدەنگ بوو. نامەیەکی بەڕێزتانی پێبوو، ناردی و چاوم پێیکەوت عەیبێکی وای تێدا نەبوو[1]. بەلام چونکە ئەمجارەش جلەودارانی دەوڵەت زۆریان ڕاسپاردووە و نووسیویانە و فەرموویانە کە نەکەن سەبارەت بە مەرگەوەڕ و بنار لەگەڵ بەرپرسانی نێردراوی عوسمانی و ئەوانەی دژبەرن و لە مەرگەوەڕ و بنارن نامە بگۆڕنەوە. عەرزتان دەکەم ئەگەر هاتوو لەوەی بەولاوە کارێکی ئاوا هاتە پێش هەتا زۆر پێویست نەبێ هەر بە سوال و جواب و ڕسپاردەی زارەکی باشترە [کارەکان ڕاپەڕن]. ئەگەر هاتوو زانیتان هەر پێویستە، بەڕێزتان تەنیا ئەوەندەتان لەسەر شانییە کە بنووسن لە فلانە خاک کە تۆ هاتوویە وێ و دەتهەوێ ئاژاوە بنێیەوە و بیگری سەرلەبەری ملکی

---

[1] - بێگومان بە باری سیاسیدا نامەکەی حاکمی ورمێ هەڵەی تێدا بووە بۆیە میرقەڵەم ئاوا بەئەدەبانە نووسیویەتی: «عەیبێکی وای تێدا نەبوو.» پاشان ڕێنوێنی دەکا کە دەبێ ئاوا بکەن و ئاوا نەکەن. م. پ

دەوڵەتی مەزنە و بە ئێمەی ئەسپاردووە و لە لایەن دەوڵەتەوە ئیزنمان نیە کە بۆ ساتێکیش ڕێی مانەوەی کەسانێک بدەین کە کاروباری کەوشەنی هەرێک لا دەشێوێنن. دەوڵەتی عوسمانی لە تەورێز کاربەدەست و شابەندەری[1] داناوە. ئەگەر قسەیەکتان هەیە بڕۆنە لای ئەو با خۆی لەگەڵ کاربەدەستانی ئازەربایجان بکەوێتە گفتوگۆ. سەبارەت بە کەس‌وکار و کورانی میرسولتان کە ئێستا لە مەرگەوەڕن، ئەگەر بە ئەحمەدئاغا دەخوڕن و بە پشتیوانی هێزی وی لەوێ دەجووڵێنەوە و سەریان دێنن و دەبەن، بفەرموو کە پێیان بڵێن ئەحمەدئاغا چۆتە تەورێز و وڵامی بەجێی دراوەتەوە و بە ڕێگای سابلاغدا دەچێتەوە مووسڵ، دەی ئێوە کە بە گورسێکی ڕزیو کەوتوونە چاڵ دەڵێن چی؟ بفەرموو کە لە لایەکەوە تەواو ناهومێدیان بکەن و لە لایەکی ترەوە یەکجار هیوایان وەبەربنێن بۆ نۆکەرایەتی خۆتان. چەشنێک لەگەڵیان بجووڵێنەوە هەتا نووسراوەیەکیان لێ‌وەدەست بێنن کە تێیدا خۆیان بە نۆکەر و ڕعێتی دەوڵەتی مەزنی ئێران دانابێ و ئەم کارانە زۆر ڕێگاخۆشکەرن. ئیدی بەڕێزی پایەبەرز چونکە خۆی ئاگاداری مەبەستەکانە، باشتری لێدەزانێ، بەڵام بەراستی دەبێ جەنابتان بەوردی و خێرا کارەکە ڕابەڕێنن و نابێ هێندە بخایەنێ، دەنا وەکوو پەتا هەموو لایەک دەگرێتەوە. [ئیتر] تەواو.»

بەکورتی کاتێک کورانی میرسولتانی بناری بەجارێک لە پشتیوانی و یارمەتیدانی دەوڵەتی عوسمانی سەبارەت بە خۆیان ناهومێد بوون، بەناچار کەوتنە شوێن کەیخودا و بەریوان و دەستیان بۆ ئێروشەوێ درێژ دەکرد. سەرەنجام کەریمخانی ڕەوەند کە ڕاسپاردەی ڕێکخستنەوەی کاروباری مەرگەوەڕ بوو بە چەند وادە و بەڵێنێک دڵی ڕەوبردووی دڵداری دانەوە و بۆ ڕعێتایەتی دەوڵەتی بەرز هیوای وەبەرنان و بەگشتی ئاگری شەڕنانەوە داکووژا.

---

1 - قۆنسوول، کونسوول.

# ئەو ڕووداوانەی کە ساڵی ١٢٧٤ی کۆچی/ ١٨٥٧ ـ ١٨٥٨ی زایینی قەومان و گەڕانەوەی یۆسفخانی سەرلق لە سەرەتای ساڵی ١٢٧٥دا

یەکێک لە ڕووداوەکانی ئەم ساڵە سەبارەتە بە عەلیئاغای سەردارعێلی بشکوفتی مەنشوور بە شکاک کە پیاوێکی سەربزێو بوو. هەمیشە نۆکەر و چەکدارانی ڕێگایان بە ڕێبوارانی کەلی قوشچی و قولنجی دەگرت و ڕووتیان دەکردن و ئازاریان دەدان و دەیانچزاندن و ماڵی بازرگانانیان بە تاڵان دەبرد. خودی عەلیئاغاش دەستی داگرتبوو بە سەر بەرهەم و حاسڵاتی گوندی «هووسین»ی ناوچەی سۆمادا کە مڵکی تایبەت و پاوانی کورەکانی لوتفعەلیخانی سەرتیپی خوابەخشیو بوو. سەرخێڵی بشکوفتی ئیزنی خۆتێومردانی نەدەدا بە ڕاسپێراوانی بیووکخانی سەرلق و ئەویش بەگوێرەی ڕێگەپێدانی کاربەدەستانی جڵەوکێشی دەوڵەت تاقمێک سەربازی لقی حەوتی بە سەرۆکایەتی حەسەنعەلیخانی گەزنیقی و هاوکاری لوتفوڵلابەگی سەرکاری دێهات و ناوچەکان بەڕێکردە دەڤەری سۆما. نێردراوەکان لە دەوروبەری هووسین لە شوێنێک کە پێیدەڵێن «ئاشتیان» و ماڵی عەلیئاغای لێبوو، ئاورگی شەڕ و لێکدانیان داگیرساند. حەسەنعەلیخانی گەزنیقی و ڕێزدار لوتفوڵلابەگ هەردووک لە پێشەوەی ریزی سەربازان ڕاوەستابوون و ئازایەتییان دەنواند. عەلیئاغا دابوویە سەر گردێکی قوتیلە و بە زەبر و پریشکەی فیشەکی ئاگربار مەرشەی سەربازانی لە کۆڵ خۆی دەکردەوە. لەم بگرە و بەردەیەدا حەسەنقولیخانی گەزنیقی وەبەر گوللەی عەلیئاغا هات و کوژرا. لە زمان خودی لوتفوڵلابەگەوە دەگێڕنەوە کە چونکە عەلیئاغا زۆری ناخۆش دەویستم و دەیبوغزاندم، دەیهەویست بمکووژێ. من دەمزانی، هەر بۆیە چووبووم جلوبەرگی کوردیم کردبووەبەرم و لە پێش سەفی سەربازان چەقیبووم. عەلیئاغا بە لێنێکچوون وای زانیبوو کە حەسەنقولیخان، لوتفوڵلایە و بە

فیشەکێک کە زۆربەی جاران دەیئەنگاوت، ئەو بێچارەیەی گەوزاند، بەڵام دیسانیش سەربازەکان هەنگاویان شل نەکرد و ڕاوەستان و عەلی‌ئاغایان دەرپەڕاند.

یەکێک لە ڕووداوەکانی دیکەی ئەم ساڵە گەڕانەوەی یۆسف‌خانە. هەروەکوو پێشتر نووسرا لە کۆتایی شەڕ و کێشە و گیرانی هیراتا کە شازادە حیسامووسسەڵتەنە وێڕای هێزەکانی ئێران لەوێ بنەیان داکوتابوو، لە ورمێوە قاقەزێک سەبارەت بە شەهیدبوونی عەسکەرخانی سەرتیپ لە ناوچەی مەرگەوەڕ گەیشتە دەست یۆسف‌خانی سەرلک و لە پایتەختیشەوە بە حیسامووسسەڵتەنە ڕاگەیەندرا. بەپێی فەرمان پرسەیان بۆ دانا و بەوپەڕی ڕێز و شەوکەتەوە تازیەیان بۆ داگرت. پاش تەواوبوونی تازیەنباری هەروەکوو لە سەرچاوە مێژوویی‌یەکانی سەردەمی قاجاری‌دا وەبەرچاو دێ، کاروباری گرینگی ڕێککەوتنی نێوان ئێران و ئینگلیس سەبارەت بە شاری هیرات ڕادەپەڕێ و دەبڕێتەوە. هەر بۆیە دەستەیەک لە هێزەکان بانگ دەکرێن بۆ پایتەخت و هێندێکیان لە ڕکێفی حیسامووسسەڵتەنەدا لەوێ دەمێننەوە. حیسامووسسەڵتەنە قەڵای هیراتی چۆڵ کرد و گەڕایەوە خاکی پیرۆزی [مەشهەد]. لەوێ یۆسف‌خان ئیزن درا کە بچێتە پایتەخت و پاش ئەوەی ئیکلامی پاشای کێشا، لەبەر کۆمەڵێک خزمەتی بەرچاو و گەلێک سەرکەوتنی شایان کە بە پاڵپشتی لقی تازەی ئەفشار بەتایبەت لە ڕۆژانی گەمارۆدا نواندبووی، بە سۆز و سیلەچاوی میرانە بەسەرکرایەوە و کەوتە بەر ئێرەیی ئامپاکانی و پلەی سەرتیپ دووەمی ئەفشار و دروشم و نیشانەی ئازایەتی درایە و سەری پێی بەرز کرایەوە. دواتر ئیزن درا بەرەو ورمێ بڕوا و بەر لە خۆی چەکدارەکانی لەگەڵ خانلارخانی سەردەستە کوڕی ئارەحمانپاشاخان و نەجەفقولی‌بەگی سەردەستە بەڕێکردنەوە بۆ مەوتەنی دڵبەستەی. خۆشی دوا بە دوایان گەیشتەوە زێد و مەڵبەند و تازیەی داگرت بۆ عەسکەرخانی سەرتیپی ڕەشیدی برای.

❖❖❖❖

# شەڕ لەگەڵ تورکمانان و ئەو دەورە گرینگەی کە سەرکردەکان و جەنگاوەرانی ئەفشاری ورمێ لەم تێکهەڵچوونەدا گێڕایان

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تا جڵەوی قەڵەم بەرەو ڕووداوەکانی مەروی خوراسان وەربسووڕێ و بکەوینە سەر نووسینەوەیان کە شازادە هەمزەمیرزای حیشمەتوددەولە کوڕی جێنشینی خوابەخشیوی میر سەرکردایەتی کردوون. خاکی خوراسان کە یەکێکە لە هەرێمەکانی ئێران هەر لە سەرەتاوە مەکۆی ئاژاوە و تێکەولێکە بووە و بۆ وێنە جووتە قەڵای سەرەخس و مەرو لەو شوێنە هەڵکەوتوون و نیشمەنگای تیرە و تۆرەمە گومڕاکانی تورکمانانی خوراسانن. هەر لە کۆنەوە تورکمان کاریان کوشتوبڕ و تاڵان و ڕێگری و ڕووتکردنی کاروان و ڕێبوارانی ئەو سەرزەمینەیە. لە ڕاستیدا تورکمان ڕێژەیان پتر لە سەدهەزار هۆبەنشین و لە هەر سەردەمێکا پاشاهانی ئێران بەتایبەت سەفەوییەکان و نادرشای ئەفشار لەشکریان ناردوونە سەری بۆ لێدان و دەمکوت کردنیان و زۆر جاران گەلێکیان بە لەپەشیران لێ قەڵتوبڕ کردوون و چاکیان چێومچزە داون. بەکورتی لەم چاخەدا چونکە هەواڵی سەربزێوی و سەرهەڵدانی دووبارەی ئەو تۆرەمەیە پەیتاپەیتا بە گوێی گەورەپیاوانی بارگای ناسرەددین‌شای قاجاری فەرمانڕەوا ئاشنا دەکرا، شازادەی هێژا هەمزەمیرزا حیشمەتوددەولە کە پێشتر لە ڕووداوی سەربادان و هەڵگەڕانەوەی محەممەدحەسەن‌خانی سالار کوڕی ئاسەفوددەولە و شێوانی خوراسان‌دا خزمەتی بەرچاو و هونەری شیاوی نواندبوون، لەسەر فەرمانی میری بەرزەجێ وێڕای هێزە نەبەزەکان شان‌بەشانی میرزا محەممەدی قەواموددەولەی ئاشتیانی

وەزیری بـەرەنگاری ڕاسـپێردرا بـۆ لێـدان و سـەرکوتی تورکمانـانی مـەرو و سەرەخس. بۆیە فەرمانی شانازی نووسرا بۆ هاتن و جەمبوونەوەی هێزەکـانی وڵاتی ئێران. لقی حەوت و هەشتی ئەفشاری ژێرحوکمی یۆسفخانی سـەرتیپ و لقەکانی مەراغە وێڕای جەعفەرقولیخانی نوسرەتولمولک و زۆربەی هێزەکانی ئێران لە ناوچە و مەڵبەندەکانی وڵاتەوە بە سەرکردایەتی سەرکردە ناودارەکانی ئەو سەردەمە بانگ کرانە تاران.

بەکورتی شازادە حیشمەتوددەولە بەو هـەمووە هێـز و دەسـەڵاتەوە لـە تارانەوە ئێزن درا و بەرەو خاکی پیرۆز بزووت. سـەرەتاکانی مـانگی مبـارەکی ڕەمەزان گەیشتن و لەبەر دەم دەروازەی ئـەرگ‌دا ڕەشمـاڵ و دەواری هەڵـدرا و چەند ڕۆژێک سەرقاڵ بوون بە کـۆکردنەوەی چەکوچـۆڵ و پێداویـستییەکانی شەڕ و تێکهەڵچوون. دوای لێبوونەوە لەم کارانە جووڵانەوە و لە شـوێنێک کـە پێی‌دەڵێن «کاڵ» تاوڵ و خێوەتیان وەکوو ئەستێرەی ترووسکەدار خۆیان نواند. لەم کاتەدا میرزا محەممەدی قەواموددەولەی وەزیری بەرەنگاری گەیشتە کاروانی کەژاوەی لەشکری بەرەو سەرکەوتن. شازادە حیشمەتوددەولە سەردارانی سـپای بانگهێشتن و لەگەڵیان کەوتە باس و ڕاوێژ و سـەبارەت بـە داگیرسـانی شـەڕ گفتوگۆی کرد. هەموویان وایان بە بـاش زانـی کـە شـازادە جیهانـسۆزمیرزای سەرتیپ کۆمەڵێک سەرباز و سوارە لەگەڵ خۆی هەڵـبگرێ و ببێتـە پێـشەنگ، هەتا هەم لەبەر ئاپۆرای حەشامەت ڕێگای چوون تەنگەبەر نەبێ و هـەم ئـاوی ڕووباری سەرەخس بەو شانەدا بەرداتەوە بەڵکوو خێرا لووزەو ببەستێ و بگاتە «کووچەی قوم» و سپا تێراو و پاراو بێ و توونیایەتی برستی بزووتن و ڕۆیشتن ویشک نەکا. لەسەر ئەم بڕیارە شازادەی بەرزمجێ لە مانگی شەشەکان‌دا وێڕای دوو لقی بەرکێفی خۆی و لقی موزەففەری مەراغە و لقی نـۆی خۆیـە و چـاردە دەزگا تۆپ و کۆمەڵەسـوارێک ڕووی کـردە «نـەورۆزئاوا» و شـانی دایـە بـەر هەڵگێڕانەوەی ئـاوی ڕووبـاری سـەرەخس بـە شـانی کووچـەی قـومدا. لـەو

جەنگەیەدا شازادە حیشمەتوددەولە بەشان و شەوکەتەوە گەیشتن و دوای چەند ڕۆژان بەستێنی ئاوەکە هەڵگەڕایەوە و لەوێوە لەشکری زاڵ بارگە و بنەی خستە نێوەندی کاروانی شکۆمەند و بزووت. ڕێزدار حیشمەتوددەولە و قەوامودەولەی وەزیری بەرەنگاری و کۆمەڵێک سوار لە دواوەی هۆردوو وەڕێکەوتن. وا دانـدرا کە سوارانی خوراسانی لە جێبۆسە و پەساران قەرەوڵ بن و هـۆردوو بپـارێزن. هەموو ڕۆژێک بەم شێوەیە شەش فرسـەخیان ڕێگـا کوتـا هـەتاکوو گەیـشتنە کووچەی قوم. خوداوڕاستان لەوێ ئاو وەگیر نەدەکەوت و لەشـکرچی لـە هـەر شوێنێک چاڵاویان لێدان بەڵام شوێنەواری ئاو بەدی نەکرا. شەو و ڕۆژێک ئـاوا تێپەڕی و توونیایەتی هێرشی هێنا و بەتایبەت خومـارانی پیاڵـە بـە دەسـتی لەشکر خراپیان لێقەوما! کەچی لەپڕ بە قوردەتی خودای تاق و تـەنیا لـە نێـو جێخێوەتەکانی لقی حەوتی ئەفشاری ورمێدا ئـاوێکی زۆر و سـارد و سـووک هەڵقوڵی و تەواو جەماوەری قۆشەن و تەنانەت یەکسمەکانیشیان پێـیتێـراو و پاراو بوون و بۆ شەو و ڕۆژێکی دیکەشیان پاشەکەوت کرد. سـەر لـە ئـەنگۆرێ لەوێوە بزووتن و نیوەشەو گەیشتنە مزلی «داشڕەبات» و بەیانی کە خۆر باڵی ئەنگاوت بەرەو «قۆریـاب» کەوتنـەڕێ. لـەو ڕۆژەدا حیـشمەتوددەولە لەگـەڵ چەکدارانی ئەفشاری بەرکێفی یۆسفخانی سەرتیپ پێـشەنگ و قەوامودەولـە پاشەنگ بوو. چونکە سوارانی تورکمان هەمیشە لە هەڵێک دەگەڕان، تەماشایان کرد پۆلی پاشەنگان شەڕکەرێکی وایان تێدا نیە، بـۆیـە بەجارێک پـەلاماریان دان و بە هەڵمەت و هەڵسووڕان خۆیان هێناوبرد، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا و تەنیا چەند لەشکرچییەکی ئێرانی بریندار بوون و برێکیش لە بارگە و بنە بـە تـاڵان ڕۆیی. لای ئێوارە هێزە باڵادەستەکان گەیشتنە «قۆریاب» کە جێگای کشتوکاڵی تورکمانان بوو. دەغڵودانێکی زۆر کەوتە بـەرچنگی قۆشـەنجییان و تـەواو بـە دڵنیایی دووسێ ڕۆژان سەنگەریان دابەست و بنەیان داگرت. پاش ئـەم ماوەیـە فەرمانی بزووتنی قۆشەنی دا و خۆشی لەبەرووەی نەکا دیسان تورکمان کـە لـە

دەرفەتێک دەگەڕان هەڵکەنەوە سەریان و بیکەنەوە تراتێن، بـرای سپاسـالاری لەگەڵ دوو لقی بەرزکێفی خۆی و لقی ئەردەوێڵ و مشکینشـار و لقـی شنـازدەی شوقاقی و چوار تۆپەوە وەکـوو بـەرایی بـەرێکرد. خۆشـی ئەشـریفی ویـرای هێزەکانی ئەفشار و مەراغە و کۆمەڵێک سوار لە دواوە بـزووت. لـەم ڕۆژەشدا تاقمێک سوارەی تورکمان هەڵمەتیان هێنـا و کردیانـە هـەرا، بـەڵام کـاروانی لەشکری زاڵ تووشی هیچ خەسارێک نەبۆوە. سـەربازانی لقـەکانی ئەفـشار و موقەددەم بە گوڕمی دلێرانە و پیاوانە بەربەرچیان دانەوە. دوای ئەوەی گەیشتنە جێلەنگەری تورکمانان تەماشایان کـرد خۆ لـەوێ نـەماون و بـار و کۆچیـان لێناوە و چەند فرسەخێک دوور کەوتوونەوە. حیشمەتوددەولە پۆلێک سـوارە و سەربازی ومشوێن خستن و ئەوانیش [گەیشتنە سەریان] و بەجارێک هاواریـان کرد یاعەلی و بە هەڵمەتێک پێشەنگانی تورکمانیان هەڵچنین و هـەتا لێـواری ڕووبار هەڵیانبرین. تورکمانەکان لە ترسی گیانی خۆیـان ڕووباریـان بـڕی و پەڕینەوە و چەند منداڵێکی تەمەن کاڵیان لێتێکـەوتن و لـە مەمکۆڵـەی نـەمان شیریان مژی. ڕاست لەو جەنگەدا سوارەی «هەزارە» بـە تێـشکاوی گەڕانـەوە و ڕەویـن و ڕاکردنیـان سـەربازانی تۆقانـدن و ورەی تورکمانـانی پێهـەڵابرد و سـەرلەنوێ ومشـەڕ کـەوتنەوە. لـەوێ بارەکـە بـە شـێوەیەکی سـامناک هەڵگەڕایەوە و نیزیکەی بیـست سـەرباز و سەردەسـتەیەکی پاڵـەوانانی لقـی ئەردەوێڵ و مشکینشار کـوژران و گـیران. تورکمـان لـەم تێکهەڵـچوونەدا بـە سەرکەوتوویی گەڕانەوە. ئیتر شـازادە حیـشمەتوددەولە پەیکـەردەی ئـەوانی بەپێچەوانەی پارێز دانا و بە پەرژەوەندی نەزانی. لەشـکری بـەختیار دوو ڕۆژ لەوێ بنەی خست و ئەوسا ئاغارمزاخانی سەرئاجودان بـەپێی فـەرمان لەگـەڵ کۆمەڵێک ئەندازیار چوونە نێو قەڵای مەرو و جێگای بنـەگربوونی هۆردووویـان دیاری کرد. حیشمەتوددەولە کە ئەم چەندە ڕۆژە لە دەرموەی قەڵا بنەی دانابوو لە کاتێکی بەوەدمی ڕوانی و ئەوکات بەوبەری شەوکەتەوە پێینایە قەڵای مـەرو.

لەوێ پتر لە ماوەی مانگێک تەشریفی موبارەکی حیشمەتودەولە وێڕای یەکێک لە سەرکردەکانی سپا هەموو ڕۆژێ یەکسم و رەوەی هۆرنوویان بۆ لەوەڕ دەبردنە دەر و دەشت و لای تاوپەڕێ دەگەڕانەوە و جارجارەش چەند سەر ئەسپ و یەستری تورکمانانیان ڕادەدا. ڕۆژگار خولی دا و مانگی محەڕرەم داهات و هێزەکانی ئێران لە دە ڕۆژەی یەکەمی عاشووورادا تەکیەکانیان ڕێکوپێک کردن و کەوتنە لە خۆدان و تازیەداری.

ئەوەی ڕاستی بێ لەم ماوەیەدا تۆرەمەی «سالوور»ی دانیشتووی «یۆڵئووتن» کە لە سەر ڕێگای هاتوچۆ بوون، پەلاماری قافلەی تایفەی «ساررووق»یان دەدا کە لە شوێنەکانی ترەوە ئازووخەیان دێنا بۆ جەماوەری هۆرنوو. حیشمەتودەولە وەختایەک شتەکەی لێ ڕوون بۆوە، لێدان و دەمکوتیانی بە ئەرکی سەر شانی خۆی زانی. دەمەو ئێوارەیەک کۆمەڵەچەکدارێکیان ناردنە سەری و خودی شازادەی پایەبەرزیش لەگەڵ چەکدارانی ئەفشار و مەراغە و دەستە سوارێک کە ئازاترین پیاوانی هۆرنوو بوون بەرەبەیانی چوونە دەستەی تورکمانان و یەکسم و خەنیمەتێکی زەوەندیان وەچنگ هێنان کە هەر باسی ناکرێ. لەم کاتەدا پەرویزخانی چەرداوەڕوو هەڵیکردە سەر تورکمانان کە لە دەرەوەی قەڵای «یۆڵئووتن» چادر و چیغیان هەڵدابوون و ڕایاننەنگاوتبوون. تورکمانەکان بەجارێک دەسڕێژیان لێکردن و سوارانی چەرداوەڕوویان پاشەکشە پێکردن. بە دیتنی ئەم دیمەنە پەرویزخان ڕەحی غیرەتی بزووت و جارێکی تر توند و تیژ هەڵمەتی برد و زۆر چاکی هەوڵ دا. لە گەرمەی تەقەکەدا برای پەرویزخان لەگەڵ بیست و شەش کەس سوارەی بەرڕکێفی برینی قووڵیان هێنا. ئەسپەکەی پەرویزخانیش بە فیشەکی تورکمانان ئەنگوا و سەقەت بوو، بەڵام دیسانیش ئەو پیاوە دلێرە بە پێیان هەر شەڕی دەکرد. قەواموددەولە کە ئاوای دیت لەڕێوە ئەسپێکی بۆ نارد و پەرویزخان لێی سوار بۆوە و هۆمەنی برد و هەتا نێو هۆبەی تورکمانان ڕانەوەستا و خەنیم

بەرگەیان نەگرت و پەنایان بردەوە بەر پەساری قەلا و تاقمێکیان بازرە بـوون. ئەوسا شازادە حیشمەتودەولە فەرمانی تەقەی دا بە تۆپخانە و گوللەتۆپێک بە سەر دیواری قەلادا ئاوەژوو بۆوە و ژنێکی تورکمـانی کوشـت. دەورەدراوان بـە دیتنی ئەم دیمەنە شلەژان و بەناچار پاڕانەوە و ئامانیان خواسـت و پـەنادران. دوای ئەم ڕووداوە دان و دانەوێلە و نان و پێخۆریان لە قەلاوە دێنان و لە فێتـی نرخی ڕۆژ بە جەماوەری هۆردوویان دەفرۆشتن. پاش سێ‌چوار ڕۆژان بەگوێرەی فەرمانی شازادەی پایەبەرز سێسەد کەسیان وەکوو بارمتە دانە دەست دەولـەتی شکۆمەند و بەڕوالەت ملیان بە چەلەمەی حکوومەتا هێنا. شـازادەی بـەرزەجێ گەڕایەوە مەرو و دوای دوو ڕۆژ سوارانی «سالوور» کە وەکوو بارمتـە لـە نێـو هۆردوودا بـوون نیوەشـەو دەرپـەڕین و شـوورەی قـەلایان هەلـبوارد. خێـلی «سالوور»یش مال و کۆچیان لە «یۆل‌ئووتن» پێچایەوە و خۆیان گەیاندە شکێر و هەورازی چیاکان و ماتەیان هەلگرت. لەم کاتەدا عەبدولعەلی‌خـانی سـەرتیپی تۆپخانە لەگەل دوو لقە سەرباز ڕاسپێردرابوو کە بچێتە «یـۆل‌ئـووتن» و ئـەو دەغلودانەی لە چالاندا شاردبوویاننەوە، بیاندۆزنـەوە و ڕایانگوێزنـە قـەلا، بۆیە لەسەر هەست و بەپارێز دەڕۆیشتن. بەلام جەماوەری «تەکە» کە نیزیکـەی پێنسەد سوارێکی دڕ و ئازا بوون، بۆسـەیان نابوویـە و لـەناکاو دەرپـەڕین و پەلاماری سەربازەکانیان دا، کەچی عەبدولعەلی‌خانی موقـەددەم بـە یارمـەتی تۆپخانە شکستێکی قورسی بە سەر شانی‌دا سەپاندن. کاتێـک ئـەم ڕووداوە بـە گوێی حیشمەتودەولە گەیشتەوە، وێڕای کۆمەلێک لـە چەکـدارانی ئەفـشار و سوارانی شاسەیوانی «قورت‌بەگلوو» ڕۆیی و لە گوێگتەپەی یەک فرسەخی مەرو سەرەڕێی پێگرتن و سوارە و سـەرباز بـێ‌سـێ‌ودوو وەشـەڕ کـەوتن. تورکمـان بەرگەیان نەگرت و بە بالەپڕژە ڕەوین. پتر لە بیست و پێـنج کەسـیان بوونـە چێشتەی شمشێری خەزاکەران. سواران و سەربازانی ئێرانی سەری‌بـڕاوی ئـەو کەسانەیان بە سەری نێزانەوە کردن و گەڕانەوە قەلا.

ڕۆژێکــی حیــشمەتودەولە کــە ســەرکردەکانی قۆشــەنی کۆکردبــۆوە و سەبارەت بە خێڵی شەڕفرۆشی «تەکە» قسەی هێنانە گــۆڕ، گــوتی مــاوەی دوو مانگ زیاترە کە لە قەڵای مەرو ماوینەوە یان لە ڕاستیدا گەمارۆ دراوین. چــاک دەزانم کــە وردەوردە سپا برستی لێبڕاوە و لاواز بــووە و دوژمــن برشــتی پتــر پێهەڵچووە. لەم ماوەیەدا بە هیچ چەشنێک لە خوراسانەوە یاریدەی ئێمــەیان نەداوە. وا باشترە کە هەموومان بۆ خاشەبڕ کردنی ئەم تۆرممەیە لێببڕێین و چی دیکە ڕۆژگار بە فیڕۆ نەدەین و بزانین خودا چۆنی دێنێ با وابێ. ســەرکردەکانی سپا هەموویان یەکدڵ و یەکزمان عەرزیان کرد کە ئێمــە غــولامی دەوڵــەتین و گوێمان بەرداوەتەوە بۆ فەرمانی شازادەی پایەبەرز، هەر حوکمێکی بیکەی ملــی وەبەردێنین و تۆ خاوەندەســەڵات و داوەری. جــا کــەوابوو لــە کلکــەی مــانگی محەررەمدا بە ورەی بەرزەوە پاڵیان بە پشتیوانی یەزدانی تــاک و تــەنیاوە دا و بزووتن. ئەوەی پیر و پەککەوتە و شەڕپێنەکراو بوو وێڕای بارگە و بنە لە قەڵا بەجێهێشتران. سێ لکی سەربازانی خۆیە و فەراهان و ناسرییە خرانە بەردەستی ئاغارەزاخانی سەرئاجودان بۆ پاراستنی قەڵا. بــۆ ســبەینێ هێزەکــانی ئێرانــی جمین و لە یەک فرسەخی شوێنی نیشتەجێبــوونی تورکمانــان هۆردووبــەزیان کرد. بەهەڵکەوت دوو تیرەی عێلی «تەکــە» کــە بــەم جووڵانــەوەیان زانیبــوو، چووبوون و ئەو شەقەجۆگانەی کە لە مەودای ڕێیەدا هەبوون ئاویان وێگێڕابوون هەتا ڕێگای تێپەڕینی لەشکری ئێران بگیرێ. کاتێک یۆسفخانی شوجاعوددەولە . م مەبەستەی زانی لەگەڵ لقی چەکدارانی سینگی وەپێش دا و گــوتی دەچــین و جۆبارەکان پردیان لەسەر هەڵدەبەستین. شــازادەی بــەرزمجێ بــەم داخــواز و هەنگاوەی یۆسفخانی ئەفشار ئۆخژنی لە دڵ و دەروونی گەڕا و ڕایسپارد کــە بڕوا و ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنێ. یۆسفخانی سەرتیپ هەر لەو شەودا بە سەختەدار و ئالوودارانی پردی لەسەر جۆباران هەڵبەستن. پردەکان ئەوەندە قایم بوون کە ئەو دەریای لەشکرە بە ئەسپ و یەستر و بارگینەوە پێیاندا پەڕینەوە بــەڵام کــون و

کەلەبەریان تێنەکەوت و چورتەشیان نەکرد. بەم شێوەیە لەشکرچی لە چۆمەڵ و شەقەجۆگان پەڕینەوە و بەرەورووی مەتەریزی تورکمانانی دەشتەوان سەفیان بەست و چەقین. تورکمانیش ڕیزەکانی خۆیان دابەش کردن و هەر ئەو ڕۆژە نیزیکەی دوازدەهەزار گوللەتۆپی ئاگربار لە تۆپانەوە حەواران. بەڵام تورکمان و هۆبە و چادر و چیغیان هیچیان بە سەر نەهات. لای ئێوارە گەڕانەوە و گەلێک سەنگەری قایمیان دابەستن و هەر جێیەک لەبار بوو سەرباز و قەرەوڵی لێداندرا. چەند ڕۆژێک ئاوا ئاگری شەڕ لە نێوان هەردک لادا هەڵدەگیرسا هەتاکوو لە مانگی سەفەردا بە ئامانجی هێرش بزووتن و چوونە سەر مەتەریزەکانی تایفەی تەکە. لە لایەن شازادەوە وا داندرا کە یۆسف‌خانی ئەفشار و قاسم‌خانی سەرتیپ وێڕای لقێک سەربازی فەراهان بە دەستی ڕاستا و شازادە جیهانسۆزمیرزا و جەعفەرقولی‌خانی نوسرەتولمولک بە باڵی چەپا و تێکڕای هێزەکانی دیکەش بە دوای بارگە و بنەی هۆردوودا ببزون. خودی حیشمەتودەولە لەگەڵ چەند لق سەرباز و تۆپخانە لە جەرگەی لەشکری‌دا ڕاوەستان و هەروەها قۆڵی ڕاست و چەپیش تۆپیان ڕەگەڵ خستن. بەڵام بەر لە بزووتن قارەمان‌بەگی سەردەستەیەکی لقی حەوتی ئەفشاری ورمێ بێ‌ئیزن لەگەڵ سەربازانی خۆی هەڵمەتیان برد و تورکمانیش لە شانی ڕاستەوە جمین. تاقمێکیش لە یۆسە دەرپەڕین و هێرشیان هێنا. لەو جەنگەدا سەربازانی فەراهانی شکان و تێکشکانی ئەوان سەربازانی ئەفشاری پاشەکشە پێکرد. لەو تێکەولێکە و پرکێشانە سەربەخۆیەی قارەمان‌بەگدا، محەممەدحەسەن‌خانی سەرتیپی ناوبەدەرەوە دوای کوشتنی چوار کەسی تورکمان بە دیل گیرا و کوژرا. دوو سەردەستەی ئەفشار و بیست سەربازیش کەوتنە شوێن‌پێی محەممەدحەسەن‌خان. لەم کاتەدا یۆسف‌خانی سەرتیپی لقەکانی سپای ئەفشار بە دیتنی ئەم بارەهەوایە لە سەرلق و سەردەستە و سەرپەلەکانی ئەفشاری ڕاخوڕی و نەڕاندی و ئیزنی شەڕی دان. چەکداران و پلەداران ئازایانە

تێراچوون و بە تۆزە هەڵسوورانێک تورکمانیان بردنەوەپاش. ئەوسا هەردک لا بەکۆمەڵ هێرشیان کرد و شەڕێکی بەسام قەوما. لەو ڕۆژەدا سەرکردەکانی سپای ئێران بەگشتی و جەعفەرقولی‌خانی نوسرەتولمولکی قاجار بەتایبەتی چالاکی و ئازایەتییان نواند و حیشمەتوددەولەش دنەی دان و ئافەریمی لێکردن. لای بانگی‌شێوان هەردک لا دەستیان لە تێکۆشان هەڵگرت و گەڕانەوە جێ‌حەسانەوەی خۆیان و چەند ڕۆژێک شەڕ ڕاوەستا.

وا هەڵکەوت کە ڕۆژێکی خودادادخانی سەرتیپ ئەسپ و بارگین و ماین و یەستری بردبوونە لەوەڕ و لقێک سەربازی ئەردەوێل و مشکین‌شار و لقێکی عەرەب و عەجەم و دوو تۆپێشی وێڕابوون. لەپڕێ سوارانی تورکمان لێیان دەرپەڕین و بە سەریانداداان و خودادادخان و هاوڕێیانیان بەزاند و دوو تۆپەکەشیان لێگرتن. دەوری پەنجاشێست کەس و بگرە پتریش سەرباز و تۆپچی وەبەر لەپەشێری تورکمانان کەوتن و تێداچوون. بە قەومانی ئەم ڕووداوە قۆشەنچی شلەژان و ترسان و هەروەها کەمبوونی ئازووخەش لە هۆردوودا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری خۆ نواند. چەند جارێک حیشمەتوددەولە ڕووی دەکردە سەرکردەکانی سپا و دەیگوت کێ دەتوانێ بچێتە قەڵای مەرو و پێداویستی و خورد و خۆراک بێنێ؟! هەموویان خۆیان لەم ئەرکە لادەدا. سەرەنجام یۆسف‌خانی سەرتیپی ئەفشار بە دوو دەزگا تۆپ و دوو لقی بەرکێفی خۆیەوە ئەم خزمەتەی قبووڵ کرد. سەرکردەی ئەفشار لە ماوەی دوو شەو و ڕۆژدا ئازووخەش لە هۆردوودا و تفاق و پێداویستییەکی زۆری لە قەڵاتی مەرووەوە ڕاگواست بۆ نێو هۆردوو و ئافەریمی لێکرا و لە هاوشانەکانی تێپەڕی. بەم قەرارە هەموو ڕۆژێ یەکێک لە سەردارانی سپا بە تۆپ و سەربازەوە دەڕۆیی و تفاق و ئالیکی دێنا بۆ وەڵسات و یەکسەمی قۆشەن و سەر لە تاریکان دەگەڕایەوە. بەڵام هەموو ڕۆژێک بێ‌نێوبڕ دوو سێ کەس لە سەربازانی هۆردووی ئێران بە چنگ تورکمانان بەخسیر دەکران. سەرەنجام حیشمەتوددەولە وای

بڕیار دا کە نیوەشەوێک هۆردوو بەرێتە نێو قەڵای مەرو و چۆنیەتی بارودۆخەکە بە مەزنەپیاوانی دەوڵەت ڕابگەیەنێ و داوای یارمەتی بکا. هەموو لایەک لەسەر ئەم تەمایە ڕێککەوتن و شەوی ١٧ی ڕەبیعی یەکەم لای بەیانی جاڕی کۆچیان کشا و بەرەو قەڵا بزووتن. قەوامودەولە وێڕای دوو لقی سمنان و دامغان و لقێکی فەراهان وەپێش کەوت و قۆرخانە کە بڕی هەشتسەد بار بوو درایە دەست لقی ئەردەوێل و مشکینشار. خودی حیشمەتودەولە لەگەڵ دوو لقی ئەفشاری ژێرکێفی یۆسفخان و لقی ئەرشیز و مەراغە کەوتەڕێ. بەڵام هەر کە هێزەکانی ئێران باریان لێنا و لە سەنگەرەکانی خۆیان ترازان، سوارانی تورکمان بە سەریان دادان و لەڕێوە ئاگری شەڕ و لێکدان هەڵگیرسا.

## گەردەلوولی شەڕ و بەزینی حیشمەتوددەولە و ئەسیرکرانی یۆسفخانی سەرتیپ بە چنگ تورکمانان

لەم بوومەلێڵی بەیانەوە هەتاکوو ناوهەلات شەڕێکی قورس قەوما. ئەگەرچی یۆسفخانی سەرتیپی ئەفشار و قاسمخانی سەرتیپ پێکەوە وێڕای هێزەکانیان پیاوانە خۆیان ڕاگرت و گەلێکیان چاونەترسی و ئازایەتی نواند، بەلام سەربازەکان فیشەکیان لێبڕا. پەیتاپەیتا ڕایانئەسپارد و داوای تەقەمەنییان کرد، کەچی لە ترسی گیان کەس نەیوێرا بۆیان بەرێ. سەرەنجام وەختایەک سەبارەت بە گەیشتنی تەقەمەنی و یارمەتی ناهومێد بوون و تورکمانەکان پەساپەسا هەڵیانوێژنین و زاڵتر بوون، قاسمخان لەگەڵ چەکدارەکانی بە سووکایەتی هەلات و بۆی دەرباز بوو، بەلام یۆسفخان ڕاکردنی بە شەرمەزاری و پەڵەی سەر شانی دەزانی و چەشنی سەددی ئەسکەندەر خۆڕاگر و پتەو شەڕی پیاوانەی دەکرد و ئاخرییەکەی تورکمان دەورەیان گرت و لەگەڵ پۆلێک لە پیاوەکانی گرتیان. پاشماوەی چەکدارەکانی ڕەوین و لە نیزیک گوێگتەپە سەنگەریان دابەست و ڕاوەستان. لەو مەتەریزانەدا جەعفەرقولیخانی نووسرەتولمولک و حاجی عەسکەرئاغای ئەفشاری برای فەزانئاغای سەرلقی تۆپخانە کوژران.

پەرویزخانی چەرداوەڕوو سەرەڕای ئەوەی کە دەمی بە شمشێر برینی تێببوو، دیسانیش هەر شەڕی دەکرد. لەو گەردەلوولی تێکهەڵچوونەدا زریانی دەست لێکبەردانی سپای ئێران هەڵیکردێ و حیشمەتوددەولە و قەواموددەولە وێڕای پۆلێک چەکدار لە کاتەژمێرێکا مەودای چوار فرسەخیان بڕی و خۆیان گەیاندموە قەلای مەرو. لەوێوەش بەرمو شوێنی نیشتەجێبوونی تایفەی

سارووق جمین و لەگەڵ سوارانی «هەزارە» ڕۆیشتن و لـەشکریان بـێخـاوەن و خێو و سەردار بەرەڵلا کرد. کاتێک سپا گەیشتە قەڵای «پۆلئووتن» بوونـە دوو قـــۆڵ. دەســـتەیەک بـــە لێـــواری ڕووبـــاردا تێپـــەڕین و دەســـتەکیش ڕێگـــای «نەورۆزئاوا» و «کووچەی قوم»یان گرتەبەر، بـەڵام دووسـێهـەزار کـەس لـە توونیان خنکان و تێداچوون و دووسێهەزاریش بە دەرد و مـەرەدی بـێئـاوی و توونیایەتییەوە ژاکان و سەرەنجام گەیشتنە سەر ڕووبار و دووسێ هەزارێکیش بە دیل گیران. لەو لاوە هەزار کەسێک لە شوێنی نیـشتەجێبـوونی سـارووقان گەیشتنە باڵ قۆشەنی تێکشکاو. دوای شەو و ڕۆژێک شەڕ لەگەڵ تایفەی سارووق قەوما و دیسان شکانی لێکەوتەوە. حیشمەتوددەولە و قەواموددەولە ئـەژنۆیان لـەرزی و خۆیـان بـۆ ڕانـەگیرا و چوونـە خـاکی پـیرۆز. لـەو ڕەوینـەدا عەبدولعەلیخانی موقەددەمی سەرتیپی تۆپخانە کە بـۆ ڕەشـیدی و جـوامێری بەناوبانگ بوو بە دیل گیرا. جەعفەرخانی ئەفشاری فەرمانـدەی لقـی هەشـتی ورمێ باسکی برینێکی قووڵی هێنا و هەڵکلا. ئەبولقاسمئاغـای نـەوەی، خـۆی گەیاندە سەری و تەماشای کرد کە [لە حەوت سـاڵان ڕاسـت بۆتـەوە] و گیـانی داوەتە دەست گیانپەروەرێنی. نەقیبەگی کۆهەکلووی ئەفشاری سەردەستەی لقی هەشتیش گیرا و هەر خوداش دەزانێ چەند کەسی دیکە بەخسیر کراون.

# یۆسفخانی سەرتیپی ئەفشاری ورمێ لە زیندانی تورکمانان‌دا

دوای گیرانی یۆسفخان وەختایەکی تورکمان بۆیان دەرکەوت کە یەکێکە لە سەرۆکانی عێلی ئەفشاری ورمێ و ئێستا لە سەردارانی سپای ئێرانە زۆر چاکیان دەورە تەنی و وەها کەوتنە پاراستنی کە هەر باسی ناکرێ. لە نێو خۆیان‌دا لێیان بوو بە کێشە و دەمەقرە کە بە چنگ کامەیانەوە بێ و سەرەنجام حەکیم تووپاڵ و قووشیدخان کە لە نێو تورکمانان‌دا بە لەشکرزۆری و دەوڵەمەندی دەناسران بە سەر هەموو لایەکدا زاڵ بوون. پاشان یۆسفخانی سەرتیپی ئەفشار و جەوادبەگی هاورکێڤی برانە نێو چادر و چیغی ئەوان و چۆنی پێویستە ئاوایان چاوەدێری کردن کە دەرباز نەبن. زۆربەی ئەم رووداوە لە زمان خودی عەلیمحەممەدی وەکیلی لقی حەوتی ئەفشارەوە گێڕراوەتەوە کە خزمەتکاری تایبەتی یۆسفخان بووە و لەگەڵ جەوادبەگ پێکەوە گیرابوون. ناوبراو هەتا ڕزگاربوونی سەرتیپ لە بەند و داوی تورکمانان لە مەرو بووە و وەکوو پزیشک هاتوچۆی نێو خاوخێزانی تورکمانانی کردەوە و ڕێی لێ‌نەگیراوە. پاشاسوڵتانی دەمڕاستی کاروباری ملکوماشی سەرتیپ لەم ماوەیەدا لە خاکی پیرۆز چاوەدێری ماڵ و بارگە و بنەی سەرتیپ بوو. جاروبارە بەپێی پێویست و لەسەر داوای ئاغا و سایەچەوری خۆی دەچوو بۆ خزمەتی و لە نێو تورکمانانی مەرودا چاوی پێی‌دەکەوت و دەگەڕایەوە. ماوەی گیرانی یۆسفخانی ئەفشار بە چنگ تورکمانان بە دوو ساڵ زیاتری قسە لێدەکرێ و هەر خوداش دەزانێ وایە یان نا. پاش ئەوەی کە ماوەیەک بە سەر ئەم رووداوە تێپەڕی، یۆسفخانی ئەفشار لای خۆی بیری کردەوە کە ئەوەندەی بۆی دەکرێ

خۆی هەڵکا لە کرینەوە و ڕزگار کردنی ئەسیرەکانی سپای ئێران نەخاسمە سەربازانی ئەفشار و بەم کار و هەنگاوەی ناوبانگی باش لە ڕۆژگاردا بەجێبێڵێ. بۆیە ئەم ویست و ئامانجەی خۆی بە تورکمانان ڕاگەیاند و ئەوانیش بە بیستنی ئەم هەواڵەی کە بەڕاستی ئاواتەخوازی بوون کەیفیان گەلێکی گوڵ کرد و هەرکامەیان وردەوردە یەخسیری خۆیان دێنا و بە نرخێکی زۆر پێیان دەفرۆشت. پاشان بەپێی بەڵگە و پسوولە لە خاکی پیرۆزی [مەشەد] دراوەکەیان لە سوڵتانپاشای دەمڕاستی وەردەگرت.

هەر لەم سەروبەندەدا نەقیبەگی ئەفشاری کۆهەکلووی سەردەستەی لقی حەوت کە بە دیل گیرابوو، ئەسپێکی تورکمانی وەگیر هێنا و بەدزی پێی‌نایە ڕکێف و بە نێو تورکمانانەدا ڕۆیی و ڕووی کردە تارانی پایتەخت. کاتێک ناسرەددینشای قاجار ئەم چوست و چالاکییەی نەقیبەگی بیستەوە ئافەریمی لێکرد و مواجبی پێهەڵابرد و ئیزنی گەڕانەوەی درا بۆ مەوتەنی خۆی. جا با ئێستا یۆسفخان لە زیندانا بەجێبێڵین و بگەڕێینەوە سەر ڕووداوەکانی ورمێ.

## دەی بەڵام با بزانین لە ورمێ چ ڕادەبرێ؟!
## کۆچیدوایی نەجەفقولیخانی بەگەربەگ

ئەکبەرمیرزای کوڕی قارەمانمیرزا هەروا لەسەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ پاڵی داوەتەوە. یەکێک لە ڕووداوەکانی ئەم چاخە سەبارەتە بە نەجەفقولیخانی بەگەربەگی کوڕی خوداڵێخۆشبوو حوسێنقولیخان. لەم ڕۆژگارەدا نەجەفقولیخان خانەنشین کرابوو و بەوپەڕی ڕێزەوە دەژیا و وای لێهات کە پیری پەکی خست و هێز و بڕستی لێبڕا و بەرەبەرە توایەوە و نیشانەی مەرگ سەری لە سوێگەی ژیانی نا. دوای ماوەیەک تەواو لە پێ پەڕی و بە جێوبان بۆی کەوت و سەرەنجام ڕۆژی پێنجشەممۆ ٢٠ی مانگی جیمادی دووەم پاش وەسێت کردن بەرەو باغی بەهەشت باڵی گرت. تەرمی ئەو خوابەخشیوە لە گۆڕستانی خان نێژرا کە دواتر لەسەر وەسێتی خۆی ڕاگوێزرێ بۆ خاکی بەر دەرانەی بەرزی ئیمامان. موفتی شاعیری ورمێیی ئاوای ڕێکەوتی کۆچیدوایی خان هۆنیوەتەوە:

سرووش هات و لە ناکاو هەڵیخوێند بە گوێی هۆشا
بەگەربەگ کۆچی لێنا و ڕۆیی بۆ بەهەشتەلان[1]

شوێنەواری خێر و چاکەی کە لە دوای ئەو خوابەخشیوە بەجێماوە بریتییە لە نۆژەن کردنەوەی میحرابی مزگەوتی گەورەی ورمێ و هەڵاوەسینی چلچرا و زێڕتێکرتنی پۆپەی گومبەز و دانانی مینبەر. ئەو خوداڵێخۆشبووە پتر لە حەفتا ساڵی تەمەن بە خۆشی و کامەرانی تێپەڕ کرد.

---

[1] - «بیگلربیگی بمنـزل جنت مقام کرد» دەبێتە ١٢٩١ و دروستیش نیە.

## حوکمڕانێتی نەسروڵلامیرزای کوڕی حاجی محەممەدوەلیمیرزا

لە ماوەی تێپەڕبوونی شەش ساڵ بە سەر حوکماتی شازادە ئەکبەرمیرزای کوڕی قارەمانمیرزادا لە ورمێ، ئیمامقولیخانی سەرتیپی ئەفشار ناسراو بە بیووکخان باڵی بۆ ڕاخستبوو و ئەویش بە داد و هاواری جەماوەری ئەفشار ڕادەگەیشت. بەڵام ڕۆژێکی بەپێچەوانەی ئەدەب جووڵایەوە و لە کۆڕی مەیخواردنەوە و قوماركردندا بە ناحەزی لەگەڵ خوابەخشیو مەلیکمەنسوورمیرزا تێکەوت، کە ئەویش بە فیتی حاجی ڕەجەبعەلیخانی سەرتیپی تۆپخانە و ئەسەدوڵلاخانی وەزیر بوو. مەلیکمەنسوورمیرزا سکاڵای بردە بەر دیواندارانی مەزن و ئەوانیش خێرایەکی لەسەر دەسەڵاتیان لابرد. نەسروڵلامیرزای کوڕی حاجی محەممەدوەلیمیرزا لە جێی داندرا و بوو بە حوکمڕانی ورمێ. ئەو پایەبەرزە بێجگە لە پوختەیی و زانایی پیاوێکی وریا و کارزان بوو، بەڵام لەگەڵ تۆرەمەی ئەفشاران نەدەسازا و لێیان بە گومان بوو. زۆری سووکایەتی بە سەر کوڕەکانی نەجەفقولیخانی بەگلەربەگ هێنا و تۆماتی خراپی پێوەبەستن و تاوانی بەدرۆی لەسەر سوور کردنەوە. لە ڕاستیدا ئەم حاکمە هێندەی دەسەڵاتی ورمێ بە دڵەوە نەدەنووسا و دوای ماوەیەک بیانوویەکی دیتەوە و ڕۆیی بۆ تەورێز و دەستی لە کاری حوکماتی ورمێ کێشایەوە. دوای ئەو لەسەر داوای ئیمامقولیخانی سەرتیپی ئەفشار پلەی حوکمداری درایە ئەسەدوڵلاخانی قاجار کە پێشتر پێشکار بوو. لەم دەورانەدا حاجی محەممەدوەلیخانی ئەفشاری قاسملوو کوڕی حوسێنقولیخانی بەگلەربەگ کە لە نێو براکانیدا بە پیاوێکی زیرەک و ئاقڵمەند دادەندرا و هیچیان تایان نەدەکرد و ماوەیەکی درێژ گەلێک پلە و پایەی گرینگی حکوومەتی لەسەر شانی بوو، ماڵاوایی خواست لە دنیای ڕووخەک و نەمێن. کوڕەکانی بریتین لە: ١- محەممەدزەمانخان. ٢- محەممەدباقرخان. ٣- محەممەدسادقخان. ٤- حاجی ڕەحیمخان. ٥- ئەحمەدعەلیخان. ٦- مەنووچێهرخان. ٧- موحیبعەلیخان.

## درانی جڵەوی دەسەڵاتی ورمێ بە مەلیکمەنسوورمیرزای کوڕی فەتحعەلیشای قاجار

لە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی/١٨٦٢ ـ ١٨٦٣ی زایینیدا مەلیکمەنسوورمیرزا کە برای دایک و بابی مەلیکقاسممیرزایە و هەردووکیان لە داوێنی کچی ئیمامقولیخانی بەگلەربەگی ئەفشار بەربوونەوە، ڕۆنیشتە سەر تەختی دەسەڵاتی ورمێ. شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا لای ناسرەدینشا زۆر خۆشەویستە و لێینیزیکە و گەلێک بە شوێنیدا دەنێرێ و یەکێکە لە هاوڕکێفانی. لەم ساڵەدا وەکوو هەمیشە دیسان لە ڕکێف و خزمەتیدا خۆی دەنواند و چونکە زمانی دەگیرا شا بە قسەکانی کەیفی دەبزووت. ڕۆژێک لە هەوێڵ پاشادا هێندێک باسی کەش و هەوا و گەشت و سەیران و دڵبزوێنی مەڵبەندی ورمێ هاتەگۆڕ. شازادەی بەرزمجێ بەوپەڕی پێداگری داوای حوکمانی وێندەرێی کرد و بێ یەکوبوو باربووی کرا و حوکمی بۆ لێدرا. شازادەی پایەبەرز بە خەڵاتی تایبەت بەسەرکرایەوە و لە خزمەت فەرمانڕەوا ئیزنی خواست و بەهەشتاو رووی کردە تەورێزی ناوەندی دەسەڵاتی[ئازەربایجان] و ئیمزای فەرمانی وەرگرت و دوو کاغەزی سەبارەت بە هەواڵی چوونی خۆی نووسین بۆ جانگیرخانی بەگلەربەگ و ئیمامقولیخانی سەرتیپی ئەفشار و ناردنی و پاشان پێینایە ئاوزەنگی و ڕۆیی و گەیشتە گوندی «بەدەلبوو»ی ملکی ئیمامقولیخانی سەرتیپ. دوای شەوێک مانەوە و میوانداری کران، بۆ سبەینێ ڕۆیی و گەیشتە بنکەی دەسەڵاتی و کۆڕی دیداری گشتی لە تەلاری کلاوفەرەنگی بەجێماوی

خوابەخشیو مەلیک‌قاسم‌میرزا پێکهێنا. بۆ ڕۆژی دوایی جانگیرخانی بەگەربەگی بە بریکار دانا و وا بڕیار درا کە عەلی‌نەقی‌خانی سەرتیپ و شازادە پێکـەوە لـە دیوانی حکوومەت دابنیشن و زۆر ورد بە داد و سکاڵای جەماوەر ڕابگەن. پاشـان کاروباری دەسەڵاتی بەپێی لێوەشاوەیی بە سەر سەرۆکان و مەزنانی ئەفـشاردا دابەش فەرموو. ئەوەی سەبارەت بوو بە کاروباری لەشکری خرابوویە ئەسـتۆی ئیمام‌قولی‌خانی سـەرتیپی ئەفـشار. لێـرەدا دەگەڕێینـەوە سـەر حـاڵوباڵـی یۆسف‌خان کە لە بەند و داوی تورکمانان‌دا مابۆوە.

# ئازادبوونی یۆسفخانی سەرتیپی ئەفشار

# لە زیندانی تورکمانان

پاش ئەوەی کە دوو ساڵ پتر بە سەر گیرانی سەرتیپی پایەبەرزدا تێپەڕی، خودا وای هێنا کە بە دانی حەڤدەهەزار تمەن دەرباز بێ. قووشیدخان کە لەسەر گیرانی سەرتیپ لەگەڵ حەکیم تووپاڵ کێشەی شەریکایەتی هەبوو، بەم بڕە پوولە ڕازی نەبوو. ئەو دوو کەسە هەرایان لە نێوانیدا قەوما و شەڕەچەقەیان لێپەیدا بوو. سەرەنجام یۆسفخانی سەرتیپ بەدزی پوولەکەی دا بە حەکیم تووپاڵ و جەوادبەگی ئەفشاری بابنۆکەری بە بارمتە لەوێ بەجێهێشت و خۆی نیوەشەوێک بێچرپە لە نێو تورکمانان دەرکەوت و باڵی گرت و تیژبەزی و هێندەی پێنەچوو کە خۆی گەیاندە خاکی پیرۆز. پاشاسوڵتان و تێکڕای نۆکەران و غولامانی کە لەوێ ئاگادار و پارێزەری ماڵ و سامانی سەرتیپ بوون گەشانەوە و شوکرانەیان بژارد. بەڵام لەو لاوە قووشیدخان پاش دەرچوونی سەرتیپ زۆر چاک جەوادبەگی دەپاراست و لێیسوور بوو کە ئەویش بە نرخێکی گران دەکڕنەوە و دەیبەنەوە و لەوێی بەجێناهێڵن. یۆسفخان چەند ڕۆژ لە خاکی پیرۆزی [مەشەد] بۆ زیارەت مایەوە و پاشان ڕووی کردە تارانی پایتەخت. پاش ئەوەی گەیشتە تاران و سەردانی ئامپا و هاوشانەکانی کرد، بە هاوکاری مەزنەپیاوانی دەوڵەت توانی بچێتە خزمەت ناسرەددینشا. سەرتیپ لە شەڕ و لێکدان و ڕووداوەکانی مەرودا پیاوانە زۆر خزمەتی شایانی ڕاپەڕاندبوون. پاش بە دیل گیرانی بە جەنگ تورکمانان لەگەڵ چارەنووس هێنابووی و دوو ساڵ لە نێو هۆبە و چاردانی خەنیماندا ژیابوو. گەلێکی تاڵی و سوێری کێشابوو و بۆ ڕزگاری دیلانی ئێران هەنگاوی درەوشاوەی هاویشتبوون، جا بۆیە پاشای

خاوەنشکۆ بە سیلەچاوی میرانە خوێندییەوە و کردی بە سەرتیپ یەکەم و مووچەی بۆ زیاد کرد و لە نێو هاوشانەکانیدا کەوڵی شانەبەرزەی خستە سەر شانی. جا بەڕاستی سەرتیپ هەر چۆنێکی کە بە سەرکراباوە لێیدەوەشاوە و هەقی خۆی بوو.

بەکورتی چونکە دوای ماوەیەک گەورەپیاوانی دەسەڵات نەیانهەویست لەشکر بنێرنە سەر ئەستەراباد، ئیزنیان فەرموو کە یۆسفخانی سەرتیپی ئەفشار لە بارگاوە بگەڕێتەوە مەوتەنی و دوای ڕێکخستنی هێزەکانی بەر فەرمانی بگەڕێتەوە تاران. لەسەر ئەم قەرارە سەرتیپ ڕووی کردەوە ورمێ و چاوی ئیمامقولیخانی سەرتیپ و خزم و کەسانی خۆی بە دیداری ڕوون بوونەوە.

هەر لەم کاتەدا جەوادبەگی ئەفشار کە وەکوو بارمتە لە نێو تورکمانان مابۆوە بە نرخێکی گران کڕدرایەوە و ئازاد کرا.

هەروەک پێشتر باسی کرا لەبەر وەی سەفەری ئەستەراباد لە بەردا بوو، یۆسفخان بە مەبەستی ڕێکخستن و ساز و پەرداخ کردنی لقەکانی هەڵدەسووڕا و دەمێک نەدەحەجمی. لەم سەروبەندەدا عەلیئاغای سەردارعێلی شکاک کە چەند جارێک بانگکرابوویە تاران و لەوێ بەپێی فەرمان خرابوویە بەندیخانە و بە تکای یۆسفخان بەردرابوو و پاش گەڕانەوەی بیۆوە سەرخێڵ، سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە سەربادان و کەڵەوەکێشی. کاتێک چۆنیەتی مەبەستەکە بە بارەگای میری ڕاگەیەندرا، بەگوێرەی فەرمان سەرتیپی یەکەم یۆسفخان وێڕای هێزەکانی ئەفشار ڕاسپێردرا بۆ دەمکوت و لێدان و گرتنی عەلیئاغا. ئەو پرکێش و گوێنەبیستەی شکاک لەگەڵ جەماوەری خۆی هەڵمەتی بردبوویە سەر «جێنیزە» و هەرای نابوویەوە. یۆسفخانی سەرتیپ لەگەڵ سەربازانی ئەفشار بەرەوڕووی بۆوە و گرتی و هێنایە ورمێ و چەند ڕۆژێک زیندانی کرا. دوای چەند ڕۆژێک دیسان بە کەیخودایەتی و نێوبژیوانی سەرتیپی یەکەم، شازادە

مەلیکمەنسوورمیرزای حوکمرانی ئەفشار، دیواندارانی مەزنی دڵنیا کردەوە و بەڵگەی دانێ کە عێلەکەی سەر وەبەر دەوڵەت دێنێ و هەرچی پیناکی لە پێیدایە دەیدا و دووبارە بۆوە سەرخێڵ و گەڕایەوە سۆما و برانۆست. بەڵام چونکە لەگەڵ میرزائاغای برای لەسەر لابران و سەرعێلایەتی قڕەیەکیان لە مابەینیدا بوو، دوای چوونەوەی عەلیئاغا لەناکاو میرزائاغای برای بە سەر ماڵی دادا و تاڵانی کرد! لەم بگرە و بەردەیەدا عەلیئاغا بە فیشەک ئەنگوا و بە ڕاکردن خۆی گەیاندە ورمێ و چۆنیەتی ڕووداوەکەی بە خزمەت مەلیکمەنسوورمیرزا ڕاگەیاند. دیسانیش هێزێک نێردرایە سەر کوردستان و میرزائاغایان گرت و هێنایانە ورمێ و بەپێی حوکمی حاکم فەلاقەیان کرد و بە شووڵان تەزاندیان و ریشی درێژیان تاشی! «عەلی قاسوو»ی شەڕفرۆش یەکێک لە دەستوپێوەندەکانی عەلیئاغا کە تەنانەت خۆشی لێیدەترسا!! لە مەیدانی تۆپخانە بە دارێکی ئەستوورەوە هەڵیانواسی و وەکوو مەڕ لە نێوگەڵانیڕا هەڵیانقڵیشاند و کردیانە دوو کوت و بە خراپترین شێوە کوشتیان. پاش ئەم کارانە ناوچەکان هێور بوونەوە و تەناهی باڵی بە سەر کێشان.

دوای ئەوەی یۆسفخان توانی لقی حەوت و هەشتی ئەفشار ساز و ئامادە بکا، بەپێی فەرمانی گەڕانەوە، ئیمامقولیخانی سەرتیپ دووەمی برای لە ورمێ بەجێهێشت و ئەردەشێرخانی کوڕی کە شەیتانی پێکەنیبوو وێڕای خۆی بردی و ڕۆیی بۆ خزمەت پاشا. لەم کاتەدا میرزا عەلیخانی کوڕی میرزا مستەفاخانی بەهائولمولکی ئۆستاجلوو فەرماندەی لقی لقی تازەی ئەفشار بوو. لقی هەشت محەممەدحەسەنبەگی کۆهەکلوو سەرکردایەتی دەکردە و لقی حەوت کەسێکی تایبەتی بۆ دیاری نەکرابوو. بەکورتی یۆسفخان گەیشتە تاران و دوای لە سانددرانی سەربازان، هێزەکانی وەبەردڵی گەورەپیاوانی دەوڵەت کەوتن و خانی ئەفشار وێڕای چەکدارانی خۆی و هێزەکانی دیکە بەرەو ئەستەراباد کەوتنەڕێ هەتا شەڕ و کێشەی لەمێژینەی ئاژاوەگێرانی تورکمانی ئەو مەڵبەندە کۆتایی

پێبێنن و هێمنی و تەناهی باڵی بنگێوێ و خەڵک ئاسوودە بێ. دوای ڕاپەڕاندنی ئەرک و خزمەتی ئەستەراباد و گەڕانەوە تاران، لەسەر داوای بـاوکی نـاوداری سەرکردایەتی لقی حەوت باربووی ئەردەشێرخانی کوڕی کرا. جا لەبەروەی کـە بەپێی فەرمان دەبوو یۆسفخان لە تاران بمێنێتـەوە، ئەردەشـێرخانی کـوڕی لەگەڵ دوو لقی حەوت و هەشت بەڕێکردەوە ورمێ. هەر لەم سەفەرەدا بـوو کـە محەممەدحەسەنبەگی کۆهەکلووی ئەفشاری فەرماندەی لقی هەشت چـۆوە بـەر دلۆڤانی خودا.

## نارەزامەندی هێزەکانی مەراغە لە ئاغاخانی میرپێنجی سەرکردەیان و بەخشرانی ئەم سەرکردایەتییە بە یۆسفخانی سەرتیپ یەکەم

ئەوەی راستی بێ وەختایەکی کە یۆسفخان لە سەفەری ئەستەراباد گەڕابۆوە و لە تاران لەنگەری خستبوو، هەرای نارەزامەندی و دەنگەدەنگی دوو لقی موزەففەر و تازەی مەراغە رەنگی دایەوە و وردەوردە گوێی گەورەپیاوانی دەولەتی پێزرینگایەوە. وا دیارە کە سەربازانی ئەو دوو لکە لەبەر هەلسوکەوتی نالەبار و دەسدرێژییەکانی ئاغاخانی میرپێنج هاواریان دەهات و بەرەبەرە هەوێنی دژایەتی خۆی گرت و تووڕەیی گەیشتە رادەیەک کە رۆژێکیان هەموو پێکەوە چوونە مالی میرپێنج و بەبداخیان دەرکێشا و بە بلمەبلم و ئاپۆرابەستن لە چەرگەقەلادا مانیان گرت. وەک دەلێن جلەوکێشی ئەم دوو لکە دەمراستێکی ئازا و زمانپاراو بوو کە بە کۆمەلێک بەلگە زۆرملییەکانی ئاغاخانی سوور دەکردنەوە. میرپێنج زۆری سەر سوڕما و بە چەند راسپاردەیەکی خۆش و نەرم و نیان ئامۆژگاری کردن و گوتی دەست هەلگرن لەو هەرا و گرووگرتنە، بەلام هیچ فایدەی نەبوو. سەرەنجام مەبەستەکە بە گوێی ناسرەددینشا یشتەوە و تووڕەی کرد و [فەرمووی] دەبێ هەلیاندرێن. بەلام چونکە کوشتن و تێدابردنی دووهەزار مرۆڤ کارێکی نارەوا بوو، هەروەها دوای لێکۆلینەوە زولم و زۆرەملی میرپێنج سوورکرانەوە، وا داندرا کە ئەو دوو لقە هەرکام لە ئەفسەرەکان بۆ سەرکردایەتی هەلبژێرن خۆیان سەرپشکن. ئەوانیش لە نێو تەواوی هاوشان و هاوتاکاندا یۆسفخانی ئەفشاریان بۆ سەرکردایەتی خۆیان داوا کرد. لەسەر داوای ئەوان میرزا محەممەدخانی سپاسالار، یۆسفخانی

ئەفشاری نارده نێو مەکۆی ئەو دوو لقە. کاتێک بەرێزیان گەیشتە بەردەرگای جەرگەقەلا بەپیرییەوە چوون و بەخێریان هێنا و کەوتنە سپاس و شوکرانەبژێری. یۆسفخانی ئەفشار بڕی سەد تمەنی باربووی سەردەستە و سەرپەلەکانیان کرد و هەمووی بە چاکەی میرانە هیوادار کردن و متمانەی پێبەخشین. ئەوسا بە ئالاوە لە جەرگەقەلا دەرکەوتن و بردیانە مالی یۆسفخان. ئەم خزمەتەی بەرێزیان خرایە سەر خزمەتەکانی پێشووی و لەبەر چاوی کاربەدەستانی گەورەی حکوومەت جوانی ڕەنگ دایەوە و کەوتە بەردلان و لە ماکەی دەسەلاتەوە نازناوی «شوجاعوددەولە»ی بۆ نووسرا. لەم سەردەمەدا شازادە حاجی حیسامو سسەلتەنەی سولتان‌مرادمیرزا کوڕی جێگرمەی‌میر کە حوکمڕانی هەرێمی فارس بوو، بە مەبەستی پاراستنی قەلەمڕەوی داوای هێزێکی کردبوو لە بارەگای پاشا. گەورەپیاوانی دەسەلات وایان بە باش زانی دوو لقی مەراغە بە سەرکردایەتی ئیمامقولیخانی سەرتیپ، برای یۆسفخانی شوجاعوددەولە کە لە ورمێ بوو بانگ بکرێ و بنێررێنە فارس. پاش ئەوەی لە ماوەیەکی کورتا فەرمانی چوونی گەیشتە دەستی، سەرتیپ ئەردەشێرخانی سەرلکی برازای خۆی لەگەل حاجی میرزا موحسینی ئاشتیانی سەرحیسێبی لەشکری کردنە جێنشین و خۆی بەپەلە ڕووی کردە پایتەخت. لەوێوە نێردرایە فارس بۆ ژێرڕکێفی حاجی حیسامو سسەلتەنە و پتر لە دوو سال خزمەتێکی زۆری کرد و زەحمەت و کوێرەوەری کێشا. لەم ماوەیەدا چەندین جار نامەی ڕەزامەندی و دلخۆشی حیسامو سسەلتەنە سەبارەت بە سەرتیپ دەگەیشتە دەستی مەزنەپیاوانی دەولەت.

## لادرانی مەلیکمەنسوورمیرزا لەسەر حوکماتی ورمێ و ڕاگوێزرانی دەسەلات بۆ ئەحمەدمیرزا موعینوددەولە و کێشەکانی لەگەڵ شوجاعوددەولە

ساڵی ١٢٣٨ی کۆچی/ ١٨٦٦ ـ ١٨٦٧ی زایینی، چونکە لە ڕاستیدا شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا سەرەڕای چێژتنی تامی خزمەت ڕکێفی پاکی پادشای پیرۆز، ببوو بە جێڕاز و هاودەمی دەربار، دووری خزمەت فەرمانڕەوای بە ئەشکەنجەیەکی بەئێش و ژان دەزانی و لایەکی وای لە کاروبارەکان نەدەکردەوە. کەمتەرخەمی و بێمەبالاتی بەرێزیان لە ماوەی دوو ساڵدا شیرازەی کارەکانی لێکهەڵوەشاند و وەرگیرانی پیتاک بەجارێک چەتی تێکەوت و حکوومەت لەسەر تەوەرە و بستەی یاسا ترازا. وای لێهات کە بڕی سێهەزار تمەن باجی دیوانی بە هەڵپەسێراوی مایەوە و نەنێردرا. جڵەودارانی حکوومەتی ئازەربایجان گزیری بەدفەڕ و توند و تیژیان نارده سەری و هەڵیانپێچا. شازادەی بەڕزەجێ میرزا باقری کوڕی میرزا غولامڕەزای ئۆستاجلوو کە پێشکار و وەزیری بوو لەگەڵ خۆی بردی بۆ تەورێز هەتا لەوێ پێیان بڵێ کە من هەرگیز دەستم وەرنەداوەتە کاروباری وەرگیرانی پیتاک و هەمووی ئەم وەزیرە بردوویەتی و خواردوویەتی. لەگەڵ ئەمەشدا قسە و داد و هاواری شازادەیان نەسەلماند و زۆر توندیان لێکێشا و لە ڕادەیان بردەدەر. شازادەی هێژا سەیر سەری لە کاری خۆی سوڕما. لەم جەنگەیەدا شازادە بەختی چاکی هێنا چونکە کاروانی موبارەکی فەرمانڕەوایەتی بە مەبەستی زیارەتی خاکی پیرۆز دەبزووت و پێویست بوو مەلیکمەنسوورمیرزاش لە ڕکێفیدا بێ، بۆیە لە تارانەوە برووسکەیەکیان لێدا کە بچێ و ئەویش بەپەلە لە تەورێزەوە ڕووی کردە بارەگا. فەرمانڕەوای هێژا

ئەو سێ هەزار تمەنەی کە مابوو بە شازادەی گەورە مەلیک مەنسوورمیرزای مامی بەڕێزی بەخشی و ئەحمەدمیرزا مەعینودەولەیان ناردە ورمێ. کاتێک موعینودەولە گەیشتە تەورێز بەهەلکەوت یۆسف خانی شوجاعودەولەش لەوێ بوو. لەو سەردەمەدا بەڕێز عەزیزخانی موکری سەردار، پێشکاری ئازەربایجان بوو. موعینوددەولە چونکە لە دەوری یەکەمی حکوومەتی دا جەماوەری ئەفشار ویکرا بە یەکدەنگ و بەوپەڕی سووکایەتی لە ورمێ بە دەرکراوی ناردبوویانەوە تەورێز و ئەم کۆدەنگییەی بە فیتی شوجاعوددەولە دەزانی، تەواو بەڕێزیانی ناخۆش دەویست. کاتێک کە زانی عەزیزخانی سەردار لەبەروەی شوجاعوددەولە خزمی سپالارە و یەکێکە لە لایەنگرانی، بۆیە بەڕێزیانی خۆش ناوێ. پەنامەکی لەگەڵ سەرداری گشتی و میرزا قارەمانی ئەمین لەشکر کۆبۆوە و گوتی ئەرک و ڕێوشوێنی دەسەلات و حکوومەتی ئەفشارم بۆ دیاری بکەن. ئەوانیش پێیان گوت کە مەرجی سەربەخۆبوونی تۆ لە حکوومەتی ورمێدا بێ دەسەلاتی و دەم لە پووش کردنی شوجاعوددەولە و دەستوپێوەند و کەسەکانییەتی چ لە بواری گرینگی لەشکری و چ لە کاروباری ملک وماش و ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان دا. موعینودەولە بەم ڕێنموونییە نەهێنییەوە بە خاکی مەراغە و سابلاغ دا ڕۆیی بۆ ورمێ و شوجاعودەولە لە تەورێز مایەوە.

کاتێک موعینوددەولە گەیشتە ناوچەی دۆڵ بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و ئاگادار بوون سەبارەت بە کاروباری گرینگ و بەرچاوی حکوومەتی لەوێوە حاجی میرزا مەهدی مستەوفی سەرکاری شارەزای ورمێی بانگ کردە لای خۆی و کاکڵی مەبەستەکانی لێوەرگرت و بە زانیارییەکی تەواوە چوو بۆ شار و پاش ئەوەی گەیشتەجێ لە باغی سەردەری و باڵەخانەی کلاوفەرەنگی ڕۆنیشتە سەر تەختی دەسەلات. هەروەکوو باوە وەختایەک دابەزی مامۆستایانی ئایینی و پیاوماقووڵانی مەڵبەند و سەرکردەکانی قۆشەن بە شەوکەتێکی تەواو کۆبوونەوە و پوورەیان دا و چوونە بەخێرهێنان و سڵاوی و پاش بلاوبوونی

کوڕی جێژنی دیدار و پێشوازی هەر کەس چۆوە ماڵە خۆی. حاجی میرزا مەهدی مستەوفی پلەی سەرکاری و بەرپرسایەتی پیتاکی دیوانی درایە و خودی موعینوددەولەش هەمو ڕۆژێک بە کاروباری مەڵبەندەکە ڕادەگەیشت و کەس مافی ئەوەی نەبوو کە خۆ تێهەڵقوتێنێ و بە دزی و بە ئاشکرا شەش‌دانگی خەیاڵی لەسەر تێکدان و شێواندنی کارەکانی سەر بە شوجاعوددەولە بوو. لەبەروەی شوجاعوددەولە لە تەورێز بە چۆنیەتی هەڵوێستەکانی دەزانی، ئەردەشێرخانی سەرلق و حاجی میرزا موحسینی ئاگادار کردبوونەوە و ئەرکی خۆیانی تێگەیاندبوون. ئەوانیش بەپێی فەرمان هەموو ڕۆژێک لە ژووری سەرکردایەتی‌دا ئامادە دەبوون و بە کاروباری هێزەکانی مەڵبەند ڕادەگەیشتن و موعینودەولە لە دڵی گران دەهات و پێی‌ناخۆش بوو. ڕۆژێکی قاقەز و بەڵگەنامەیەکی عەزیزخانی سەرداری گشتی خستەڕوو کە دەریدەخست پاشابەگی کارگێڕی ملک‌وماش و گوندەکانی شوجاعەددەولە پیاوێکی غەیانە سەبارەت بە دەوڵەتی هەتاهەتایی و ئەو دزی و ڕێگری و کوشتارەی کە لە نێوان ڕێگای تەورێز و ناوچەکان‌دا ڕوویان داوە و دەقەومێن بە ڕێ‌خۆشکەری و فیتی ئەوە و لەبەرچاوی دیوانی باڵا تاوانبارە، بۆیە موعینوددەولە دەبێ بیگرێ و بە زنجیرپێچ بینێرێتە تەورێزی ناوەندی دەسەڵات. پاشابەگ بە بیستنی ئەم هەواڵە ماوەیەک بە پەرەوازەیی خۆی شاردەوە و حاجی میرزا موحسینیش لە ماڵەوە مووشی داگرت و دەرنەکەوت. بەڵام ئەردەشێرخانی سەرلق هەموو ڕۆژێک سەردانی ژووری سەرکردایەتی دەکرد و هێزەکانی لە سان دەدا و پێدادەهات و لە ڕاکردووان و ئامادەنەبووانی دەپرسییەوە و بە قەدرایە سەرەموویەک لە ڕێ‌وشوێنی شوجاعوددەولەی باوکی لای نەدەدا. شوجاعوددەولە بۆی ڕوون کردبوونەوە کە هەرچییەکی موعینوددەولە سەبارەت بە ئێوە دەیکا بە فیت و دنەی سەرداری گشتی و کاربەدەستانی بەرزی ئازەربایجانە، بۆیە هەتا بۆخۆم دەگەڕێمەوە نابێ وستە بکەن و دەبێ زۆر جوان

بجوولێنەوە. لەسەر ئەم پێوشوێنە ڕۆژێکی حاجی میرزا موحسین، ئەردەشێرخانی سەرلقی بردە لای ڕێزدار موعینوددەولە و بە تەگبیری زانایانە کۆتایی بە گلە و گازندەی نێوانیان هێنا. خوداوڕاستان لەم ڕۆژانەدا کە نێوەڕاست مانگی محەررەم بوو نەخۆشی چاوقولکە لە ورمێ بە بەرپانی سەری هەڵدا و بەرەبەرە پەرەی گرت و مەحموودمیرزای یەکێک لە کورانی موعینوددەولە تووشی هات و بە دوو ڕۆژان کوشتی. هەروەها هەموو ڕۆژێک جگە لە کەسانی ناوبەدەرەوە ژمارەیەکی دیکەش پێیدەچوون. شازادەی حوکمڕان وێڕای قەرمواشانی حەرەمی، ماڵی ڕاگواست بۆ باغی «عەشیرەتئاباد»ی برایمخەلیلخان و لەوێ بنەی دانا. ئەردەشێرخانی سەرلق بە کەسوکارەوە ڕۆیی بۆ ناوچەی بەناوبانگی «دەشتەبێل» و خاتوونی شوجاعوددەولە لە باغی کەمالئاباد مزڵی دانا. خەڵکی وڵاتەکە شەو و ڕۆژ سەرقاڵی تایەزداری و [لە خۆدان و چەمەری گێران بوون] بۆ حەزرەتی سالاری شەهیدان [ئیمامی حوسێن] سلاوی لێبێ و لەبەر خودا دەپاڕانەوە ئەم بەڵایە بڕەوێنێ و لە کۆڵیان بکاتەوە. هەر لەم ڕۆژانەدا شوجاعوددەولە گەیشتەوە ورمێ و دوای دیداری ڕاستەوخۆ لەگەڵ موعینوددەولە تەشریفی چوو بۆ باغی کەمالئاباد و دوای برانەوەی پەتاکە تەدارەکی زەماوەندی ئەردەشێرخانی سەرلقی کوڕی پێکهێنا.

## شەڕی نێوان بڵباس و قەرەپەپاغ و ڕاسپێردرانی شوجاعوددەولە بۆ چوونە لاجان

لەبەروەی هۆزی بڵباس هەمیشە شانیان داوەتە بەر تالان و کوشتاری خەڵکی ورمێ و مەراغە، [عەبباس‌میرزای] جێگرەوەی‌میر قەرەپەپاغی بردوون و لە [دەشتی] سندووس نیشتەجێی کردوون و بەڕاستی ئەوانیش وەکوو کێو لە بەرامبەریان‌دا چەقیون و تەواو پێکەوە دوژمنن. ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی/ ١٨٦٧ ـ ١٨٦٨ی زایینی، دەستەیەک قەرەپەپاغ لە [شاری] سابلاغ بە قەرەوڵ داندرابوون. شەوێکی هەمزاغای سەردارعێلی بڵباسان لەناکاو هەڵیکوتایە سەر ئەو باغەی کە قەرەپەپاغ بە مەستی لێی‌نوستبوون و سی‌ویەک کەسی لێ‌کوشتن. پاشان جلوبەرگی کوژراوەکانیان داماڵین و لە بەر خۆیان کردن و بەرەو قەڵای لاجان بزووتن هەتا ئێشکچییەکانی ئەوێش لە حەوشەی ژیان دەرپەڕێنن. باقرئاغای سەردەستە و مەهدی‌سوڵتانی تۆپچی هەرکام بە دەستەیەک سەرباز و تۆپخانەی ئاگربارەوە لەوێ خەریکی پاراستنی قەڵا بوون. کۆمەڵی بڵباس ویستیان لە قەڵا وەژوورکەون، بەڵام کاتێک دیتیان پارێزەران وریان و تۆپەکان دەمیان داپچڕیوە، خۆیان کلا کرد و چاوەڕوانی دەرفەت مانەوە. قەڵاداران بە کاغەزێک چۆنیەتی باروبۆخەکەیان لە شوجاعوددەولە ڕوون کردەوە و ئەویش بە دیوانداران مەزنی ڕاگەیاند. بۆیە فەرمانێک لە لایەن گەورەپیاوانی دەوڵەت دەرچوو بۆ بەڕێزیان کە هەڵکاتە سەر بڵباسان و بیانتەزێنێ و قەڵایەکی تازەش لەوێ دروست بکا کە هەمیشە تاقمێک سەرباز و چەند تۆپی لێ‌بێ. شوجاعوددەولە هەتاکوو هاتنی ئەم فەرمانە تاقەتی نەهێنا و بە هێزی بەرزکێفی خۆیەوە ڕووی کردە لاجان. هەمزاغا و پیاوەکانی لە خۆیان ڕانەدی ڕاوەستن و

پەنایان بردە بەر خاکی عوسمانی. ئەوسا شوجاعودەولە وەستاکارانی شارەزای کۆکردنەوە و لە ماوەی سێمانگدا بە بڕی دووهەزار تمەن قەڵایەکی ساز کرد. کاتێک هەواڵی تەواوبوونی قەڵا بە خزمەت جلەوداری دەوڵەت ڕاگەیەندرا محەممەدمیرزای ئەندازیار کوڕی شازادە مەحموودمیرزایان نارد کە چاوی پێیبکەوێ و نەخشەی قەڵاکە بەرێتەوە بارەگای پیرۆز. ئەویش بەپێی فەرمان گەیشتە لاجان و نەخشەکەی لەگەڵ خۆی بردەوە تاران. شوجاعودەولە ئەم خزمەتەشی وەبەردڵان کەوت و خەڵاتێکی تایبەتی بۆ نێردرا و خەرجی تێچووی قەڵاش لە داهاتی دیوانی ورمێوە باربوو کرا. لەم سەروبەندەدا مزگێنی ئیزندرانی ئیمامقولیخانی سەرتیپ لە ئەرک و کاری شیراز و گەڕانەوەی بۆ تاران شوجاعودەولەی گەشاندەوە و نۆخۆزنی خستە دڵ و دەروونی.

## نێردرانی میرزا سادقی قایمەقام بۆ تەورێز و پێهەڵچوونی هەتا پلەی پێشکاریی موزەففەرەددینمیرزا؛ بانگکرانی شوجاعوددەولە بۆ تەورێز و ڕاسپێردرانی لقی حەوت بۆ مانەوە لەوێ

میرزا سادقی قایمەقام یەکێکە لە ئامۆزاکانی میرزا ئاغاخانی نووری مەزنەوەزیر و پیاوێکی لێزان و پڕ و تەواوە. پێشتر خەڵکی تەورێز لەبەر چەند هۆیەک لێیهارووژان و بەردەرگایان پێگرت و بەوپەڕی سووکایەتی دەریانپەڕاند و [تەنەکەیان لە دووی کوتا] و بێدەسەڵاتیان کرد و لەو دەمەوە هەتا ئێستا لە پایتەخت بە دوورەپەرێزی دەژیا. لەم کاتەدا کە عەزیزخانی سەرداری گشتی لە پلەی پێشکارێتی ئازەربایجان لادرا و هیچی بە چنگ نەما و بانگ کرایەوە تاران، قایمەقام سەرلەنوێ داندرایەوە بە جڵەوداری ئازەربایجان و پێشکاری موزەففەرددینمیرزا و نێردرایەوە تەورێز. دەڵێن بۆ ئەم کارە گەورەپیاوانی دەسەڵات و باوەڕپێکراوانی دامودەزگای فەرمانڕوایەتی یەکدەنگ نەبوون. تاقمێک کە خەڵکی تەورێز بوون وەباڵیان بۆ کێشا و دەستەیەکیش قەت پێیانخۆش نەبوو. بەڵام چونکە بەڕێزی جێنشینیمیر بەدڵ سوشیدەویست و متمانەی پێیبوو، ئەوانیش متەقیان لێبڕا. میرزا سادق لە مەودای ڕێگادا حوکمی ئەرک و ڕاسپاردەکانی تازەی خۆی ناردن بۆ حاکمان و ئەمیرانی ئازەربایجان. بۆ وێنە کاغەزێکی نووسی بۆ شوجاعوددەولە و باسی ئەوەی کردبوو کە هەروا چاوێکم بە ئیمامقولیخانی سەرتیپی برات کەوتووە کە لە فارسەوە گەڕابۆوە. ئێوەش دەبێ هەتاکوو من دەگەمە تەورێز بەوپەڕی وریایی و سەرۆکایەتی تەناهی سنوورەکان بپارێزن و چاوتان بە سەر

ڕێک‌وپێکی کاروباری گرینگی لەشکرەوە بێ و چاوەڕوانی فەرمانی داهاتووم بن. میرزا سادق زۆری عەسکەرخانی سەرتیپی شەهید خۆشدەویست و لەگەڵی گەرم‌وگوڕ بوو. ئێستا لەگەڵ یۆسف‌خان و ئیمام‌قولی‌خانیش هەر وایە و نەگۆڕاوە.

بەکورتی کاتێک قایمەقامی بەڕێز لە سەرەتاکانی مانگی نیوجێژنانەدا گەیشتە تەوریز و پێشوازییەکی بەشەوکەتی لێکرا، لەبەروەی بەدڵ لە خەڵکی تەوریز و ئاپۆرا و هەرا و هەڵلایان دەترسا و هەقیشی بوو، بڕوا و متمانەی بە هیچکام لە هێزەکانی ئازەربایجان نەدەکرد و بەبزی نامەیەکی نووسی بۆ شوجاعودەولە کە لقێکی ئەفشار لەگەڵ پلەدارانی زیرەک و وشیار بەرێ بکا بۆ پاراستنی تایبەتی خودی قایمەقام. لەم ڕۆژانە و لە ۲۵ی مانگی نیوجێژنانەدا ساڵی [هەتاوی] تازە بۆوە و شوجاعودەولە دوای بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی نەورۆزی میری کاروباری گرینگی لەشکری ئەسپاردە دەست خانبابا خانی برازای و جارێ جڵەوی حکوومەتی دایە چنگ جانگیرخانی بەگلەربەگ و لە ڕۆژی ۵ی مانگی قوربانەدا بەرەو تەوریز کەوتەڕێ. ئەردەشێرخانی کوڕیشی لەگەڵ لقی حەوت بوو.

هەر لەم سەروبەندەدا بەڕێز میراز عەلی‌حوسێنی سەڵماسی کە پیاوێکی ئەدیب و زانا بوو کۆچی‌دوایی کرد.

## هاتنی میخائیلی جێنشینی خونکاری ڕووسیا بۆ ئێران و ڕاسپێردرانی شوجاعوددەولە بۆ پێشوازی و بەخێرهێنانی

سالی ۱۲۸۵ی کۆچی/ ۱۸٦۸ ـ ۱۸٦۹ی زایینی کە شوجاعوددەولە لە تەورێز بوو، هەوالی هاتنی میخائیلی جێنشینی [سەرۆک] دەولەتی شکۆمەندی ڕووسیا بە خزمەت مێرزا ناسرەددینشا ڕاگەیەندرا. چونکە دەبوو کەسێک لە ئەمیرانی دەربار بچێتە پێشوازی، یۆسفخانی شوجاعوودەولە لە بەختی بلێندی بازی ئەم شانازییەی لەسەر شانی نیشت. بڕیار درا کە بڕی هەزار تمەن بۆ خەرجوبەرجی ئەم سەفەر و میوانداریيەی میخائیل وەربگرێ. شوجاعوددەولە بە مەبەستی دەربڕینی سپاس و پێزانین سەبارەت بە شانازی ڕاسپێردرانی بۆ ئەم ئەرکە، بۆخۆی ڕاوستەخۆ کەوتە تەدارەکی ئەم گەشت و دیدارە و تیژ بەرەو لەنکەران ئەسپی تاو دا. یۆسفخان بەر لە ڕۆیشتن هاوڕێیانی خۆی لە نێو پیاوانی مەند و ماقوول هەلبژارد و ڕۆژی ۱٤ی مانگی محەررەم بزووت. لە مزلی «خەلاتپۆشان»ی یەک فرسەخی تەورێز چاوی بە کۆنسوولی ڕووسیا کەوت کە لە تەورێز دەبوو. دیارە کۆنسوول بۆیە هاتبوو هەتا لە نیزیکەوە چاوی بە کۆمەلی میوانداران و ڕێوشوێنی پێشوازی بکەوێ. پاش ئەوەی مالاواییيان ڕاست و ڕۆیشتن لە گوندی «واسمەنج» کە لە دوو فرسەخی تەورێزە لایان دا و ڕۆژی شەممۆ ۱۵ی مانگ لەوێوە بزووتن و لە پەنای «قوری گۆل» جەمی نیوەڕۆیان کرد. پاشان سوار بوونەوە و شەو گەیشتنە ئاوایی «کورەکەندی» کە یازدە فرسەخ لەو شوێنەوە دوورە و لەوێ دابەزین و وچانیان دا و ڕۆژی یەکشەممۆ ۱٦ی مانگ ڕێگان داگرت. بەکورتی شاندی شوجاعوددەولە تەواو بە شەوکەت و شکۆمەند مزلاومزل ڕۆیی و لە ئەردەوێل تێپەڕی و گەیشتە

نیزیک کەوشەن. پاش ئەوەی کە نیو فرسەخی دیکە بە ڕێگادا ڕۆیشتن سەردەستەیەکی قازاخان کە بە زمانی دەوڵەتی ڕووسیا پێی‌دەڵێن کاپیتان بە خۆی و بیست چەکدارەوە لە لایەن جێنشینەوە گەیشتن. بە دابی خۆیان سەلامی کرد و ڕێزی نواند و ئەرکی سەرشانی ڕاگەیاند. شوجاعودەولەش سەردەستە و یارانی زۆر بە گەرموگوڕی بەخێرهێنان و چاکوخۆشی لەگەڵ کردن. تفەنگدارانی پیادە کە لە پێشەوە دەڕۆیشتن ئیزنی دان بگەڕێنەوە و لە یەک فرسەخیش غەفاربەگی کارگێڕی سەیفولمولک و حاجی سەفەرعەلی بەندەردار و تێکرای کەیخودا و پیاوماقووڵان بە پیر شاندەکەوە چوون و میوانداریان لێکردن. ئەوێ کە قەرەوڵخانەی ڕووسانی لێبوو پازدە کەس سوارەی قازاخی ئامادە لەسەر داب و دەستووری خۆیان ریزیان بەست و شوجاعودەولەیان بەخێرهێنا.

شوجاعودەولە بەوپەڕی دڵۆڤانی بە بەردەمیاندا ڕابرد و [وەک پاسەوانی شەرەف] بەسەری کردنەوە پشکنینی. ئەو پازدە کەسە لەگەڵ سەرپەلی خۆیان لە پێش شوجاعودەولەوە دەڕۆیشتن. دوای بڕینی فرسەخێک ڕێ، لە جێگایەکی دیکە نیزیکەی بیست قازاخ ڕاوەستابوون و لەسەر دابی ئەوانی پێشوو جووڵانەوە و لەگەڵ ئەو پازدە کەس جێگۆڕکەیان کرد و بەم چەشنە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە خودی ئاستارا. لە زارکی بازاڕی ئاستارا خەڵک گاوگەردوونیان کرد و پاش ئەوەی لەوێ تێپەڕین، چوون و لە ماڵی خانەخوێ دابەزین. میرعیسابەگی ئامۆزای سەیفولمولک کە سەردەستەی قازاخان بوو لە ماڵی قولی‌خانی سەرلک دابەزی و بیست قازاخێک لە لەنکەرانەوە وێڕای هاتبوون. چونکە لە لایەن حاکمی ڕووسەوە بۆ میوانداریتی ڕاسپێردرابوو بە قولی‌خانی سەرلکی ڕاگەیاند و تکای لێکرد کە چاوی بە شوجاعودەولە بکەوێ. پاش ئیزن دران شانازی دیداری پێبرا و شوجاعودەوەش زۆر بە گەرمی وەریگرت. بەکورتی ڕۆژی پێنج‌شەممۆ ٢٠ی مانگی محەڕرەم لە ئاستارا بزووتن و بەرەو لەنکەران تێڕاچوون. لەوێوە هەتا لەنکەران مەودای ڕێگا پێنج فرسەقە کە بە نێو

لێرەوار و دەریادا دەخوشێ و هەر لەو شوێنە دوو ئاستارا هەیە کە یەکیان هی دەوڵەتی شکۆمەندی ئێرانە و ئەوی دی ئی رووسیایە. دوای ئەوەی کە لە رووبار پەڕینەوە چوونە نێو خاکی رووسیا و لەوێ سەرۆکی گوومرگ بە جلی رەسمییەوە بە پیریانەوە چوو. پاشان لەوێرا رۆیشتن و لە یەک فرسەخی لەنکەران «ئەلێکساندر ئۆویچ»ی جێگری حاکم بە چل سوارەوە پێشوازی لێکردن. لە هەموو شوێنێک بیست کەس قازاخ لە نوا و دوای شوجاعوددەولەوە دەرۆیشتن. لەم کاتەدا میرعیسابەگی میواندار بە قولیخانی سەرلکی گوت کە بەپێی نامەی جێنشینی پایەبەرز خەرجوبەرجی سەفەری شاندەکە بە تەواوەتی دابین کراوە و ئامادەیە، بۆیە عەرزی شوجاعوودەولە بکەن کە هاوڕکێفانی وەربیگرن. وەختایەک قولیخان مەبەستەکەی بە خزمەت شوجاعوددەولە راگەیاند فەرمووی کە لە سایە سەری پاشای ئێرانەوە ئەگەر رۆژێ هەزار تمەنیش بدەن قبووڵ ناکرێ و وەرناگیرێ و پێویستمان پێی نیە، بەڵام با خەرجی جەمی شەو و نیوەڕۆ لەسەر ئەوان بێ. کاتێک گەیشتنە لەنکەران نیزیکەی چوارپێنجهەزار کەسیان بە پیرەوە هاتبوو. شوجاعوددەولە و هاوڕێیانی شەو میوانی کاربەدەستانی حکوومەتی بوون و رۆژی هەینی ۲۱ی مانگی محەررەم چوونە سەیرانی دەریا.

شەوی دواتر سێ کاتەژمێری بە سەردا تێپەڕیبوو کە جێنشینی پایەبەرز بە رێگای «بیلەسەوار»دا گەیشتە لەنکەران و تەواوی رەوگەی نێو [شاری] بۆ چراخان کرابوو. پاش چوونی «میخائیل» نوێنەرێکی تایبەت لە لایەن حاکمی شارەوە بۆ بەخێرهێنان گەیشتە خزمەت شوجاعوددەولە و سەبارەت بە چۆنیەتی کەموکووڕی میوانداری داوای لێبووردنی کرد چونکە زۆربەی بەرپرسان و پلەداران چووبوونە پێشوازی جێنشین. بەڵام سبەینێ دوو کاتەژمێر لە دانی بەیانی تێپەڕێ لە خزمەت شوجاعوددەولەدا حازرم و «تێربووسکی»

سەرتیپیش لە لایەن جێنشینی پایەبەرزەوە دێ. ڕۆژی شەممۆ ڕێکەوتی ۲۲ی مانگ لە کاتی دیاریکراودا حاکم و هاوڕێیانی هاتنە دیداری شاندی ئێران.

بۆ ڕۆژی داهاتوو شوجاعوددەولە لەسەر داب و دەستوورێکی جوان و بەشەوکەت چووە دیداری جێنشین و بە خزمەت خۆی و خاتوونی هاوسەری گەیشت و دوای ناساندنی خۆی و هاوڕێیانی فەرمانی ئەرکی سەر شانی پێشکەش کرد و بە سۆزی مەزنانە بە سەر کرایەوە. پاش بەشدار بوون لە شەوەخوانەدا و لەسەر داوای جێنشین دیداری دواتر خرایە بادکووبە.

بۆ بەیانی جێنشین وێڕای شوجاعوددەولە بە داب و دەستووری ڕەسمی سواری کەشتی کرا و ڕۆژی شەممۆ ٢٤ی مانگی محەڕڕەم گەیشتنە بادکووبە.

لەسەر داوای جێنشین شاندی ئێرانی لە بادکووبەش بەشداری میوانیی جەمی شەو بوون. پاش ئەم کارانە میوانداری ئێرانی و هاوڕێیانی لێی‌سواری کەشتی بوون و بەرەو ئێران تێکشان. کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆی شەممۆ ۲۹ی مانگی محەڕڕەم کەشتی گەیشتە لەنگەرگای ئاستارا و لەوێوە بە ڕێگای ئەردەوێڵدا چوونە تەورێز.

شوجاعوددەولە دوای ئەوەی لە تەورێز ڕکێفی بەتاڵ کرد، چاوێکی بە میرزا سادقی قایمەقام کەوت و دواتر ڕۆژی سێ‌شەممۆ لەگەڵ هاوڕێیانی چووە خزمەت موزەففەرەددین‌میرزای جێگرەوەی‌میر و بەسەرکرایەوە. با لە بیرمان نەچێ کە جێنشینی [سەرۆک] دەوڵەتی ڕووس بەڵێنی دابوو بە شوجاعوددەولە نیشان و میداڵ و حەمایەلی لە خوندکار بۆ وەربگرێ و بە دەوڵەتی ئێراندا بۆی بنێرێ.

## ئەسپێردرانی کورسی دەسەڵاتی مەڵبەندی سێکوچکەی ورمێ و خۆی و سەڵماس بە یۆسفخانی شوجاعوددەولە و هەڵبژێرانەوەی دووبارەی موعینوددەولە وەکوو حوکمداری ورمێ

پاش ئەوەی شوجاعوددەولە لە ئەرکی میوانداری بۆوە و گەیشتە تەوریزی ناوەندی دەسەڵات، چۆنیەتی کار و ڕاسپاردەکانی بە دوور و درێژی لە لایەن شازادەی هێژا و میرزا سادقی قایمەقامەوە بە نووسین بە خزمەت بارەگای میری مەزن ڕاگەیەندرا. خاوەنشکۆ وەبەردڵی کەوت و فەرمووی خزمەت و زەحمەتەکانی پێشووی شوجاعوددەولە هەمیشە لەبەرچاوە و شایانی هەر جەشنە بەسەرکردنەوەیەکە، بۆیە جارێ دەسەڵاتی مەڵبەندی دڵنشینی خۆی و سەڵماس هەتا خاکی دڵبزوێنی ورمێ و لاجان کە سەرزەمینی کۆنی ئێران و سەرسنوورن، دەکەینە باربووی. پێویستە بۆخۆی لە خۆیە دابنیشێ و کاروباری ئەو ناوچە و مەڵبەندانە ڕێکبخا و تەناهی و ئارامی باڵی بنگێوێ. دوای دەرچوونی ئەم فەرمانە شوجاعوددەولە بە خەلات و واژۆی بەڕێزی جێگرەوەیمیر سەربەرز کرا و نێردرا بۆ بنکەی دەسەڵاتی. لەبەروەی کەنیزەهاوسەرانی ئەحمەدمیرزای حاکمی پێشوو لە خۆیە بوون، شوجاعوددەولە لەگەڵ مەحرەمانی خۆیان بەڕێی کردن بۆ تەوریز. بەلام لە مەودای ڕێیەدا نامەیەکی شازادە موعینوددەولەیان لە تەوریزەوە پێگەیشت کە من جارێکی دیکە بوومەوە حوکمڕانی ورمێ و زانیومە کە شوجاعوددەولە ئێوەی لە خۆیەوە پاڵپێوەناوە، بۆیە هەرکە نووسراوەکەی منتان گەیشتە دەستی دیسان بگەڕێنەوە بۆ لای ورمێ هەتا خۆم لەو چەند ڕۆژەی داهاتوودا دەگەمەوە. ئەوانیش بەپێی فەرمان سەری ولاخیان بەرەو ورمێ وەرسووڕاند و پاش ئەوەی

کە گەیشتنە شار محەممەدڕەحیم‌میرزای کوڕە چکۆلەی حاکمی هێزا کەوتە ڕاگەیشتن بە داد و داوای خەڵک و لە جێی خۆیدا باسی دەکەین.

بەڵام لەو لاوە پاش ئەوەی کە شوجاعوددەولە لە خۆیەوە ڕۆنیشتە سەر تەختی دەسەڵات، شەڕانی و چەتە و ڕێگر لە ترسی هەڵمەت و گورزی زەبروزەنگی ئەو ئەمیرە زیرەک و لێوەشاوە بەجارێک دەستیان هەڵگرت و خزانە نێو کون و کاژێران و خۆیان مەڵاس دا. لە ماوەیەکی کورتدا هێمنایەتی و تەناهی لەو ناوچانەدا وەهای باڵ ئەنکاوت کە چاوی ڕۆژگار و گوێی ئاسمانی لەرزۆک هەتا ئێستا نە دیویەتی و نە بیستوویەتی.

هەر لەم ڕۆژانەدا ئیمام‌قولی‌خانی سەرتیپ ناسراو بە بیووک‌خان، برا چووکەی شوجاعوددەولە کە لە سەفەری فارسەوە گەڕابۆوە تاران و لە بارەگای پادشاوە ئیزن درابوو گەیشتە تەوریزی ناوەندی دەسەڵات و چووە زیارەتی شازادەی بەڕێز. دوای چەند ڕۆژێک لقی حەوتی ئەفشار کە بە سەرکردایەتی ئەردەشێرخانی کوڕی شوجاعوددەولە لەوێ پاسەوانی تایبەت بوون ڕێگەی گەڕانەوەیان درا بۆ ورمێ و خودی بیووک‌خانی سەرتیپ لەبەر وەرگرتنی چەند ڕێنوێنییەک لە تەوریز مایەوە.

## ئەو ڕووداوانەی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی موعینودەولە و لە جەغزی پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ خەڵکی ورمێ قەومان

شازادە ئەحمەدمیرزا موعینوددەولە یەکێک لە کوڕانی جێگرەوەی خوابەخشیوی میر پیاوێکی وریا و لێوەشاوە و تێکەیشتوو بوو، بەڵام ئاشکرایە کە دادموانی و مافی [جەماوەر] لە ژێر باری چنۆکی و بێدادیدا دەیانناڵاند. بۆ بەڕێوەبردنی فەرمان و لابردن و دانانی حاکمان و شکاندنەوەی خەڵکی تایبەت و ڕەمەکی سەرەڕۆ بوو. سەرەڕای داهاتی دیوانی، ملکدارانی هەڵدەپێچا و دایدەکرووسین و ئەمیران و مەزنانی ئەفشاری بە هیچ دانەدەنان. پیاوماقووڵانی ئەفشار ماوەیەک گوێی خۆیان لە حاند هەڵسوکەوتی ناڵەباری ئاخنی و متەقیان نەکرد هەتا سەرەنجام بە پشتیوانی زانایانی ئایینی لێیەوەخۆکەوتن و بۆ لادان و دەرپەڕاندنی بە هێزی خۆیان ڕچەیان شکاند و ڕێگایان تەخت کرد و چەند جارێکیان هەڕەشە بۆ نارد. کەچی موعینودەولەی ملهوڕ ئەو ورتەورتانەی بە قڕەی قشقەلە و ئەو زەنازەنایەی بە هازەهازی مێشوولان دادەنا و بە وەی دەخوڕی کە مامی پادشایە و قەت ڕانەدەچەنی و شان و باهۆی تێک انەدەبرد و وڵامێکی بەجێی نەدەدایەوە پرسیاری مامۆستایانی ئایینی و ئەمیران.

کاتێک چۆنیەتی هەڵسوکەوتی لە هەموو شوێنێک دەنگی داوە و بەتایبەت لە خۆیە بۆ شوجاعودەولە ڕوون بۆوە، چونکە ئاکام و سەرەنجامی کارانی تێدێنا و پیاوێکی ئاقڵ بوو، ویستی کە بە تەگبیری بەڕێوەجێ ورمێی مەوتەنی لە بوونی پیاوانی غەوارە پاک بکاتەوە و بیخاتە سەر خۆی و

سەلماس. جا بۆیە کاغەزێکی نووسی لە بەڕێز میرزا عەلیئەکبەری عەبدولمەلیکی موشتەهیدی[1] ورمێ و بە نەسیرسولتانی ئەفشاری کەلهوڕی پیاوی ئەمین و ڕازداری خۆیدا بۆی نارد و ڕاینەسپارد کە لەگەڵ تێکڕای مامۆستایان و سەرۆک و سەرکردەکان بە مەبەستی خاشەکێشانی زۆرەملی موعینوددەولە قۆڵیان هەڵماڵن و ئەوەندەی کە دەتوانن بە بەڵگە و بۆنەی شەرعی و ڕێسایی لەگەڵی تێکەون و لە هەڵپێچانی گەورەپیاوانی دەوڵەت نەترسن، چونکە ئەوان فامیدە و دادپەروەرن. کاتێک نەسیرسولتانی کەلهوڕ بەدزی نامەکەی خستە بەرچاوی بەڕێز میرزا عەلیئەکبەر ورەی بەرزتر بۆوە و بە تێکڕای مەزنەمامۆستایانی نیشان دا. زانایانی ناوبەدەرەوەی دینی لەو سەردەمەدا بریتی بوون لە: ١- حاجی میرزا عەلی فەقیهـ. ٢- میرزا محەممەدسەمیعی شێخی. ٣- سەیدئاغای سەدرولعولەما. ٤- حاجی میرزا مەهدی. ٥- ئاخوند مەلا ڕەزا فەقیهـ. ئەم تاقمە بە دنەی ڕێزدار میرزا عەلیئەکبەر لە مزگەوتی بازارباشی کۆبوونەوە و بنەیان داکوتا و بە تەپڵ و دەهۆڵ جاڕیان کێشا و کردیانە هەرا و هەنگامەی ڕۆژی ڕابوونەوە. شازادە موعینوددەولە هەتا بلێی ئازا بوو. بە خزمایەتی و مامێتی پاشا دەخوڕی و بە فیز و دەمار لە تەلاری سەردەری دانیشتبوو. ئەم قریوەقریوەی بە کایەی منالان و گالتەجاڕیی ئیشکەڕنان و بێئاوەزان دەزانی.

بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ ئاپۆرای جەماوەر و هەرای هەمووانی زیاتری پەرە دەگرت. لە کۆنیشەوە گوتوویانە نز بازاڕی شێواوی دەوێ. شەوێک کۆمەڵی نەزان و لاتەوپاتەی ئەفشاران دەستیان تێکگرت و وێکڕا بە گوڕمگوڕ و هەراهەرا پەلاماری باڵەخانەی خانەمیریان دا لە سەردەری و بە دەنگی بەرز و نەڕەنەڕ کردیانە قەرمچی و عۆین و جنێویان بە موعینوددەولە دا. موعینوددەولە لەو

---

[1] - لە کوردیدا بۆتە موشتەهید دەنا «موجتەهید»ە.

کاتەدا حاجی ڕەجەب‌عەلی‌خانی سەرتیپی تۆپخانەی ئەفشار کوڕی فەزان‌ئاغای میرپێنجی بانگ کرد و فەرمووی کە بە تەقەی تۆپی ئاگربار ئاژاوەی جەماوەر ڕۆمرکێنێ. سەرتیپ بە پەند و ئامۆژگاری و سەرکۆنە هەرچۆنێک بوو پێشەنگی لات و شەلاتانی بلاوە پێکردن و گوتی بڕۆن هەدا دەن هەتا سبەینێ. ئاپۆراکە گەڕانەوە و هەر کەس چۆوە مالی خۆی. موعینوددەولە بۆ بەیانی شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزای مامی لەگەل جانگیرخانی بەگلەربەگ ناردنە خزمەت مامۆستایانی دینی هەتا بزانن ئەو هەللا و هەرایە بۆ چیە و بەڕێزان چیان دەوێ؟! کاتێک ئەوان چوونە لای ڕێزدار میرزا عەلی‌ئەکبەر و مامۆستایان و ڕاسپاردەکەیان ڕاگەیاند، وەلامیان دانەوە کە ئێمە بە حکوومەتی وی ڕازی نین و غەدرەکانیان دەنک‌دەنک بژارد. بەناچار مەلیک‌مەنسوورمیرزا و بەگلەربەگ بە ناهومێدی تەشریفیان گەڕانەوە. توخم و تۆوی دوژمنایەتی و هەرا پەساپەسا پتری تەشەنە دەکرد و سەرەنجام وای لێهات کە ڕۆژێکی لای نیوەڕۆ هەموو پێکەوە لە مزگەوتەوە هەستان و بە جەماوەرێکی زیاتر لە پێشوو چوون و بەردەرگای سەرای حکوومەتیان گرت و ڕانەوەستان و شوویان لێهەلکێشا و خۆیان بە بالەخانەی سەردەریدا کرد و زۆر نالەبار و ناحەز جوولانەوە. موعینوددەولە خوتخوتەی کەوتە دلی و خوشی بۆ مالی مەلیک‌مەنسوورمیرزا کە بە ئەندەروونێدا ڕێیەکی هەبوو. لەوێ گوتی مامە گیان لەو حەشامەتە بپرسن کە ئامانجیان چیە لەم هەرایە و ئەو کەسەی کە بێ فەرمانی پادشا دەیهەوێ سەر دەسەلاتم لابەرێ کێیە؟ مەلیک‌مەنسوورمیرزا چونکە ئاکامی کارەکەی دەزانی وەلامێکی سەبارەت بە پرسیارەکەی نەداوە و ناردی بە شوێن ئەردەشێرخانی سەرلقی کوڕی شوجاعوددەولەدا کە بە هێزەوە بێ و قرە و هەراکە داکووژێنێ. کاتێک هەوالیان دا بە ئەردەشێرخان جارێ دەستەسەربازێکی پاسەوانی شاری ئامادە کرد و گەیشتە مەیدانی تۆپخانە و کە ئاپۆرای جەماوەری بینی بەوپەڕی ڕێزەوە بە موعینوددەولەی گوت کە تازە مانەوە ئێوەی پایەبەرز

لــە خانەمیردا بــاش نیە و ئەگەر بەرێزتـان پێتانخۆش بــێ مــن و ســەربازانی حازر و چەکدار لە ڕکێفتاندا دێین بۆ باغی دلگوشا و ئەوێ ئەهوەنترە. شــازادە مەلیکمەنسوورمیرزا قسەکەی بۆ سەلماند و موعینوددەولە وێـرای کوڕەکـانی خۆی کامرانمیرزا و ئەبولفەتحمــیرزا و محەممــەدڕەحیممــیرزا چوونــە بــاغی دلگوشا، بەلام خەلکی شار و ئەو حەشامەتە کەوتنە شوێنیان و لەوێ هــەرچی قسەی پووچ و جنێوی تال و ناخۆشی کە بۆ گوتن نەدەبوو لە پارسەنگیان نان.

سەرەنجام ئەردەشێرخانی سەرلق بە سوور و شین هەلگەڕان و هەڕەشەی تێکەل بە بەرژەوەندی ئاژاوەکەی ڕۆمرکانــد و جــەماوەری لــە بــاغی دلگوشــا بلاوەپێکرد. موعینوددەولە لەگــەل کوڕەکــانی مــاوەی ســێ شــەو و ڕۆژان بــە دلەخورتێ و مەینەتباری لە باخی دلگوشا مانەوە و ئەو ڕۆژ و کــات و ســاتانە هەرگیز بە ژیان نەدەهاتنە ژمار. یەکێک لە ڕووداوە گالتەجارییەکانی ڕۆژگــار هێنانی هەوالێک بوو لە لایەن عەلیبەگی ئاجودانەوە کە دەیگــوت جــەماوەری شار ڕێزدار میرزا عەلیئەکبەری موشتەهیدی ڕیش درێژی بالابەرزی ئەستوورەی چوارشانەیان بە مینبەرەوە لەسەر سەریان داناوە و هەر ئێستا لە لای دەروازەی بازارباشەوە بەرەو باغی دلگوشا دێن و بافیشان دەردەکەن. ئەگەرچی ئەم قسەیە لــە نووکەوە درۆ بوو، بەلام موعینوددەولە ئەوەندە تۆقیبوو کە لێــیوەراســت گەڕا و باوەڕی کرد و لەرێوە گوتی ئەسپان زین کەن و یەکــسەر بــەرەو گونــدی قشلاخی قەرەئاغاجی ملکی ئاغاخانی سەرتیپ کە قەلایــەکی تــازەی لــێ ســاز کردبوو، بالی گرت و ڕەوی. دوای ڕۆیشتنی [حاکم] تەواوی ئەو هەرا و هوریایە دامرکا. هەر لەوێ مایەوە هەتا ڕۆژایەکی کە حاجی میرزا موحسینی حیسابداری هێزەکانی ئەفشار لە حەج گەڕابۆوە و بەرەو ورمێ دەهــات و بــە قــەرەئاغاجدا تێدەپەڕی. کاتێک بە چۆنیەتی ڕووداوەکەی زانی، چووە لای موعینوددەولە و لە نێو قساندا عەرزی کرد هەتا چەند ڕۆژی دیکە بیووکخانی ئیقبالوددەولە کە لە سەفەری فارس گەڕاوەتەوە دەگاتەوە ورمــێ. بــە هیــوای خــودا هــەر کــە ئــەو

گەیشتەوە پاش تەمێ کردنی قەلەوقوتە و جەماوەری ڕەمەکی و سەرمواندنەوەی مەزنەمامۆستاکان کاروباری حکوومەتی [شازادەی] پایەبەرز دەچێتەوە سەر دۆخی جارانی و چۆنی پێتخۆشە ئاوا وەدی دێ.

موعینودەولە ئەو کاتەی کە لە باغی دلگوشا بوو، داوای لە حەسەنخانی سەرتیپی فەرمبەپاغ کردبوو بێتە هانای و بە کاغەزێک سەرهەڵدانی خەلکی ورمێی بۆ شازادەی هێژا موزەففەرەددینمیرزا ڕوون کردبۆوە. بۆیە وەختایەک بیووکخانی سەرتیپی برای شوجاعودەولە کە لەسەر ئیزنی شازادە بەرەو ورمێ دەچۆوە، جەببارخانی پێشخزمەتی میری ڕەگەڵ خرا کە بچێ و لە کێشەکە بکۆڵێتەوە و لەگەڵ ئیقبالودەولە، موعینودەولە و مەزنەمەلاکانی ئەفشار پێکبێننەوە و ئەم ئەرکە راپەڕێنن. کاتێک گەیشتنە دەوروبەری «غیلمانسەرای» ئیقبالودەولە بە مەبەستی دیدار و زیارەتی شوجاعودەولە لە جەببارخان هەڵبرا و ڕۆیی بۆ «خۆی» و پێشی ئەسپارد و گوتی هەتاکوو من دەگەڕێمەوە و دێمەوە ورمێ تۆ لە باغی دلگوشا دانیشە و شتەکە مەدرکێنە و باسی هیچ مەکە. بەڵام پاش ئەوەی گەیشتە ورمێ و بە پیریەوە چوون و جێورێی بۆ دیاری کرا، لەبەروەی پیاوێکی ساویلکە و بێئەزموون بوو ڕۆژێکی بێئاگاداری ئەردەشێرخانی سەرلک و میرزا عەلیخانی سەرلک کە هەردووکیان بەپێی فەرمانی دووراودووری ئیقبالودەولە بە دەورەیدا دەهاتن و خزمەتیان دەکرد و میوانداری بوون، یەکسەر چوو بۆ گوندی «زەقەلا»ی ئاغاخانی سەرتیپ بۆ لای موعینودەولە و لەوێوە هێنایەوە شار. لای ئێوارە غولامان و فەراشانی عێراقی لە راست و چەپەوە سەفیان کێشا و موعینودەولەیان بردەوە بالەخانەی سەردەری و دایاننایەوە سەر تەختی دەسەلات. جەببارخان بە خۆی دەنازی و سمێلی بادەدا یانیها هێز و برشتم نواندووە. کاتێک مامۆستایان و جەماوەری هاودەنگ لێیان ڕوون بۆوە و بە هاتنەوەی ئەو کابرا بەگیرە و پێداگرەیان زانی تووڕە بوون. مەلاکان و

سەرکردەکان حەشامەتی کۆدەنگیان لـێ تین دا و سەری شـەو هەڵپـشکووتن و ساز و پەرداخ و چەکدار هرووژمیان بردە سەر خانەمیری [ورمێ] و بەردەبارانیان کرد. بەناچار سەیر شەمزان و ئالۆزکان و حوکمڕان و جـەببارخان لـە ترسـی گیانیان لەرزەیان کەوتە سەرتاپای ئەندامی و بە هەڵەداوان ناردیان بە شـوێن حـاجی ڕەجـەبعـەلیخـانی سـەرتیپی تـۆپخانە و حـاجی ڕۆسـتەمخـانی سەردەستەدا و هێنایانن و گوتیان کە بە تەقەی تۆپی سماتەشکێن دیسان ئاوری ئەم هەرا و ئاژاوەیە ڕۆمرکێنن. جەماوەرەکە بەم گەفانە نەسلەمینەوە و پتریـان پێداگرت و هێندەی نەمابوو کە پرکێـشی بکەنـە سـەر حکوومـەت. وەختایـەک موعینوددەولە تەماشای کرد ئەمجار لە جاری پێشووی خراپتـری لێقـەوماوە و بەختی وەرگەڕاوە، بە تەگبیری جانگیرخانی بەگلەربـەگی مێردەپـووری و بـە ڕێخۆشکەری حاجی ڕەجەبعـەلیخـان هـەر لـەو سـەری شـەوەدا بەوپـەڕی سەرشۆڕی و تێشکاوی چارەی ئەما و ڕۆیی بۆ ئاوایی «گەجین»ی مـڵکی حـاجی ڕەجەبعەلیخانی سەرتیپی تۆپخانە. لەوێ بنەی داکوتا هەتاکوو بزانێ دواڕۆژ چۆن دەبێ. کاتێک حەشامەتی کۆدەنگ بە ڕاکردنی حوکمـڕان و جـەببارخانیان زانی و بۆیان روون بۆوە کە تەختی دەسەڵات بەتاڵ و بێحوکمـدار بـەجێماوە، گەڕانەوە خانە و لانەی خۆیان و سـەنیری خانرجـەمییان وە ژێـر سـەری دا و لێیخەوتن.

بەڵام لەو لاوە پاش ئەوەی بیووکخانی سەرتیپ گەیشتە خۆیە پەیتاپەیتا بیستی کە خەڵکی ورمێ ڕاپەڕیون و هەراکە وڵاتی تەنیوەتەوە و زۆریشی سەر لە پەلە و بێئەزموونی جـەببارخان سـوڕما. هـەر بۆیـە خێرایـەکی ئێزنـی لـە شوجاعوددەولەی برای بەرزمجێی وەرگرت و بەپرتاو ڕێگای ورمێی هەڵبوارد. لە پەنا قەڵای «کەریمئاوا» ئەردەشێرخانی سەرلک وێڕای کۆمەڵێک پێشوازیکەر بە خزمەت مامی بـەناوبانگی گەیـشت و دەسـتی مـاچ کـرد. کاتێـک لـە قـسەی پێشوازیکەرانەوە چۆنیەتی ڕووداوەکانی بۆ ڕوون بـۆوە، ڕووی کـردە ئـاوایی

«گەجین» کە فرسەخێک لـە شـارەوە دوورە و چـوو بـۆ لای موعینودەولـە و جەببارخان و چـاوی پێیـان‌کـەوت. پـاش دیـدار و دوانـدنی موعینودەولـە و گفتوگۆیەکی زۆر، وا قەرار کرا کە بەپێی فەرمان و ئیزنی شازادەی جێگرموەی‌میر سەرلەنوێ موعینودەولە بەرێنەوە سـەر تـەختی دەسـەڵاتی ورمـێ و لەگـەڵ [خەنیمەکانی] ڕێکیان‌بخاتەوە. بەم شـێوەیە وێـڕای حوکمـڕان و جـەببارخان ڕوویان کردە شار و موعینودەولەیان بردە کۆشکەڵی سەردەری. بەڵام بە قەولی ئەستێرەگەران چونکە ئەو ڕۆژە بـۆ گەڕانـەوە مـاڵ و شـار موبـارەک نـەبووا بیووک‌خانی سەرتیپ لە باغی «توو» کە دەڕوانێتە دلگوشـا خێـوەتی هەڵـدا و شەوی لەوێ ڕۆژ کردەوە. بۆ سبەینێ بەری‌بـەیانی مەزنەمامۆسـتایان چوونـە دیداری سەرتیپی بەڕێز و لە مابەینی قسان‌دا دیسان دەستیان کردەوە بە سـکاڵا لە چنگ هەڵس‌وکەوتی نالەبار و زۆرەملییەکانی موعینودەولە و ڕەپ و ڕاست گوتیان ئەگەر بێتوو جارێکی دیکە بکرێتەوە حاکم لە سەرمان و دەوڵەت لاگیری بێ، ئێمە هەمووومان وڵاتەکە چۆڵ دەکەین و دەچینە جێگای دوورەدەست و سـەر وەبەر زۆردارێکی ئاوا ناهێنین. سەرتیپ هەرچی وەبەری هەڵخوێندن و دوارۆژ و دوورەیی و دەرهەڵبوونی فەرمانڕەوای وەبیر هێنانەوە هەر بەڕاستی بـێ‌فایـدە بوو. ئاخرییەکەی مامۆستایان بەناچار لە کۆڕەکە هەسـتان و هـەر ئـەو ڕۆژە شاریان بەجێهێشت و چوونە لێواری دەریای شاهی (گۆلی ورمێ) هەتا بە سواری کەشتی بڕۆنە تەورێز. وەختایەک سەرتیپ بارودۆخەکەی ئاوا هاتـە بـەرچاوی لەبەر سەرووەبەرهێنانی دەوڵەتی شکۆمەند و داکووژاندنی ئاوری ئـەم بەڵایـە، زەحمەتی وەبەر خۆی نا و پێی‌نایە ڕکێف و بـە خـستنەڕووی بەڵـگە و بۆنـەی ئاقڵمەندانە مامۆستایانی هێنانەوە سەرخۆ. ئەوانیش بە مەرجێ ڕازی بوون کە موعینودەولە هەر هەتا ئاخری ساڵ لە ورمێ بمێنێتـەوە و دەسـت وەرنەداتـە کاروباری حکوومەتی، دەنا هەمان تاس و هەمان حەمام. هەر چۆنێک بێ لەبەر خۆشەویستی و ڕاوێژی سەرتیپ مامۆستایان یـەکی چوونەکـەیان خـستەوە و

گەڕانەوە و حوکمڕانیش بە شێوەی لاریکەوە و مەیرێژە لەگەڵی هێنان. لەم کاتەدا جەببارخانی ڕاسپاردە بە کار و کردەی کاڵ و نەکوڵیوی خۆی زانی و تێگەیشت کە ئەم خزمەتە گەورەیە بە ناوی بیووکخانەوە تۆمار دەکرێ، ئەگەرچی سەرەڕای ئەمەش دەسخۆشانەیەکی چاکی بۆ کۆکرابۆوە و لە لای میرزا فەزلوڵلای کەلانتەر داندرابوو. بۆیە ڕۆژێکی لەناخاڵ پێی نایە ئاوزەنگی و بە بیانووی ڕاو بە سەرڕەو بەرەو تەورێز فری! شازادە مەلیکمەنسوورمیرزا و بیووکخانی سەرتیپ و حاجی ڕەجەبعەلیخان شوێنیان هەڵگرت و وەختایەک گەیشتنە سەری هەرچەندی خۆیان هێناوبرد و ویستیان بیگێڕنەوە نەیبیست و پتر پێی لەسەر لاساری خۆی داگرت و تیژتر لە تیری ساردەکەوان بەرەو تەورێز تێڕاچوو.

بەڕاستی لەبەر پێوقەدەمی بەودەمی بیووکخانی سەرتیپ گیانی گەورە و گچکەی خەڵکی ورمێ گورمی لافاوی ڕق و تووڕەیی دەوڵەت نەیگرتنەوە و خەڵەستن. موعینودەولە ماوەی سێمانگ بەوپەڕی سەرشۆڕی و سووکایەتی لەسەر کورسی دەسەڵات تۆتەکەی گرت و دەورووبەری نەورۆزی میری دەستی لە حوکمڕانێتی بەردا و بەرەو تەورێزی ناوەندی دەسەڵات بزووت و کەوتە شوێن کاری خۆی.

## کۆچی‌دوایی مەلیک‌مەنسوورمیرزا و چۆنیەتی ڕووداوەکان

ئەوەی ڕاستی بێ لەم سەروبەندەدا کە مانگی شکۆداری ڕەجەب بوو، خەڵک سەیر بە کەیف‌خۆشی هەر ترینگەیان دەهات. ڕۆژێکی بیووک‌خانی سەرتیپ وەختی لە مەزن و مالوولانی مەڵبەند خواستبۆوە و بانگهێشتنی کردبوون بۆ باغی دلگوشای خۆی. لەم کاتەدا شازادە مەلیک‌مەنسوورمیرزاش تەشریفی هات و هەر گەیشتە تەلاری باغ هێڵنج دایانگرت و ڕشایەوە و خوێنێکی زۆر و لەتەجەرگی هێنایەوە. لەڕێوە حەکیم سینیۆری جوولەکەیان گەیاندە سەری و کەوتە چارەسەر کردنی. جێوبانی خودی شازادەیان هێنا و لە تەلاری نێو باغ بۆیان ڕاخست. ئەگەرچی شادمانی کۆڕەکە وەسەر خەم گەڕا، بەڵام شازادە هیچ پێی‌خۆش نەبوو خانەخوێ بە خۆی‌دا بشکێتەوە و دڵتەنگی چەتری هەڵدا، بۆیە داوای کرد کە تارژەن و گۆرانیبێژ بێن و بێدەنگ نەبن و خۆی پێوە سەرقاڵ کردن، یانیها جواناوی نەدەڕشت. کاتێک میوانداری کۆتایی پێهات و کوڕەکە بلاوەی لێکرد، شازادەیان بە سواری فایتوون بردەوە ماڵ و سەرسەرای خۆی و پاش سێ ڕۆژان ڕۆیی بۆ بەر دلۆڤانی یەزدانی. پاشان سێ ڕۆژیان سەرەخۆشی بۆ دانا و جارێ تەرمی ئەو خوابەخشیوەیان لە حوجرەیەکی مزگەوتی محەممەدوەلی‌خان دانا هەتا ڕایگوێزن بۆ ژێردەرانەی بەرزی ئیمامان.

چەند شوێنەوارێکی چاکی کە ئەو خوابەخشیوە لە دوای خۆی بەجێی‌هێشتوون بریتین لە: ١- نۆژەن کردنەوەی تەکیەی قەرەسندووق کە شوێنی خەڵوەنشینیی دەروێشانی جیهاندیدە و گەڕیدەیە و بە یارمەتی

حەسەن‌ئاغای سەرفەراش دیوارێکی قایمی بە خشت و گێچ بە دەورەی‌دا کێشا و چەند ژووریشی لێ‌زیاد کرد. ٢- سازکردنی خەزێناوێک لە مەیدانی تۆپخانە.

شازادەی خودالێخۆشبوو بە [وەجاخ‌کوێری مرد] و پاشەواری نێر و مێـی لە پاش بەجێنەما.

هەر لەم سەروبەندەدا شـوجاعودەولە بـە مەبەسـتی تـاوتوێ کردنـی هێندێک کاروباری گرینگی مەڵبەندەکە فەرمووی کە بیووک‌خـان بگاتـە خۆیـە. ئەویش جڵەوی کارەکانی ئەسپاردە دەست ئەردەشێرخانی برازای و حاجی میرزا موحسینی حیسابداری سپا و چوو بۆ خۆیـە و دوای دیـداری کـاکی بـەرزەجێی بەپێی فەرمان ڕۆیی بۆ تەورێز.

# نێردرانی خەلاتی تایبەتی خونکاری ڕووسیا بۆ یۆسفخانی شوجاعوددەولە

پێشتر باسی کرا کە جێنشینی [سەرۆک] دەولەتی ڕووسیا دوای ئەو هەمووە ڕێز و میوانداریییە بەڵێنی دا بە شوجاعوددەولە کە میدال و حەمایەلی تایبەتی بۆ وەربگرێ کە نیشانەی پلەی سەردارییە. هەر بۆیە لە ئاخروئۆخری ئەم ساڵەدا کاغەزی فەرمانی خوندکاری خاوەنشکۆ لەگەڵ میدال و حەمایەلی تایبەت بە چەند کەسێکی ماقووڵی ئەو وڵاتەدا گەیشتە بارەگای پیرۆزی پادشای بەرزەجێی ئێران. فەرمانڕەواش بە سیلەنیگای میرانە لاواندییەوە و حوکمێکی بۆ مۆر کرد و دەستێک قوماشی بالاپۆشی ئاوریشمی کشمیری تریوسکەدار چەشنی خۆری بۆ خستە سەر. پاشان بە یەکێک لە پیاوماقووڵانی بارەگادا نێردران بۆ شوجاعوددەولەی ناودار. ڕۆژی گەیشتنی خەلات و فەرمان لە لایەن دوو پادشاوە، شوجاعوددەولە بەو شەوکەت و بڕشت و دەسەڵاتەی کە بووی وەهای پێشوازی کرد کە دیدەی ڕۆژگار دیمەنی ئاوای زۆر کەم دیتبوو. کۆڕێکی جێژن و پیرۆزبایی ئەوەندە خۆش و جوانی ڕازاندەوە کە دار و بەرد کەوتنە سەما و هەڵپەڕین و شادمانی. دوای بڕانەوەی کۆڕ و کۆبوونەوە و میوانداری کرانی بە دا، و دەستووری ئەو کەسانەی خەلاتیان هێنابوو، شوجاعوددەولە دەستنووسی فەرمانەکانی ناردن بۆ ئەردەشێرخانی کوڕی. ئەویش جانگیرخانی بەگلەربەگ و مامۆستایان و پیاوماقووڵان و سەرکردەکانی سپای بانگهێشتن کردن و کۆڕی جێژن و پیرۆزبایی و ڕازاندەوە.

# لیزگەی ناوی کەسان

(غ)



(ف)

(ن)

## لیزگەی ناوی شوێنەکان

(ن)



(و)

# لیزگەی‌ناوی نەتەوە و هۆز و خێڵ وخانەدانان

(چ)

*****